ناوی کتێب:
# مێژووی ئەمریکا

بابەت: مێژوو
نووسەر: پرۆفیسۆر د. ئاراس فەریق زەینەڵ
دیزاینی بەرگ و ناوەوە: ئومێد محەمەد
تیراژ: ١٠٠٠ دانە
نۆبەتی چاپ:چاپی چوارەم ٢٠٢٤
نرخ: ٦٠٠٠ دینار
چاپ: چاپخانەی تاران

# پێڕست

## پێشەکی

ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە دەستپێکی دۆزینەوە جوگرافیەکان و دۆزینەوەی جیهانی نوێدا دۆزرایەوە، هەر لە سەرەتاوە پانتاییەکی فراوانی لە زەوی بەپیت و ژینگەیەکی رەخساو بۆ گەشەی ژیان و جوولەی مرۆڤایەتی لە خۆگرتبوو، ئەمەش هۆکاری سەرەکی بوو بۆ ئەوەی بە لێشاو خەڵکی بە جیاوازی ئاستی کۆمەلایەتییانەوە لە هەموو ناوچەکانی جیهانەوە بە تایبەت لە ئەورووپای رۆژئاواوە رووی تێبکەن و تیایدا بناغەی ئەم دەوڵەتە بەهێزەی ئەمڕۆ دابڕێژن.

بەهۆی فراوانی رووبەرەکەی و بێئەندازە دەوڵەمەندیی خاکەکەی و نەبوونی دەسەلاتێکی بەهێز بۆ پارێزگاریکردنی، ئەمە وایکرد زلهێزەکانی ئەو سەردەمە چاو ببڕنە ئەم دیاریە بەنرخەو ململانێ بکەن بۆ بردنەوەی، لە کۆتاییدا بەریتانیا کە گەورە زلهێزی ئەو سەردەمە بوو توانی دەستبگرێت بەسەر ئەو خاکە دەوڵەمەندە تازە دۆزراوەدا.

وەک نەریتی ئەو سەردەمەی زلهێزەکان لەگەڵ خەڵکی ئەو ناوچانەی کە داگیریان دەکرد بەریتانیا گەلی ئەمریکای لە زۆر لە مافە سەرتاییەکانی بێبەش کرد و لە ناو خاکی خۆیاندا وەک هاولاتی پلەدوو مامەڵەیان لەگەڵ دەکردن، یەکێک لەو رەفتارانەی بەریتانیەکان کە مایەی نیگەرانی زۆری ئەمریکیەکان بوو ئەوەبوو کە بە درێژایی ئەو ماوە زۆرەی کە بەریتانیا حوکمی ئەمریکای دەکرد هیچ پلەبەرزێکی بەریتانیا (شا یان وەزیرێکی پلە بەرز) سەردانی ئەمریکایان نەکرد، لە کۆتاییدا هەستکردنی ئەمریکیەکان بە چەوسانەوەو ژێردەستی و هەموو ئەو سوکایەتیانەی بەرامبەریان دەکرا بوون بە هۆکاری سەرەکی بۆ سەرهەڵدانی شۆڕشی گەلی ئەمریکا لە پێناو سەربەخۆییدا.

خەباتی گەلی ئەمریکا لە پێناو سەربەخۆییدا هەنگاوێکی خێراو سەرسوڕهێنەری لە مێژووی ئەو کیشوەرەدا تۆمار کرد، پەرەسەندن و خەملینی گیانی نەتەوەیی و پچڕانی رەهێلەکانی ژێردەستی، هەموو ئەمانە ژانگەلێک بوون دواجار تایبەتکارەکانی نەتەوەیەک و کۆمەلگەیەکی دروست و قەوارەیەکی ئازادی هێنایە بەرهەم، دواجاریش لە رێگەی ئەم شۆڕشەوە گەلی ئەمریکا توانییان دەسەلاتی بێگانە لە ولاتەکەیان کۆتایی پێبهێنن و پاش کۆششێکی زۆر سەربەخۆیی خۆیان بەدەست بهێنن.

سەرکردەکانی شۆڕشی سەربەخۆیی ئەمریکا وەک دڵسۆزترین کەسەکانی ئەو وڵاتە ڕێگەیان نەدا باری پشێوی وڵاتەکەیان بەردەوام بێ و بە خێرایی کاریان کرد بۆ پتەوکردنی بناغەی دەسەڵاتە نوێیەکەیان، بۆ ئەو مەبەستەش وەک گرنکترین کار هەستان بە نووسینەوەی دەستووری وەڵاتەکەیان، نووسینی دەستوور وەرچەرخانێکی زۆر گرنگ بوو لە دۆخی ئەمریکاداو هەلێک بوو بۆ هاوڵاتیان تا پێناسەی بەها سەرەکیەکانیان بکەن و بەڵگەنانەی رابەر بۆ کۆمەڵگەیەکی نوێ بنووسنەوە.

ئەو جیاوازیە گەورەیە کە لە رووی ئابووری و کۆمەڵایەتیەوە لە نێوان ویلایەتەکانی باکوورو باشووری ئەمریکادا هەبوو لەگەڵ ململانێی بەردەوامی باکوورو باشوور بۆ دەستبەسەرداگرتنی ئەو ویلایەتە نوێیانەی کە لە رۆژئاوادا دروست دەبوون ، سەرەتاو هۆکاری سەرەکی بوون بۆ دروستبوونی نەخوازراوترین و مەترسیدارترین رووداو لە مێژووی ئەمریکا لەسەر خودی گەل و خاکی ئەو وڵاتە کە ئەویش جەنگی ناوخۆیی بوو، ئەم جەنگە ترۆپکی ململانێی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و سەربازی بوو لە نێوان دوو گرووپدا لە چوارچێوەی یەک دەوڵەتدا بۆ دەستگرتن بەسەر سەروەت و سامان و دەسەڵاتی سیاسی لەو وڵاتەدا، سەرباری زۆری زیانەکانی ئەم جەنگە بەڵام خودی جەنگەکەش هێمای زاڵبوونی ئەمریکیەکان بوو بەسەر گەورەترین قەیراندا لە مێژووی وڵاتەکەیاندا، کە لە کۆتاییدا بوو بە سەرەتای لە دایکبوونی نەتەوەی ئەمریکا و کۆماری نوێی فیدرالی لە جیهانی نوێدا.

بۆ ماوەیەکی زۆر ئەمریکا بەهۆی بنەماکانی مۆنرۆوە لە ترسی دەستێوەردانی دەرەکی لە کاروباری ناوخۆی وڵات، بەدوور بوو لە هەموو ئەو رووداوانەی کە لە جیهاندا بە گشتی و ئەورووپا بە تایبەتی روویاندەدا، بەڵام زیادبوونی توانای سەربازی و ئابووری ئەمریکا و دەرکەوتنی وەک زلهێزێکی لاو لەسەر شانۆی سیاسی جیهان هۆکاری بوو بۆ ئەوەی ئەمریکا لەو کەنارگیریەی بێتەدەرەوەو بە پێی ویست و بەرژەوەندی خۆی رووداوەکانی جیهان ئاراستە بکات.

ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە مەیدانی جوگرافی و ئابووری و ئایینی و سیاسیدا ماوەیەکی بەرفراوانی گرتەوە و وای لێهاتووە بێهەڵوێست بوون بەرامبەری واتای خۆدزینەوەیە لەڕاستی، بۆ ئاگاداربوون و شارەزایی لەم مەیدانە فرەلایەنەش پێویستە بگەڕێینەوە بۆ ڕەگوڕیشەی مێژوویی ئەم وڵاتە، چونکە تا

بنەڕەتی خەڵکی ئەو وڵاتەو پێکهاتەی مێژوویی و ئایینی و پاشخانی ڕابردووی سیاسی ئەمریکا نەزانین، ناتوانین بڕیاری تەواو لەسەر ئەمڕۆی بدەین .

سەرکردەکانی ئەمریکا لە هەلێک دەگەڕان تا هەژموونی وڵاتەکەیان بەسەر سیاسەتی نێودەولەتیدا بسەپێنن، ئەم هەلەشیان بە هەڵگیرسانی هەردوو جەنگە جیهانیەکە بۆ ڕەخساو توانییان لە هەردوو جەنگەکەدا ڕۆڵی سەرەکی ببینن لە یەکلاکردنەوەی ئەنجامی جەنگەکان لە بەرژەوەندی خۆیان و هاوپەیمانەکانیان.

ئیتر لێرەوە ئەمریکیەکان نەک بە تەنها توانییان بەرژەوەندیەکانی خۆیان لە جیهاندا بپارێزن، بەڵکو توانییان هەژموونی خۆیان بەسەر جیهاندا بسەپێنن و زۆربەی ڕووداوەکانی جیهان بە شێوەیەک ئاراستە بکەن کە پێچەوانە نەبێت لەگەڵ سیاسەت و بەرژەوەندیەکانیاندا، بەشێوەیەک ئەمڕۆ ئەمریکا بووە بە زلهێزە جیهانیەی کە دەیەوێت لە ڕووی هێزی سەربازی و ئابووری و سیاسی و تەکنەلۆژیاوە دەسەڵات و سیستەمی جیهانگەرایی خۆی بەسەر جیهاندا پیادە و پراکتیک بکات، ئەوەی ئەمڕۆ لەسەر شانۆی سیاسی جیهان ڕوودەدات ئەمریکا بزوێنەری سەرەکی زۆربەی هەرە زۆری ڕووداوەکانەو توانیویەتی لە زۆربەی ئەو گۆڕانکاریانەی کە لە ناوچە جیاوازەکانی دونیادا ڕوودەدات بەرژەوەندی خۆی بپارێزێت و ڕووداوەکان بەپێی بەرژەوەندی خۆی ئاراستە بکات.

مێژووی ئەمریکا ڕۆڵێکی باڵای گێڕاوە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا، هەرچەندە گەلی ئەمریکا خاوەنی مێژوویەکی دێرین نیە ئەگەر بەروارد بکرێ لەگەڵ وڵاتانی ئاسیاو ئەفریقاو ئەورووپا وەک نموونە، بەڵام ئەو ئەزموونە گەورە و مێژووییە کە گەلی ئەمریکای پیا تێپەری لە سەرەتای دروستبونیەوە تا ئەمرۆ شایەنی ئەوەیە کە بە وردی لێکۆڵینەوە و هەڵوێستە لە مێژووی ئەم نەتەوەیە بکرێت.

ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کە لە سەدەی بیست و یەکدا بەردەوام لەو پەری بەهێزی ونەشونمایدایەو، پێگەی تاکە هێزی گەورەی جیهانی لەخۆگرتووە، ڕەشەبای جیهانگیریش ڕۆژ لە دوای ڕۆژ کاریگەری خۆی زیاتر دەکات، ئەرکی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکایە دەرفەتی جیهانگیری لە بەرژەوەندی گەلی ئەمریکی و دەوڵەتانی دیکەی چواردەوریدا(دۆست و هاوپەیمانەکانی) بقۆزێتەوە، (صامۆئیل هانتکتۆن) لێکۆڵینەوەیەکی لەسەر گرنگی بەردەوامبوونی تا چارەسەرو سەقامگیری. دەڵێت: جیهان بەبێ ڕێبەری ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا دەبێتە جیهانێکی توندوتیژتر و پشێوی زیاتر و دیموکراتی کەمتر و گەشەی ئابووری لاواز

دەبێت لەو جیهانەی کە بە کاریگەری ویلایەتەکان بەردەوامی دەخوازێ، ئەو ویلایەتانەی کاریگەرییان زیاترە لە کاریگەی هەر دەوڵەتێکی دیکە بۆ داڕشتنی کاروباری جیهانی.

پێشەنگی نێودەوڵەتی بەردەوامخوازی ویلایەتە یەکگرتوەکان پێویستە بۆ خۆشگوزەرانی و ئاسایشی ئەمریکیەکان و داهاتووی ئازادی ودیموکراتی و ئابووری کراوە و سیستمی نێودەوڵەتی لە جیهاندا.

شتێکی سروشتیە ستراتیژی ئەمریکی بۆ خزمەتی بەرژەوەندی ئەمریکیەکانە، ئەمریکا لە ڕوانگەی جموجۆڵی و شەڕی دژ بەوەی کە بە (تیرۆری جیهانی) ناودەبرێ و بەردەوام لە چەندین ناوچەی جیهاندا هەڕەشە لە بەرژەوەندی ئەمریکا دەکات.

ئاراس فەریق زەینەل
٢٤ / ٢ / ٢٠٢٤

## ناساندنێکی گشتی

ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەکەوێتە نێوەندی کیشوەری ئەمریکای باکوور کە بەشێکە لەسەر زەمینی جیهانی نوێ، ئەم وڵاتە لە باکوورەوە کەنەدا دراوسێیەتی وولاتی مەکسیک و کەنداوی مەکسیکۆ دەکەونە دیوی باشووریەوە و لە ڕۆژهەڵاتیشیەوە زەریای ئەتڵەسی و لە ڕۆژئاواشەوە زەریای ئارام، ئەمە جگە لە ویلایەتی هاوای و ئالاسکا، چونکە ویلایەتی هاوای دەکەوێتە ڕۆژئاوای کیشوەری ئەمریکای باکوور لەناو زەریای ئارامدایە، ویلایەتی ئالاسکاش دەکەوێتە ئەوپەڕی باکووری ڕۆژهەڵاتی کیشوەری ئەمریکای باکوور و هاوسنوورە لەگەڵ رووسیادا.

ڕووبەری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا نزیکەی (٦٧٥.٨٢٦.٩)کیلۆمەتر چوار گۆشەیە، هاوکات دەکەوێتە نێوان هێڵەکانی درێژی (٧٠-١٢٥) پلە ڕۆژئاوای گرینیچ و بازنەکانی پانی (٢٥-٤٩) پلە باکووری هێڵی یەکسانیەوە.

سروشتی زەمینی ئەمریکای باکوور جۆراوجۆرە، لەچیا و گردۆڵکە و دەشت پێکهاتووە، دووری نێوان ڕۆخی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای دەگاتە (٤٨٢٧)کم.[١]

ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هەشت ڕووباری گەورەی تێدایە، ئەوانیش (میسیسپی، هدسۆن، الاباما ، السلام ، بۆتۆماک، ئۆهایۆ. هتد.....)، گەورەترین ڕووباری ئەمریکا میسیسپییە، درێژییەکەی دەگاتە (٣٩٧٤,٢٣کم) دەڕژێتە ناو ڕووباری هدسۆنەوە، پاشان هەریەکە لەم ڕووبارانە دەڕژێنە ناو زەریای ئەتلەسی و کەنداوی مەکسیک و کەنداوی کالیفۆرنیا لە ڕۆژئاوای مەکسیک.[٢]

ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە (١٧٧٦/٧/٤) سەربەخۆیی خۆیان لە ئینگلتەرا ڕاگەیاند و پاش (٨) هەشت ساڵ شەڕ لەگەڵ بەریتانیا لە (١٧٨٣/٨/٣) توانیان بە تەواوی سەربەخۆیی خۆیان بە دەست بهێنن، بەریتانیا و فەرەنساو وڵاتانی دیکەی تری جیهان دانیاننا بەو سەربەخۆییەی ئەمریکادا، ئەمریکایەکان لە پاش ئەم سەربەخۆییە توانیان یەکەم دەستور بۆ ئەم وڵاتە دابنێن و لە (٣٠)ی نیسانی ساڵی (١٧٨٩) یەکەم حکومەتی فیدراڵی ئەمریکا دامەزرا بە سەرۆکایەتی (جۆرج واشنتن)

---

١) د.ئازاد محمد أمين:جغرافية الامريكتين،جامعة البصرة،١٩٨٣، ص٧- ١٩.

٢)مؤلف مجهول: معلومات وحقائق عن الولايات المتحدة الأمريكية، دون مكان الطبع،ص ٣.

و (جـون ئـادامس) وەک جێگری سـەرۆک و (جیفەرسـۆن) وەک وەزیـری دەرەوە و(الکســندر هــاملتون) وەک وەزیــری دارایــی و(هنــری نــۆکس) وەک وەزیــری جەنگی(ئەدموند راندولف) وەک وەزیری داد و(چون چای) وەک سـەرۆکی دادگای باڵای فیدراڵی، شاری نیۆیورک کرایە پایتەختی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، پاشـان لە سـاڵی (١٨٠١) شـاری (واشـنتن دی سـی) یـان دروسـتکرد و پایتەختیـان گواسـتەوە ئەو شـارە کە تـایبەتە بە فەرمـانڕەوایی ئەمریکـا، ئەوکـات ژمـارەی دانیشـتوانی ئەمریکـا تەنهـا (٣) سـێ ملیـۆن کەس بـوو، هەروەهـا لە (١٣) ویـلایەت پێکهاتبوو،[1] بەڵام ئێستا (٥٠)پەنجا ویلایەتە، لە سـاڵی (٢٠٢٣) ژمارەی دانیشـتوانی ئەمریکـا گەیشـتە زیـاتر لە (٣٣٥.٨٠٠.٠٠٠) ملیـۆن کەس وچڕی دانیشـتوانی (١٧٥) کەس لە (٣٣) کیلۆمەتر چوار گۆشـەدا، ڕێژەی گەشـەکردنی دانیشـتوانی (٨٧%) و ڕێـژەی مـردن تیـایدا (٠,٦%) بـووە، لـە ڕووی پەیڕەوکردنـی ئاینیــەوە (٥٨%)ی پرۆتــستانت و (٢٦%)ی کاسـۆلێک و (٢%) جـوو و (٨%)ی بـێ ئـایین و (٦%) ئاینیەکـانی دیکە، هەروەهـا لە ڕووی زمـانەوە جـگە لە زمـانی ئینگلیـزی کە زمـانی سەرەکیە لە وڵاتدا چەندین زمانی جیاوازی تێدایە وەک (فەرەنسی، ئەڵمـانی، ئیتـالی، چینی، ئیسپانی) و چەنـدین زمـانی دیکە،[2] لە ڕووی ژیـانی ئـابووریەوە ئەمریکا لە ڕیزی پێشەوەی وڵاتە کشتوکاڵی و پیشەسازییەکانەوە دێت، بۆ نموونە کشـتوکاڵ لە ئەمریکـا لەسـەر شـێوازی کێڵگەی فـراوان پەیـڕەو دەکرێت، هەر لە کەنارەکـانی ئەتڵەسییەوە تا دامێنی چیاکانی ڕۆکی بە دەشـتاییەکانی حەوزی میسیسپیشـەوە بۆ کـێڵگەی دانەوێـڵەی وەک (گەنـم و جـۆ و گەنمەشـامی) تەرخـانکراوە، بە جۆرێـک ویـلایەتە یەکگرتووەکـانی ئەمریکـا زۆرجـار بە یەکەم وڵاتـی جیهـان دادەنرێـت لە بەرهەمهێنـانی گەنمـدا، هەروەهـا چەڵتـووک (بـرنج) لە کەنارەکـانی سـەر ئەتڵەسـی و دەشتی میسیسپی بەرهەم دەهێنرێت و کۆیلەکان بە تایبەتی ڕەشپێستەکان ئەو کات بە پلەی یەکەم پشتیان دەبەست بەم بەرهەمە، هەروەها ئەمریکا لە ڕووی بەرهەمـی لۆکەش بە هەمان شێوە لە ڕیزی پێشـەوەی وڵاتـانی جیهانەوەیە، هاوکـات بەرهەمە

---

١)فرحات زيادة و ابراهيم فريجي: تاريخ الشعب الأمريكي، تحت اشراف فيليب حتي، مطبعة برنستون، ١٩٤٦، ص٥٣-٦٢.

٢)لوقمان خەیاڵی: پوختەیەک لە مێژووی گەورە زلهێزی جیهان، چاپخـانەی وەزارەتـی ڕوشـنبیری، سلێمانی، ٢٠٠٥، ل ١٨-٢٠.

کشـتوکاڵییەکانی دیـکەی وەک (تـوتن و قامیشـی شـەکر) لە زۆربەی ناوچەکـانی ئەمریکـا بەرهەم دەهێنرێـت، لە ڕووی ئاژەڵـدارییەوە ئەمریکیەکـان زۆر بـایەخ بەم بـوارە دەدەن، لەسـەر شـێوازێکی پێشـکەوتووانەی هـاوچەرخ مەڕ ومـاڵات بە خێودەکەن و بەهـۆی فرۆشـتنی بەرهەمەکانیەوە داهـاتی باشـیان دەسـت دەکەوێت، جگە لە (ماسی) کە بۆ خۆی بەشێکی گرنگی ژیانی ئابووری دانیشتوانی ئەمریکا پێکدەهێنێت، ئەوەش بەهۆی ئەوەی ئەمریکا خاوەن کەنارێکی دەریایی فراوانە.[1]

ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ڕووی پیشەسازیەوە زۆر پێشکەوتووە بە تـایبەتی لە پیشەسـازی ئۆتۆمبیـل و چەک و کەرەسـتەی جەنگـی بە هەمـوو شێوەکانیەوە و کۆمپیوتەر و لە بوارەکانی تەکنەلۆژیا و پێوەندیەکان و سیستەمی هـاتوچۆدا سـەرکەوتوو بـووە، ئەمەش وایکـردووە کە ئـابووری ناسـان پێیـان وایە ئەمریکا تەنها لە ڕێگەی باج وەرگرتن و پارەی ئینتەرنێت و هـاتوچۆدا دەتوانێت بژێت، ئەمە جگە لە خزمەتگوزاری پزیشکی و بیناسازی و نەوت و هتد... .[2]

١)د. طليعة الصياح و د. راغب العلي: تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية، جامعة دمشق،١٩٩٥، ص ٨ – ١٠.

٢) د.صالح زهر الدين: موسوعة الامبراطورية الأمريكية، المركز الثقافي اللبناني، ط١، ٢٠٠٤، ص ٤٠.

## دۆزینەوەی جیهانی نوێ

پێویستە ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە (کریستوڤەر کۆلومبس) یەکەم کەس نەبوو کیشوەری ئەمریکای دۆزیبێتەوە، بەڵکو بەپێی وتەی پرۆفیسۆری ئینگلیزی (جیرازیوی) ئاماژە بەوە دەکات میسرییە کۆنەکان بۆ یەکەم جار لەساڵی (٣١٥٠پ.ز) ئەمریکایان دۆزییەوە بەهۆی پەیوەندییەکانی نێوان هەردوولاوە.[١]

دۆزینەوەی کیشوەری ئەمریکا لەلایەن ئەوروپییەکانەوە دەگەڕێتەوە، بۆ سەردەمی گەشەکردنی دۆزینەوە جوگرافیەکان لەئەوروپا سەردەمی بوژانەوەی ئەوروپا کۆمەڵێک دیاردە و سیمای تایبەتی خۆی هەبوو وەک دۆزینەوەی چاپ و زیندوکردنەوەی کلاسیکیەت و چاکسازی ئایینی و دۆزینەوەی پێگەی جوگرافی و دورست بوونی کۆمەڵێک کاری یەک لە دوای یەک و بەردەوامی بیرمەندان و زانایان و پیاوانی ئایینی و پیاوانی سیاسی و رۆشنبیران بوون.[٢]

دۆزینەوەی ئەمریکا و نیشتەجێبوون و فراوانخوازی تیایدا دیاردەیەکی سەیر نەبوو، جگە لە شەپۆلێک لە شەپۆلەکانی پڕ جووڵەی ڕەوتی مرۆڤایەتی نەبێت، چونکە لە سەرەتای مێژووەوە ئەم شەپۆلانە هەبوون، هەندێکیان لە دوای ئەوانی دیکە هاتوون ئیتر لە شێوەی کۆچی هۆز و خێڵەکان بوو بێت یان تێپەڕینی سوپاکان بووبێت بە دەشت و کێو و ڕووبار و دەریاکاندا، دەبێت ئەو ڕاستیە قبوڵ بکەین کە ژیان بەردەوام لە ڕەوت و کۆچ و گۆڕاندایە، هەریەک لەمانە (بابلی، سۆمەری، میسری، ئێرانی، رۆمانیەکان، کوردو... هتد) هاتن و سەردەمی خۆیان تەواوکرد و مێژووش دوایان کەوت، مێژوو هێزێکە لە سنورێکدا ناوەستێت، بەڵکو بەردەوام لە گەشەدایە، هەرکەس هاوئاهەنگ و تەریبی بێت ئەوا بە زیندوویی و کارایی دەمێنێتەوە،[٣]ئەوەش بەپێچەوانەکەی گوزەری کرد دوا دەکەوێت و دەوەستێت، وەک هەموو ئەو هێزە گەورانەی تیاچوون، چیرۆکی دۆزینەوەی

---

١)د. محمد محمد صالح: تاريخ اوروپا من عصر النهضة و حتى الثورة الفرنسية(١٥٠٠-١٧٨٩) بغداد، ١٩٨١، ص ١٠٩.

٢) د.فرغلي علي تسن: تاريخ اوروپا الحديث و المعاصر، جامعة العلاقات الدولية، دار الوفاء للطباعة والنشرالاسكندريه، ص ٤٠.

٣) فرحات زيادة: تاريخ الشعب الأمريكي،ص ٣ - ٥.

ئەمریکـا و پاشـتریش لەگەڵ مێـژوو هـاوتەریبە، دۆزیـنەوەی ئەمریکـا و پاشـتریش لەگەڵ مێژوو وئەزمـونی مێژوویـدا گـوزەری کـرد لەبەر ئەوە هەر لە دۆزینەوەیەوە تا ئێستا ڕوو لە گەشەو شارستانیەو بەو ئاڕاستە دەڕوات.

زۆرێـک لە مێژوونوسـان ئەوەیـان دووبـارە کـردۆتەوە کە بەر لە گەشـتەکەی کۆلـۆمبس چەنـدین ڕەوی دیـکەی مرۆڤـایەتی لە ناوچەکـانی ئاسـیا و ئەفریقـا و ئەوروپاوە گەیشتۆتە ناوچەکانی ئەمریکا.[1]

هەروەک لە ئەفسـانە کۆنەکانیشـدا هەیە کە زۆربەیـان دەگەڕێـنەوە بـۆ چـاخە کۆنەکان و باس لە بوونی زەوییەکی فراوان ئەکەن بە ئاراسـتەی ڕۆژئـاوادا، وەک ئەوەی لە کتێبەکـانی مێژوونـوس (سـیوبومبس) هـاتووە، ئەم ئەفسـانەیە لەسـەر شێوەی دیـالۆک لە نێوان (سلینومیداس)دەبینرێ،سلین بـاس لەوە دەکات کە ئاسـیا وئەفریقا وئەوروپا بە ئاو دەور دراوە، ولە پشـتی ئەو ئـاوەوە ڕووبەرێکی گەورەی زەوی هەیە, چـی دیـکەش لەم بـارەیەوە وتـراوە ئەوەیە کە میسـرییە کۆنەکـان و فینقیـی و باسـک و کەتـالۆنی و ئەڵمـانی و فەرەنسـایی و هینـدیی و ژاپـۆنی و ڕۆمانیەکان توانیویانە بگەنە ئەمریکای ئەمڕۆ، بەڵام لە ڕاستیدا ئەم بیر وباوەڕ و ئەفسانانە هیچیان پشتڕاستێکی زانستییان نیە، جگە لەوەش دەوترێت باکورییەکانی ئەسکەندینافیا یەکەم گروپ بوون گەیشـتونەتە ئەمریکـا، ئەمەش بە گەیشـتنی (لیف ئەریکسـۆن) بـۆ فاینلانـد یـان زەوییەکـانی (کـرۆم) لە سـاڵی (١٠٠٣)، کە شـوێنەکەی دەکەوێتە نزیک نیۆیورکی ئەمڕۆوە، پاشتریش براکەی (ئۆرفولد) لە سـاڵی (١٠٠٨)دا دووبارە دەگاتەوە فاینلاند، دواتریش (تۆرفین کارلسفنی) ئیرلەندی لە سـاڵی (١٠١١-١٠١٢)دا دەگاتە فاینلاند.[2]

بەڵام باکوریەکـانی ئەسـکەندینافیا هـیچ ئاسـەوارێکیان بەجـێ نەهێشـتووە کە گوزارشت و جەخت لەسـەر ئەوە بکەنەوە گەیشتۆنەتە ئەو ناوچـانە، دیـارە ئەمەش ڕەنـگە بگەڕێـتەوە بـۆ ژیـانی سروشـتی دەریاییـان و زۆربەی گەشـتەکانیان زیـاتر لەبەر ئەوەش بێت کە هیچ نوسـینێکیان جێ نەهێشـتووە کە بـاس لە بوونیـان بکـات یان شوێنەوارێک کە پشت ڕاستی ئەم ڕووداوە مێژووییەی ئەوان بکاتەوە، زۆربەی

---

١) د.طليعة الصياح و د. راغب العلي: هەمان سەرچاوە، ل ٢٧.

٢) هەمان سەرچاوە، ل ٢٧.

ئەو بۆچوون و ڕایانەش لە بارەی گەشت و کۆششی ئەوانەوە هەیە کە ئەمریکایان دۆزیبێتەوە ئەوەی کە هەیە تەنها لە ڕێگەی گێرانەوەکانەوە بۆیان ماوەتەوە.[1]

جگە لە مانەش هەندێ لە سەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە زانا ڕۆژهەڵاتیەکان لە سەدەکانی ناوەڕاستدا بە ئامادەکردن و ناردنی دەریاوانەکان بە ئاراستەی ڕۆژئاوادا دەستپێشخەری و ئاسانکاریان کردووە بۆ دۆزینەوەی ئەمریکا، هەروەک ئەوەی (ئیدریسی) گەریدە باسی دەکات کە ئامانجیان دۆزینەوەی وڵاتێکی تازە بوو لە ڕۆژئاوادا، هەروەک لە دواتر (کۆلومبس) سوودی لێوەرگرتوون و ئاماژەش بەوە دەکات کە سوودی وەرگرتووە لە ڕای (فەرغانی) ئەستێرە ناس کە خاوەنی کتێبی (المدخل الی علم الافلاک)، کە بەر لە دەرکەوتنی (کۆلۆمبس)بە (٣٠٠)ساڵ کراوەتە لاتینی و ڕۆژئاواییەکان لە گەشتەکانیاندا سوودیان لێوەرگرتووە، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەو هەوڵانەدا لە ڕاستیدا دۆزەرەوەی ڕاستەقینەی ئەمریکا دەگەڕێتەوە بۆ هەوڵی دەریاوانە ئیسپانیەکان.[2]

لە ڕاستیدا گەڕان بە دوای شوێن و ناوچەی وڵاتی نوێ سیمایەکی ئەو سەردەمە بوو، بۆ ئەو مەبەستەش هەریەک لە وڵاتانی وەک (ئیسپانیا و پورتوگال و ئیتالیا و هۆڵەندا و فەرەنسا و ئینگلتەرا... هتد) یەک لە دوای یەک کەوتنە گەڕان و دۆزینەوەی پێگە جوگرافیەکان، پاش ئەوەی پورتوگالییەکان ڕێگایەکیان بەرەو هند دۆزییەوە بە خولانەوە بە دەوری ئەفریقیادا، ئەوەبوو دەریاوان (دیاز) توانی لە ساڵی (١٤٨٦) بگاتە سەری لوتکەی هیوا (رأس الرجاء الصالح) لەو پەڕی باشووری کیشوەری ئەفریقیا، هەروەها (فاسکودیگاما)یش لە ساڵی (١٤٩٨) توانی ئەو لوتکەیە ببڕێت و بگاتە (کالیکوت)ی هیندستان، ئەم چالاکییانە وای لە ئیسپانەکان کرد بۆ هەمان مەبەست تێبکۆشن بۆ ئەوەی بە ئاراستەی خۆرئاوا ڕێگایەکی نوێی بازرگانی بەرەو چین و هیند بدۆزنەوە، چونکە مەڵبەندی بازرگانی بوو لە ڕۆژهەڵاتدا، هاوکات بۆ کێبڕکێ کردنی پورتوگالیەکان، بۆیە هەستان بە پشتگیری کردنی (کریستوڤەر کۆلومبس) کە بە ڕەگەز ئیتالی و خەڵکی شاری جەنەوە بوو، یەکەمین کەسێک بوو لەم بوارەدا ناوبانگی هەبووە و پاش

---

١)هەمان سەرچاوە، ل ٢٨.

٢)د.عبد العزیز سلیمان و د. عبد المجید نعنعی: تاریخ الولایات المتحدة الأمریکیة الحدیث، دار النهضة العربیة،بیروت، ص ٧- ٨

مشتومڕێکی زۆر شا ژنی ئیسپانیا (ئیزابیلا) رازی بوو بەوەی هەموو کۆمەکێکی بکات، (کریستوڤەر کۆلومبس) پاش بەدەستخستنی کۆمەڵێک زانیاری جوگرافی و دەریاوانی لە (٣)ی ئابی ساڵی (١٤٩٢) بە سێ کەشتی دەریایی و (٨٧) دەریاوانەوە لە بەندەری (پالس)ی ئیسپانیاوە کەوتەڕێ و لە (١٢)ی تشرینی یەکەمی ئەو ساڵە پاش ماندووبونێکی زۆر و بێزاری کەشتیوانەکان و ترس لە ئەفسانەکان، گەیشتنە دورگەی (سان سلفادور) دواتر بەرەو (کوباو هایتی) بەڕێکەوتن، کاتێک گەیشتنە کوبا وایانزانی ئەمە وڵاتی هیندە و ناوی خەڵکەکەیان نا هیندیە سوورەکان، چەند ماوەیەک لە دورگەکانی دەریای کاریبیدا سوڕایەوە و لە سەرەتای ساڵی (١٤٩٣) گەڕایەوە وڵاتی ئیسپانیا، و نەبێت تەنها ئیسپانەکان هەوڵی دۆزینەوە جوگرافیەکانیان دابێت، بەڵکو پورتوگالیەکان و فەرەنسیەکان و ئینگلیزەکان لەگەڵ ئیسپانیەکان زۆربەی ئەمریکای باکور و باشوریان دۆزیەوە، خەڵکی گەیشتە (رأس هورن) کە دوا وێستگەی ئەمریکای باشوورە.[1]

لەگەڵ ئەو هەموو دۆزینەوانەی کۆلۆمبس، (کۆلۆمبس) یەکەم ئەورووپی نەبووە کە ئەمریکای دۆزیبێتەوە، بەڵکو لە پێشتر خەڵکی باکووری ئەوروپا بە نزیکەی پێنچ سەدە لەپێش ئەو چوون بۆ ئەو شوێنانە، لەگەڵ ئەوەشدا دۆزینەوەکەی کۆلۆمبس بۆ جیهانی نوێ سەرەتایەکی گرنگ بوو بۆ مێژووی ئەمریکا، هەرچەندە هەندێک نووسەر پێیان وایە مێژووی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە دامەزراندنی داگیرگەی ئینگلتەرا لەسەر کەناری رۆژهەڵاتی ئەمریکای باکور لە سەدەی حەڤدەهەمدا دەست پێدەکات.[2]بەم دۆزینەوە مەزنەش (کریستوڤەر کۆلۆمبس) شۆڕشێکی گەورەی لەو سەردەمە بەرپاکرد لە جیهاندا، چونکە دواتر ئەم کیشوەرە نوێیە بووە نیشتمانی گەلێکی زیندوو و چالاک، هاوکات سروشتی جوگرافی لە باریش لەم کیشوەرە هاندەرێکی باشی ئەوروپییەکان بوو کە بە لێشاو کۆچی بۆ بکەن و تیایدا نیشتەجێ ببن.دوای گەڕانەوەی کۆلۆمبس لە دوایەمین گەشتی لە ساڵی (١٥٠٤)دا بۆ ئیسپانیا، (ئەمریکوڤسیوتشی ١٤٥٤-١٥١٢) بە ڕەگەز ئیتالیی وەک دۆزەرەوەیەکی ئیسپانی هەستا بە چەند گەشتێک و توانی کەناری بەرازیل بدۆزێتەوە، دوای گەڕانەوەی بۆ ئەوروپا هەواڵی گەشتەکەی بڵاوکرایە وە ناوی لە

---

١) فرحات زیادة: سەرچاوەی پێشوو، ل ٣ – ٥.

٢) د. اسماعيل احمد ياغي: معالم التاريخ الأمريكي الحديث،مكتبة العبيكان،ط ١، الرياض،٢٠٠١، ص ١١.

ناوی کۆلۆمبس زیاتر دەرکەوت. ئەمریکۆ ڕایگەیاند ئەو وڵاتەی بۆی چووە وڵاتێکی تازەیە و ژاپۆن و هند نیە، بەڵکو زەوییەکی تازەیە و جیاوازی هەیە، بەمەش جوگرافی ناسەکان ئەم جیهانە تازەیان ناونا (ئەمریکا) بە ناوی ئەمریکۆوە.[1]

لە پاش دۆزینەوەی کۆلومبس بۆ ئەمریکا (جۆن کابوت) (١٤٦١-١٤٩٨) پەیدابوو، کابوت وەک کۆلۆمبس و ئەمریکۆ بە ڕەگەز ئیتاڵییەو لە ساڵی (١٤٩٠) ڕۆیشت بۆ ئینگلتەرا و بوو بە بازرگانێکی دەوڵەمەند، هەستا بە گەشتێک بۆ ئەمریکای باکوور لەسەر ڕاسپاردەی پاشای ئینگلتەرا لە ساڵی (١٤٩٧)دا، لە کەناری ڕۆژئاوای ئەمریکای باکوور نزیک بوویەوە و پێ دەچێت ئەو شوێنە (نیوفۆندلاند) یاخود (لابرۆ- درۆ) بێت. لەسەر بنچینەی گەشتەکانی کابووت پاشای ئینگلتەرا توانی ڕووبەرێکی فراوان بخاتە سەر ئەم جیهانە نوێیە.

هەرچەندە فەڕەنساش درەنگ کەوتە بواری دۆزینەوە جوگرافیەکان بە هۆی سووربوونی فەرەنسا لە دامەزراندنی ئیمپراتوریەتەکەیان لە ئەورووپا وەک لە جیهانی نوێ، بەڵام دواتر لەسەر بنچینەی دوو گەشتەکەی (جاک کارتییە ١٤٩١-١٥٥٧) توانی ناوچەیەک لەسەر ڕووباری (سانت لۆرانس) بدۆزێتەوە و ناوی (مونتریاڵی) لێ بنێت کە گوندێکی هندی بوو.[2]

ئەمەش وای لە ئەوروپییەکان کرد بە لێشاو ڕووبکەنە ئەم خاکە نوێیە و لەگەڵ خۆیاندا تۆوی دانەوێڵە و بەرهەمە کشتوکاڵییەکانیان برد و دەستیانکردە کشتوکاڵ کردن، هەروەها ئاژەڵ و ماسی و گیانەوەرە جۆراوجۆرەکانیش بە شێوەیەکی زۆر لە کیشوەرەکەدا بڵاوبوونەوە، دواتریش دەرکەوت کیشوەرەکە پڕە لە کانزای (ئاسن، خەڵوز، مس، نەوت... هتد). جگە لەمانەش چەند هۆکارێکی دیکە یارمەتی گەشەکردنی نەتەوەی ئەمریکییاندا لەوانەش زۆری ڕووبارى گەورە کە وەک هۆکارێکی کارای گواستنەوە بەکاردەهێنران و زۆری کەنداوەکانیش یارمەتی بنیاتنانی (داگیرگە)ی بچوکیان دا و هەریەک لەو دورگانە دواتر هەوڵی پاراستنی سەربەخۆیی و قەوارەی تایبەت بەخۆیاندا.[3]

زنجیرە چیاکانی (اپلاتشیان) بوونە لەمپەر لە بەردەم پەلهاویشتنی بەرەو خۆرئاوا، لە هەمان کاتدا (داگیرگە)کانی خۆرهەڵات جمەیان دەهات لە خەڵک و

---

١)د.عبد العزيز سليمان و د. عبد المجيد نعنعي: س- پ، ل ١٧.

٢) د.صلاح احمد هريدي: دراسات التاريخ الأمريكي، جامعة العلاقات الدولية، دار الوفاء للطباعة والنشر،٢٠٠٠، ص٣٧.

٣)فرحات زيادة: س- پ، ل٥.

مۆرکی تایبەت بە خۆیان وەرگرت، دواتر خەڵک توانی لەم چیایە بپەڕێتەوە و چیتر خەڵک بەرەو خۆرئاوای کیشوەرەکەش ملیان ناو خەڵکە کۆچبەرەکە لە دەشتەکانی خۆرهەڵاتدا نیشتەجێ بوون، چونکە لە سەرەتادا ئاسان نەبوو بەرەو خۆرئاوا کۆچ بکەیت، دواتر بەهۆی چاک کردنی ڕێگاکانەوە و پشتیوانی حکومەت بە ناردنی سوپا و کۆمپانیاکان بووە شتێکی ئاسایی.(١)

## شارستانیەتی ئەمریکا

بە درێژایی مێژووی ئەم سەر زەمینە لەگەڵ پەیدابوونی یەکەمین مرۆڤدا، مرۆڤایەتی توانیویەتی شارستانیەت بۆ خۆی دروست بکات، قۆناغ بە قۆناغیش ئەم شارستانیەتانە گۆڕان و پەرەسەندنیان بەخۆوە بینیوە و چەندین شارستانیەتی دەوڵەمەندییان بنیات ناوە کە دەتوانن ئەو گەل و مرۆڤانە شانازی پێوە بکەن.

لە کۆتایی چەرخی بەستەڵەکدا بە مەبەستی ڕاووشکاری کۆمەڵێک ڕاوچی بۆ ڕاوکردنی نێچیر بە گەرووی بیرنیجداکە هەردوو کیشوەری ئاسیا و ئەمریکای باکور بەیەکەوە دەبەستێتەوە پەڕیونەتەوە بۆ ئەمریکای باکوور، ئەمانە بە یەکەمین مرۆڤەکان دادەنرێت لە هەردوو ئەمریکادا ژیابن.

کۆچکردنی ئەو ڕاوچیانە بۆ ئەمریکا ماوەیەکی زۆری خایاندووە، چەندین شارستانیەتی جیاواز لەم ناوچەیەدا دروست بووە، هەر لە شارستانیەتی دواکەوتووەوە بگرە تا ئەوپەڕی شارستانیەتی پێشکەوتوو.

شوێنەوارناسەکان ئاماژە بە پێشکەوتنی گەلە ڕەسەنەکانی ئەمریکا دەکەن، ئەمانە بەپێی ئەو سەردەمەی تیایدا ژیاون خاوەنی چەندین شارستانیەتی ڕەسەن و پێشکەوتوو بوون، بە پێی سەرچاوە مێژووییەکان کە ئاماژەی پێ دەدەن خاوەنی چەندین پەرستگا و یاریگا و بیر و باخچە و شەقام و گۆڕەپان و شوێنەواری ژیان و کێڵگەی کشتوکاڵی لە شاخ و دەشتەکانیدا بوون، ئێستاش شوێنەواری زۆربەی ئەو شارستانیەتانە هەر ماون.

لێرەدا هەوڵدەدەین هەندێک لەو شارستانیانە بخەینەڕوو:

---

١) د.طليعة الصياح: س- پ، ل٣ – ٤.

**یەکەم. ئۆلۆمیکس:**

وەک سەرچاوەکان باسی دەکەن یەکەم شارستانیەتی گەورەی ئەمریکایە و لە (٣٥٠٠)پ.زدا لە ناوچەکانی مەکسیک وگواتیمالا(غواتیمالا) دەستی بە گەشە و پەرەسەندن کردووە، لە ساڵی (١١٥٠)پ.زدا شاری سان لۆرانزۆ دەکەنە مەڵبەندێکی ئایینی تا ئاهەنگە ئاینیەکانیان تیا ساز بکەن و ژمارەیەکی زۆر لە پەیکەر و شتە پیرۆزەکانیان تیادا جێ کردوەتەوە، بەلاّم ئەم شارە لە ساڵی (٩٠٠)پ.زدا بە هۆکارێکی سروشتی وێران بووە و سەرجەم پەیکەر و شتە پیرۆزەکانیان لەناوچووە، بەلاّم دوای سەد ساڵێک و لە ساڵی (٨٠٠)پ.زدا لە دوورگەیەک بەناوی (لافینتا) زۆر دوور نەبووە لە (سان لۆرانزۆ)ی ڕووخاو، هەمان مەڵبەندی ئاینیان دروست کردووەتەوە بۆ هەمان مەبەست و سەرلەنوێ سەرجەم پەیکەر و شتە پیرۆزەکانیان دروستکردەوە، هەرەمێکی گەورەیان دروستکرد، بەرزییەکەی (٣٠) مەتر (١٠٠) پێ بووە، بەرزترین بینای سەردەمی خۆیان بووە لە ئەمریکای ناوەڕاستدا و شاری (کویکولکو) لە رۆژئاوای (سان لۆرانزۆ) کردویانەتە مەڵبەندێکی بازرگانی، هەروەها لە بواری پەیکەرتاشیدا ئۆلۆمیکەکان پەیکەری گەورەیان لە بەرد و پەیکەری بچوکیان لە بەردی ڕەنگاوڕەنگ دروست دەکرد، هەروەها زۆربەی ئەو دەسکەوتانەی گەلی (ئۆلۆمیکس) بە دەستیان هێنابوو لەلایەن گەلنی تری ئەمریکاوە سوودی لێ وەرگیراوە بۆ نمونە تۆپی پێ ئەمریکی ئەمانە بووە، هەربۆیە بە ڕۆشنبیری ئۆلۆمیکس دەوترێت (دایکی رۆشنبیرییەکان).[1]

**دووەم. تەشافییەکان**

تەشافییەکان چیای (ئەندیز)یان لە ساڵی (٩٠٠)پ.زدا لە ناوچەی پیرۆ بەکارهێناوە بۆ نیشتەجێ بوون و پشتیان دەبەست بە دەریاچەکان لە ئەمریکای ناوەند، لە کاتێکدا ئۆلۆمیکسەکان لە ناوچەکەدا هەبوون،هەروەها گەشەیان دا بە شارستانیەتی ئۆلۆمیکس. تەشافییەکان هەڵدەسان بە چاندنی گەنم، ئەم جۆرە

---

١)تاریخ العالم لةسةر ( C.D).

خـواردنه دەیتـوانی خـواردنی شـارەکه دابـین بکـات بەبـێ تێکۆشـانێکی گەورە،[1] تەشـافییەکان توانیـان ئـامێری چنـین بەکـاربهێنن بـۆ چنینـی جـل و بەرگەکانیـان سەرەڕای کەمـی لۆکە، هەروەهـا له پیشەسـازی قاپوقاچاغدا شـارەزاییەکی زۆریـان هەبووە، هەندێک کـات قاپوقاچاغەکانیـان لەسـەر شـێوەی ئـاژەڵ و باڵنده دروسـت کردووە، تەشافییەکان له ساڵی (٨٥٠)پ.زدا شوێنێکیان بۆ مەبەستی ئایینی دۆزیەوە ناویان نا (تەشافین زی هۆنتار)، ئەمیش پێکهاتووە له گۆڕەپانێکی گشتی و شەقام و دیـواری ئەسـتوور، هەروەهـا پەرسـتگایەکی بەردینـی گەورە کەوتبـووە ناوەڕاسـتی گۆڕەپـانەکه و له پەرسـتگاکەدا پەیکەرێکـی گەورەیـان بـۆ خواوەنـد (ئیـل لانـزۆن) دروست کردبوو.[2]

•

### سێیەم. بۆبلۆ (ئاناسازییەکان)

له دەورەبەری سـاڵی (٩٠٠)پ.زدا ئاناسـازییەکان بەبـاو باپیرانی هندییه سـوورە هۆپییەکــانی ئەمــرۆ دادەنــرێن لەو ناوچــانەی ئێســتا به باشــووری ویــلایەته یەکگرتووەکـانی ئەمریکـا دەناسـرێن دەسـتیانکردووە به دروسـت کردنـی گونـد، بیناکانیان له شێوەی باڵەخـانەی سـەیر و بێ وێنه دابـوون و پێیـان دەوتـن (بۆبلـۆ). زۆربەی کات لەسەر تاوێره بەردە زەبەلاحەکـان دروست دەکران و پێکهـاتبوون له چەنـد قاتێـک، هەر قـاتێکیش چەنـد ژوورێکـی تێـدایه، بەناوبـانگترین کۆشـکەکانی (مێسافێردە)یه نزیکەی دووسەد ژووری تێدایه و دەکەوێته ویلایەتی کلۆرادۆ.

ئاناسازییەکان له بواری کشتوکاڵ و کاری دەستی و هەڵکۆڵین به توانا بوون، به خواوەندەکانیان دەوت (کیفا) و زیاتر له بەشی خوارەوەی بۆبلوەکان

دادەنـران و هەر لەوێـش کـاری پەرسـتنیان ئەنجامـدەدا، ئەم گەله زیـاتر له ناوچەکانی ئەریزۆ و نیو مەکسیکۆ بوون.[3]

---

١) لاوریت سیجولانه: امریکا اللاتینیة (الثقافات القدیمة ما قبل الکولومبیة، ترجمة- صالح علماني، ط١، المجلس الاعلی للثقافة،٢٠٠٣، القاهرة، ص ٢٤١.

٢)تاریخ العالم، س- پ.

٣)ب. رادین: الحضارات الهندیة في امریکا، ترجمة- یوسف شلب الشام، دار المنارة، ط ١، ١٩٨٩،سوریا، ص ٣٠.

**چوارەم. ئەزتێک**

دیارە شارستانیەتی ئەزتێک یەکێکە لە شارستانیەتە کۆنەکانی ئەمریکا کە لە پێش دۆزینەوەکان هەبوو و تاڕادەیەک لە زۆر لایەنەوە پێشکەوتوو بوون کە خەڵکەکەی دانیشتووانی ڕەسەنی ئەمریکان و لە هیچ وڵاتێکی دیکە کۆچیان بۆ ئەمریکا نەکردووە، ئەزتێک هۆزێکی هندی بوون لەمەکسیک، لەدوڵی مەکسیکۆ نیشتەجێ بوون خاوەن ئیمپراتۆریەت بوون لە نێو سالانی (١٣٢٥-١٥٢١ز).

لە سەدەی سیازدە لە دەشتەکانی مەکسیک نیشتەجێ بوون هەر لە سەرەتاوە تووشی پێکدادان و شەڕ بوون لەگەڵ دانیشتوانە ڕەسەنەکانی ناوچەکە لەنزیک سەرووی دەریاچەی (تشكوكو)وە باڵادەست بوون بەسەریان دا و بۆ خۆیان پایەختیان بنیاتناوە، دامەزراندنی (ئەزتێک) لەو شوێنەدا بۆ خۆی گرنگ بوو، خانووەکانیان (کوخەکانیان) لە قامیش دروست کردووە، لە سەدەی (١٥)یەمدا ئەمانە کەوتنە ململانێ و هاوپەیمانی لەگەڵ دەرو دراوسێکانیاندا تا ئەو ئاستەی توانییان ڕووبەرێکی زۆر لە ناوەڕاستی ئەمریکا داگیر بکەن، لە ساڵی (١٤٤٠ز) بە داگیرکردن گەیشتنە دوڵی مەکسیک و توانییان مل بە ژمارەیەک هۆزی ناوچەکە کەچ بکەن، لەم قۆناغەدا پایەختەکەیان گەشەی کردو دانیشتوانیان زیادی کرد تا ئەوەی ئیسپانیەکان سەریان سوڕما لە گەورەیی ڕێک وپێکی و گەشەکردن و زیادکردنی خەڵک.[1]

ئەم شارستانیەتە خاوەنی سیستمی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری و هونەری و تەلارسازی خۆیان بوون، سنووری دەسەڵاتیان بە درێژایی کەنداوی مەکسیک بوو تا لە کەناری ئۆقیانوسی ئارام ئەم ئیمپراتۆریەتە (٣٨) بەشی لە خۆگرتبوو، تێکڕای ئەم بەشانەی (ئەزتێک) بەخێر و بێری دەرامەتە کشتوکاڵ و پیشەسازییەکان دەژیان، شارستانیەتی (ئەزتیک) پایەختەکەی ناوی (تنوگێلان) بوو کە شوێنەوارناسەکان وایدادەنێن ئەم شارە یەکێکە لە گەورەترین ئەو شارانەی کە ئەمریکای لەسەر بنیات نراوە لە ساڵی (١٤٩٢) لە کاتێکدا ئەم پایەختە دەکەوێتە ناوەڕاست دەریاچەی فلیب.[2]

---

١)د.طليعة الصياح: س- پ، ل ٢٩.

٢)د. عبد العزيز سليمان: س- پ، ل ٢١ – ٢٢.

له شارستانییەتی (ئەزتێک)دا ساڵ (١٨) مانگ بوو هەموو مانگێکیان (٢٠) ڕۆژ بووە، لەو قۆناغەدا ئەزتێک لە ڕووی زانستی گەردوون ناسیدا،پێشکەوتووتر بوون لە ئەوروپاییەکان گەردوون ناسەکانی (ئەزتێک) چاودێری هەڵکشان و ڕووداوەکانی خۆر و مانگ و ئەستێرەکانیان کردووە و وێنەیان بۆ نهێنی کێشاوە و ڕەنینی خۆیان لە ڕێگای زانست و وەرزشەوە دەربڕیوە.لە ڕاستیدا گەشتی ئیسپانیا بۆ وڵاتەکەیان گەیاندیانە بەرزترین قۆناغی گەشەکردنی شارستانی ئەم گەلە.[1]

## پێنجەم. مایا

ڕەگەزی گەلی (مایا) ئەگەڕێتەوە بۆ گواتیمالا و باشووری وڵاتی هندۆراس، بەڵام لە ناوچە و شارە ئاوەدانەکانی خۆیان کۆچیان کردووە و لە سەدەی شەشەم و حەوتەمدا هۆکارەکەشی نەزانراوە، پێدەچێت کۆچەکەیان بگەڕێتەوە بۆ بڵاوبوونەوەی نەخۆشی یاخود ئەو زەوییەی کە دەیانچاند بەشی پێداویستییە سەرەکیەکانی نەکردوون.

هەندێک لەم شارانەی دروستیان کردبوو لە ئاستێکی بەرزی گەشەکردن و پێشکەوتندا بوون وەک شاری (palenquecopan)، بەڵام ئەمانە لە سەدەی شەشەمدا شار و گوندەکانیان بەجێ هێشتووە هەتا ئێستا هۆکاری ئەو چۆڵکردنە نەزانراوە، لەوانەیە بە هۆی ترسیان بووبێت لە نەخۆشی پەتای کۆلێرا کە لە ناوچەکە بڵاوبوو بۆوە، هەروەها نەیانتوانیوە سوود لە زەویەکانیان وەربگرن بە ئامێرە سادەکانیان، هەربۆیە کۆچیان کرد بۆ ناوچەکانی (یوکاتان) و کردیانە ناوەندی دەسەڵاتی رامیاری و ئاینی خۆیان، تیایدا شارستانیەت و ڕۆشنبیری خۆیان لە هەموو ناوچەکانی ئەو نیمچە دوورگەیە بڵاوکردەوە.[2]

لە سەدەی حەوتەمدا ئەم ناوچەیەشیان بەجێ هێشت کە هۆکارەکەی نەزانراوە، پاشان لە سەدەکانی (١١- ١٢) گەڕاونەتەوە هەمان ناوچەکە بە ئاوەدانترین شارەکانی مەکسیک دادەنرا، لەپاش ئەوەی لە سەدەی پانزەدا گەیشتبووە

---

١) د.صلاح احمد هريدي:دراسات في التاريخ الأمريكي، ص ١٥.

٢)ب. رادين: الحضارات الهندية في امريكا، ص ٣٧.

گەورەترین ئاستی پێشکەوتن و گەشەکردنی ئاوەدانی ئەو ناوچەیە بۆ دواجار و کۆتایی ئەم ناوچەیەیان بەجێ هێشت.[1]

لە سەدەی دوانزەشدا کۆچبەری نوێ ڕوویان تێکردووە، وەک پێشتر ئاماژەمان پێدا ئەمانە ناوچەیەکی ڕەسەنیان لە گواتیمالا و باشووری هندۆراسیدا هەیە کە توانیویانە شاری گەورە و پێشکەوتوو دروست بکەن کە ناوی (palenquecopan) دەڵێن کۆچەکەشیان نەزانراوە، لە دواییدا بەهۆی نەخۆشی و پەتای قورسەوە بووە ڕوویان کردۆتە دورگەی یۆکۆتانا و لەوێ (chichentaza) کردە مەڵبەندی سیاسی و ئایینی خۆیان، لە دوایدا لەبەر هۆکاری نادیار وازیان لەو شارەش هێناوە دواتر توانیان مەکسیک دروست بکەن و گەشەی پێ بدەن، شارەکانی تەلارسازی جوان و شەقامی پان و دارو درەختی ڕازاوەی تێدابووە ئەمە جگە لە بوونی پەرستگای گەورە کە ناوی پەرستگای (کوکولکان) بووە.

چەندین شاری دیکەیان لە مەکسیک دروست کردووە و بایەخی زۆریان بە ئاوەدانی داوە، بەڵام لە ڕاستیدا بەر لە هاتنی ئیسپانیەکان بۆ ئەم ناوچەیە شەڕی ناوخۆ ئەم شارستانیەتیەی بە تەواوی وێران کرد، بیروباوەڕیان فرەخودایی بووە و تیایدا بەردەوام ململانێی نێوان خێر و شەڕ هەیە و لە کۆتاییشدا بەپێی ئەم بیروباوەڕە هێزی خێر سەردەکەوت.[2]

ئەم شارستانیەتە لە دوو ماوەدا پێشکەوتووە ماوەی یەکەم ئیمپراتۆری کۆن لە سەدەی چوارەم تا سەدەی نۆیەم و ماوەی دووەم لە ماوەی ئیمپراتۆری تازە لە سەدەی نۆیەم تا چواردە بەنیسبەت ئیمپراتۆریەتی تازەوە، هەر لە سەرەتاوە پێشکەوتنی بەخۆیەوە بینیوە و لە کاتێکدا هێزەکانی ئیسپانیا گەیشتنە نیمچە دوورگەکە لە سەرەتای سەدەی (١٥)یەم وا سەیریانکرد نیمچە دورگەکەش لە حاڵەتێکی ناهەمواردایە، ئەو دەسنووسانە کە لەسەر بەردەکان جۆرێک لە نووسینیان هەبووە کە پێی دەوترێت هێرۆگلیفی، هەروەها ئەم هۆزە هەستاون بە

---

١) د.صلاح احمد هريدي: س- پ، ل ١٦.

٢) د. عبد العزيز سليمان: س- پ، ل ٢٥.

دروســـتكردنی پەرســـتگا و کۆشـــک و تەلار و بایەخیـــان داوە بە ئـــاوەدانی و ڕازاندنەوەی شارەکانیان.[1]

**شەشەم. ئەنکا**

لە بنەڕەتدا وشـەی (Incas) بنەمـاڵەی فەرمانڕەوایـانی دەگـرتەوە، پاشـان ئەم وشەیە وایلێهات هەموو دانیشتوانی دەگرتەوە، هەروەک چۆن پیرۆییە کۆنەکان بە ئیمپراتـۆریەکەی خۆیـان دەوت، هەنـدێک ئەفسـانەش هەیە کە دامەزرانـدنی ئەم شارسشتانیەتە بۆ خواوەند دەگەڕێتەوە، بۆ نموونە:

یەکێـک لەو ئەفسـانانە کە لە هەمـوو ئەفسـانەکانی تـر ناسـراوترە دەڵـێن (مانکوکاپاک) و خوشکەکەی (ماماأوکویو) باوکیان (خۆر) هەردووکیانی ناردووە بۆ دامەزرانـدنی ئیمپراتـۆریەتەکە و ئەمـانیش بە ڕاسـتی هەسـتاون بە دروسـتکردنی پایتەختی دەوڵەتە نوێکە لە (کوزکو) یان ناوەڕاستی جیهان یان (کیتشوا).[2]

زاراوەی (اییـو) کە بنـاغە و بڕبڕەی کۆمەڵایەتیـان بـووە، ئەم زاراوەیە مەبەسـت لێی کۆمەڵە خێزانێک بـووە زەوییـان چانـدووە (کشـتوکاڵ)، بە شـێوەیەکی گشـتیش هەستاون بە چەند ئیشوکارێکی دیکەش، پاش ئەوەی ئەم خێزانـانە کشـتوکاڵەکانیان دوریوەتەوە، ئەنکا بەشێکی کشتوکاڵەکەی بۆ خۆی بردووە، بەشـێکی دیکەیشـی بـۆ خواوەند ڕۆشتووە، ئەوەشی ماوەتەوە بەشکراوە لە نێوان ئەو خێزانـانەی کە سـەر بە (اییو) بوون، هەر شتێکیش لە سـنووری دەسـەڵاتی (ئەنکـادا) ڕوویبدایە ئەوا پێی دەزانی، ئەمەش بە هۆی چەند ڕێگایەکەوە بـوو کە پایتەختی دەبەسـتەوە بە هەمـوو ناوچەکـانی تـرەوە (الشکاسـکیس) ئەو نێـراوانەی کە راسـپێرابوون بە هەڵگـرتن و گواستنەوەی هەواڵ و فەرمانەکانی بۆ ناوچەکانی تر مـاوەیەکی زۆریـان دەبڕی بۆ ئەوەی ئەم هەواڵانە بگەیەنـنە شـوێنی مەبەسـت، هەواڵەکانیشـیان لە (کیبوس)ەکانـدا کۆدەکردەوە کە ئەمەش بریتی بوو لە ئامێرێکی دروسـتکراو لە گرێی ڕەنگاوڕەنگ، هەروەهـا (ئەنکـاس) ئەم ئامێرەیـان بـۆ ژمێریـاری کردنـی کشـتوکاڵەکانیان لە کـاتی کۆکردنەوە و خەزنکردنیدا بەکارهێناوە، هەروەها بۆ ژماردنی ئەو سـەربازانەی کە

---

١) د.طليعة الصياح: س- پ، ل ٣٢.

٢) ب. رادين: س- پ، ل ١٠٤.

دەنێران بۆ بەشداری کردن لە شالاّوە سەربازییەکاندا، سەبارەت بە (الاماوتا) واتە زانایـان و مامۆسـتا مەبەسـت لێـی ئەوانە بـوون سـپێرابوون بە لەبەرکردنـی کەلتورەکەیـان و پاشـان بڵاوکـردنەوەی بەشـێوەیەکی زارەکـی، ئەنکا نـوێنەرایەتی بەرزترین دەسەلاّتی دەکرد، هەروەها نوێنەری خۆریشی دەکرد هەروەک چۆن لە میسر لە هەندێک لە شارستانیەتەکان ڕوویداوە.[1]

نەتەوەی ئەنکـا لە چیاکـانی ئەنـدێر نیشـتەجێ بـوون، لە دەوروبەری سـەدەی (١٠)ی زاینـی توانییان قەڵەمڕەوی خۆیان لە ناوچەکانی هاوسێیاندا فراوان بکەن، ئەو شارستانیەتە کۆنانەی کە لە پێش ئەمان لەم ناوچانەدا هەبوون لەناو بەرن بۆ نموونە:

لە نـاوبردنی هنـدیەکانی کیشـوو لە سـەدەی (١٢)دا لە سـەرەتای سـەدەی (١٦)دا دەسەلاّتی خۆیان بەسەر ولاّتانی (پیرۆ، پۆلیڤیا، ئیکوادۆر، بەشێکی شیلیدا) سـەپاند، ئەم نەتەوانە لە دەوروبەری دەریاچەی (تیتیکاکا) کە دەکەوێتە بەرزاییەکانی چیای ئەنـدێر لە ولاّتـی پیـرۆوە لە دەوروبەری سـەدەی (١٠)ز بەرێ کەوتـوون، وەک وتمان هەموو دەسەلاّت و بەرژەوەندی نەتەوە و شارستانیەتەکانی پێش خۆیـان کە لەم ناوچانەدا هەبووە لە ناوبردووە، پاشان شـاری (کوزکو)یـان کـرد بە پایتەخـت و بـنکەی دەسـەلاّتیان، لەبەرئەوەش ئەمـان دادەنرێن بە میراتگری شارسـتانیەتەکانی پێش خۆیـان لەم نـاوچەیەدا، وەک شارسـتانیەتەکانی (Aymaras- auechva) کە لە بەرزاییەکانی چیای ئەندێزدا دروست بوون.[2]

شارسـتانیەتی کەناراوەکـانی پیـرۆ کە گەشـانەوەی ئەم شارسـتانیەتیە هەروەک زانای ئەمەریکی (مینز) دەڵێت لە (٥)ی سەدەی یەکەمی زایینیدا بـووە، پاشـان وردە وردە بەرژەوەندی و دەسەلاّتیان زیادی کردووە، هەتـا لە سـەرەتای سـەدەی (١٦)ز دا هەمـوو ولاّتـی (پیرۆ، پۆلیڤیا، ئیکوادۆر و بەشـێکی شـیلی)یان گرتەوە کە پێشتر ئاماژەمان پێدابوو.

ژمـارەی دانیشـتوانەکەی نـزیکەی (٦٠٠٠٠) کەس بـوو، لە پێکهـاتەی ئەم شارسـتانیەتەدا هـۆز بریتـی بـووە لە یەکەیەکـی سیاسـی، سـەرەڕای ئەرکە

---

١)لاوریت سیجولانە: س- پ، ل ٢١٨.

٢)د.صلاح احمد هریدی: س- پ، ل ١٧.

کۆمەڵایەتیەکەی کە بریتی بووە لە هەرەمێک لە سەرو هەرەمەکەوە (ئانکا کوڕی خۆر) بووە، پاشتر سەرۆکی یەکە کارگێڕیەکان و ئەنجومەنی ڕاوێژکاری و بەوجۆرە تا خوارەوەی هەرەمەکە دەکاتە چینی تشتی.

یاسا ڕەوشتییە توندەکەشیان لە سڵاوکردنی ڕۆژانەیاندا دیار بووە هەر لەناو ئەم یاسایەشدا ئەمانەشی تیابوو (أماسوا، امایوکیا، أماکیا) واتە (دزی مەکە، درۆ مەکە، تەمەڵیش مەبە) لەناو فەرمانڕەواکانیشیاندا بەپێی مێژوونووسە ئیسپانیەکان هەندێک لەو فەرمانڕەوایانەی (باتشاکوتک) و (بیراکونشا) و (هوایانا کویاک).(1)

### حەوتەم. شبشا

ئەم شارستانیەتە دەکەوێتە بەرزاییەکانی کۆلۆمبیا و دەوڵەتێکی ڕامیاری بووە و چەند دەسەڵاتدارێک فەرمانڕەوایی کردوون، بۆ نموونە (زەبا) لە پاکتا و (زاک) لە تەنجا، دوو دەسەڵاتدار بوون فەرمانڕەوایی ئەم گەلەیان کردووە، گەلیش باوەڕیان وابووە کە ئەم فەرمانڕەوایانە لە ڕەگەزی خواوەندی ڕۆژ و مانگن.

شبشا تا ڕادەیەکی زۆر پێشکەوتوو بووە و یاسای ژمارەیی و نووسینی وێنەییان بەکارهێناوە، هەروەها بازرگانییەکی فراوانیان هەبووە و خاوەنی چەندین پیشەسازی بوون، لە پیشەسازی قاپوقاچاغدا گەیشتبوونە قۆناغێکی گەورەی پێشکەوتن، لە پیشەسازی زێڕدا دەستێکی باڵایان هەبووە و هەروەها لە دروستکردنی پەرستگاکاندا تەختە و قامیشیان بەکارهێناوە.(2)

### هیندییە سوورەکان

هیندییە سوورەکان کۆمەڵە تیرەیەک بوون و هەریەک لەو تیرانە بەجۆرێ خۆیان بەڕێوە دەبرد، ئابووریەکان خۆ بژێوی بوو پشتیان بە پیشەیەک دەبەست، ئەمانە لە کیشوەری ئەمریکا لە سەروبەندی کۆتاییەکانی چاخی بەستەڵەک نیشتەجێ ببون، واتە لە سەردەمانێکدا ژیاون کە بارودۆخی کەشناسی ئێجگار

---

١)دیب علي حسن: الولايات المتحدة الأمريكية من الخيمة الى الامبراطورية، مراجعة وتدقيق. اسماعيل الكردي، الاوائل للنشر، ط ١، ٢٠٠٢، سوريا،ص ١٠.

٢) د.صالح زهر الدين: س- پ، ل٥ – ٢٠.

سەخت و سارد بووە، لە ژیانێکی سادەدا ژیاون و شارستانی و ئاستی شارستانیەتیان زۆر لاواز بووە.

ئەو کاتەی ئەوروپییەکان گەشتنە ئەمریکا هیندییە سوورەکان لە گشت بەشەکانی ئەو کیشوەرەدا بوونیان هەبووە و زیاد لە (٤٠٠) هۆز و زیاتر لە (١٦٠) زمان و دیالیکتی جیاواز بوون، لە ڕاستیدا نیشنگەی یەکەمی ئەو هۆزانەش کیشوەری ئەمریکا نەبووە و بیروبۆچوونی جیاواز لەبارەی شوێنی بنەڕەتی ئەو هۆزانە هەیە:

**بۆچوونی یەکەم:** کۆمەڵێک لە لێکۆڵەرەوان پێیان وایە لەکیشوەری ئاسیاوە هاتوون.

**بۆچوونی دووەم:** شوێنی بنەڕەتیان دەگەڕێتەوە بۆ ئەفریقا و پێیان وایە لە کیشوەری ئەفریقاوە بەرەو ناوچەی بە پیتی ئەمریکا هاتوون.[١]

لە بارەی مێژووی کۆچکردنەکەشیان ڕای جیاوازیان هەیە، هەندێک لە مێژوونووسان دەگێڕنەوە بۆ (٤٠) چل هەزار ساڵ پێش ئێستا و هەندێکی دیکە بۆ (٢٠) بیست هەزار ساڵ و تا ئێستاش ئەو مێژووە یەکلا نەبۆتەوە، چونکە لە هەمانکاتدا کۆمەڵێک لە شوێنەوارناسان و ئەو کەسانەی دەربارەی مێژووی کۆچکردنی هیندییە سوورەکان دەکۆڵنەوە پێیان وایە هندیە سوورەکان (١٠٠٠) ساڵ پێش ئەوروپیەکان لە ئەمریکادا نیشتەجێ بوون و ئەم بۆچوونەش لەوەوە سەرهەڵدەدات کە لە سەدەی (١١) کە (فایگنگ) یەکێک بووە لەو دەریاوانانەی لەگەڵ کۆمەڵێک لەو کەسانەی لەگەڵیدا بوون بە دەریاکاندا گەشتی کردووە و گەشتۆتە هەردوو ئەمریکاکە، لەو سەردەمەدا هۆزە هیندییەکانی بینیوە کە لەوێدا ژیاون و سەرقاڵی ژیانی سادە و ساکاری خۆیان بوون.

کاتێک هیندییە سوورەکان هاتوونەتە ئەمریکا لە سەرەتادا ڕوویان لە باکووری ئەمریکا کردووە و بە ئاراستەی باشووری ڕۆژهەڵات بڵاوبوونەتەوە و نیشتەجێ بوون، دواتر بە هەمان ئاڕاستە چوونەتە نێو ئەمریکای لاتینەوە (باشوور) و بە درێژایی کەنارەکانی ڕۆژئاوا و ناوچە شێوە درێژەکانی باکوور و باشووری نێوان بەرزاییەکانی ڕۆکیدا بە درێژایی کەنارەکانی باشوور بڵاوبونەتەوە.[٢]

---

١) دیب علی حسن: س- پ، ل ١٠.

٢) عمر خۆشناو: سرینەوەی بەرامبەر لە کەلتوری ئەمریکیەکاندا(هندیە سورەکان)وەک نموونە، رۆژنامەی بزووتنەوەی ئیسلامی، ساڵی ٢٠٠٧.

## هۆکـاری ناولێنانیان

((لێکۆلەر دیاسـومیر و)) گەشـتۆتە ئەو ڕاسـتیەی دانیشـتوانی یەکەمـی ئەمریکـا ڕەگەزی ڕەش بـوون و گەشـتوونەتە کەنـاری دەریاکـانی بەرازیـل و لە ئەفریقیـاوە بەرەو ئەمریکـا هـاتوون و لەو خێڵە هینـدییانە بـوون کە ناویـان بەن بە(الافتوفـاکس، الارنـب الکبیـر، الناهـاوس، النولیتـاکس، الکـرایبس، الاینکایکـا، الابـالاش)، هەروەهـا "هینـدییە سـوورەکان" نە هینـدی بـوون نە سـووریش بـوون، بەڵکـو هۆکـاری ناوهێنانەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ ئەو بۆچوونەی کۆلۆمبس کە پێی وابووە گەشتۆتە هند، لەبەرئەوە ناوی ئەوگەلەی ناوە هندییەکان.[1]

لە کاتێکدا دەربارەی ناولێنانیان بە هینـدییە سوورەکان بۆچـونێکی دیکەش هەیە ئەویش ئەو هۆکـارەیە کە لە کاتێکدا ئەو هـۆزانە ڕووبەڕووی جەنـگ بـوونەتەوە بە بـۆیەیەکی سـووربا و دەم و چاویـان ڕەنـگ کـردووە یـان دەمـامکی سـوورباویان کردۆتە سەریان و دەم و چاویـان پێ داپۆشیوە کە ئەو دەمـامکە بە بۆیەی سـوور ڕەنگ کراوە، لەبەرئەوە پێیان وابووە کە مرۆڤـی سـوورن. هۆکـاری تـریش هەیە کە پێسـتی دەموچـاوی ئەم هـۆزانەی لە ئەمریکـادا نیشـتەجێ ببـون لەپێسـتی گەڵنـی ئەوروپـا جیـاوازبووە و ڕەنگێکـی سـووورباو بـووە لە پێسـتی دانیشـتوانی ئاسـیا کە گەنم ڕەنگە بوون نزیـک بـووە واتە جیـاوازی ڕەنگـی دەم وچاویـان وایکـردووە ئەو ناوەیان بەسەردا بسەپێنرێت.[2]

## بارودۆخی گشتی ژیانیان

کاتێ کۆلۆمبس گەشتۆتە ئەمریکا هیندییەکان لە باکووری ئەمریکـا و ناوچەکـانی دیــکەدا بڵاوبــوونەوە و ژیــانی هــۆزایەتی خۆیانیــان هەبــووە و پابەنــدی یاســا خێڵەکیەکان بوون.

کۆلـۆمبس لە بارەیـانەوە نووسـیویەتی: (زۆر لە نەتەوەی کەنـدا و زیرەکتـرن، مامەڵەیــان زۆر مەدەنــی و لەســەرخۆ بــووە و لە ڕێکخســتن و بەڕێــوەبردنی کاروبارەکــانی خۆیــان چ لە ڕووی سیاسـیەوە بێـت یــان لە ڕووی ئـابووری و

---

١)لویس ی. لوماکس: ثورة الزنوج، تر. ابراهیم عبود، نیویورک، ١٩٦٢،ص ١٢.

٢) دیب علی حسن: س- پ، ل ١٢.

کۆمەڵایەتیەوە تایبەتمەندی خۆیان هەیە، زۆر دەست ڕەنگینن و جۆرە قوماشێک دروست دەکەن کەس ناتوانێ بەو جوانیە دروستی بکات، پەرستگاکانیان بە شێوەیەکی زۆر نایاب و ناوازە لە تەختە دروست کرابوون بە شێوەیەک لەناو خۆماندا شتی لەو جۆرە بە خەونیش نابینین).[١]

(لویس مۆرگان) لە بارەی یەکێ لە خێڵە سەرەتاییەکانی ئەمریکای باکوورەوە دەنووسێ و دەڵێ: (خاوەنی ژیانی کۆمەڵایەتی و ئاکاریین و خۆیان سەرۆک هەڵدەبژێرن و خۆشیان لایدەبەن و هیچ کەس نەیتوانیوە سنووری یاساکانی بشکێنی، هاوکاری یەکتری زۆر بەهێز بووە تا ڕادەی خۆبەقوربانی کردن، دیلی جەنگیان نەکوشتووە و ئەندامانی خێڵ یەکسان بوون و وەرگرتنی ئەندامێکی نوێ بەئاهەنگ بووە و دروشمەکانی ئایینی خۆیان سەماکردن بووە و لە دەرکردنی بڕیاردا دەبوایە تەواوی خێڵ ڕەزامەندی لەسەر دەرببڕن...).[٢]

لەو ڕۆژگارانەی سپی پێستەکان هاتوونەتە ئەمریکا سوورپێستەکان خەریکی ژیانی سادەی خۆیان بوون و چەکی تایبەت بەخۆیان هەبووە، ئەو چەکانەی دروستیان دەکرد بریتی بوو لە ڕم و کێرد. بەخێوکردنی گا لای هندییەکان زۆر بەنرخ بووە، چونکە سوودیان لە پێستەکەی وەرگرتووە و لە دروستکردنی (دەوار) بەکاریان هێناوە، شاخەکانی لە دروستکردنی ئامێری تایبەت بەخۆیان کە زۆر سادەبوون بۆ کاروباری ڕۆژانەی خۆیان بەکاریان هێناو جگە لە سوود وەرگرتن لە گۆشت و شیرەکەی.[٣]

هیندییەکان باوەڕیان بە خورافیات هەبووە و بەهێزی ڕۆحی ناویان بردووە و بۆچونیان وابوو ئەو هێزە ڕۆحیە لەلایەن هەندێ کەسەوە یان لە ڕێگەی ئاهەنگ گێڕانەوە کە جۆرە مەراسیمێکی ئایینی تایبەت بەخۆیان بووە دەستەبەر دەکرێ بڕواشیان بە گواستنەوەی ڕۆح لە یەکێکەوە بۆ یەکێکی تر هەبوو، ئەمەش چاکە و خراپەی دەردەخست، چونکە ئەو ڕۆحە چاکە و خراپەی کەسەکەی دیاری دەکرد.

---

١) د. محمد فؤاد ابراهيم و د. حسين فوزي: المعرفة، المجلد الخامس، بيروت، ١٩٨١، ص ٧٧٣.

٢) سمير سمو: فەرهەنگی سەیر و سەمەرەکانی جیهان، و.مستەفا سعید عەلی، چاپخانەی چوار چرا،سلێمانی ٢٠٠٥،ل ١٩٦.

٣)ديب علي حسن: س- ث، ل ١٢.

هیندییەکان کاهینی خۆیان هەبووە، بەڵام لە ڕاستیدا کۆمەڵێ فاڵچی و جادووگەر بوون کە ئاهەنگەکانیان دەگێڕا و هەندێکی تریان چارەسەری نەخۆشیان دەکرد، هەروەک باوەڕیان بە ڕۆحی گەورەکانیان هەبووە، لە ڕووی تەندروستیەوە هەر ڕوویان لەوان دەکرد، لەکاتی ناوخۆشیەکاندا بۆ دەرخستنی مەردبوونی خۆیان ئارامیان دەگرت و لەکاتی ئازاردا بە ڕۆژ و دەبوون نوێژیان بۆ ڕۆحی گەورەکانیان دەکرد.[1]

ژیانی هیندییە سوورەکان وەک کۆمەڵگاکانی تر ڕۆڵی سەرەکی خۆیان گێڕاوە کە ڕۆڵی دایکایەتیە و لە پێناویدا خۆیان بەکوشت داوە، لە نەریتەکانیان ئەوەبوو دایک کۆرپەی خۆی زۆر بە توندی بە تەختەیەکەوە دەپێچایەوە بۆ ئەوەی بە ئاسانی کارەکانی خۆی جێبەجێبکات، لەوەش سەیرتر بەتایبەت لە نێو هیندییەکانی باشووردا ئەگەر ژنێکیان منداڵی ببوایە لە کاتی زەیسانیدا لە جێگەدا نەدەکەوت، بەڵکو منداڵەکەی بەجێ دەهێشت و باوک لە شوێنی دایکەکەدا دەخەوت بە مەبەستی فریودانی گیانە شەڕانیەکانی بۆ ئەوەی کە نەزانن منداڵێکی تازە لەدایک بوو هەیە و زیان بە منداڵەکە و دایکەکەشی بگەیەنن.[2]

ڕۆڵێکی دیکەی ژنان چێشتلێنان و کۆکردنەوەی دار بووە کە ئەمەش ئەرکێکی قورسە، چونکە کەرەستەی پێویستیان نەبووە و ئاویان دەکردە پێستەی ئاژەڵەوە کە لە شێوەی قاپدا دروستکرابوون و بەردی گەرمیان دەخستە ناو قاپەکەوە بۆ ئەوەی ئاوەکە گەرم بێت، لەگەڵ ئەم ئەرکە قورسەی سەرشانیان دەبوایە لەکاتی جەنگەکاندا یارمەتیدەری پیاوەکانیان بن و پێداویستی پیاوەکانیان ئامادەبکەن و ڕوو لەبەرەی جەنگ بکەن جلیان بۆ دروست دەکردن لە پێستی گا و لۆکە، کچەکانیش یارمەتیدەری دایکەکانیان بوون و مێرد منداڵەکانیش لەگەڵ پیاوەکاندا بەشداری ڕاویان دەکرد.[3]

لە ڕووی کشتوکاڵکردنیشەوە هیندییەکان کشتوکاڵیان کردەوە، بەڵام ئەو بەروبوومانەی کە دەیانچاند کەم بوون و چەند جۆرێکی دیاریکراو بوون وەک

---

١) د. محمد فؤاد ابراهیم: س- پ، ل ٧٧٣.

٢)الكسيس دی توكفيل: الديمقراطية في امريكا، تر- امين مرسى قنديل، ط٢، القاهرة، ١٩٩١،ص ٣٠٢ - ٣٠٤.

٣) مسعود الخوند: الموسوعة التاريخية الجغرافية، الجزء الثالث، اوروپا، د-ت،ص ٢١٣.

(ئەنانــاس و گەنمەشــامی و بیــبەر و تەمــاتە و تــوتن)، هینــدییەکان بــوون کە ئەوروپییەکانیـان فێـری بەکارهێنـانی تـوتن کـرد، هینـدییەکانیش لە ئەوروپییەکـانەوە فێـری شــتومەکی دروســتکراوبوون وەک (دەمــانچە و شــەراب)، هەرئەمــانیش هینـدیەکانیان فێری بەخێوکردنی مەڕ ومـاڵات و ئەسـپ کـردووە، چـونکە لەکـاتی کۆچکردنیـان بـۆ نـاو کیشـوەر لەگەڵ خۆیـان بردویـانن هۆکـاری گواسـتنەوە لای هندییەکان بریتی بووە لە بەلەمی بچووک کە خۆیان دروستیانکردووە، بەڵام کاتێک ئەوروپییەکان هـاتنە ئەمریکـا و لەگەڵ خۆیـان ئاژەڵی بارکردنیـان هێنـا هیندیەکانیش فێـری بەکارهێنـانی عەرەبـانە بـون و لە گواسـتنەوەی وشـکانیدا بەکاریـان دەهێنـا تەختەیان لە دروستکردنی خاونوودا بەکارهێناوە، بەتایبەت لە ناوچەی جەنگەڵەکـان کە دوای بتـولای تێـدابووە، بەڵام لەناوچەکـانی تـردا وەک دەشـتەکان هینـدییەکانی خـاوەن گـای وەحشـی بـوون خیوەتیـان لە پێسـتی گـا بـۆ حەوانەوەیـان خانوویـان دروستکردوە.[١]

لەگەڵ ئەوەی هیندییەکان چەند بنکەیەکی بازرگانیان هەبووە بۆ هەموو شتەکان، بەڵام پارەیــــان نەبــــووە، بەڵکــــو بە گــــۆڕینەوە و قەرزدان پێداویســــتیەکانیان دەستەبەرکردووە، لە ئەنجامی ئەو کۆچانەشدا ژمارەیەک لەو خێڵانە لەنـاوچوون و ژمـارەیەکی کەمیشـیان کە مـاون دووبـارە نەگەڕاونەتەوە بـۆ نـاوچەکەی خۆیـان، چونکە لەناوچەکانی دیکەی ئەمریکادا بڵاوبوونەوە.[٢]

### ناوچەکانی نیشتەجێ بوونیان

خێڵە هیندییەکان لە زۆربەی ناوچەکانی ئەمریکـادا بوونیـان هەبـووە بەتـایبەت لە دەوروبەری دەریاکـان و شـارەکانی ئێسـتای ئەمریکـا. ناوچەکـانی نیشـتەجێبوونیان بەرزاییەکــانی (گواتیمــالا و مەکســیک و بۆلیفیــا و پیــرۆ و ئیکــوادۆر و هەنــدێ لەناوچەکــانی کۆلۆمبیــا و چیــای ئەنــدێر) بــوون، کە لە بــاکورەوە بــۆ باشــوری ئەمریکــای باشــوور بڵاوبــونەتەوە و بەپێــی ناوچەکــانی نیشــتەجێ بوونیــان پیشەکانیشیان گۆڕاوە کە کشتوکاڵ و راوچێتی بووە و کەلتووری خۆیان هەبووە و

---

١) گۆڤاری ئەمریکا ناسی، ژمارە (١)، سەنتەری نما، ٢٠٠٥.

٢)فرانک ال شوئل: امریکا چگونە امریکا شر، و.ابراهیم صدقیانی، چ٣، چاپخانەی شبهر، تاران،١٣٨٣، ل١٧.

تایبەتمەندی کەلتوورەکەشیان بەپێی ناوچەکانیان گۆڕاوە، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی لە پیشەسازی و داب و نەریتەکانیاندا هاوشێوە و چوونیەک بوون.

زۆرێک لەو هۆزانە لە پێش هاتنی کۆچەرە ئەوروپییەکان بۆ ناوچەکەیان بەتایبەت (نراجنت، موهیکان و خێڵەکانی تری ڕۆخی ڕووباری دبلازیر) کە پێش (١٥٠) ساڵ لەناوچەکەدا ژیابوون لە ئێستادا گەر گەشتیارێک بگەڕێت بۆ ماوەیەکی زۆر تووشی هیندییەکی ئەو خێڵانە نابێت، چونکە لەلایەن ئەوروپییەکانەوە ناچارکراون ناوچەکەیان جێبهێڵن و کۆچ بکەن.[١]

## هیندییەکانی باکووری ئەمریکا

لە ئەمریکای باکوور ژمارەیەکی زۆر خێڵی هیندی ئەژیان، ژمارەی ئەو هندییانەش نزیکەی ملیۆنێک بوون بە زۆری لە بەرزاییەکانی (مەکسیک و کەنەدا) ئەو بەشەی کە لەمڕۆدا پێی دەوترێت ویلایەتە یەکگرتووەکان ژیاون و بە هیندیەکانی باکوور وتراوە هیندی دەشتەکی و لەسەر ڕاوکردنی ئاژەڵی گا ژیاون.[٢]

بە هیندییە دەشتەکیەکانیش وتراوە هیندیەکانی ناوچەی کێوی، مەبەست لەو کێوەیەیش بوونی گای کێوی بووە کە لەو ناوچانەیەدا بڵاوبوونەتەوەو لە وەرگایەکی گەورەبووە و نزیکەی (١٥٠) جۆر ئاژەڵی لێ بووەو، ئەم ئاژەڵانەش ڕێگربوون لە بەردەم سوورە پێستەکاندا تا کشتوکاڵ بکەن، بۆیە ژیانیان لەسەر ڕاوکردن بەند بووە و ڕاویان کردووەو لەدروستکردنی جل وبەرگ و تەنانەت بەلەمیشدا گۆشتەکانیان وشک کردۆتەوە بەکاریان هێناوە و پیاوانی ئەم ناوچەیە پەڕی داڵیان لە شێوەی کڵاوێکدا دەچنی و دەیانکردبە سەریانە.

سوورپێستەکانی ناوچەی کاریبۆ یان کەنەدا کە سەرانسەری زەوی کەنەدای ئێستای دەگرتەوە ڕاوی ئاژەڵیان کردووە و گۆشتیان بۆ کاتی پێویست هەڵگرتووە، لە درەخت خانوویان دروستکردووە، بۆ پارێزگاریکردن لە خۆیان سەگیان ڕاگرتووە و ئاژەڵی بار ڕاکێشانیان بەخێوکردووە و لەزستاندا سەگیان بۆ

---

١) د. رفعت غنيمي الشيخ: امريكا والعالم في تاريخ الحديث و المعاصر، عين للدراسات والبحوث، ٢٠٠٦،ص ١٣.

٢) تشارلز وماری بیرد:تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية، مكتبة الاطلس،دمشق، الجزء الاول، ص ٢٣.

ڕاکێشانی عەرەبانەکانیان بەکارهێناوە، ئەم خێڵانە ئارەزووی بازرگانیان هەبووە لە گواستنەوەی کەل وپەل و هۆکارەکانی گواستنەوەی سادە لە نێوان خێڵە هیندییەکان و ئەوروپییەکاندا لەوانە بەریتانیەکان و فەرەنسیەکان ڕۆڵی گەیەنەریان بینیوە.[1]

یەکێک لەو خێڵە هیندییانەی لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئێستادا دەژیان (ئەیروکوا)یەکانن کە لە ڕۆژئاوای نیرۆکی ئێستادا نیشتەجێ ببون، بە بەهێز ناسرابوون و هەر لەبەر ئەو هۆیەش بووە هۆزەکانی دەوروبەر لێیان ترسابوون.

هۆزی (جیفارۆ) لە هەرێمی مۆنتان دەکەوێتە خۆرهەڵاتی ئیکوادۆر، لەگەڵ ئەوەی ئەمانە یەک هۆزن، بەڵام بۆ چەند گروپێک دابەشببون کە بەردەوام لەململانێی ناوخۆییدا بوون و لە سەردەمەکانی پێشوودا بەکاری کشتوکاڵکردن و ڕاوکردن خەریک بوون، ئەو بەروبوومانەی دەیانچاند توتن و گەنمەشامی بووە و لەکاتی ڕاوکردندا گیای (بارباسکۆ)یان بەکاردەهێنا کە جۆرە گیایەکی بێ هۆشکەربووە، ماسییەکانیان پێ بێهۆش دەکرد، بەمەش بەئاسانی دەیانتوانی ڕاویان بکەن.[2]

سوورپێستەکانی ئەوراک لە هۆزە هیندییە سەرەتاییەکان بوون کە کۆلۆمبس لە ساڵی (١٤٩٢) لەکاتی گەشتنی بۆ کیشوەری ئەمریکای باکوور دۆزینیەوە و باس لەم هۆزە دەکات کە لە کاتێکدا خۆی و ژمارەیەک لەو دەریاوانانەی لەگەڵیدا بوون لە کەنارەکانی ئەو کیشوەردا دابەزیون بەخۆیان و شمشێرەکانیانەوە بە زمانێکی جیاواز و نامۆ دواون کە جیاوازبوون لە زمانی ئەمان نەرواکیەکان سەریان لەو سپی پێستانە سوڕماوە بەجۆرێ کە کۆلۆمبس لە بیروەریەکانی خۆیدا لە بارەیانەوە دەنووسێت: ئەرواکیەکان چەکیان بەکارنەهێناوە و نەشیانناسیوە، کاتێک شمشێرەکانیان بینیوە نەیانزانیوە چۆن بەکاری بهێنن کاتێک گرتوویانە بەدەستیانەوە دەستیان بڕیوە، ئاسنیان لەبەردەست نەبووە و قامیشیان بۆ دروستکردنی چەقۆکانیان بەکارهێناوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەی هۆزێکی سادە و ساکاربوون نەیانتوانیوە بە ئارەزووی خۆیان ئەو هۆزانە ژێردەستە بکەن و لە

١) د. محمد فؤاد ابراهیم: س- پ، ل ٧٧٠.

٢) فرانک ال شوئل: س- پ، ل ٢٢.

کاروبارەکانی خۆیاندا بەکاریان بهێنن، لەگەڵ هەموو ئەو هەولانەدا تەنیا (٥٠) کەسیان خستۆتە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە.[١]

هەندێک جار ژمارەی دانیشتوانی هەندێ لە لادێکانی نەرواکیەکان دەگەیشتە (٣) هەزار کەس و لادێکانیان لە شێوەی گومەزی رێکخراودا بوون و جاری وا هەبووە کۆمەڵێ لادێ لەژێر دەستی یەک سەرۆکدا بووە کە هەندێ جار (٨٠) دێ لەیاریەکی رەسمیدا لەناویەکا پێشبرکێیان هەبووە تۆپێکی شێوە لاستیکی دادەنرا لە یاریگایەکدا کە بە بەرد دەورە درابوو بەو پێشبرکێیە سەرۆک هۆزیان دەستنیشان دەکرد.

سوورپێستەکانی کەنارەکانی ئەمریکای باکوور و ئۆقیانوسی ئارام بۆ خۆراک زۆرتر پشتی بە کشتوکاڵ نەبەستبوو، بەڵکو لەسەر ڕاوکردنی ماسیەکان لەچ وەرزێکدا دێتە ناو ئاوی ڕووبارەکان و ڕاویاندەکردن و هەندێ جار گۆشتی ماسیان بە تازەیی بەکاردەهێنا و هەندێ جاریش بە وشکی لەدوای وشکردنەوەی لە وەرزێکی تردا بەکاریان دەهێنا.[٢]

سوورپێستەکانی ناوچەی دانە، کالیفۆرنیای ئێستا دەگرێتەوە، ناوچەی ئەمانە زۆر وشک بووە، لە باشوورەوە جگە لە ڕوەکێکی درک کە بەدرکی (سپج براش) ناسراوە هیچی دیکەی تێدا نەبووە و دانیشتوانی ئەم ناوچەیە زۆر هەژار بوون و خواردنی سەرەکیان بەروبوومی وەک بەروبوومە کە زۆر بەدژواری دەیتوانی لەم ناوچانەدا بەرهەم بدات و تەنانەت خۆراکی ڕۆژانەیان بەهۆی وشکی ئاوهەواکەیانەوە هەندێ جار بریتی بووە لە مشک و کوللە و هەزارپێ و حەشەرات و پەناگەکانیان لەشاخەکاندا بوە و جل وبەرگیان لە پێستی ئاژەڵ بووە، هەروەها هۆزە کەناریەکانی زەریای ئارام لەگەڵ مرواریدا ئاشنابوون و لەبری پارە بەکاریان هێناوە، ئەمەش گرنگی لەوەدایە کە پێش چوونی وڵاتانی داگیرکەر بازرگانی و ئاڵوگۆڕکردن لەو ناوچەیەدا هەبووە.[٣]

---

١)دیب علي حسن: س- پ، ل ١٤.

٢) ب. رادین: س- پ، ل ١٣- ١٥.

٣) میسلون هادي: من اساطير الهنود الحمر، الموسوعة الصغيرة، بغداد، ص٣٠.

یەکێکی تر لەخێڵەکانی باکوور خێڵی (سیوە) کە لە کەنارەکانی ڕووباری ئۆهایی و ئاورێژگەی ڕووباری مسیسپی نیشتەجێ ببوون و خاوەنی شارستانیەتێکی پێشکەوتوو بوون و بە ڕەگەزە توندەکانی هیندییەکان ناسرابوون، گرنگی زۆریان بە ژمارەی دانیشتوان داوە و هەوڵیانداوە لەسەر حسابی خێڵەکانی دەوروبەریان ژمارەیان زیاد بکەن، لەگەڵ ئەوەشدا زۆر لایەنی دیکەی ژیانیان هاوشێوەی خێڵەکانی دیکەی ویلایەتە یەکگرتووەکان بوون، بەڵام بەشێک نەبوون لەو شارستانیەتەی کە لە ناوچەکانی باکووری (ربوغداند) هەبووە، ناوچەی تری باکووری خۆرئاوای نێو مەکسیکو و ئەریزونا کە خاوەنی داب و نەریتی دەوڵەمەند بووە، لەهەندێ بیناکاری و دروستکردنی قاپ و گۆزەدا بەجۆرێک پێشکەوتوو بوون ناکرێ بەراوردی بکەین بەو شارستانیەتانەی کە لای خێڵەکانی دیکە هەبوون چونکە تایبەت بووە بە خێڵەکانی باشووری ڕۆژئاوا، دوو تایبەتمەندی هەبوو کە لە نێوان سیوەکان و هاوشێوەکانیاندا:

**یەکەم/ گرنگیدان بە کشتوکاڵ هاوبەش بوو.**[1]

**دووەم/ ڕێکخستنی کۆمەڵگا.**

لە ڕووی کشتوکاڵیەوە سیوەکان زۆر گرنگیان بەکشتوکاڵ نەداوە وەکو ناوچەکانی باشوور و ئەو خێڵانەی لە باشووری ڕۆژئاوا دەژیان، و لە ڕووی کۆمەڵایەتیەوە دابەشکردنی نازناو لەلای سیوەکان و خێڵەکانی باکوور بەپێی خێزان بوو هەر خێزانێک بە ناوی ئاژەڵێکەوە دەناسران و زۆر جاریش کۆمەڵێک یەک نازناویان هەبوو وەکو کۆمەڵەی ورچ یان سیسرک یان هەر ئاژەڵێکی تر وە تاک نازناوی خێزانەکەی وەردەگرت واتە هەڵگری ئەو نازناوە بوو کە باوک وەریدەگرت، بەڵام لای خێڵەکانی باشووری ئەمریکا بە پێچەوانە دەبوو تاک نازناوی دایکی وەردەگرت و ئەو خاسیەتەی لای سیوەکان هەبوو بەهەمان شێوە لای خێڵەکانی تری باکوور بەدی دەکرێت، نەگونجاوی ئاوو هەوای باکوور لەگەڵ

---

١) دیب علی حسن: س- پ، ل ١٥.

جۆری خاکەکەی هۆکاری گرنگینەدانی خێڵەکانی باکوور بووە بە کشتوکاڵ وەکو خێڵەکانی باشوور.[1]

شـــیرۆکیەکان یەکێکـــی تـــرن لە خێڵەکـــانی بـــاکوور و لە نیـــوەی ئیکۆتـــای کاروبارەکـــانی خۆیـــان بەڕێـــوەبردووە کە لە ســـاڵی (١٥٤٠) بەمـــلاوە شـــوێنی بەڕێوەبردنی بووە، لە ئێستادا نیوئیکۆتای ناوچەکانی کارۆلینای باکوور و باشوور دەگرێتەوە، شیرۆکیەکان لە خـێڵە هەرە گەورەکـانی هینـدییە سـورەکان بـوون کە بەردەوام لە شـەڕدا بـوون لەگەڵ خێڵەکـانی تـری دەوروبەریـان و لە کـاتی هـاتنی ئەوروپیەکاندا لە ململانێکانی نێوان ئینگلیز و فەڕەنسـیەکاندا واتە (لە جەنگی حەوت ساڵەی نێوان ئینگلیز و فەڕەنسا کە لە ئەنجامی شەڕەکەدا ئینگلیز توانی دەسـەڵاتی فەڕەنسـا لە ئەمریکـای بـاکوور و هیندسـتان نەهێڵێت و ببێتە یەکەم ئیمپڕاتـۆریەتی جیهان) دابویانە پاڵ ئینگلیز و لە ساڵی (١٨١٢) دایانە پاڵ ویلایەتە یەکگرتووەکان و لە ئێستاشـدا لە کارۆلینـای بـاکوور و لە نـاوچەیەکی تـایبەت بە خۆیـان دەژیـن و ژیانێکی سادە و خێڵەکیان هەیە و تێکەڵی خەڵکی تری ئەمریکا نابن.[2]

## هیندییەکانی باشووری ئەمریکا

سورپێستەکانی کاریب، یەکێکن لە هۆزەکانی باشووری ئەمریکا و شەڕەنگێزن و لە دۆڵی ڕووباری ئەمازۆرن لە زەوییە نزمەکانی (جەوانە) نزیەکی ساڵانی (١٣٠٠) کۆچیان کردووە لە باشووری ئەمریکاوە بۆ دروگەی کاریبی کە ئەمرۆ بە دورگەی (وندوراند) ناسـراوە و لەدوایدا هینـدییەکانی (نەرواک) دەسـتیان بەسـەر داگرتـووە، هینـدیەکانی کـاریبی تـاڕادەیەک پێشـکەوتوو بـوون و کشـتوکاڵ و ڕاوە ماسـیان کـردووە و هەنـدێ ئـاژەڵی بچووکیـان بەخێـوکردووە و لە چەنـد لادێیەکـی بچـووک بچووکدا دەژیان و سەرۆک هۆز و گەورەی دێیان بەردەوام نەبووە، بەڵام لە کاتی شـەڕدا بە چەنـد پێشـەوایەکی شـارەزاو لێهـاتوو لە بەکارهێنـانی ئەو چەکـانەی هەیـانبووە بەژدار دەبـوون لە شـەڕەکاندا و هەر بەبچـوکی منـداڵەکانیان ڕادەهێنـا

---

١) دیب علي حسن: س-پ، ل١٦

٢) میسلون هادی: س- پ، ل٣٨ – ٤٠.

لەسەر شەڕکردن بۆئەوەی فێری داب و نەریتی جەنگ ببن و کاتێکیش گەورە دەبوون ناوە منداڵەکانیان لادەبرا ناوێکی تریان لێدەنرا.[1]

سورپێستەکانی شابان، کە لە ڕووی جوگرافیەوە دابەش ببون بۆ دوو کۆمەڵە شابای باشوور لە ناوچەکانی باشووری ئەمریکا دەژیان. سورپێستەکانی تیاهواناکۆ لە هیندییەکانی بۆلیفیان ئەمانە نزیکەی (١٠) دە هەزار ساڵ پێش ئێستا لە بۆلیفیادا ژیاون و شارستانیەتی خۆیان هەبووە لە ناوچەی تیاهواناکۆ لە نزیک دەریاچەی تیتی کاکا نزیکەی (١٠٠) سەد هۆز کە ئایین و زمان و داب و نەریتی خۆیان هەبوو، بە زمانی کیشوانی قسەیان نەکردووە، بەڵام لە سەدەی (١٤)چواردەی ز کۆتایی بە شارستانیەتەکەیان هێنراوە لەلایەن هۆزێکی تری هیندییەکانەوە ئەوانیش ئیماراکانیان پێ دەوتن، دەستیان بەسەر بۆلیفیادا گرتووە دواتر ئیماراکانیانیش کۆتاییان پێهات لەلایەن دانیشتوانی (پیرۆ)ەوە کە لە سەدەی (١٥)پانزەی ز دەسەڵاتیان بەسەر بۆلیفیادا گرت و کردیانە بەشێک لە ئیمپڕاتۆریەتەکەیان و زمان و داب و نەریتی خۆیان بەسەردا سەپاند کە زمانەکەیان کیشوانە و ئەو زمانەیە کە لە ئێستادا ئەو هۆزە قسەی پێ دەکەن.

ئەرواکییەکانیش هۆزێکی تری هیندییەکانی باشوور بوون و لە دورگەی کاریبی و هبانیولا و بۆرتۆریکۆی ئەمڕۆدا ژیاون و هەر کۆمەڵێکی تری ئەرواکیەکان لە حەوزی دەریای ئەمازۆرن و چەند بەشێکی تری ئەمریکای باشووردا بونیان هەیە هیندیەکانی تانیویان پێ دەوترێت.[2]

---

١) دیب علي حسن: س-پ، ل١٦

٢) میسلون هادي: س-پ، ل٤٠

## كۆچكردن بۆ ئەمریكا

سەرەتای دەستپێكردنی كۆچی ئەورووپییەكان بۆ ئەمریكای باكور بە شێوەیەكی بەرفراوان دەگەڕێتەوە بۆ ئەو كاتەی كریستۆڤەر كۆلمبس لەساڵی (١٤٩٢)دا توانی هەندێك دوورگە لە دەریای كاریبیدا بدۆزێتەوە، هەرچەندە (فایكینگەكان)ی دانیشتونی ئەسكەندەنافیا بە (٥٠٠) ساڵ پێش كۆلۆمبس كۆچیان بۆ ئەم جیهانە نوێ یە كردووە.[1]

جگە لە هیندییەكان سەراپای گەلی ئەمریكا لە ڕێگای كۆچكردنەوە چوونەتە ئەو كیشوەرە، یاخود ئەوەی كۆچبەرە كۆنەكانن، تا هەڵسانی جەنگی ناوخۆی ئەمریكا نزیكەی (٥) ملیۆن كۆچبەر لە (ئێرلەندە، ئینگلتەرە، ئەڵمانیاو وڵاتانی دیكەوە) روویانكردە ئەمریكا و لە نێوان ساڵەكانی (١٨٧٠ و ١٩٢٠)دا نزیكەی (٢٠) ملیۆن كۆچبەری دی لە ئەمریكا نیشتەجێ بوون، زۆرترین ڕێژەی كۆچبەریش لەو ناوچانەوە بوو كە زێدی خۆیان یاخود باوباپیرانیان لە ئاراستەكانی خۆرهەڵات و باشووری ئەورووپا بوو، لە سەرەتادا ئەم كۆچكردنە لەسەر شێوازێكی كۆمەڵ كۆمەڵ و بچووك بوو، كە لە جێگەیەكدا دادەبەزین و دەستیان دەكرد بە دروستكردنی شارۆچكەیەكی بچووك و دواتر قەڵاو كڵێسە و بینایەیان دروستكرد و سەرقاڵی كشتوكاڵ كردن دەبوون،[2] بە شێوەیەكی گشتی گرنگیان دەدا بە چاندنی (توتن) كە نرخی لە بازارەكانی (لەندەن)دا زۆر بەرز بوو، بەم هۆیەوە قازانجی زۆریان دەست دەكەوت بۆ نموونە دانیشتووانی (ڤرجینیا) لە دەوروبەری ساڵی (١٦١٩)دا لە (٢٠٠٠) كەس تێپەریان نەدەكرد، بەڵام هەر لەو ساڵەدا چەند كاروانێك گەیشتنە ویلایەتەكە یەكێكیان نزیكەی (٩٠) كچی لەگەڵ ڕەسمی (زواج)دا لەخۆ دەگرت و هەر كەسەش خوازبێنی یەكێكیانی بكردایە دەبوو (١٢٠) بوند (توتن) بدات بەرامبەر كرێی گواستنەوەی لە ئینگلتەرەوە بۆ ئەمریكا، هەروەها لە (هۆلەندا)شەوە كاروانێك كۆیلەی (زنج) گەشتنە ویلایەتەكە و لەلایەن خەڵكەوە كڕران، لە نێو مێژوونوساندا بۆچونێك هەیە و پێیان وایە كە سەراپای دانیشتوانی

---

١ - د. محمد محمود النيرب: المدخل في تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية،ط١، ١٩٩٧، دار الثقافة الجديدة، الجزء الاول، القاهرة، ص٢٥-٢٦.

٢ - صاموئيل اليوت مورسيون: كريستوفر كولمبوس (المكتشف العظيم)، ترجمة -فوزي قبلاوي، مطبعة دار مكتبة الحياة، بيروت، ١٩٥٩، ص ٤٧.

ئەمریکـا بەر لە شۆڕشـی ئەمریکی خەڵکی بەریتانیـا بـوون،[1] بەڵام پێدەچێت ئەم بۆچوونە بەو ڕەهاییە نەبێت، بەڵام گومـان لەوەدا نییە کە کۆچبەرە ئینگلیزییەکـان ڕێژەیەکـی زۆر بگـرە هەرە زۆری کۆچبەرەکانیـان پێـک دەهێنـا و (داگیـرگە) ئینگلیزیەکـان زۆر زوو گەشـەیان دەکـرد و لە ئایـاری سـاڵی (١٦٢٩)دا بەنـدەری (لندن) پڕ بوو لە خەڵک و نزیکەی (٤٠٠) کەسی پوریتانی لەگەڵ (٢٠٠) سەر مەڕدا بەرەو ئەمریکـا کەوتنەڕێ و لە نێوچەی (سـایلم) گیرسـانەوە و سـاڵی دواتـر واتە (١٦٣٠) نـزیکەی (٩٠٠) کەسی تر لەو نێوچەیە گیرسـانەوە و نـزیکەی (٩) شـاریان بنیاتنـا لەوانەش شـاری (بوسطن)، جگە لەمەش بەریتانیـا (داگیرگە)ی (نیویۆرک)ی واڵاکرد هەرچەندە هۆڵەندا چەند هەوڵێکی خستەگەڕ کە لە دەوروبەری (نیویۆرک) نـاوچەیەک بـۆ خـۆی دابڕێت،[2] بەڵام بەریتانیـا بە زەبـری هێـز دەری کـردو ئـاڵای ئینگلیـزی لە سەرانسـەری نـاوچەکە هەڵکـرد و دواتـر بـوویە گەورەتـرین شـاری ئەمریکا و جیهان و پاشان ئینگلیزەکان پەلیان هاویشت بۆ (فلوریدا)، ئینگلیزەکـان و کۆلۆنیالیسـتەکان سـەرەتا پێیـان خـۆش نەبـوو بیانییەکـان ڕووبکەنە (داگیرگەکـان) تەنـانەت بـا سـکوتلەندی یـاخود ئیرلەنـدیش بـن، بەڵام وردە وردە ئەم بەنـدوباوە هەڵوەشـایەوە سـکوتلەندییە ئیرلەنـدییەکانیش بە قەبـارە و ژمـارەیەکی نزیـک لە ئینگلیزەکـان ڕوویـانکردە ئەمریکـا و لە (داگیـرگە)کانـدا نیشـتەجێ بـوون و دزەیـان کـردە سـنورە خۆرئاواییەکـان و لەوێ نرخـی زەوی زۆر هەرزان بـوو، توانیـان کـۆمەڵگەیەکی بەهێـزی دیموکراسـی بنیـات بنـێن جـگە لەمـانیش پرۆتسـتانتە فەرەنسییەکان لە نێوان ساڵانی (١٦٦٠-١٦٩٠)دا ڕوویانکردە (داگیرگەکان) کە ئەوانە بە (هیوگونت) ناسرابوون و خەڵک بەچاوی ڕێزەوە سەیری دەکردن، چونکە پێیان وابوو کشتوکاڵ و بەروبوومی چاک دەهێننە ناو وڵاتەوە،[3] هەروەها بەهۆی جەنگ و هێرشـی لویسـی (١٤)ی فەرەنسـا و شکسـتی ئەڵمانیـاوە زۆربەی ئەڵمانیەکـانیش ڕوویـانکردە ئەمریکـا بەهـۆی ئەوەی خۆیـان بە سەرشـۆر دەزانـی و لە گەشـتیار و پیشەوەر پێکدەهاتن و لە پنسلفانیا و ماریلند و فرجینیا نیشتەجێ بوون، جگە لەم

١ - محمود محمد الحبيب، كولمبوس مكتشف امريكا، ط١، بيروت،١٩٧١، ص ١١-١٢.

٢ - فرحات زيادة: س- پ، ل١٣-١٥.

٣ - د.طليعة الصياح: س- پ، ل١٧ – ١٨.

گەلە ئەوروپیانە دوو گەلی تر لە ئەمریکادا دەژین کە هیندییەکان و زنجیەکان بوون.

**یەکەمیان:** خاوەنی ڕەسەنی وڵاتەکە بوون.

**دووەمیان:** کۆیلە بوون و لە ئەفریقیاوە هێنرابوون.[1]

هۆکاری ئابووری ڕۆڵی سەرەکی هەبوو لە زۆربوونی ژمارەی ئەم (زنج)یانەدا، یەکەمجار کە کۆچبەرەکان ڕوویانکردە ئەمریکا خۆیان لە چەند کەنارێکی چڕو ئالسکا و بە دارستاندا دەبینییەوە لە هیندەکانەوە فێری هۆکارەکانی کشتوکاڵکردن و دروستکردنی (کوخ) و بەلەمی بچووک و پێستەخۆشکردن و دارتاشی دەبوون و لەوانەوە شێوازی خۆگونجاندن لەگەڵ ئەم ژینگەیەدا فێردەبوون، کۆچبەر لەیەک کاتدا پێویست بوو ڕاوچی و چەکدار و جوتیار یش بێت و لە ە هەموو کاروبارێکدا پشت بە خۆی ببەستێت.[2]

ئەوانەی ڕوویاندەکردە ئەمریکا لە چەندچین و توێژێک پێکهاتبوون، لەوانەش ئایندارە چەوساوەکان، سامان ویست و کەسە ئاواتخوازەکان، هەژار و کەمدەرامەتانی وڵاتانی ئەوروپا لەگەڵ بەرهەڵستکارانی سیاسەتی بەریتانیا جگە لە کۆیلە (زنج) یەکان کە بە زۆر دەهێنران و خەڵکانێکیش کە ڕیسواو ئابڕوو تکاو بوون یاخود تاوانبار و قەرزاربوون لە وڵاتی خۆیان هەڵدەهاتن و ڕوویاندەکردە ئەمریکا.[3]

هۆکاری کۆچکردنی ئەو ژمارە زۆرەی خەڵکیش بۆ ئەم کیشوەرە بۆ چەند فاکتەرێک دەگەڕێتەوە.

---

١ - كارلهاينتس دشنر: تاريخ الولايات المتحدة، ترجمة محمد جديد،ط١، دار قدمس للنشر و التوزيع، سوريا، ص ٥٥-٥٨.

٢ - د.محمود السيد: تاريخ اوربا و الامريكتين، مؤسسة شباب الجامعة، الاسكندرية، ٢٠٠٤،ص١٢٨-١٣٥.

٣ - د.رأفت غنيمى الشيخ: امريكا والعالم، ص ١٢-١٣.

## هۆكارەكانی كۆچكردن بۆ ئەمریكا

### یەكەم: هۆكاری سیاسی

لە ئەنجامی ئەوەی كە (جیمس)ی یەكەم سیاسەتێكی بێزاركەری دەگرتەبەر كۆڕێك لە پوریتانەكان لە وڵات هەڵهاتن و ڕوویانكردە ئەمریكا و بە هیوای وڵاتێكی ئازادەوە كۆچیانكرد و بەریتانیایان بەجێ هێشت بە هۆی ناكۆكی ڕێچكەو ڕێبازی پرۆتستانت و كاسۆلیك، ژمارەیەكی زۆر لەم گروپە كۆچیان كرد بۆ ئەمریكا تا لەوێ ئازادی رادەربڕین بۆ خۆیان مسۆگەر بكەن و ژیانێكی دوور لە چەوساندنەوە بەدەست بهێنن، جگە لەوە لەیاسای (چارلی یەكەمدا) هاتبوو رێ لە كەس ناگیرێت بۆ كۆچكردن، ئەمەش هاندانی خەڵك دەگەیەنێت بۆ كۆچكردن، لە فەرەنسادا هیگۆنتە پرۆتستانتەكان كەمێك ئازادی ئاینیان لەلایەن پاشای فەرەنساوە پێدرابوو، دەیانتوانی باس لە ئاینزاكەیان بكەن، بەڵام پاش ئەوەی پاشای فەرەنسا لە ساڵی (١٦٨٥) ئەو ڕێژە ئازادییە بە ئاینیەی سەندەوە لێیان، كەوتنە بەر چەوساندنەوەی كاسۆلیكەكان و ناچاركران كۆچ بكەن بۆ جیهانی نوێ، چونكە كۆچكردنیان بە دواچارەسەر دەزانی.[1]

لە ئەنجامی فراوانخوازییەكانی لویسی چواردەهەم و شكستی ئەڵمانەكان، خەلكانێكی زۆر لە ئەڵمانیەكان ڕوویانكردە ئەمریكا، چونكە خۆیان بەسەرشۆر دەزانی و نەیان دەتوانی لە وڵاتەكەی خۆیاندا بمێننەوە، هەروەها خەڵكانێكی تر لە ئەوروپا بە هیوای ژیانێكی ئاسوودە و ئارام ڕوویانكردە ئەمریكا تا لە بارودۆخی سیاسی نالەباری وڵاتەكەی خۆیان ڕزگاریان بێت كە لە پاشماوەی ململانێی پاشاو كڵێسە و پەرلەمانی سەدەكانی ناوەڕاست مابووەوە.[2]

### دووەم: هۆكاری ئایینی

ئەم هۆكارەش گرنگییەكی زۆری هەبوو، چونكە لە سەدەكانی ناوەڕاستدا لە زۆربەی ناوچەكانی ئەوروپای ڕۆژئاوادا خەڵك دوای یەك كەنیسە و ڕێباز كەوتبوون، ئەویش ڕێباز و كەنیسەی كاسۆلیكی بوو، لادان لەو ڕێبازەش بە

---

١ - فرنسيس فريدمان: موجز التاريخ الامريكي، (د. ت)، (د.ط) ص١١.

٢ - فرحات زيادة:س، پ،ل ١٠.

تـاوانێکی گەورە دادەنـرا، پـاش هەڵگیرسـاندنی شـۆڕش لە سـەرەتاکانی سـەدەی شـانزەهەم دژی پاپـا و کەنیسـەی کاسـۆلیکی بە نـاوی (شۆڕشـی چاکسـازی و پرۆتستانتی) لە زۆر وڵاتانی ئەوروپی وەک (ئەڵمانیا ، ئیتاڵیا و ئیسپانیا) زۆرینەی خەڵکی ئەم وڵاتانە لەسەر مەزهەبی کاسۆلیکی مانەوە، بەڵام لە فەرەنسا شۆڕشەکە بەهێزتر بـوو،[1] دوای ئەوەی پاشـای فەرەنسـا لە سـاڵی (١٥٩٨)دا بە ئاگربەسـتێک شـەڕەکەی کۆتـایی پێهێنـاو ئـازادییەکی کەمـی سـنوورداركراوی بـۆ هۆگۆنتەکـان و شوێنکەوتوانی (چۆن کالڤن) لە پرۆتستانتیەکان پێدان، بەڵام زۆری پێ نەچوو ئەو ئـازادییە سنووردارەشـیان لێسـەندرایەوە، بەمەش شـوێنکەوتوانی کـالڤن نەخشـەیان کێشـا بـۆ کـۆچکردن بـۆ ئەمریکـا، چـونکە لە شـوێنی خۆیـان بڕوایـان بە دەسـەڵاتی ڕۆحـی پاشـا نەبـوو، هەروەهـا پاشـا و سـەرانی سـەر بە کاسـۆلیکیش دژی ئەوان دەوەسـتانەوە،[2] بـۆیە دەیانویسـت لە ڕێـگەی ئەم کۆچەیـانەوە لە ئەمریکـا کەنیسـەیەکی سـەربەخۆ بـۆ خۆیـان دروسـت بـکەن، بەڵام لە ئینگلـتەرا جیـاوازی بیروبۆچوونی ئاینی ڕوویەکیتری وەرگرت بە تەواوەتی کۆتـایی بە دەسـەڵاتی پاپا هێنـرا، هەروەهـا لە دەسـتوری ئینگلتـرادا هـاتووە کەنیسـەی دەوڵەتـی کەنیسـەی ئینگلیـزییە، ئەمەیـان بڵاوکـردەوە و وتیشـیان هەر کەسـێک شـوێن ئەم کەنیسـەیە نەکەوێـت تووشـی لێپرسـینەوە و سـزا دەبێـت، ئەمەش بـووە هـۆی دەرکەوتنـی کۆمەڵێـک بە نـاوی پۆریتانییەکـان، نارەزاییـان لەو بڕیـارە دەربڕی و وتیـان مـافی هەمـوو کەس و کـۆمەڵێکە کەنیسـەی تـایبەتی هەبێـت یـان شـوێن هـیچ کەنیسـەیەک نەکەوێت.[3]

زۆرێـک لە ئینگلیزەکـان بە هیـوای بڵاوکـردنەوەی مەسـیحیەت بەرەو ئەمریکـا کەوتنەڕێ و نیازمەندبوون هیندییەکانی ئەمریکا بهێننە سـەر ئـایینی مەسـیحی، جگە لەوە نـاکۆکی نێـوان ئاینزاکـانیش ڕۆڵـی تـایبەتی هەبـوو کە هەریەک دەیویسـت ئـاینزاکەی خـۆی پـێش ئەوی تـر لەو ناوچـانە بڵاوبکـاتەوە، کۆمەڵێک بانگخوازیـان دەنارد بۆ ئەوەی بت پەرستەکانی ئەم جیهانە نوێیە بهێننە سـەر ئـاینزای خۆیـان، هەروەهـا کەمـایەتی وەک هیگۆنتەکـان و پۆریتانیەکـان بە دۆزینـەوەی وڵات و

---

١ – فرانک اشر: موجز تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية، ترجمة – مهيبة مـالكي الدسوقي، مطبعـة دار الثقافة للطباعة والنشر،بيروت،١٩٥٤،ص ١٣.

٢ – ستيفن قنسنت بنية: أمريكا، ترجمة– عبدالعزيز عبدالمجيد، القاهرة، ١٩٤٥، ص٣٣.

٣ – ديب علي حسن: س– پ، ل٩٧.

ناوچەیەکی ئازاد کۆچیان بۆ ئەمریکا کرد بە هۆی نائازادییان لە وڵاتی خۆیان، هەروەها ئینگلتەراش دەیویست ڕزگاری بێت لە پۆریتانیەکان و بە هیچ شێوەیەک ڕێگری نەدەکردن بۆ کۆچکردن.[1]

**سێهەم: هۆکاری ئابووری**

ئەم هۆکارەش لە گەڵێک بواری جۆراوجۆردا خۆی دەبینێتەوە لەوانەش زۆربوونی ڕێژەی بێکاری لە ئینگلتەرە و تێکچوونی سیستمی ئابووری و کشتوکاڵی و دەست بەسەراگرتنی دێر و زەوییەکانی کلێسەوە، لە نێوان ساڵانی (١٦٢٠-١٦٣٥) گوشارێکی ئابووری توند بەسەر ئینگلتەرا هاتبوو، ژمارەیەکی زۆری خەڵک تووشی بێکاری ببوون، تەنانەت کەسانی لێهاتوو شارەزاش زۆر بە خراپی دەیانتوانی ژەمی ڕۆژانەیان بە دەست بهێنن، کەمی بەرهەمیش ئەوەندەی تر بارودۆخەکەی گران کردبوو، تەنانەت لە سەردەمی شاژنە (ئیلیزابیس) ئینگلتەرا جەمەی دەهات لە ژن و پیاوی بێکار، شەقامەکانیان دەکێڵا بۆ گەڕان بە دوای کارێکدا یان بۆ دۆزینەوەی خۆراک، ئەمانەش وایکرد خەڵکی بیر لە ڕێگەچارەیەک بکەنەوە تا چیتر ژیانیان بەو شێوەیە بەفیرۆ نەڕوات، بۆیە کۆچکردنیان بۆ ناوچەکانی ئەمریکا بە چارەسەر دەزانی بۆ ڕزگاربوون لە بارودۆخی خراپی ئابووری وڵاتەکەیان،[2] جگە لەمانەش شۆڕشی پیشەسازی، پیشەسازی نوێی چنینی هێنابووەکایەوە، بۆ بەردەوام بوونی خۆشی پێویستیەکی زۆری بە کەرستەی خاو لە خوری و پەموو هەبوو تابتوانێت درێژە بە خۆی بدات، خاوەن کێڵگەکانیش کێڵگەکانی خۆیان جێهێشتبوو، گوندنیشینەکانیشیان ناچارکردبوو مەڕ بە خێوبکەن، بەمەش زۆرینەی جوتیارەکان ڕوویانکردە شارەکان بۆ دەست کەوتنی کارو شارەکانیش جمەیان دەهات لە دانیشتوان، هەموو ئەمانە وایکرد خەڵکانێکی زۆر بۆ چاکردنی باری ئابووریان و پەیداکردنی سەروەت و سامان، کۆچ بکەن بۆ ئەمریکا یان بۆ گەڕانەوەی توانای ئابووریان ئەو کۆچەیان دەکرد تابتوانن ئابوورییە پاشەکەوتووەکەیان بگەڕێنەوە بۆ دۆخی جاران، هەروەها زۆرێک لەوانەی خاوەنی هیچ نەبوون، بەپێی ئەو هەواڵانەی پێیان گەشتبوو لە

---

١ - فرحات زيادة: س- پ، ل١٣.

٢ - ماكس ليرنر: أمريكا كحضارة، ترجمة- د.راشد البراوي، الجزء الاول، القاهرة، ١٩٦٦، ص ٤١-٤٢.

نیشنگەکان و ناوچەکانی ئەمریکا، لەوەی باس دەکرێت بە پێدانی زەوییەکی زۆر بە مەرجێک بۆ ماوەی پێنج ساڵ کار بۆ گەورەکەی بکات کۆچیان بۆ ئەمریکا کرد. [1]

هەروەها بەمەبەستی بازرگانی، کۆیلە ڕەشپێستەکانیان دەبرد بۆ ئەمریکا، لەوێ بـۆ خزمەتکـردن و ئـیش پێکـردن سـوودیان لـێ دەبینـین، بەم هۆیەشـەوە ئەوروپاییەکان ڕویان دەکردە ڕەش پێستەکانی ئەفەریقیا و ژمارەیەکی زۆریان لێ ڕاودەکـردن و دەیـانگرتن و بە کەشـتی باریـان دەکـردن و ڕەوانەی ناوچەکـانی ئەمریکایان دەکردن، بەمەش ئەم ڕەش پێستانە ئەوەندە ڕقیان جولابوو و حەزیان دەکرد بشکێن نەک بچەمێنەوە و بەرامبەر ئارەزووی پیاوە سپی پێستەکان. [2]

## چوارەم: ململانێی زلهێزەکان

بەر لە نیوەی سەدەی شانزەهەم کۆلۆنیالیزم لە ژێر چنگی ئیسپانیا و پرتوگالدا بووە و تا توانیویانە ناوچەیان بۆ خۆیان داگیرکردووە، بەڵام دواتر ئینگلتەرا وەک هێزێکـی کێبڕکـێ دەرکەوت و بە زۆر خەڵکـی ڕەوانەی نـاوچە تـازە دۆزراوەکـان دەکـرد و هەرگیـز ڕێگەی لە کـۆچکردوان نەدەگـرت بـۆ کۆچکردنیـان بـۆ ئەمریکـا، بەڵکـو چەنـدین کۆمپانیـا لە ئینگلـتەرا دروسـت ببـوو بـۆ ڕەوانەکردنـی خەڵـک بـۆ ناوچەکـانی ئەمریکـا بەڵام بەرامـبەر بە کارێـک، هەروەهـا وڵاتـانی دیـکەش کەوتـنە خۆیـان وەک هۆڵەنـداو فەرەنسـا و سـوید و... هتـد تـا ئەمـانیش شـوێنی خۆیـان لەم ململانێیە بکەنەوە. [3]

## پێنجەم: هۆکاری کەسی

بیرۆکەی ژیانی باشتر بەسەربردن لە ئەمریکا تەنها لای ئاینزاکان نەبوو، بەڵکو هەندێک لەوانەی کە ڕوویان دەکردە ئەمریکا ئاواتەخوازی نێوبانـگ و پلە وپایەی بڵندبوون و هەندێکیش ڕابردوویان پاک نەبوو دەیانویست بە کۆچ کردن بۆ ئەمریکا لاپەڕەیەکـی نـوێ لە ژیـانی خۆیـان هەڵبـدەنەوە و هەنـدێکیش لە دادگـا و بنکەکـانی پۆلیس داواکراو بوون و لە ترسی گرتن یاخود بە فاکتەری تاوان هەڵدەهاتن بەرەو

---

١ - د.رأفت غنيمي الشيخ: س- پ، ل ٢٣-٢٤.

٢ - محمود السيد: س- پ، ل ١٢٤.

٣ - جواهر لال نهرو: چاوپێداخشاندنێک بە مێژووی جیهاندا، و. ڕۆوف محمد زوهدی، بەرگی یەکەم، هەولێر، ل ١٢١.

ئەمریکا. خەڵکانێکی زۆر هەبوون دەگەڕان بە دوای ژیانێک لە ژێر سایەی ئازادیدا بێت، تەنانەت خەریک بوو لە میانەی کۆچکردنیان بۆ ئەمریکا زۆر بە ئاشکرایی سروشتی خۆیانیان دەچەسپاند، لەپاڵ ئەم کۆچکردوانەشدا کۆمەڵێک کەس جەربەزە و گەڕۆک هەبوون و خاوەنی وتەی بەهێز و ڕۆحی پەلاماردان بوون و ئەم خەسڵەتەشیان پاڵی پێوەنان ڕووەو دەریا وشکانییەکان کۆچ بکەن.[1]

### شەشەم: هۆکاری فەلسەفی

هەندێک لە کۆچبەران بڕوایان بەوە هەبوو دەکرێت کۆمەڵگایەک بنیات بنرێت لە بەرزترین پلەی نموونەدا بێت و لەو کۆمەڵگا گەندەلانەی خۆیان ڕزگاریان بکات، واتە کۆمەڵگایەک بێت دەسەبەری دادپەروەری و ئازادی و مافی مرۆڤەکان بکات، ئەمەش دەبینین لە نوسینەکانی (تۆماس مۆرۆ) (جۆن لۆک- ١٦٣٢- ١٧٠٤) و (تۆماس هۆبز- ١٥٨٨-١٦٧٩) و (دیڤید هیوم- ١٧١١-١٧٧٦) و (مۆنتسیکیۆ- ١٦٨٩-١٧٥٥)ی فەرەنسی و سەرجەم فەیلەسوفەکانی تری ئەورووپا کە ڕۆڵیان لەم کۆچکردنەی خەڵکدا هەبووە.[2]

### حەوتەم: هۆکاری کۆمەلایەتی

دابەشبوونی کۆمەلایەتی چینەکانی خەڵک لە ئەورووپا بە پێودانگی سەدەکانی ناوەڕاست دابەشبوونێکی گەندەڵ و زیانبەخش بوو بۆ زۆر کەس و لە ژێر فشاری ئەو بارە نالەبارەدا زۆر کەس هەڵهاتن، کاتێک ئەو خەڵکە کۆچکردووە ڕوویانکردە کیشوەری نوێ هەریەک لە ژێر بار ودۆخێکی سەختدا بوو کە پێویست بوو بەرەو باشکردنی ببات و لەم جیهانە نوێیەدا (پشت بەخۆ بەستن) وەک یەکێک لە بنەما پتەوەکانی ئەو کۆمەڵگا نوێیە چەسپاو، ئەمەش گیانی بەرەنگاربوونەوە و نەفەس درێژی بەخشییە ئەمریکایەکان و هەوڵ و خۆماندووکردنەکانیان زۆر ڕێگای لە بەردەمدا ئاسانکردن.[3]

---

١ - فریشتە نورائی: مێژووی گۆرانکاریی کۆمەلایەتی و سیاسیی ئەمریکا، و.هەورامان فەریق کریم، چاپخانەی خاني، چاپی یەکەم، ٢٠٠٧، دهوک،ل ١٢-١٥.

٢ - لاری الوتیز.نظام الحکم في الولایات المتحدة، ترجمة –جابر سعید عوض، ط١، القاهرة،١٩٩٦،ص ٢١.

٣ - تشارلز وماری بیرد: س- پ، ج١/ ل١٩.

بە هەزاران کۆچبەریش بە مەبەستی دەربازبوون لە شەڕ و ئاژاوەکان ڕوویان لە ئەمریکا دەکرد و ئەوروپایان بەجێهێشت، زۆرێک لەوانە ماڵ و شمەکەکانیان بەجێ دەهێشت، هەندێکیش بە هۆی تاوانە کۆمەڵایەتیەکەیانەوە هەڵئەهاتن، چونکە لە دادگاوە بانگکرابوون یاخود زیندانی بوون و هەڵهاتبوون، بۆیە کۆچیان کرد تا لاپەڕەیەکی نوێ لەو ڕابردووەی هەیبووە هەڵبداتەوە. (١)

**ململانێکانی نێوان فەرەنسا و بەریتانیا**

بەر لە هاتنی کۆچەرە ئینگلیزەکان بۆ ئەمریکای باکوور، فەرەنسییەکان بەر لەئەوان بە ماوەیەکی زۆر هاتوونەتە ئەم کیشوەرە و تیایدا نیشتەجێ بوون، لە ناوەڕاستی سەدەی حەڤدەهەم شاری (کیوبیک) وەک یەکەم داگیرگەی فەرەنسی دامەزرا بە ناوی فەڕەنسای نوێ یان کەنەدا، بەڵام دوای هاتنی کۆچەرە ئینگلیزییەکان بۆ ئەم کیشوەرە، وردە وردە ناکۆکیان لەم جیهانە نوێیەدا دەستیان پێکرد، ناکۆکی ئەمانیش بوەتە هۆی زیاتر گەشەسەندن و فراوانبوونی داگیرگەکانی ئەمریکا. (٢)

دیارە ململانێ و ناکۆکی ئەم دوو زلهێزە ئەوروپیەکان بە شێوەیەکی کورت بۆ ئەم چەند خاڵەی خوارەوە دەگەڕێتەوە:

١. ململانێ لە پێناو بەدەستهێنانی ناوچەی بەرهەمهێنی فەڕو و بازرگانی زیاتر لە ئەمریکا.

٢. ڕەنگدانەوەی ململانێی سیاسی ئەم دوو دەوڵەتە لە ئەوروپاوە بۆ داگیرگەکانیان، ئەمەش دوای پەرەسەندنی ناکۆکی ڕامیاری نێوان پاشا (ولیم ئۆف ئەورانج)ی ئینگلیزی لە ساڵی (١٦٨٨)ز و هەڵهاتنی جیمسی دووەم لایەنگری کاثولیکەکان لە لایەن لویس چواردە پاشای فەرەنسا پشتگیری دەکرا. (٣)

٣. گواستنەوەی توند وتیژی ئایینی و ناکۆکی نێوان ئاینزاکانی کاسۆلیک و پرۆتستانت بۆ ئەمریکا، ئەمەش ناکۆکی نێوان داگیرگەکانی ئینگلیز و فەرەنسای زیاتر کرد.

٤. یارمەتیدانی فەرەنسییەکان بۆ هندییە سوورەکان بۆ زیاتر بە تالانبردنی داگیرگەکانی ئینگلیز لە ئەمریکا.

---

١ - د.رأفت غنيمي الشيخ، س- پ، ل ٢٤.

٢ - عبدالعزيز سليمان: س- پ، ل ٣٨-٤٠.

٣ - د.طليعة الصياح: س- پ، ل ٤٩.

٥. دامەزراندنی زنجیرەیەک ناوەند و مەڵبەند و قوللەی پارێزگاری بە شێوەیەکی نیوە بازنەیی لەلایەن فەرەنسیەکانەوە بۆ گەمارۆدانی داگیرگەکانی ئینگلیز، ئەمەش وایکرد بەرەو ڕۆژئاوا فراوانخوازی بکەن.[1]

زۆرترین ئەو جەنگانەی لە نێوان داگیرگەکانی ئینگلیز و فەرەنسا ڕوویانداوە، درێژەپێدەری جەنگەکانی نێوانیانە کە لە ئەوروپا لە کۆتایی سەدەی حەڤدە و سەرەتای سەدەی هەژدەهەم ڕوویاندا، لە گرنگترین ئەو جەنگانەش:

## یەکەم: جەنگی پاشا ولیەم

پاش هاتنی ولیەمی سێیەم بۆ سەر دەسەلات لە ئینگلتەرا، لەگەڵ لویسی چواردەهەمی فەرەنسیدا کەوتە ناکۆکییەوە و شەڕ و ناخۆشی لە نێوانیاندا درێژەی کێشا، ئەم جەنگە گرنگیەکی تایبەتی هەبوو بۆ ئەمریکا، بە جەنگی شا ولیەم (١٦٨٩-١٦٩٧) ناسراوە، لەم جەنگەدا ئینگلیز توانی دەست بگرێت بەسەر (پۆرت ردیاڵ)دا، کە پێشتر بەدەست فەرەنسی و هندییە سورەکانەوە بوو و هاوپەیمانی فەرەنسییەکان بوون، بەپێی پەیماننامەی (رایزفیک) ئەم دوو ناوچانە دران بە ئینگلتەرا.[2]

## دووەم: جەنگی شاژن ئان

جەنگی بۆماوەیی ئیسپانی، ئەمیش بۆ ئەمریکا جەنگێکی گرنگ بوو، بە جەنگی شاژنە (ئان) (١٧٠٢- ١٧١٣) ناسراوە، لەم جەنگەدا ئینگلیزەکان توانییان لە ساڵی (١٧٠٢)دا دەستبگرن بەسەر (سان ئۆگەستین) لە فلۆریدا و بیسووتێنن، لە ساڵی (١٧١٠)دا دەست بگرنەوە بەسەر پۆرت رۆیاندا، لە هەمان کاتدا فەرەنسییەکان بە هاوپەیمانی هندییە سوورەکان هێرشیان دەکردە سەر ئینگلیزەکان بە درێژایی ئەو سنوورە، لە ساڵی (١٧١٣)دا بە پەیماننامەی (ئەوتەرخت) ئینگلیزەکان توانییان سەرجەم ئەو ناوچانەی دەیانویست بەدەستی بهێنن و لە ناوچەکەدا دانیان پێدا بنرێت، هەروەها فەرەنسا نیوفولاند و ناوچەی ئەکادیا و ئورکواز بداتەوە بە

---

١ - اسماعیل احمد یاغي: س- پ، ل ٤٩.

٢ - د.طلیعة الصیاح: س- پ، ل ٥١.

ئینگلیزەکـان، لەهەمـان کاتـدا ئینگلیزەکـان ئەو مافەیـان بەخشـییە فەڕەنسـا بە پاریزگاری کردن لە دورگەی (سەری بریتون) بۆ خۆیان.[1]

**سێیەم: جەنگی بۆ ماوەیی نەمساوی**

ئەم جەنگە بە جەنگی (پاشا جۆرج)یش دەناسرێت لە ساڵی (١٧٤٣- ١٧٤٨)دا روویـداوە، ئەم جەنـگە پـێچەوانەی رووداوەکـانی ئەمریکـا بـوو، لە گرنگتـرین ئەنجامەکـانی داگیرکردنـی بـنکەی جەنگـی لویزبـۆرگ بـوو لە کەنـداوی بریتـۆن، هەروەها هندیە سوورەکان چیتر پێویستیەکانیان لە فەڕەنسییەکان نەکڕی بەهۆی بەرزی نرخی ئەو شمەکانەوە، لە ئەنجامی پچڕانی پەیوەندی کەنەدا بەفەڕەنساوە، ئەمەش وایکرد کەل وپەل و پێویستیەکانیان لە ئینگلیزەکـان بکڕن، بە پەیماننـامەی (ئێکس لاشاپێل) کۆتایی پێهات.[2]

**چوارەم: جەنگی حەوت ساڵەی نێوان بەریتانیا و فەڕەنسا (١٧٥٦- ١٧٦٣)**

جەنگی حەوت ساڵەی نێوان فەڕەنسا و بەڕیتانیا لە ئەمریکا کە لە نێوان ساڵانی (١٧٥٦- ١٧٦٣) بەرپـابوو، چەنـد هـۆیەکی هەبـوو بـۆ ئەوەی ئەو شـەڕە روو‌بـدات، یەکێک لە گرنگترین هۆیەکانی بەرپابوونی ئەو شەڕە جیاوازی نێوانیان بوو لەسـەر خاوەنـداریتی ئەمریکـای بـاکوور و کەنەدا، یەکێکـی تـر لە هۆکارەکـانی پێشـبرکێ کۆنترۆڵکردنی ئەڵمانیا بوو کە ئەوکاتە دەوڵەتێکی یەکگرتوو نەبوو.[3]

سـەرچاوەی شـەڕی حەوت سـاڵەی بەریتانیـا و فەرەنسـا دەگەڕێـتەوە بـۆ شـەڕەکانی جێگری ئۆتریش (١٧٤٠- ١٧٤٨) کە دوو لایەنـی سـەرەکی فەرەنسـا و بەریتانیا و دوو لایەنی تەوەرەی لاوەکی ئۆتریش بوو، ئەمە جگە لەوەی دەتوانین بڵێین تەواوی ئەوروپـای گرتـۆتەوە، واتە وڵاتـانی (بەریتانیـا، فەرەنسـا، بروسـیا، هانوفر، نمسا، روسیا، سویدو سکسونیا) پاش دەستپێکردنی بە ماوەیەک (ئیسپانیا و پورتوگـال)یش بەشـداریانکرد، بەڵام هەروەک ئامـاژەی پێـدەدەین لەم شـەڕانەدا (فەرەنسـا و ئوتـویش) لەلایەک (بەریتانیـا و بروسـیا)یش لەلایەکـی دی پـێکەوە

---

١ - وليم لانجر: موسوعة تاريخ العالم، تر- د. محمد مصطفى زيادة، فرانكلين للطباعة والنشر، الجزء الرابع، القاهرة،١٩٦٣، ص ١٣٦٢.

٢ - د. عبد العزيز سليمان نوار: س- پ، ل ٤٢.

٣ - اسماعيل احمد ياغي: س- پ، ل ٣٩.

یەکیانگرت کە بە یەکێتی(بەراوەرگرتوو) ناوی دەبرێ، هەروەها دەوڵەتی هانوڤریش دایەپاڵ (بەریتانیا) و روسیا و سوید و سکسونیاش دایانەپاڵ فەرەنسا، کەچی لە شەڕەکانی جێگری ئوتویشدا بارودۆخەکە بەمجۆرە بوو، واتە ئەو هاوپەیمانیەتەی پێشتر بەم شێوەیە بوو (ئوتویش و بەریتانیا) و (بروسیا و فەرەنسا)، بەڵام لە شەڕی حەوت ساڵەدا بارودۆخەکە بەم شێوەی لێهات (بروسیا و بەریتانیا) و (ئوتش و فەرەنسا).[1]

بەریتانیا دەیویست باڵادەستی خۆی بەسەر فەرەنسادا بگەیەنێتە ئەو جێگایەی کە گەڕانەوەی بۆ نەبێ و تەواوی کۆڵۆنیاکانی لەدەست بنێتەدەر، بۆیە لە ساڵی (١٧٥٥) فەرمانی دا بە هێزە دەریاییەکانی خۆی لە لێوارەکانی هیند و ئەمریکا تا دەست بگرن بەسەر کەشتیگەلیەکانی فەرەنسادا، کە ئەوکاتە (مقاطعة)ی هۆڵەندی لە هند بوون.[2]

لەو نێوەدا ئوتریش کە لە شەڕەکانی پێشوودا بەیەکگرتن لەگەڵ (چی پی نەرا) بڕیاریدا بۆ بەربەرەکانی بروسیا هەستی ئاینزای کاسۆلیکی بجوڵێنێت پشتیوانی ئەم وڵاتە بەلای خۆیدا بێنێت، لەلایەکی تریشەوە بروسیاش لە پشتیوانی فەرەنسا دڵنیا نەبوو و مەیلی بەلای بەریتانیادا دەشکایەوە، فەرەنسا و ئۆتریش لە ساڵی (١٧٥٦) پەیمانی دۆستانەیان لە فێرسای ئیمزاکرد و کەوتنە پاڵ یەک، لەو بارودۆخەدا فریدریکی دووەم ئۆلێماتۆمێکی بەخشی بە ئوتروش و لە ئۆگاستی (١٧٥٧)دا ناوچەی ساکسی داگیرکرد و شەڕی حەوت ساڵەشی بردە قۆناغێکی جدییەوە.[3]

ژمارەیەک لەویلایەتەکانی ئەڵمانیا و روسیا پشتیوانیان لە ئوتریش کرد، هاوپەیمانی ئوترویش واتە بە داگیرکردنی هانۆڤر هەڕەشەیەکی جیدی بۆ پروسیا پێکهێنا، پروس کەوتە پەلەقاژە و شتێکی وای نەمابوو بەتەواوی شکست بخوات و لەمەیدان یچێتەدەر، بەڵام بە یارمەتی بەریتانیا و لێهاتوویی فیردریکی دووەم لەو شکستە حەتمیە دەربازی بوو.[4]

هەر لەوکاتەدا روسیا توانی لەسەر حسابی پروس هەندێ پێشڕەوی بکات، بەڵام بەرەی سەرەکی شەڕ بەریتانیا و فەرەنسا بوون کە وا دەهاتە بەرچاو فەرەنسا

---

١ - د.طليعة الصياح: س- پ، ل ٥٢.

٢ - اسماعيل احمد ياغي: س- پ، ل ٣٩ -٤٠.

٣ - عبدالمجيد نعنعي: س- پ، ل ٤٦.

٤ - فرنسيس فريدمان: مؤجز التاريخ الأمريكي،ص ٧٥.

شکستی حەتمی دەخوات، ئەمەش زۆری پێنەچوو فەرەنسا ناوچەکانی خۆی لە هیند و کەنەدا لەدەستدا و بەریتانیەکان دوورگەکانی مارتینک و کوبایان داگیرکرد، لە ئاکامدا چەند ڕووداو و شەڕیان نزیکردەوە، سەرەتا مەرگی ئەلیزابێت (کچی پێتری گەورە) ئیمپراتۆری روسیا و هاتنە سەرکاری پێتری سێیەم لە ساڵی (١٧٦٢) ئەمە کاتێک بوو کە ئیسپانیا یەک ساڵ بوو هاتبووە ناو شەڕەوە کە بەریتانیا لە شەڕی دەریادا بشکێنن و دەستبگرن بەسەر ئیمپراتۆریەتەکەیدا، بەم شێوەیە وتوێژەکانی ئاشتی لە ساڵی (١٧٦٣)دا لە پەیمانی پاریس کۆتاییان پێهات.[١]

سەرەڕای ئەوەی فەرەنسا بە تەواوی لە ئەمریکا کشایەوە، زۆرترین زیانی بەرکەوت بەتایبەت لە لایەنی ئابووریەوە کە مەبەست هەردوو فەرەنسا و بەریتانیا لە ئەمریکا و ڕوودانی ئەو شەڕە لەبەر لایەنی ئابووری بوو، چەندین هۆکار بوونە هۆی سەرکەوتنی ئینگلیزەکان بەسەر فەرنسییەکان لە ئەمریکای باکووردا:

١. زۆری ژمارەی دانیشتوانی داگیرگەکانی ئینگلیز (یەک ملیۆن و نیو بوون) بە بەراورد لەگەڵ ژمارەی دانیشتوانی فەرەنسییەکان لە ئەمریکا کە هەشتا هەزار دەبوون، ئەمەش بەهۆی وەرنەگرتنی کۆچکردوی پرۆتستانتی ئەگەر فەرەنسیش بن و نیشتەجێ بوونیان لە داگیرگەکانی ئینگلیزدا بێت وەک (هۆگۆنتەکان).

٢. بەهێزی کەشتیگەلی ئینگلیزی و بەتواناییان لە تێکشکاندنی کەشتی و بەلەمەکانی فەرەنسیەکان، هەروەها پچڕانی پەیوەندی نێوان فەڕەنسا و کەنەدا و نەگەیشتنی یارمەتییەکان بۆ کەنەدا.[٢]

٣. دەست بەسەراگرتنی ئینگلتەرا بەسەر کەرەستەی خاو و سەرچاوەی ئابووری زیاتر وەک لە فەڕەنسا.

٤. فراوانی داگیرگەکانی ئینگلیز یارمەتیدەر بووە بۆ باشترکردنی پەیوەندی نێوان دانیشتوان و ڕێکخستنی کاروباری بەرگری، هەروەها هاوکاری دانیشتوانی داگیرگەکانی ئینگلیز و ڕۆڵی سەرکردەی وەک (جۆرج واشنتن) لە شەڕەکاندا دژ بەفەڕەنسیەکان و دروستبوونی داگیرگەکان و ململانێی وڵاتە ئەوروپیەکان لە ئەمریکای باکووردا.[٣]

---

١ - د.طليعة الصياح: س- پ، ل ٥٣.

٢ - د.طليعة الصياح: س- پ، ل ٥٤.

٣ - د. محمد محمود النيرب: تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية، دار الثقافة الجديدة، الطبعة الاولى،١٩٩٧، الجزء الاول، ص ٢٤.

## دروستبوونی داگیرکەگان و بارودۆخیان

لە پاش دۆزینەوەی ئەمریکای باکوور، کۆچکردن بۆ ئەم کیشوەرە دەستیپێکرد، ئەو کــۆچبەرانەش زۆربەیـــان لە دەوڵەتـــانی ئەوروپـــای رۆژئـــاوایی بـــوون، مەبەستیشیان لەم کۆچە نیشتەجێبوون بووە لەم کیشوەرەدا، ئەم کۆچبەرانەش بە هۆکـار و مەبەسـتی جیاجیـا هـاتوونەتە نـاوچەکە، هەنـدێکیان بـۆ ئەوە هـاتوونەتە ئەمریکا بە ئازادی پەرستن ئەنجام بدەن، هەنـدێکی تریـان بـۆ بڵاوکردنەوەی ئـایینی مەسیحی لە نێو هندییە سوورەکان و هەندێکی تریان بۆ گەڕان بە دوای زێڕ و زیـو و کـانزای بەنـرخ و هەنـدێکی تریـان بـۆ سـامان کـۆکردنەوە، بە ئامـانجی بنیاتنـانی نیشـتمانێکی نـوێ و بەکارهێنـانی زەویـیەکەی تـا پێداویسـتیەکانیان پڕبکـاتەوە و ژیانێکی باشتر و چاکتر بۆ خۆیان دەستەبەر بکەن.[1]

لەڕاستیدا ململانێی وڵاتانی ئەوروپی و کێبڕکێ بـۆ بەدەستهێنانی زەوی نـوێ و دەستگرتن بەسـەریدا لەڕێگەی دامەزراندنی داگیرگە و نـاردنی خەڵکەوە بووە، بۆ ئەم مەبەستەش یەکەم دەوڵەت گرنگی دابێت بە بەدەستهێنانی نـاوچەی دەسـەڵات و داگیرگەی لێ دامەزراندبێت لە ئەمریکای باکوور، بریتیە لە:

### یەکەم: ئیسپانیا

ئیسپانیا لە پێشەوەی دەوڵەتە ئەوروپیەکانی تردا جێ پێی خـۆی لەم کیشـوەرە نـــوێیەدا جیگیرکـــرد، لەڕێـــی هەردوو دۆزەرەوەکەی (دی ســـاتو و کوردنـــادۆ) لە ناوچەی باشووری رۆژهەڵات و رۆژئاوای ئەمریکای بـاکوور، ئەمەش بە مەبەسـتی پاراستنی ئیمپراتۆریەتە فراوانەکەی بوو لە ئەمریکای لاتینیدا.

لە ناوچەکـانی فلۆریـدا ئیسـپانیەکان هەسـتان بە بونیادنـانی چـوار ناوەنـدی نیشتەجێ بوون، لە گرنگترین ناوەندەکانیان (سـان ئۆگسـتن) بـوو لە سـاڵی (١٥٦٥) لەسەر بەندەری (سانت ئۆگستین) لە فلۆریدا، قەڵایەکی گەورەشـی تیـادا دروسـتکرد بۆ پاراستنی داگیرگەکە لە مەترسی هندیە سوورەکانً و هێزە ئەوروپاییەکانی تر.[2]

---

١ – د.صلاح احمد هريدي: دراسات في التاريخ الأمريكي، ص٢١.

٢ – تشارلز و ماري بيرد: تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية،ج١/ص ٧.

لە نێوان ساڵانی (١٦٩٠- ١٧٣١) ئیسپانەکان هەستان بە بونیادنانی دوازدە ەڵبەندی ئایینی و مژدەبەری بۆ ئایینی مەسیحی لە نێو هندیە سوورەکاندا لەپێناو دەستگرتن بەسەر کەنارەکانی رۆژئاوای ئەمریکای باکووردا، هەر بۆیە ئیسپانیەکان چەندین مەڵبەندی ئایینیان لە ویلایەتەکانی کالیفۆرنیا و تەکساس و نیو مەکسیکۆ و نیفادا و ئۆکلاهوما و چەندین ناوچەی تر دامەزراند.[1]

لە ڕاستیدا ئامانجی ئیسپانیەکان لە کردنەوەی ئەم مەڵبەندە ئایینیانە لە ئەمریکای باکوور تەنها بۆ مەسیحی کردن بوو نەک بۆ کاری سیاسی یان سەربازی، گەورەترین مەڵبەندی بانگەشەی ئایینی لەباکوور لەساڵی (١٦٠٩)دا بونیادنرا، مەبەستی نیشتەجێبوونی ئیسپانیەکان لە ئەمریکای باکوور بۆ مەبەستی سیاسی نەبووە،چونکە هیچ کۆچکردنێکی ئەوتۆ بۆ ئەم مەبەستە بەدی ناکرێت، بەڵکو مەبەستیان بڵاوکردنەوەی ئایینی مەسیحی بووە بە تایبەتی ئایینزای کاسۆلیکی لە نێو هندیە سورەکاندا، ئەمانەش تەنها لە ڕێگەی پیاوانی ئایینیەوە جێ بەجێدەکرا، دواتر شارستانیەتی ئیسپانی لە ناوچەکانی باشوور و باشووری رۆژئاوای ئەمریکای باکوور بڵاوبووەوە.[2]

### دووەم: فەڕەنسا

فەڕەنسا لەپاش دەوڵەتە ئەوروپیەکانی تر بە پلەی دووەم دێت کە توانیبێتی جێ پێی خۆی لە ئەمریکای باکوور جێگیر بکات، ئەمیش لە ڕێگەی دەریاوانی ئیتاڵی (دی فیراتزانو) لە ساڵی (١٥٢٤)دا، پاشای فەڕەنسا (فرانسی یەکەم) ناردی و کەنارەکانی ئەمریکای لە نێوان (کیپ نیر) هەتا (فوندلاند) دۆزییەوە و دواتریش لە ڕێگەی گەشتەکانی (جاک کارتی)یەوە لە ساڵانی (١٥٣٤-١٥٤١) چەندین ناوچەی دۆزییەوە.

لەڕاستیدا گرنگیدانی فەڕەنسییەکان تەنها بۆ مەبەستی بازرگانی و ئاڵوگۆڕی بازرگانی نێوان ئەو ناوچانە بووە، بەتایبەتی بۆ کۆکردنەوەی پێستەی ئاژەڵ و یەکەم سەرچاوەی بازرگانی فەڕەنسییەکان بوو، چونکە لای ئەوروپییەکان نرخێکی

---

١ - د.محمد محمود النیرب: تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية،ج١/ص٢٤.

٢ - د.علي حسين الشلش: جغرافية امريكا الشمالية الاقليمية، جامعة البصرة، ١٩٨٠، ص ١٣٧.

بەرزی هەبوو و بە ئاسانی ئاڵوگۆڕی پێدەکرا، ئەمەش قازانجێکی زۆری بە فەرەنسیەکان دەگەیاند. [1]

فەرەنسیەکان توانییان لەساڵی (١٦٠٤)دا لە (نوفاسکۆشیا)ی ئێستا بە درێژای ڕووباری سانت لۆرانس یەکەم داگیرگەی خۆیان بنیاد بنێن.

فەرەنسیەکان دەستیان گرتبوو بەسەر دوو دەروازەی گرنگی ئاویدا، ئەمەش یارمەتی کردارە بازرگانیەکانی دەدات، سەرباری ئەوەی کەنداوی سانت لۆرانس و دەریاچە و ڕووبارە گەورەکانی میسیسپی و ئۆهایۆ و کەنداوی مەکسیک لە ژێر دەستیاندا بووە، ئەمەش کارەکانی زیاتر بۆ ئاسان کردبوون. [2]

فەرەنسیەکان لە نێوان ساڵانی (١٦٢٥- ١٦٦٤)، چەندین داگیرگەیان دروست کردووە وەک (سان کریستۆڤەر) لە ساڵی (١٦٢٥) و بۆ فراوانکردنی ئەو داگیرگانە لە ساڵی (١٦٢٦)دا کۆمپانیایەکی تیادا دامەزراند، هەروەها لە ساڵی (١٦٣٥)دا فەرەنسیەکان (جواد ئەلوب و مارتینک و تورتوگا) لە نێوان ساڵەکانی (١٦٤٨- ١٦٥٦)، لەم داگیرگانە پێکهاتووە (سانت مارتین، سانت بارتلمیو، سانت کروا، سانت ماری گالانت، سانت لوشیا و گرینادا). [3]

لە سەردەمی لویسی سیانزەهەمدا (١٦١٠- ١٦٤٢) وەزیری فەرەنسی (ریشیلۆ) لە ساڵی (١٦٢٧)دا کۆمپانیایەکی دانا بۆ بەڕێوەبردنی کارەکانی فەرەنسای نوێ لە ئەمریکا، دواتریش لە سەردەمی لویسی چوارەمدا زیاتر گرنگی پێدراوە و کارمەندی بۆ تەرخان کراوە و دواتر لەوێ نیشتەجێ کراون و پێداویستی کشتوکاڵییان بۆ دابینکراوە، لە نیوەی سەدەی حەڤدەهەمدا لە دەست بەسەرداگرتنی ناوچەکانی دیکەی ئەمریکای باکوور بەردەوام بوون، لە ساڵی (١٦٩٩)دا (لویزیانا)یان بنیاتنا و بنکەی خۆیان بردە کەنداوی مۆبێل لە ساڵی (١٧٠٢)دا، هەروەها لە ساڵی (١٧١٨)دا شاری (نیوئەورلیانز)یان بنیاتنا. [4]

سەرەڕای ئەوەی فەرەنسیەکان دەستیان گرتبوو بەسەر ڕووبەرێکی فراوانی زەوی لە ئەمریکای باکووردا، بەڵام زۆر بە خێرایی لایەنگرەکانیان لەم ناوچانەدا

---

١ – ولیم لانجر: س- پ، ج٤/ص ١٣٣٧.

٢ – د.اسماعیل احمد یاغي: معالم التاریخ الأمریکي الحدیث، ص٣٥.

٣ – د.طلیعة الصیاح: س- پ، ل ١٩.

٤ – د.محمد محمود النیرب: س- ث، ل ٢٦.

کەم دەبوونەوە، ئەمەش بەهۆی ئەو جەنگە حەوت ساڵەی لە نێوان فەڕەنسیەکان و دانیشتوانی رەسەنی ناوچەکەدا کەوتەوە، لە نێوان ساڵەکانی (١٧٥٦- ١٧٦٣) لە کوتاییدا فەڕەنسیەکان تێکشکان و ئینگلتەراش هەموو رۆژهەڵاتی میسیسپی و باکووری دوورگەی (مەکسیک)ی خستەژێر دەسەڵاتی خۆی.[1]

## سێیەم: ئینگلتەرا

ئینگلتەرا سێیەم دەوڵەتی ئەوروپا بوو دوای لەپاش ئیسپانی و فەڕەنسیەکان، توانی دەسەڵاتێکی زۆری لە ئەمریکای باکووردا هەبێت و چەندین ناوەندی بەهێز لەم جیهانە نوێیەدا بنیات بنێت، بە تایبەت دوای جەنگی حەوت ساڵەی لەگەڵ فەڕەنسیەکان (١٧٥٦- ١٧٦٣)، ئەمەش دوای ئەوەی چەند هەوڵێکی سەرنەکەوتووی لە دروستکردنی دوو داگیرگە لە ناوچە کەنارییەکانی زەریای ئەتڵەسی لە بەشی رۆژهەڵاتی چیای (ئەپلاش)، یەکەمیان داگیرگەی (جیمس تاون) لە ساڵی (١٦٠٧) لە ویلایەتی ڤێرجینیا بنیادنرا، دووەمیان داگیرگەی (بیلمۆس) لە ویلایەتی ماساشوستس لە ساڵی (١٦٢٠)دا و هەردووکیان دوو داگیرگەی کشتوکاڵی بوون.

لەبەرئەوەی زۆرترین ڕەگەزی کۆچبەران بۆ ئەمریکای باکوور لە ڕەگەزی ئینگلیزەکان بوو، ئەمە وایکرد چەندین داگیرگەی ئینگلیزی لە ئەمریکای باکوور دروست ببێت و تەنانەت تا ساڵی (١٧٣٢) سیانزە داگیرگەی ئینگلیزی دامەزرا و دوایەمینیشیان تا ئەو ساڵە (جۆرجیا) بوو لە ساڤانا.[2]

ئینگلیزو داگیرگەکان

ئینگلیزەکان بەشداری بزووتنەوەی دۆزینەوەی جوگرافیان کرد لە کۆتایی سەدەی (١٥ز)وە بۆ یەکەمین جار بە سەرکردایەتی دەریاوان (جون کاپوت) ئینگلیزەکان گەشتنە کەناری (نیوفاولاند) و بەو کەنارەدا بەرەو باشوور

---

١ - ئیزاک ئایسیموف و فرانک وایت: مێژووی شارستانیەت (هەنگاوی هەزارەکان)، و حامید گەوهەری، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە،دەزگای ئاراس، هەولێر،٢٠٠٣،ل ١٢٨.

٢ - فرحات زيادة: تاريخ الشعب الأمريكي، ص، ١٣-١٧.

شۆڕبوونەوە و سەرجەم ئەو ناوچانەیان وەک موڵكداری پاشایەتی بەریتانیا پاوان كرد. [1]

(جیمستۆن) یەكەمین سەنتەری ئاوەدانی ئینگلیزەكان بوو كە بە ناوی (پاشاجیمس)ەوە ناونرابوو ئەوەی شیاوی وتنە سیاسەتی پادشایەتی بەریتانیا لەگەڵ ئەو كۆمپانیا و دامەزراوانەی كە خەریكی پرۆسەی ئاوەدانكردنەوەی سەرزەمینی ئەمریكا بوون كە بە قازانج و بەرژەوەندی نیشتمانی دایک لە ئینگلتەرا كەوتەوە هەر ئەمەش بە یەكێک لە گرنگترین فاكتەرەكانی نیشتەجێ بوونی ئینگلتەرا دادەنرێت لە ئەمریكا. [2]

جگە لەوەش چەوساندنەوەی ئایینی لە بەریتانیا بەهۆی ناكۆكی ڕێچكەو ڕێبازی وەک پرۆتستانت و كاسۆلیک بە تایبەتی ستەمكردن و داپڵۆسینی گروپی (پیوریتانی) بە هۆكارێكی زۆر كاریگەری كۆچكردنی خەڵكی ئینگلترا دادەنرێت بۆ ئەمریكا، هەروەها بەهەمان شێوە لە فەرەنساش بەهۆی چەوسانەوەی گروپی (هیگۆنۆت) لە سەردەستی كاسۆلیک، پەیڕەوانی ئەم گروپە ناچاری ڕەوكردن بوون و لە كەنداو و شوێنەكانی دیكەی ئەمریكا نیشتەجێ بوون. [3]

لەگەڵ تێپەڕبوونی ڕۆژگاردا سەرزەمینی كۆلۆنیالی ئینگلیز لە فراوانبووندا بوو، پاشان یەكەی گەورەتری لێ دامەزرا كە پێی دەوترا (ویلایەت) هەریەک لەم ویلایەتانە ئۆتۆنۆمی تایبەتی خۆی هەبوو، بەڵام بە گشتی ویلایەتەكان پابەندبوون بە تاجی پاشایەتی بەریتانیاوە، پێویستە ئاماژە بۆ ئەوە بكەین لە سەرەتادا حكومەتی بەریتانیا هانی هاوڵاتیانی خۆی دەدا، بەڵكو ئاسانكاریشی بۆ دەكردن لە پێناو كۆچكردن و نیشتەجێ بوون لە خاكی تازەی ئەمریكا، [4] چاوەڕێی هیچ كەڵک و قازانجێكیشی لێ نەدەكردن، بەڵام كاتێک سەرنجیدا ئابووری ویلایەتە كۆلۆنیاكە لە ئەمریكا پێشكەوتوو تر و زیاتر گەشەی كردووە بە بەراورد لەگەڵ ئابووری بەریتانیا ئیتر ئەم بابەتە حكومەتی لەندەنی ناچاركرد چەند ڕێگە چارەیەک بگرێتەبەر بۆ بەستنەوەی بازرگانی كۆلۆنیالەكان بە بەریتانیاوە، بۆ ئەم مەبەستەش

---

١ - اسماعیل احمد یاغي: س- پ، ل ٢٧.

٢ - د. محمد محمود النیرب: تاریخ الولایات المتحدة الأمریكیة،ج١/ص ٢٥.

٣ - بدون مؤلف: موجز التاریخ الأمریكي، وزارة الخارجیة، مطالعات عن امیركا، ص١-٣.

٤ - د.صالح زهر الدین: موسوعة الامبراطوریة الأمریكیة،ص ٣٢-٣٥.

چەند یاسایەکی پەیوەست بە بازرگانی دەرکرد کە خەڵکی ویلایەتەکانی ئەمریکای ناچارکرد تەنها لەگەڵ بەریتانیادا بازرگانی بکەن. [1]

ئەم یاسا بازرگانیەش هێندە توند و دژوار بوو دووجار ویلایەتی ماساشۆستی ئەمریکـی لە سـالآنی (١٦٨٤-١٦٨٩) لە دژی هەڵـگەڕانەوە، سـەرباری ئەمەش پەرلەمـانی بەریتانیـا لە سـاڵی (١٧٥٠) دامەزرانـدنی پیشەسـازی ئاسـنی لە کۆلۆنیالەکانی ئەمریکا قەدەغەکرد تەنها بۆ ئەوەی خەڵکی ئەو کۆلۆنیانە ناچار بکات بۆ کڕینی بەرهەم و کالا دروستکراوەکانی کارگەکانی ئینگلتەرا، هەرچۆنێک بێت کۆلۆنیـالی ئینگلیـز لە ئەمریکـا ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیـاتر پەرەی دەسـەند و بەهێزتـر دەبوو لەچاو کۆلۆنیاکانی فەرەنسا و ئیسپانیا، ئەوەش لەبەر دوو هۆی سەرەکی:

١. ئینگلیزەکـان تـا سـەر لە دۆزینـەوە و گەڕانەکـانی خۆیانـدا بە دوای زێـردا خەریک نەبوون، بەڵکو بە پێچەوانەی ئیسپانی و فەرەنسییەکانەوە هەر شـوێنێکیان ئـاوەدان بکردبـایە سـەرەتا دانیشـتوانە کۆنەکەیـان لەنـاو ئەبـرد یـان دووریـان ئەخستەوە، ئینجـا لەسـەر ئاسـتێکی فراوان دەستیاندایە کشـتوکاڵ و چانـدنی زەوی وزاری ئەو ناوچانەی داگیریان کردبوو. [2]

٢. هەروەها ئینگلیزەکان لە سـەرەتادا چەنـد نـاوچەیەکی بەرتەسک و بچووکیـان ئـاوەدان کـردەوە بەر لەوەی بەرەو هەرێمەکـانی تـری نـاوەوە بڕۆن بە پێچەوانەی فەرەنسی و ئیسپانیەکان کە خێرا بڵاوبوونەوە لەسـەر زەمینێکی فراوان و دواتـریش نەیانتوانی پارێزگاری لێ بکەن. [3]

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کۆلۆنیالەکانی ئینگلیز هەر لە سنوری کەنەداوە تا باشـوور لە شـێوازی ژیـان و گوزەرانـدا چـوون یەک نەبـوون، هەر لە سـەرەتاوە دەرکەوت کەوا جیاوازییەکی بەرچاو لە نێوان ویلایەتەکانی باکور و باشـوور هەیە، لە کاتێکدا ویلایەتەکانی باشـوور ئۆرسـتۆکراتی و خـاوەن کێڵگەی فـراوان بـوون کە قولەکـانی ئەفریقیا کاریان تێدا دەکرد.کەچی ویلایەتەکانی باکوور دیموکراتی بوون لە کێڵگە و مەزاری بچووکدا خۆیـان (سـپی پێسـتەکان) خەریکی کاروبـاری کشـتوکاڵی بـوون،

---

١ – ستيفن فنسنت بنية: امريكا، ص ٢٢-٢٣.

٢ – اسماعيل احمد ياغي: س- پ،ل٣٧.

٣ – د.محمد محمود النيرب:تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية،ج١/ص ٣٢.

هەروەها لە ویلایەتەکانی باکوور بە کارامەیی و لێهاتوویی چینی خاوەن سەرمایە و بۆرجواز بنکەی شاری گەورە و گەشەکردوو پەیدابوون.[1]

### دروستبوونی داگیرگەکان:

١. ڤێرجینیا: یەکەم داگیرگەی ئینگلیزییە لە باکووری ئەمریکای باکوور لە سالّی (١٦٠٧)دا دامەزراوە.[2]

٢. نیویۆرک: لە سالّی (١٦١٤)دا دامەزراوە، سەرەتا بە ناوی (نیوئەمستەردام) لەلایەن هۆلّەندیەکانەوە دروستکراوە، بەلاّم دواتر ئینگلیزەکان لێیان داگیرکردن و ناویان لێنا (نیویۆرک) بە ناوی (یورک)ی برای پاشای ئینگلتەرا.[3]

٣. ماساشوستس: لە سالّی (١٦٢٠)دا دامەزراوە لەلایەن پۆریتیانیەکانەوە لە ژێر چاودێری کۆمپانیای کەنداوی ماساشوستس.[4]

٤. نیوهامشیر: لە سالّی (١٦٢٣)دا دامەزراوە.[5]

٥. ماریلاند: لە سالّی (١٦٣٤)دا دامەزراوە.[6]

٦. کۆنیکتیکت: لە سالّی (١٦٣٥)دا لە دۆلّی رووباری (کۆنیکتیکت) دامەزراوە.[7]

٧. رۆدئایلاند: لە سالّی (١٦٣٦)دا دامەزراوە و لە دوو بەش پێکهاتووە لە (رۆیدئایلاند و کێلّگەکانی بروفدنس)، دواتر لەسەر ڕەزامەندی پاشای ئینگلترا یەکیانگرت و ئەم داگیرگەیان پێکهێنا.[8]

٨. دیلاویر: لە سالّی (١٦٣٨)دا بە سەرپەرشتی کۆمپانیای هندی رۆژئاوایی دامەزراوە.[9]

---

١ - د.طليعة الصياح: س- پ،ل ٤٠.

٢ - فرحات زيادة: س- پ -ل ١٣.

٣ - ديب علي حسن: الولايات المتحدة الأمريكية، ص٢٨.

٤ - اسماعيل احمد ياغي: س- پ، ل٣١.

٥ - ستيفن فنسنت بنية: امريكا، ص٣٢.

٦ - كارلهاينتس دشنر: تاريخ الولايات المتحدة، ص ١٢٢.

٧ - تشارلز وماری بيرد: س- پ،ج١/ ل١٤.

٨ - د.رأفت غنيمي الشيخ، امريكا والعالم،ص١٩.

٩ - ستيفن فنسنت بنية: امريكا، ص٣٢.

٩. کارۆلینای باکوور: لە ساڵی (١٦٥٠)دا دامەزراوە پاش ئەوەی پاشای ئینگلیز بە تەواوی دەستیگرت بەسەر ئەو ناوچانەی کارۆلینای باکووردا و کردنی بە داگیرگەی خۆی. [١]

١٠. نیوجێرسی: بە هۆی بوونی زۆری هۆڵەندییەکان لەم ناوچەیەدا هۆڵەندییەکان دروستیانکرد، بەڵام لە ساڵی(١٦٦٤)دا ئینگلیزەکان دەستیان بەسەرداگرت و بەناوی نیوجێرسی ناسرا. [٢]

١١. کارۆلینای باشوور: لە چەند داگیرگەیەکی بچووک پێکهاتبوو لە ساڵی (١٦٧٠)دا، بەڵام لە ساڵی (١٧٢٩)دا، یەکیانگرت و ئەم داگیرگەیان وەک یەکەیەکی سیاسی پێکهێنا. [٣]

١٢. پەنسلڤانیا: لە ساڵی (١٦٨٢)دا دامەزراوە. [٤]

١٣. جۆرجیا: لە ساڵی (١٧٣٢) بۆ یارمەتیدانی ئەو هەژارە ئینگلیزانەی نەیاندەتوانی قەرزەکانیان بدەنەوە پێکهێنرا، هەروەها بۆ رێگری لە هاتوچۆی ئیسپانەکان لە داگیرگەکانی ئینگلیزی لە فلۆریدا و هاتوچۆی فەرەنسی لە لویزیانا، ناوەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ پاشای ئینگلتەرا، جۆرجی دووەم. [٥]

داگیرگەکانی ئینگلیز لە ڕووی پێکهاتەی جوگرافی و ئابوورییەوە بۆ سێ بەش دابەش دەبن:

### یەکەم: داگیرگەکانی باکوور (نیوئینگلاند)

ئەمانیش بریتین لە (نیوهامشیر، ماساشوستس، کۆنیکتیکت، رۆدئایلاند)، داگیرگەکانی نیوئینگلاند دەکەونە بەشی باکووری رۆژئاوای ئەمریکای باکوور، زەوییەکەی بەردەڵانی بووە و لە هێڵی درێژی تاشەبەرد پێکدەهات و زستانەکەشی درێژ و سارد بووە، ئەمەش بژێوی ژیانی خەڵکی نیوئینگلاندی لە گەڕان بەدوای کشتوکاڵییەکانەوە گران کردبوو، خەڵکی نیوئینگلاند لە گەڕان بەدوای پیشەکانی

---

١ – ناهد ابراهيم دسوقي:دراسات في التاريخ الأمريكي،ص٢٥.

٢ – د.رأفت غنيمي الشيخ: س– پ، ل١٩.

٣ – ديب على حسن:الولايات المتحدة الأمريكية،ص٢٨.

٤ – د.ناهد ابراهيم دسوقي: س– پ، ل٢٦.

٥ – اسماعيل احمد ياغي: معالم التاريخ الأمريكي الحديث، ص٢٩.

تـردا سـوودیان لە وزەی ئـاو وەردەگـرت و ئـاش و کارگەکـانی دروسـتکردنی تەختەیان پێ خستەگەڕ، بەهۆی هەبوونی درەختی لەبار لە ناوچەکەدا خێرا تەختەی ئەم نـاوچەیە ناوبـانگی دەرکـرد، بەمەش پیشەسـازی کەشـتی سـەریهەڵدا، بەنـدەرە چاکەکـانیش هۆکـاری سـەرەکی بـوون لە گەشەسـەندنی بازرگـانی و ئابووریـدا، هەروەهـا سـوود وەرگرتن لە بەرهەمە ئاوییەکان، بەمەش ئـابوورییەکی تـاڕادەیەک بەهێز لەم ناوچەیەدا دەرکەوت. [1]

خەڵکـی ئەم داگیرگـانەش بەو شـتانەی بەرهەمیـان دەهێنـا بازرگانیـان لەگەڵ دەرەوەی خۆیانـدا بـۆ ئەوروپـا و هنـدیە سـوورەکان دەکـرد و پێویسـتیەکانیان لە دەرەوە دەکڕی.

ئەم داگیرگانە لە کشتوکاڵ کردندا پەیڕەوی رژێمی کێڵگە بچووکەکانیـان دەکرد، جوتیارەکـان لە موڵکدارە بچووکەکـان بـوون و لە شـارەکاندا پیشەسـازی پێستە و خـوری و بەرهەممهێنـانی ئاسـن و کەرەسـتەی کشـتوکاڵی و چەک و ڕاوەماسـی و پیشەسازی پاپۆڕ دروستکردن پەرەی سەندبوو، ویەکەم زانکۆ بە نـاوی هارڤارد لە ساڵی (١٦٣٦) لەو بەشە دامەزرا. [2]

### دووەم: داگیرگەکانی ناوەند

ئەمانیش بریتین لە (نیویۆرک، نیوجێرسی، دیلاوەرو پەنسلڤانیا)، دانیشـتوانی ئەم داگیرگـانە لە ڕووی ئـابووریەوە پەیـڕەوی کـێڵگەی ئازادیـان دەکـرد و جوتیارەکـان زەوی و زاری بەرفراوانیان بەکاردەهێنا و بۆ چاندنی دانەوێڵە ئەم زەوی و زارانە بەکەڵـک بـوون، هەروەهـا دانیشـتوانی ئەم داگیرگـانە بازرگانییـان لەگەڵ دەرەوەی خۆیانـدا ئەنجـام دەدا بەتـایبەت شـاری نیویـۆرک ببـوو بە بنکەیەکـی بەناوبانـگ بـۆ ئاڵوگۆڕی بازرگانی. [3]

---

١ - د.محمد محمود النيرب: س- پ، ج١ل ٣٩.
٢ - د. طليعة الصياح: تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية،ص ٤٠.
٣ - فرحات زيادة: تاريخ الشعب الأمريكي،ص ٨.

ئەم داگیرگـــانە لەڕووی پێکهـــاتەی زمـــان و ڕەگەزەوە هەمەچەشـــنە بـــوون، لە(هۆڵەنـدی، فەڕەنســی، ئینگلیـزی، ئیرلەنـدی، نەرویجـی، سـویدی، پرتوگـالی و هەنگاری) و چەندین ڕەگەزی دیکە پێکهاتبوون.

دانیشـتوانی ئەم داگیرگـانە جیـاواز بـوون لە دانیشـتوانی نیوئینگلانـد، چـونکە دانیشـتوانی ئەم داگیرگـانە زۆرینەیـان لە شـارەکاندا نیشـتەجێ بـوون، ئەمەش وایکردبـوو تائاسـتێکی زیـاتر لە ناوچەکـانی دیـکە زیـاتر بـایەخ بە بـوارە شارستانیەتەکان بدەن، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی زۆر بە خێرایی گەشە بکەن، بە تـایبەت پەنسـلڤانیا و دیـلاوەر، هەر زوو ژمـارەی دانیشـتوانەکانی ئەم داگیرگـانە زیادی کرد و شەقامە پڕ لە درەختەکانی پەیدابوون و خانووە جوان و قەشەنگەکان دروستکران و سەرنجی هەموانی بۆ رادەکێشا. [١]

## سێیەم: داگیرگەکانی باشوور

ئەمـانیش بریتیبـوون لە (ماریلانـد، ڤێرجینیـا، کارۆلینـای بـاکوور، کارۆلینـای باشوورو جۆرجیا).

ئەم داگیرگـانە لە داگیرگەکـانی بـاکوور و ناوەنـد جیـاوازبوون، بەو پێـیەی ڕووبەری زەوییەکانی ئەم داگیرگانە زۆر فراوان بوو و ژمارەی دانیشتوانەکەشی لەوانی تر زۆر کەمتر بوو تا لە کۆتایی سـەدەی حەڤدەهەمدا پێکهاتەی کۆمەڵایەتی و ئـابووری (ڤێرجینیـا و ماریلاند) تـاڕادەیەکی زۆر وابەسـتەی جوتیـاران و خـاوەن زەوییە بچووکەکانی کشتوکاڵبوون، جوتیـارانی ئەم داگیرگانە پشتیان دەبەسـت بە هێزی بازووی کۆیلەکان و کۆنترۆڵی دەسەڵاتی سیاسـی و باشـترین زەوییەکانیـان لەژێر دەستدا بوو، ئەمانیش خانووی گەورەیان دروسـتکرد و تـا ئاسـتێکی زۆریـش پەیوەندی خۆیان لەگەڵ جیهان و شارسـتانیەتی دەرەوەدا دەپاراست. [٢]

لەم داگیرگـانەدا بەرهەمهێنـان زیـاتر بـووە وەک لە بەکـاربردن، ئەمەش ژیـانی دانیشتوانی تا ئاستێکی زۆر بەرزکردبووەوە، لە بەرهەمەکانیش (توتن، گەنمەشامی، بـرنج، قامیشـی شـەکرو لـۆکە) بـوو و هەروەهـا شـاری چارلسـتۆنی کارۆلینـای

---

١ - عبدالعزيز سليمان:تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية الحديث،ص٣٧.

٢ - د.محمد محمود النيرب: س- پ، ج١ل ٤٠.

باشوور لە داگیرگەکانی باشوور وەک داگیرگەکانی دیکە ژمارەی دانیشتوانی ڕوو لە زیادبوون بوو، لە سنووری ئەمانیشدا هندیە سوورەکان دەژیان،

بارودۆخی داگیرگەکانی ئینگلتەرا لەڕووی پێکهاتەی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئایینی و ڕۆشنبیری لە نێوان داگیرگەکاندا جیاوازە، بۆیە هەوڵ دەدەین بە شێوەیەکی کورت باسیان بکەین.[1]

---

١ - د. طليعة الصياح: س- پ، ل ٤١.

## ژیان لە ئەمریكا

**یەكەم: ژیانی سیاسی**

فرە ڕەگەزی گەلی ئەمریكا مۆرك و خەسڵەتێكی تایبەت بە خەڵكی ئەو وڵاتە بوو، زۆرینەی خەڵك كە لە ئینگلیزەكان بوون كەم هەستیان بە گۆڕانكاری كردبوو، خۆیان لە بەشێكی دانەبڕاو لە گەلی ئینگلیزی ژماردە دەكرد، هەرچەندە سیستمی حكومی هەر داگیرگەیەك تا ئاستێك لەوی دی جیاواز بوو، بەڵام لە بنەرەتدا تا ئاستێك لەگەڵ یەكدا چوونیەك بوونە و هەموو ڕێسا و یاسای ئینگلیزییان وەك بنەڕەت دەزانی و هەریەك لەو داگیرگانە فەرمانڕەوا و ئەنجومەنێكی نوێنەرایەتی و هەئیەتێكی قەزایی هەبوو، شێوازی دەستنیشانكردنی فەرمانڕەواكانیش لە هەندێ ویلایەتدا لەلایەن پاشا و لە هەندێكی تردا كە نیمچە سەربەخۆ بوون بە هەڵبژاردن دەستنیشان دەكرا، جگە لە پەنسلڤانیاش هەموو داگیرگەیەك هەیئەتە تەشریعیەكەی لە دوو ئەنجومەن پێك دەهات ئەوانیش ئەنجومەنی یاریدەدەران و ئەنجومەنی هەیئەتی گشتی بووە،[1] لە زۆرینەی داگیرگەكاندا فەرمانڕەوا كە ئەنجومەنی یاریدەدەرانی دادەنا و دەستەی گشتی لەلایەن خەڵكەوە دەستنیشان دەكران، هەر زوو لە داگیرگە ئەمریكیەكاندا دوو هێزی كێبڕكێ كار پەیدابوون، یەكەمیان كۆنە پارێزی ئەرستۆكراتیەتی خاوەن ئیمتیازات بوو، دووەمیش ئازادیخواز و دیموكرات و دۆستی گەل بوو، حاكمی داگیرگەكانیش مافی هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمان، وەستاندنی یاسا و ڕێساكان، بە سەربازكردنی زۆرە ملێ، جاڕدانی حوكمی عورفی... هتدیان هەبوو.[2] هەرچەندە ئەم جۆرە دەسەڵاتە ئاماژەی حوكمێكی تاكڕەوانە بە بیری مرۆڤدا دێنێت، بەڵام ئەو ئازادییەی كە لە سەدەی (١٧و ١٨) لە ئەمریكا دا بەرقەرار بوو لە هیچ بەشێكی گۆی زەویدا نەبوو، ململانێی ئەو دوو باڵەی كۆمەڵگا ئەمریكیەكانیش فاكتەری گەشەكردنی دیموكراسیەت بوو، بەریتانیا هەموو ئەو ئازادیانەی كە لە بەریتانیا هەیبوو گواستیەوە بۆ ئەمریكا و بەخشییە

---

١ - فرحات زيادة: تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية،ص ٢٢.

٢ - د.صلاح احمد هريدي:دراسات في التأريخ الأمريكي،ص٢٩.

هاولاتیەکانی، بەڵام ئیسپانەکان و گەلەکانی تر تەنها بە مەبەستی وەبەرهێنان هاتبوون و نیازمەندی دامەزراندنی نەتەوەی تایبەت بە خۆیان نەبوون. [1]

**دووەم: ژیانی ئابووری**

سەبارەت بە بوارە ئابوورییەکەش فاکتەرە جوگرافیەکان بوونە هۆی جیاواز بوونی سیستمی ئابووری داگیرگەکان کە دابەش دەبوون بۆ باکوور و نێوەند و باشوورییەکان و پیشەی سەرەکی خەڵکی ئەمریکاش تاساڵی (١٧٦٠)یش هەر کشتوکاڵ بوو، ویلایەتە باکورییەکان بۆ کشتوکاڵ باش نەبوو، بە پێچەوانەوە لەباشوور گەشەی کرد و یاسای زەوییەکانی ئینگلتەرای بەسەردا بڕا و لە شوێنی تردا یاسای تایبەتی بۆ دانرا. بەهۆی ئەوەی کە کشتوکاڵ لە هەندێ شوێندا زۆر برەوی نەبوو، خەڵک روویانکردە چەند پیشەیەکی تر و زۆری کەنداوەکان یارمەتی فراژووبوونی بازرگانیاندا و ڕاوەماسی و بازرگانی پێکردنی برەوی زۆری پەیداکرد و بازرگانی کۆیلە سەریهەڵدا بەتایبەت کۆیلەی (زنجی) کە لە کۆیلەی سپی نرخیان زۆر گرانتر و بەرەواجتر بوو، دەرهێنانی (قیر و زەیت)یش وەک پیشەیەک سەریهەڵدا. [2]

داگیرگەکانی نێوەندی ئەمریکا تاڕادەیەک کشتوکاڵی بوون و بەندەری (نیویۆرک) بوویە تاجی شانازیکردنی جیهانی نوێ و لە (نیویۆرک) و (فیلادلفیا) و بازرگانەکان دەستیانکردە ناردنە دەرەوەی فەروو، تەختە، دانەوێڵە، بەرەو باشووری ئەوروپا و دوورگەکانی هیندی خۆرئاوا و لەوێوە شەکر و دۆشاو کەل و پەلی ناوماڵیان دەبرد. [3]

سەرەڕای زاڵبوونی ڕەگەزی ئینگلیزی لە داگیرگەکاندا چەندین ڕەگەزی دیکەش بوونیان هەبوو، لەوانە دانیشتوانی ڕەسەنی ئەمریکا (هندییە سورەکان) ئەمانیش دەسەڵاتیان گرتبوو بەسەر ناوچەکانی ناوەوەی وڵاتدا، بەڵام لە سەدەی هەژدەدا بەهۆی زیادبوونی کۆچی سپی پێستەکان و فراوانخوازیان بەرەو داگیرگەکان، دەسەڵاتی ئەمانیان کەمکردەوە. [4]

---

١ - د.عبد العزيز سليمان: س- پ، ل ٥٠.

٢ - د.محمد محمود النيرب:المدخل في تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية، ج١\ص ٤٨-٤٩.

٣ - فرحات زيادة: تاريخ الشعب الأمريكي،ص ٢٥.

٤ - ديب علي حسن: س- پ، ل ٣٨.

هەروەها رەگەزێکی زیاتر (زەنجیەکان) بووکە لەناو کۆمەڵگای ئەمریکی نوێ بڵاوبوونەوە، ئەمانە چینێکی تایبەت بوون و زۆرترینیشیان لە داگیرگەکانی باشوور لە کێڵگەکانــدا کاریــان پێــدەکرا، ژمــارەیەکی کەمیــان لە ناوچەکــانی وڵاتــدا لە داگیرگەکانی ناوەند و باشوور بەکاردەهێنران، ئەمانە هیچ مافێکی یاسایان پێ نەدەبەخشرا و دانیان بەهیچ مافێکی سروشتی خۆیاندا نەدەنا.[1]

چینێکی دیکەی کۆمەڵگای ئەمریکی سپی پێستەکانن و دەسەڵاتداری وڵات دەکەن و ئەمانە خاوەنی زەوی و زار و کێڵگەکان بوون و دەسەڵاتیان بەسەر بازرگانی و ڕاوەماسیدا گرتبوو.[2]

ئەمە بەشێوەیەکی گشتی، بەڵام بەشێوەیەکی وردتر لە داگیرگەکانی باکووردا، پۆریتانیەکان رۆڵێکی گرنگیان بینیوە لە سەرکردایەتی کردنی کۆمەڵگا لەبوارەکانی ئاینی و رۆشنبیریدا، مەڵبەندێکی گەورەی کەنیسە و قوتابخانەی تیادا دروستکراوە، بەهۆی کرانەوەی بە ڕووی رێبازە ئاینیەکاندا وابەستەیی ئایین لە داگیرگەکاندا بوونی هەبووە.[3]

بەڵام لە داگیرگەکانی باشووردا، کێڵگەی فراوانی تیادا هەبووە و دانیشتوانی ئەم داگیرگانە بە ئاشکرا چەند چینێکی کۆمەڵایەتی بوون لە شێوەی خاوەن کێڵگەکان و ئەرستوکراتەکان لە لوتکەی هەرەمی کۆمەڵایەتیدا و کاروباری سیاسیان لەدەستدابوو، دواتر چینە جوتیارە موڵکدارە بچووکەکان بوون و بەشێکی زۆری دانیشتوانیان پێکدەهێنا، چینێکی دیکە کۆیلەکان بوون، جیاوازییەکی زۆر لە نێوان دەوڵەمەندەکان و هەژارەکاندا هەبووە، ئەمەش لەژیانی کۆمەڵایەتیدا بە پێچەوانەی داگیرگەکانی باکوور بووە.[4]

## سێیەم: ژیانی کۆمەڵایەتی

دۆزی کۆمەڵایەتی لە ویلایەتە ئەمریکیەکاندا زۆر لە بارودۆخی ئینگلتەرا دەچوو، هاتوچۆ و گواستنەوەی نێوان داگیرگەکانیش تاڕادەیەک ئاسان و لەباربوو، بازرگان و دەوڵەمەندەکانیش منداڵانی خۆیان دەناردە زانستگا ئینگلیزییەکان، داگیرگە

---

١ - لويس ى. لوماكس: ثورة الزنوج،ص١٢.

٢ - د.محمد محمود النيرب: س- پ، ل ٤٩.

٣ - د.رأفت غنيمي الشيخ: س-پ، ل ٢٨-٢٩.

٤ - د. طليعة الصياح: س- پ، ل ٤٥.

باكوورییەکـان گەلێکـی هاوپێوەنـد و پـێکەوە گرێـدراوبوون و کڵێسـە و قوتابخـانە پلەوپایەیەکی بەرزیـان لە نێو خەڵکدا وەرگرت و جۆرێک لە یەکسـانی و دادگەری لەنێوان دانیشـتوانی ئەم ناوچانەدا بڵاوبوویەوە،[1] بەڵام لە داگیرگەکانی باشـووردا خەڵـک دا بەشـبوون بـۆ چەنـد چـین و توێژێـک، لەسـەروو هەموویـانەوە کشـتیارە ئەرستۆکراتەکان و وردە جوتیار و خاوەن پیشـەکان لە داگیرگەکانی نێوەڕاستیشـدا تـێکەڵەیەک پێکهـاتن کە خـاوەن لێبـوردن و دڵ نەرمـی بـوون و دەوڵەمەنـد و خۆشـگوزەران بـوون، بەڵام لە (نیویـۆرک) و (فیلادلفیـا) کـۆمەڵگەیەکی رۆشـنبیر و ئاسـت بەرز پێکهـات و هەمیشـە عەودالـی سـەما و مۆسـیقا و بـاخچە و گۆڕەپـانی تـایبەت بـوون و فیلادلفیـا لە فراوانـی کـۆڵان و هێمنـی و زۆری دامەزراوەکانـدا ناوبانگی رۆشت و ژیانێکی خۆشیان دەگوزەراند.[2]

**چوارەم: رەوشی ئایینی و کلتوری و ڕۆشنبیری**

جـگە لە رودئایلانـد و پەنسـلڤانیا سـەرجەم داگیـرگە ئەمریکیەکـان لایەنگـری بونیادنانی کڵێسـەیەکی رەسمی بوون کە دەوڵەت کۆمەکی بکات، بێزراوترین شت لە مێژووی ئەمریکادا ئەو رێ و شوێنە توند وتیژانە بوو کە پوریتانیەکان دژ بەهەندێ ئارەزووی مرۆڤانە گرتیانەبەر بەرامبەر ئەو شـتانەی کە بە (هرطقة- heretic)یـان دەزانی کە هەندێک جار ئەو رێ و شوێنانە بریتیبوون لە سزادان و نەفی کردن و بگرە لە سێدارەدانیش، بەڵام کڵێسـای (انکلیکانی) کە لە باشـووردا سیفەتی ڕەسـمی هەبـوو وەک بـاکوور تونـد وتیـژ نەبـوو،[3] بەڵکـو دەسـتی لە کاروبـاری خەڵکـی وەرنەدەدا، لە نیـوەی سـەدەی (١٨) هەژدەهەمـدا دوو بیـرۆکەی نـوێ لە ئەمریکـا سەریانهەڵدا لە بواری ئاینیدا کە رۆڵی گرنگ و پڕ بایەخیان هەبوو لە گۆڕینی ژیانی ئەمریکیەکانـــدا، یەکەم بیـــرۆکەی جیـــاکردنەوەی ئـــایین و دەوڵەت و دووەم فەرامۆشکردنی ئایین بوو، ئەمانە جیاوازییە ئایینی و ئاینزاییەکانیان کاڵ کردەوە و کوشـتاری مەزهەبی و ئـایینی چیتر بـاوی نەمـا و خەڵـک ئاوێتە و تێکەڵی یەکتری بوون.[4]

---

١ - د. طليعة الصياح و: س- پ، ل ٤٨.

٢ - د. عبد العزيز سليمان و: س- پ، ل ٥٧.

٣ - فرحات زيادة و: س- پ، ل ٢٣-٣٥.

٤ - د. طليعة الصياح و: س- پ، ل ٤٥.

باری رۆشنبیریش لە داگیرگەکاندا دەستیکردبوو بە گەشەکردن، پوریتانزەکان ڕوویان کردبووە زانست و زانیاری و باوەڕیان وابوو هەموو کەس دەبێت بۆ خۆی (کتاب المقدس) بخوێنێت، لە سەرەتادا دایک و باوک منداڵەکەی خۆیان فیر دەکرد، دواتر قوتابخانە دامەزرا کە وانەکانی خوێندن و نووسین و ژمێرە و بنەما ئاینیەکانی تێدا دەخوێنرا و خوێندنگای ناوەندیش بنیاتنرا بۆ خوێندنی زانستە کلاسیکیەکانی نزیک و بیرکاری و... هتد [1].

لە زۆر داگیرگەدا خوێندنی سەرەتایی بە زۆر بوو، لە شاری (هارڤارد) کتێبخانە و تاقیگەی زانستی کرایەوە، لە نیویۆرک و فلادلفیا چەند کۆلێژێک کرانەوەو وردە وردە رۆژنامە و گۆڤار سەریانهەڵدا و بەر لە شۆڕش تەنها شارێکی وەک (بوسطن) (٥) رۆژنامەی تێدا دەردەچوو، چەندین کەسی ناودار و خاوەن بەهرەش دەرکەوتن، ئەوەش یارمەتی زوو بزوتنی بارودۆخی ژیاری و کلتوری ئەمریکایدا بڵاوبوونەوە و تەشەنەسەندنی زمانی ئینگلیزی بوو کە بوویە مەزنترین هۆکاری پەیوەندی کردنی خەڵک بە یەکترییەوە، چەند هۆکارێکی تریش پەرەیاندا بە بوژاندنەوەی کلتوری لەوانەش بنیاتنانی حکومەتە نوێنەرایەتیەکان، سەرهەڵدانی نەرم و نیانی ئایینی و رەگەزی، سەرهەڵدانی ئازادی تاک و یەکسانی ماف. [2]

هەروەها کۆچبەرە سەرەتاییەکان لە نیو ئینگلاند کتێبخانەیان دروست کرد، بەمەش بەرەوپێشچوونێکی زۆر لەبوارەکانی (مێژوو، سیاسیەت، فەلسەفە، زانستەکان)دا ڕوویدا، لە ساڵی (١٦٣٩)دا یەکەم دامەزراوەی بڵاوکردنەوە لە داگیرگەکاندا و دووەمین دامەزراوەی بڵاوکراوە لە سەرتاسەری ئەمریکای باکوور لە کۆلێجی (هارڤارد) دا دامەزراوە. [3]

یەکەم خوێندنگاش لە پەنسلڤانیا لە ساڵی (١٦٨٣)دا دامەزرا، لەم خوێندنگایەدا خوێندن و نووسین و ژمێریاری دەوترانەوە و منالانیشیان بەشێوەی فێرکردنی سەرەتایی دەگرتەخۆ، تا پێش دەستپێکردنی جەنگی سەربەخۆیی (١٧٧٥) لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا نۆ کۆلێج دامەزران، ئەوانیش: هارڤارد لە ساڵی (١٦٣٦)، ولیام ئەندماری لە ساڵی (١٧٤٦)، زانکۆی پەنسلڤانیا لە ساڵی (١٧٥١ز)، زانکۆی شا (کنجر کولیدج) کۆلۆمبیای ئێستا لە ساڵی (١٧٥٤)، رۆدئایلاند (براونی ئێستا) لە

---

١ - فرحات زيادة و: تاريخ الشعب الأمريكي،ص ٣٢.

٢ - كنيث بثر: كل شيء عن امريكا، دار الكرنك،القاهرة،١٩٦٣،ص١٥.

٣ - فرحات زيادة و: س- پ، ل ٣٣.

سـالّی (١٧٦٤)، زانكـۆی (كـونیز كولیـدج)، روتجـرزی ئێسـتا لە سـالّی (١٧٦٦)، دار تسموس (١٧٦٩). [١]

لە سـالّی (١٦٣٩) یەكەم چاپخـانە لە ماساشوسـتس دامەزرا، لەوەوە سـەرەتای رۆژنـامە و گۆڤـار و كتێب چـاپكردن لە داگیرگەكاندا دەسـتیپێكرد، تـا پـێش جەنگی سـەربەخۆیی ئەمریكـا پێنج رۆژنـامە لە بوسـتن و سـیان لە فیلادلفیـا دامەزرا، بەم شـێوەش لە سـەدەی هەژدە بەدواوە رۆشـنبیری لەم وڵاتەدا گەشـەی كـردو بەرەوپێشەوە چوو، لە كۆتاییەكانی سەدەی هەژدەهەمدا رۆشنبیری ئەمریكی خۆی لە رۆشنبیری ئینگلیزی دەدا. [٢]

---

١ - كنیث بثر: س- پ، ل ١٥.

٢ - فرحات زیادة و: س- پ، ل ٣٢-٣٥.

# جەنگی سەربەخۆیی و دەرکەوتنی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا

**کۆمەڵگەی ئەمریکی پێش جەنگ،**

زۆربەی کۆمەڵگەی ئەمریکی پێش جەنگەکە بریتی بوون لە خەڵکە بەریتانییەکان و لەوێوە بەرەو ئەو شوێنانە کۆچیان کردبوو و هەڵگری بیری سیاسی و سیستمی یاسایی و دابونەریت و رۆشنبیری ئەوێ بوون و دامەزراوە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانیشیان زادەی بیر و هزری بەریتانیا بوون. بەڵام دوای سەدەمی حەڤدەهەم لە ئەمریکای باکووردا بەرەبەرە گەشەسەندن و گۆڕانکاریی گەورە لەو بیر و هزر و دامەزراوانەدا روویدا،

پێشتر لە سیستمی کۆمەڵایەتیدا باوک سەرگەورە بوو و جڵەوی ئابووریش بەدەست ئەو بوو، بەڵام لە ئەمریکای باکوور بەرەبەرە جڵەوی ئابووریی کەوتە دەست گەنجان و هەنگاو بەهەنگاو ماڵە باوانیان جێدەهێشت. چونکە زەوییەکی زۆریان دەخرایە بەردەست و هەمەچەشنەی پیشەی جیاوازیش بەردەست بوو.[1]

هەر ئەو فرە پیشەیی و کارە زۆرە هۆکار بوو هەتا ئەوانەی لە سیستمی کۆمەڵایەتیدا خزمەتکار بوون، ببنە خاوەنی کار و پیشەی خۆیان و بەرەو سەربەخۆبوون هەنگاو بنێن و سەرمایەیەک بۆ خۆیان پێکەوە بنێن. نموونەی ئەوانەش تۆماس جیفرسۆنی سەرۆکی حکوومەت و بنیامین فرانکلین.

بەم چەشنە جیهان و دنیایەکی نوێ هاتەکایە کە هەر لە شەپۆلی کۆچی یەکەمەوە لە ساڵی (١٦٠٧) ەوە رۆژ دوای رۆژ گەشەی دەسەند هەتا لە ساڵی (١٧٧٦) دا جەنگ هەڵگیرسا. ئەو جیهانە نوێیە کاریگەریی جیهانی هەبوو و گۆڕانکارییەکانی ناو ئەورووپاش رەنگدانەوەیان لەسەری هەبوو. بۆیە ئەو چاکسازییە ئایینیەی لە ئەورووپادا سەریهەڵدا و ئەو شۆڕشە سیاسیانەی لە سەدەی حەڤدەدا روویاندا، بازرگانیی نوێ و ئاکامەکانی دۆزینەوە جوگرافییەکان، هەموو ئەمانە لە ئەورووپا و ئەمریکاش کێشەی زۆریان نایەوە و بەریان پێ نەدەگیرا.

هەروەک قۆناغی جەنگ و پشێوی ئەو بڕوایەی لای ناوچە ئەمریکییەکان دروست کرد بیر لە سەربەخۆبوون بکەنەوە. هەرچەندە بەریتانیا پێشتر لە شوێنە

---

١ - د. رافت غنيمى الشيخ : امريكا و العالم ، ص ٣١ – ٣٣ .

جیاوازەکانـــدا بە زوویـــی زاڵ دەبـــوو بەســـەر کێشـــە و ململانێکانـــدا، بەڵام گۆڕانکارییەکانی ئەمریکا جۆرێکی دیکە بوون و جڵەوی گۆڕانکارییەکان لەدەست بەریتانیـادا نەمـایەوە و ئاڕاسـتەکان بەرەو جەنگـی نێـوان بەریتانیـا و ئەو داگیـرگە ئەمریکییانە چوون.[1]

**هۆکارەکانی هەڵگیرسانی جەنگی سەربەخۆیی:**

چەنـدین هۆکـاری جۆراوجـۆر هەبـوون کە بـوونە مـایەی هەڵگیرسـانی جەنگـی ســـەربەخۆیی و دواجـــار بەرەبەرە دەرچـــوونی دەســـەڵاتی بەریتـــانی و بەدوایـــدا دامەزرانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، لەوانەش:

**یەکەم هۆکارە ئابوورییەکان:**

لەگەڵ زۆربـوونی فشـارە دارایـی و ئابوورییەکـانی سـەر خەڵکـی نـاو داگیـرگە ئەمریکییەکـان، خەڵکـی لەو ناوچـانە زیـاتر بەرەو هەڵـگەڕانەوەو ڕاپەڕیـن دژی بەریتانییەکـان هەنگاویـان دەنـا بەو هیـوایەی گۆڕانکـارییەک لە ژیـانی ئابوورییانـدا دروست ببێت. دەسـەڵاتی بەریتـانیش بەردەوام هەوڵـی پاراسـتنی بەرژەوەندییەکانی دەدا و دژ بە خەڵکەکە هێزی بەکاردەهێنا. بەتایبەت کە خودی حکوومەتی بەریتـانی بەهـۆی ئاکامەکـانی جەنگـی حەوت سـاڵەوە لەنێـو گێـژاوی تەنگژەیەکـی سـەختی ئابووریدا بوو و بە نزیکەی سەد و چل ملیۆن جونەیهی ئەوکات قەرزار بووبوو. بە ناچاری مەرجی لەسـەر داگیرگەکـان دانـا بەشـێک لەو قەرزە لەئەسـتۆ بگرن. جگە لەوەی بـــوونی دە هەزار ســـەربازی بەریتـــانی لە ئەمریکـــادا بـــۆ لێـــدانی هێـــزە فەرەنسییەکان و لەنـاوبردنی هینـدییە سـوورەکان هێنـدەی تـر بـارودۆخەکەی ئـاڵۆز کردبـوو. چـونکە نـزیکەی سـێ سـەد هەزار جـونەیهی ئەوکـات خەرجییـان هەبـوو. ئەمەش چارەسەری پرسەکەی ئاڵۆزتر دەکرد و دەرگای هەڵگیرسانی جەنگی واڵاتر دەکرد.[2]

زیـادبوونی خەرجییەکـانی بەریتانیـا لە داگیرگەکـان و سـەپاندنی بـاجی زۆر و جۆراوجـۆر و نەبـوونی سـەربەخۆیی و نـانەوەی جەنـگ و ئاشـووب لە نـاوچەکەدا،

---

١ – د. صلاح احمد هريدي : دراسات في التاريخ الأمريكي ، ص ٤٩ .

٢ – احمد كمال ابو المجد : التاريخ الدستوري للولايات المتحده الأمريكيه ، عمان ، ١٩٩٨م، ص ٥٨ .

هۆکاربوون بۆ بێزاری خەڵکی ناو داگیرگەکان. بەتایبەت کە دەیانبینی هیچ قسەیان کاری پێناکرێت و لەنێو پەرلەمانی بەریتانیشدا هیچ نوێنەرێکیان نیە و تەنها بڕیاریان بەسەردا دەسەپێنێت لەکاتێکدا بەپێی یاسا تەنها لە کاتێکدا باج دەسەپێنرا کە خەڵکەکە نوێنەریان لە پەرلەماندا هەبێت.

هاوکات یاساکانی باج و گومرگ لەلایەن بەریتانیاوە لایەکی دیکەی کێشەکان بوون. چونکە لەپێناو پاراستنی بازاڕی کاڵا بەریتانییەکان باجی زۆر و سەخت و فرەچەشنە لەسەر کاڵاکانی ناوچە داگیرگە ئەمریکییەکان دانرابوو. ئەمەش هێندەی تر خەڵکی ناوچەکەی بێزار کردبوو.[1] لەوانەش:

یاسای دەریاوانی کە فرۆشی بەشێک لە کاڵاکانی داگیرگەکانی تایبەت کردبوو بە بەریتانیا و بۆیان نەبوو بە شوێنەکانی دیکەی بفرۆشن. بەم چەشنە لە رووی دەریاییەوە ئەو کاڵایانە جووڵەپێکردنیان قەدەغە بوو و دەبوو تەنها بۆ بەریتانیا ببرێن و لەوێوە ببرێن بۆ ناوچەکانی دیکە. ئەوەش بارگرانیی لەسەر جووڵەی بازرگانیی ئەمریکییەکان دروست دەکرد.[2]

یاسای شەکر کە لەساڵی (١٧٦٣) دا لەلایەن پەرلەمانی بەریتانییەوە دەرچوو و تیایدا داگیرگەکان ناچاردەکران لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی بەریتانیا لە هیندستان شەکر بهێنن لەکاتێکدا نەیدەتوانی بڕی پێویست دابین بکات و نرخێکی گران و ئەرکێکی زیاتری هەبوو. لەکاتێکدا پێشتر لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی فەرەنساوە شەکریان دەهێنا و تێچووەکەی کەمتر بوو و رێژەکەشی زیاتر بوو. ناچار خەڵکەکە بە نهێنی ئەو بازرگانییەیان دەکرد و لە بەرامبەردا حکوومەتی بەریتانی دەستی دەگرت بەسەر کەشتییەکاندا. ئەمەش رق و کینە و بەرنگاربوونەوەی نێوان داگیرگەکان و دەسەڵاتی بەریتانیای قۆناغێکی زۆر بردە پێشەوەو هەڵگەڕانەوەکان روویان لە زیادبوون کرد. هاتنی جۆرجی سێیەمیش هێندەی تر بارودۆخەکەی ئاڵۆزتر کرد چونکە باجی زیاتری سەپاند و لە ئاکامدا دابەشبوونی نێوخۆیی لەنێو بەریتانییەکاندا روویدا. بەڵام دواجار ئەو بۆچوونە زاڵ بوو کە پێی وابوو بەریتانیا مافی خۆیەتی لە بەرامبەر پاراستنی داگیرگەکاندا باجی زیاتریان لەسەر فەرز بکات.

---

١ - عوني عبد الرحمن سبعاوي : مێژووی ئەمریکا ، ل ٨٧ .

٢ - الان نفينز و هنري ستيل كوماجر : موجز تاريخ الولايات المتحده الأمريكية ، تر. مصطفى عامر : القاهرة ، ص٦٢ – ٦٣ .

باجی پوول: یەکێکی دیکە بوو لەو باجانەی کە حکوومەتی بەریتانی لەسەر داگیرگەکانی فەرز کرد، ئەویش ئەوەبوو دەبوو داگیرگەکان بۆ هەموو راگەیاندنێکی رۆژنامەیی و کتێب و بەڵگەنامەی یاسایی و مامەڵە و کاروبارێکی بازرگانییان پوولی تایبەت بکرن و داهاتی پوولەکەش هەمووی دەگەڕایەوە بۆ حکوومەتی بەریتانیا. خێرا دەستەیەکی بەرچاوی خەڵک دژی ئەوە گردبوونەوەو هەوڵی رێکاریی یاساییان گرتەبەر بۆ بەرپێگرتنی و ناوی (کوڕانی ئازادی) یان لە خۆیان نا.[1]یاسای داڵدەدان: یەکێکی دیکە بوو لەو یاسایانەی کە بارگرانییەکی زۆریان بۆ خەڵکی داگیرگەکان دروستکردبوو. چونکە بەوپێیە دەبوو خەڵکی ناوچەکە خۆراک و پێویستییەکانی هێزە سەربازییە بەریتانییەکان لە ئەستۆ بگرن. لە ساڵی (١٨٦٥) دا بەرنگاربوونەوەیەکی بەهێز لە داگیرگەکاندا دژ بەم یاسایانە پەیدا بوو بەتایبەت لە ویلایەتی ڤێرجینیا و ئەو بڕیار و یاسایانە بە نایاسایی لەقەڵەم دران و جیمس ئۆتیسی پارێزەر بوویە رێبەری یەکەمی شۆڕشی ئەمریکی دژ بەو یاسایانە و بەدوایدا بایکۆتی کاڵا بەریتانییەکانی لێکەوتەوە. ناچار حکوومەتی بەریتانی پاش سێ ساڵ لە جێبەجێکردنی. بڕیاریدا یاسای پوول هەڵبوەشێنێتەوە.[2]

گۆڕانکارییەکانی وەزارەتیش لە ساڵی (١٧٧٦) دا جارێکی دی بارودۆخەکەیان تێکدا. چونکە سەرلەنوێ مافی سەپاندنی باجیان بە حکوومەتی بەریتانی دا و تیایدا باج لەسەر شمەکەکانی وەک (چای ، کاغەز ، رەساس و شووشە) دانرا. لە بەرامبەردا خەڵکی داگیرگەکان لەنێویشیاندا (سەمویل ئادامز و جۆن دیکنسن) هەڵمەتێکی بەرپەرچدانەوەی باجەکانیان دەستپێکرد و بازرگانانی شاری بۆستنیش بایکۆتی کاڵا بەرتیانییەکانیان دەستپێکرد. بەرامبەر بەمەش حکوومەتی بەریتانی دەستیان دەگرت بەسەر کەشتییە بازرگانییەکاندا. ئەمەش ئاشووبێکی لێکەوتەوە کە دواجار کەشتییەکی بازرگانی سووتا و دواجار گۆڕانکارییەکان رێپێوانیان لێکەوتەوەو لەنێو رێپوانەکانیشدا پێنج هاوڵاتی کوژران. ئەمەش کڵپەی بە راپەڕینی خەڵکەکە دا و کۆبوونەوەیەکی نیشتیمانی سەریهەڵدا. ناچار حکوومەتی بەریتانی ئەو باجانەی لابرد و تەنها باجێکی زۆر کەمی لەسەر چای دانا. بەڵام ئەمریکییەکان بەوەش رازی نەبوون و بۆ ئەوەش بڕیای بایکۆتکردنی چای ناو ناوچە

---

١ - ناهد ابراهيم دسوقي : دراسات في التاريخ الأمريكي ، ص ٥١ – ٥٢ .

٢ - محمد محمود النيرب : تاريخ الولايات المتحده الأميركية ، ج١ ص ٨٦ .

بەریتانییەکان درا و هەوڵ درا لە سەرچاوەی دیکەوە چای بهێنرێت و سێ کەشتی هێنـــرا. بەڵام لەلایەن دەســـەڵاتی بەریتـــانییەوە دەســـتی بەســـەرداگیرا. خێـــرا ئەمریکییەکان خۆیان گەیاندە ناو کەشتییەکان و نزیکەی (٣٤٠) سندووقی چایان لە کەشتییەکانەوە خستە ناو دەریاوە. ئەم هەنگاوە وەک ئاهەنگێک بۆ ئەمریکییەکان تەماشا کرا و بە (ئاهەنگی چای بۆستن) ناوی دەرکرد.[1]

خەڵکی وایانزانی ئەم هەنگاوە حکوومەتی بەریتانیا ناچار دەکات سازش بکاتز کەچـــی حکـــوومەتی بەریتـــانی بڕیـــاری ســـەختتری دەرکـــرد و بڕیاریـــدا هەر هەڵگەڕانەوەیەک رووبدات خێرا سەرکوت بکرێت و بەندەری بۆستنیش بە رووی بازرگانیی جیهانیدا دابخرێت هەتا ئەو کاتەی ئەو چایەی لەناوبراوە بگەڕێنرێتەوە بـۆ حکـوومەتی بەریتـانی. بە دوای ئەوەدا پێـنج یاسـا خۆسـەپێنییەکە دەرچـوون (داخستنی بەندەری بۆستن، داماڵینی حوکمی زاتی لە ماساجوستس، دادگایی کردنی ئەو ئەفســەرە ئینگلیـزانەی لە بەریتانیـا تـاوانی گەورەیـان ئەنجـام داوە. سـەربازە بەریتانییەکـان لە مـاڵی ئەمریکییەکانـدا بمێـننەوە، فراوانکردنـی نـاوچەی کۆبـک بـۆ باشووری رووبـاری ئوهـایۆ و زەوییەکانی لە ماساتشوسـتس و کنتکت و ڤێرجینیا پێوە بلکێنرێـت و پێدانی مـۆڵەتی ئـایینی بە کاسـۆلیکەکان) ئەمـانەش هێنـدەی تـر نـاڕەزایەتی خەڵکیـان لێکەوتەوە بەتـایبەت کە خەڵکی ئەوێ لە سیانزە داگیرگەکەدا پرۆتســتانتی بیۆریتـــانی بـــوون. بـــۆیە ئەمریکییەکـــان ناچـــار بـــوون هەڵمەتـــی بەرنگاربوونەوەی بەریتانییەکان دەست پێ بکەن.[2]

یاسای کوبیک: لە ساڵی (١٧٧٤) دا پەرلەمانی بەریتانیا یاسایەکی دەرکرد کە بە گشتی خەڵکی ئـەمریکا بە خراپترین یاسایان دەبینی. یاساکە تایبەت بوو بەو زەوییە کشـــتوکاڵییانەی کە ئەمریکـــا لە کـــاتی جەنگـــی لەگەڵ فەڕەنســـییەکان لە نـــاوچە ئەمریکییەکانـدا دەسـتی بەسـەردا گرتبـوو و خاوەنـدارێتی و کـڕین و فرۆشـی ئەو زەوییـانە پێویسـتی بە مـۆڵەتی تـایبەت هەبـوو. ئەم یاسـایە وایکـرد ویلایەتـی ماساتشوســـتی وەک حـــامیەیەکی بەریتـــانی بە ســـەرکردایەتی جەنەراڵ کیـــبج دەربکەوێت. هەروەهـا سـنووری بـۆ حکـووتێکی تـایبەت لە نـاوچە فەرەنسـیەکانی کەنەدا دەستنیشـــانکرد و یاســـای مەدەنـــی فەرەنســـي و کڵێســـای کاسـۆلیکی لەو

---

١ - د. طليعه الصياح و راغب العلي : تاريخ الولايات المتحده الأمريكية، ص ٦١ .

٢ - صلاح احمد هريدي : دراسات في التاريخ الأمريكي ، ص ٥٣ .

شوێنەدا هێشتەوە. لە ڕووی جوگرافیشـەوە سنوورێکی بۆ دەستنیشـانکرد. ئەمەش تــوورەییەکی زۆری ئەمریکییەکــانی لــێکەوتەوە چــونکە فراوانخــوازیی لە بەرەی ڕۆژئـاواوە بـۆ ئەمریکییەکـان سـنووردار کـرد و دەوڵەتێکـی فەڕەنسـی خـاوەن مەزهەبــی کاســۆلیکی کـرد بە هاوســنووریان و هیـوا و خولیـای زۆرێــک لە ئەمریکییەکانی لەگۆڕنا.[1]

## دووەم: هۆکاری سیاسی:

هۆکاری سیاسی خۆی لە بیرۆکەکەی جۆرجی سێیەمدا دەبینێتەوە کە مەیلی بە لای دەسـەڵاتی رەهـادا دەڕیشـت و پێـی وابـوو دەبێـت دەوڵەت دەسـەڵاتی رەهـای بەسـەر داگیرگەکانـدا هەبێـت. جـۆرجی سـێیەم لەبەرئەوەی لە هەڕەتـی گەنجیـدا دەسـەڵاتی وەرگرتبـوو، تونـدی و هەڵەشـەییەکی زۆری هەبـوو. بە خەیـاڵی خـۆی مەبەستی بوو نەکەوێتە ژێر هەژموونی پیاوانی حیزبی ویک، بەڵکو هەوڵیدەدا لە ڕێـی پرسـی باجەکـانی سـەر داگیرگەکـانەوە دووبەرەکـی بخـاتە نێـو ریزەکـانی ئەو حیزبەوە. ئەو پرسەش دیارترین بابەتێک بوو کە جۆرجی سێیەم کـاری لەسـەرکرد و کاردانەوەی زۆری لێکەوتەوە.[2]

## سێیەم: هۆکاری دەروونی:

ئەوانەی لە جیهانی نوێی ئەمریکیدا بـوو پێویستیان بە هەندێ دیاردەی سیاسـی و کـۆمەڵایەتی هەبـوو تـاوەکو قەرەبـووی ئەو حاڵەتەیـان بـۆ بکـاتەوە کە ئەوان لەدەست چەوساندنەوەی ئایینی یان هەژاری یان نەبوونی دادپەروەری هەڵهاتبوون. ئەو نەوەی لە سەدەی هەژدەدا دەژیان، جیاواز بوون لەوانەی سـەدەی پێشـوو. ئەم نەوە نـوێیە درکیـان بەوە دەکـرد هیچیـان کەمتـر نـیە لە بەریتانییەکـان و داوای یەکسـانی و بـوونی توانـای خۆبەڕێوەبەرییان دەکرد. بەڵام حکوومەتی بەریتـانی و جـۆرجی سـێیەم هـیچ گرنگییەکیـان بەم لایەنە دەروونیـیە نەدەدا. بـێ ئاگـا لەوەی ئەمـــانەش لە نشـــینگەی خۆیـــانەوە چـــوونەتە ئەوێ و هەڵگـــری سروشـــت و بیرکردنەوەی بەریتانیان و ناکرێت ژێردەستانە مامەڵەیان لەگەڵ بکرێت.

---

١ - الان نفينز : موجز تاريخ الولايات المتحده الأمريكية ، ص ٦٥ .

٢ - العزيز سليمان : تاريخ الولايات المتحده الأميركية الحديث ، ص ٦٢ .

## کۆنگرەکان

**یەکەم: کۆنگرەی یەکەمی فیلادلفیا:**

لە ئاکامی ئەو چەوساندنەوەی لەلایەن تاجی بەریتانییەوە بەرامبەر بە خەڵکی داگیرگەکان ئەنجام دەدرا و هەڵکشانی هەستی ناڕەزایەتی بەرامبەر شوێنکەوتەیی بۆ بەریتانیا و چەند هۆکارێکی دیکەش، پەیوەندی یەکبوون و یەکڕیزی نێوان ویلایەتەکان رووی لە بەهێزبوون بوو و بیریان لە خاڵە هاوبەشەکانی نێوانیان و داهاتوی هاوبەش دەکردەوەو دەیانویست بزانن چۆن پێکەوە بەرامبەر چەوساندنەوەی بەریتانی هەنگاو بنێن. ویلایەتی ماساتشوستسی ئەمریکی داوای کرد لە فیلادلفیا کۆنگرەیەک ببەسترێت و جگە لە جۆرجیا هەموو ویلایەتەکانی تر بەشدارییان کرد و نوێنەری خۆیان نارد و لە مانگی ئەیلوول هەتا مانگی تشرینی دووەی ساڵی ١٧٧٤ کۆنگرە بەسترا و بە کۆنگرێسی یەکەم ناسرا. ئەو کۆنگرەیە دەستەیەکی دەستووری نەبوو و زۆربەی ئەندامەکانی بەبێ مەرج و بنەما و رێکاری یاسایی دەستنیشان کران و دەسەڵاتیشی سنووردار بوو و ڕاو بۆچوون و بڕیارەکانی ملکەچی ویستی گەل بوون. واتە هێزێکی نەبوو هەتا بە زۆر بیسەپێنێت بەسەر گەلدا. کۆمەڵێک کەسایەتی دیار ئەندامی ئەم کۆنگرەیە بوون، لەوانەش جۆن هانکۆک و ساموێل ئەدامز و جۆرج واشنتۆن و باترێک هندی.[1]

کۆنگرەکە ماوەی پەنجا رۆژی خایاند و تیایدا چەند بڕیارێک دران، لەوانەش ناردنی پەیامێک بۆ جۆرجی سێیەمی بەریتانیا و تیایدا سەرکۆنەی ئەو رێکارە توندوتیژیانە بکەن کە بەرامبەریان دەکرێت بە تایبەت لە داگیرگەی ماساتشوستس. تیایدا حەزپێنەبوونی خۆیان بۆ ویستی سەربەخۆیی خستەڕوو. هەروەها بایکۆتی کاڵا بەریتانییەکانیان تێدا باسکرد و چەند لیژنەیەک لە هەر شار و هەرێمێک سەرپەرشتی ئەو بایکۆتە بکەن و لەبارەی ئەوانەشەوە هەواڵ بدەن کە ئامادەی بایکۆت نین هەتا کۆنگرەکە بزانێت دۆست و دوژمنی ئەمریکا کێن. پێشنیاری پێکهێنانی حکوومەتێکی کاتی لە هەرێمی ماساتشوستس یەکێکی تر بوو لە بڕیارەکانی کۆنگرەکە هەتا بەرەو رووی رێکارە توندوتیژییەکانی بەریتانیان بوەستێتەوە.[2]

---

١ - عبد الفتاح حسن ابو عليه : تاريخ الأمريكيتين و التكوين السياسي ، ص ٥٣ .

٢ - فرحات زياده و ابراهيم فريجي : تاريخ الشعب الأمريكي ، ص ٥١ .

**کۆنگرەی دووەمی فیلادلفیا**

لە دەی ئایاری ١٧٧٥ دا کۆنگرەی دووەم بەسترا و بەستنی ئەم کۆنگرەیە و ئەو پەیامەی بۆ جۆرجی سێیەم نێردرا بوونە هۆکاری تێکچوونی بارودۆخەکە و هەڵگیرسانی جەنگ لەنێوان سیانزە داگیرگەکە و بەریتانیا لە کاتی بەستنی کۆنگرەکەدا و تیایدا راگەیەنرا کۆنگرێس لەسەریەتی سەرپەرشتی ئەو جەنگە بکات و دەسەڵاتی داگیرگەکانیش بگرێتەدەست. لەوێ بریارێکی یەکلاکەرەوە نەدرا سەبارەت بە جیابوونەوە لە بەریتانیا و راگەیاندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆ. چونکە لەنێو کۆنگرەکەدا ئەندامانێک هەبوون پشتیوانی مانەوەی دەسەڵاتی بەریتانییان دەکرد. بەڵکو تەنها هێندە بوو داواکارییەکیان نووسی بۆ جۆرجی سێیەم و تیایدا هۆکارەکانی جەنگەکەیان خستەڕوو و نیازی مانەوەیان لەگەڵ بەریتانیا بۆ باسکردبوو. بەڵام جۆرجی سێیەم زۆر بە توندی وەڵامی دانەوەو وەک یاخی ناوزەدی کردن و بریاریدا هێزی بەکرێگیراوی ئەڵمانی و هێزی دیکەش بەکاربهێنێت بۆ لێدان و لەناوبردنیان.[١]

دواتر تۆماس پین لە کتێبەکەیدا (حسن الادراک) لە پەنجا لاپەڕەدا پێویستی بەدەستهێنانی سەربەخۆیی خستەڕوو و هێرشی توندی کردە سەر جۆرجی سێیەم و باسی لەوە ئەکرد بوونی کەسێکی دەستپاک بۆ ئەمریکییەکان زۆر باشترە لەو هەموو چەپەڵ و نامەردانەی دەستیان بەسەر زەویدا گرتووە. خەڵکی قەناعەت پێکرد بتوانن جیاکاری بکەن لەنێوان مانەوە لە سایەی دەسەڵاتێکی ستەمکار و حکوومەتێکی لاواز و نێوان ئازادی و کامەرانی لە سایەی کۆمارێکی سەربەخۆدا کە پشت بە خۆی ببەستێت.[٢]

جۆرج واشنتۆنیش کە سەرکردایەتی سوپای لە بۆستن گرتەدەست، راشکاوانە بیرۆکەی سەربەخۆیی بە ترسناک لەقەڵەم دەدا چونکە تەنها ئەندامانێکی کەمی نێو کۆنگرێس داوای ئەوەیان دەکرد،

ژمارەیەکی زۆر لە هاولاتیانی بەریتانیا لە پشت جەنگی ئەمریکییەوە بوون و خەون و هیوایان سەربەخۆیی ئەمریکا بوو. هەرچەندە نەیاندەزانی سەرەنجامی جووڵە و هەوڵەکانیان بە چی دەگات. بۆیە پاڵنەری بەهێز بوون بۆ ئەنجومەنی

---

١ - عبد العزيز سليمان و عبد المجيد نعنعي : تاريخ الولايات المتحده ، ص ٧٢ .

٢ - وزاره الخارجيه الأمريكية ، موجز التاريخ الأمريكي ، ص ٣٢ .

پاسادانان هەتا هەنگاوی کردەیی لە جەنگدا بگرنەبەر. هاوکات ئیشیان لەسەر ئەوە دەکرد هەستی هاولاتیی بوونی بەریتانی لە ناخی خەڵکدا نەهێڵن.[1]

**بەڵێننامەی راگەیاندنی سەربەخۆیی و بنەماکانی دیموکراتی:**

زۆربەی مێژوونووسان پێیان وایە بەڵێننامەی راگەیاندنی سەربەخۆیی ئەمریکا یەکێکە لە گرنگترین بەڵننامە مێژووییە سیاسیەکانی سەدەی دوانزەی ئەورووپا چونکە لەوێوە بە ناوی گەلەوە بڕیاری سەربەخۆییان دا و بە مافێکی رەوای خۆیان زانی ئازاد بن لە هەر پاشکۆییەکی تاجی بەریتانی و هەر لێکەوتەیەکی دیکەی سیاسی دەرەکیی و ئەو ناوچە ئەمریکیانە دەسەلاتی تەواوەتییان هەبێت لە راگەیاندنی جەنگ و بەستنی گرێبەست و رێککەوتن و کاروباری بازرگانی.[2]

پەیامەکەی تۆماس جیفرسۆن کە رەشنووسێک بوو و هەوڵیدا رای بەشێکی فەیلەسووفە ئەورووپیەکانی وەک جۆن لوکی بۆ کۆبکاتەوە، هەوڵی سەرەتایەکی نووسینەوەوە دارشتنەوەی بنەماکانی مافی مرۆڤ بوون و پێی وابوو هەر دەبێت گەلێک ئەو دەستپێشخەرییە بکات و هیوای وابوو ئەمەی ئەو یەکەم هەنگاوی دانانی بناغەی دارشتنەوەی بنەماکانی مافی مرۆڤ بێت لە سەرانسەری جیهاندا.

پەیامەکەی جیفرسۆن ئەوەبوو (گەل خۆی حکوومەتی پێکهێناوە بۆ ئەوەی لەلایەن ئەو حکوومەتەوە کاری چاکە و خزمەت ببینێت نەوەک خراپە و چەوساندنەوەو خۆسەپاندن، هەرکات حکوومەت نەتوانێت ئەم مەبەستە بهێنێتەدی، مافی هاولاتیانە خەمی ئەمرۆ و داهاتوویان بخۆن و ئەو حکوومەتە لابدەن).[3]

دیارترین ئەو هۆکارانەی کە جیفرسۆن بۆ راگەیاندنی سەربەخۆیی خستبوونیەروو بریتی بوون لە:

١. جۆرجی سێیەم رەزامەند نەبوو ئەو یاسایانە پەسەند بکات کە لە بەرژەوەندیی گشتی دانشتوانی داگیرگەکاندا بوون.

---

١ – فرنسيس فريدمان : موجز التاريخ الأمريكي ، ص ٤٨ .

٢ – ديب علي حسن : الولايات المتحدة الأمريكية ، ص ١٢٩ .

٣ – فریشتە نورئی : مێژووی گورانکاری کومەلایەتی و سیاسی ئەمریکا ، ل ٤٥ .

٢. گۆڕینی شوێنی دەستەکانی یاسادانان لە داگیرگەکاندا و دەرفەتیان پێ نەدەدرا لە شوێنە فەرمییەکاندا کۆببنەوە بەو مەبەستەی دەستی پادشا هەمیشە زاڵ بێت بەسەریاندا.

٣. چەندین جار هەڵوەشاندنەوەی ئەنجومەنە نوێنەرایەتییەکان بە هۆی ئەوەی لەگەڵ سیاسەتی دوژمنکارانەی بەریتانیادا بەرامبەر بە مافی خەڵکی داگیرگەکان تەبا نەبوون، هاوکات ڕێگریش دەکرا لە ئەنجامدانی هەڵبژاردن بۆ دامەزراندنی ئەنجومەنی نوێ.

٤. دانانی لەمپەر لەبەردەم ڕێکردەی دادپەروەریدا لە ڕێگەی ڕێگریکردن لە پەسەندکردنی یاساکانی تایبەت بە دانان بە دەسەڵاتە دادوەرییەکاندا. بەڵکو ئەو دادوەرانە دادەنران کە ملکەچییان بۆ ویستی پادشا دەبوو.

٥. لە کاتی ئاشتیدا سەربازگە بەریتانییەکان لە داگیرگەکاندا جێگیر دەکران بەبێ ئەوەی دەستەکانی یاسادانان بەوە رازی بن، بەڵکو دەسەڵاتی سەربازی زاڵکرابوو بەسەر دەسەڵاتی مەدەنیدا و چەندین یەکەی گومرگیی دامەزرێنرا.[1]

٦. دەستتێکەڵکردنی جۆرجی سێیەم و حکوومەت بۆ ملکەچکردنی گەلی نێو داگیرگەکان بۆ چەند یاسایەکی نامۆ و خۆسەپێن. لەنێویشیاندا ژمارەیەکی زۆری سەربازان بە چەکەوە برانە نێو ماڵی خەڵکەوەو لەوێ دەمانەوە. بە کۆمەڵێک یاسا و بڕیاریش پارێزگاریان لێدەکرا.

٧. ئەو دیلانەی خەڵکی نێو داگیرگەکان بوون لەلایەن حکوومەتی بەریتانییەوە ناچار دەکران دژ بە هاوڵاتیان و وڵاتی خۆیان چەک هەڵبگرن و کوشتاریان بکەن.

٨. هەوڵدان بۆ نانەوەی کێشە و ئاژاوەی نێوخۆیی و گوێنەدان بە خواست و داواکارییەکانی خەڵک لە ئاست وەستاندنی هەر هەڵێکی ئاژاوەگێڕیدا. بەڵکو بە پێچەوانەوە پادشا بڕیاری سەختتری لەو بارەوە لە دژی هاوڵاتیانی داگیرگەکان دەردەکرد.

٩. چەندین جار بیریاران و کەسە گەورەکانی داگیرگەکان هۆشیارییان بە گەلی بەریتانی دا کە دەستەی یاسادانانی پەلەمانی بەریتانی چ ستەمێک دەکات و

---

١ - صلاح احمد هريدي : دراسات في التاريخ الأمريكي ، ص ٧٦ .

چۆن کێشەی بۆ داگیرگەکان دروستکردووە. بەڵام گوێ لەو پەیمانانە نەگیرا و هەڵوێستێکی ئەرێنی لەو بارەوە نەبینرا.[1]

وێڕای ئەو ڕاگەیاندنەش، هێشتا ئەمریکا بە تەواوەتی سەربەخۆیی وەرنەگرت و لە بەریتانیا جیانەبوویەوە. بەڵکو سەرکەوتنی ڕاپەڕینی ئەمریکی توانیی سەربەخۆیی تەواوەتی بهێنێتە دی. ئیدی لەوێوە لەسەر هەردوو ئاستی ناوخۆیی و دەرەکیش ئەمریکا سەربەخۆیی وەرگرت و دابەش بوو بەسەر چەند ویلایەتێکدا و هەرکام لەو ویلایەتانە دەستوور و دەسەڵاتی سەربەخۆیان هەبوو و سەربەخۆیی خاکی هەر ویلایەتێک لە ئاست ویلایەتێکی دیکەشدا پارێزراو بوو. دادوەری و بەرپرسی ویلایەتەکانیش بە هەڵبژاردنێکی گشتی جەماوەریی دەستنیشان دەکران.

**ڕوودانی جەنگ و بەدیهاتنی سەربەخۆیی:**

پاش ئەوەی پەیوەندیی نێوان ئەمریکا و بەریتانیاوە پچڕا و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دامەزرا، ڕووبەڕووی بارودۆخێکی زۆر سەخت بوویەوەو لەپێناو مانەوەدا پێویستی بە خەبات و خۆڕاگرییەکی زۆر هەبوو. بەهرە و لێهاتوویی جۆرج واشنتۆنتیش بەس نەبوو بۆ ئەو بارودۆخە. سەرەتا جۆرج واشنتۆن هەوڵیدا جەنەڕال (هاو) بە پانزە هەزار سەربازەوە لە بۆستن وەدەربنت، بەڵام بەریەککەوتنی نێوان دوو سوپاکە لە نیۆیۆرکدا بوو. دواجار جۆرج واشنتۆن لەبەردەم هێزە بەریتانی و ئەڵمانییەکان و یەکەکانی بەدەمەوەچوونی ئەو دوو هێزەدا شکا و بەرەو نیوجرسی پاشەکشەی کرد. کەمی ئازووقە و نەمانی ورەی سەربازان هۆکار بوون بۆ شکستی.[2]

ئەگەرچی لە سەرەتادا شکا، بەڵام دواتر (جۆرج واشنتۆن) لە شەوی جەژنی مەسیح لە ساڵی (١٧٧٦) دا ئەو هێزانە لە بەرامبەر جۆرج واشنتۆن و جەماوەردا. جەنگ لە ساڵی دواتریشدا بەردەوام بوو و هێزەکانی جەنەڕال (هاو) لە ڕێی دەریاوە لە نیۆیۆرکەوە بەرەو فیلادلفیا ڕۆیشتن و پایتەختی ئەمریکایان داگیرکرد. بەڵام بەهۆی وەستاندنی پێشڕەوییەکانیەوە، ئەگەری سەرکەوتنی یەکجارەکی لەدەستدا.[3]

---

١ - الان نفینز و: موجز تاریخ الولایات المتحده ، ص ٨٣ .

٢ - اسماعیل احمد یاغي : معالم التاریخ الأمریکي الحدیث ، ص ٨٧ .

٣- میلتون میلتز : معالم الحریه ، تر . احمد عزت طه ، دار الیقظه ، دمشق ، ١٩٦١ ، ص ١١١ .

له ساڵی (١٧٧٧) و له مانگی تشرینی یەکەمدا جەنگی ساراتۆگا له رۆژهەڵاتی نیۆیۆکەوه روویدا و بوو به خاڵی وەرچەرخان. چونکه بەریتانییەکان تووشی شکستێکی سەخت بوون و سەرکردەکەیان به بیست هەزار سەربازەوه خۆی به دەستەوه دا و رێککەوتنی نساراتۆگای ئیمزا کرد که تیایدا کشانەوەی هێزەکانی بەریتانیای له رێی بۆستنەوه له خۆگرتبوو بەو مەرجەی جارێکی دی ئەو هێزانه بەشداری جەنگی دژ به ئەمریکا نەکەن. ئەوەش یەکەم سەرکەوتنی یەکلاکەرەوه بوو بۆ ئەمریکیەکان.[1]

له سەرەتای ساڵی دواتردا حکوومەتی بەریتانی پێشنیاری بۆ ئەمریکییەکان کرد واز له سەربەخۆبوون بهێنن له بەرامبەردا هەموو داواکانیان پەسەند دەکرێن که پەیوەست بوون به نەهێشتنی باج و گومرگ و یاسا قورسەکان و لێخۆشبوون له هەموو بەشداربوانی جەنگ. بەڵام ۆنگرێسی ئەمریکی رازی نەبوو. بەوەش جارێکی دی جەنگی سەخت دەستپێکردەوه.

شارەزایی وردی شوێنی جوگرافی ناوچەکه و ورەی بەرزی سەربازان و پشتیوانی گەل، هۆکار بوون بۆ سەرکەوتنه بەردەوامەکانی ئەمریکییەکان. هاوکات ئەو سەرکەوتنانه هۆکار بوون هەتا دەوڵەتانی دیکەی دژ به بەریتانیا بچنه نێو جەنگەکەوەو لایەنی ئەمریکییەکان بگرن.[2]

### هەڵوێستی وڵاتانی رۆژئاوا له بەرامبەر جەنگی سەربەخۆییدا

سەرکەوتنی یەکلاکەرەوەی ئەمریکیەکان بەرامبەر به بەریتانییەکان تا ئاستێکی زۆر پەیوەست بوو به پشتیوانی و بڕیاری بەشداریکردنی وڵاتانی دیکەی ئەورووپا له جەنگەکەدا که ئایا دەبنه پشتیوانی ئەمریکیەکان و دژایەتی بەریتانیا دەکەن یان نا.

دوژمنایەتی قووڵی نێوان بەریتانیا و فەڕەنسا لەو کاتەدا دەرفەتێکی باش بوو بۆ ئەمریکیەکان، چونکه ئەوان له کیشوەرەکانی ئەمریکا و ئاسیا و ئەورووپاشدا له جەنگی دژ به یەکتریدا بوون.

---

١ – كلود جوليان : الامبراطورية الأمريكية ، دار الحقية ، ط١ ، بيروت ، ١٩٧٠ ، ص ١٣١ .

٢ – تشارلز وماري بيرد : تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية ، ج١ ص ١٢٥ .

به پێی ڕێککەوتنی پاریس لە ساڵی (١٧٦٣) فەڕەنسیەکان لە باکووری ئەمریکای باکوور کشانەوەو بەوەش جەنگی حەوت ساڵە کۆتایی هات و تەنها بەریتانیەکان مانەوە. ئەمەش ڕقی خەڵکی ناوچەکەی بەرامبەر بە بەریتانیەکان زیاتر کرد.[١]

یارمەتییەکانی فەرەنسا بۆ گەلی ئەمریکی لەهەتا ساڵی (١٧٧٧) سنووردار و شاراوە بوون. چونکە فەرەنسا نەیدەویست ڕاستەوخۆ دژایەتی بەریتانیا لەو ناوچەدا بکات. تەنها کاتێک ئەو ویستەی دەبوو کە دڵنیا بوایە لە شکستی بەریتانییەکان. بەڵام دوای سەرکەوتنی ئەمریکیەکان لە جەنگی ساراتۆگا ئەندامێکی کۆنگرێسی ئەمریکی گەشتی بۆ فەرەنسا کرد هەتا بتوانێت حکومەتی ئەوێ ڕازی بکات پشتیوانیان بێت بۆ شکست پێهێنانی بەریتانییەکاندا.

زۆری نەخایاند ئەو هەواڵانە گەیشتنە بەریتانیا و خێرا حکومەتی بەریتانی هەوڵیدا بە هەر مەرج و شێوازێک بێت لەگەڵ حکومەتی نیشتمانی ئەمریکیدا ڕێکبکەوێت بەو مەرجەی لە بازنەی ئیمپراتۆریەتی بەریتانیدا بمێنێتەوە. بەڵام هەوڵ و ویستەکەی هیچ بەدەمەوەچوونێکی ئەمریکیەکانی لەگەڵ نەبوو. چونکە فەڕەنسا بە ڕەسمی دانی نابوو بە سەربەخۆیی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا و لە شەی شوباتی (١٧٧٨) دا هاوپەیمانێتیەکی جەنگی لەگەڵدا بەست بە چەشنێک چەک و سەرمایە و هێزی سەربازیش پێشکەش بە ئەمریکیەکان بکات. هەروەها هەردوولا بەڵێنیاندا هەتا بە ڕێککەوتنی هەردوولا نەبێت جەنگ نەوەستێنرێت.[٢]

ئەمجار فەڕەنسا بە هەموو توانایەوە چوویە نێو جەنگی دژ بە بەریتانیەکان. بەدوای ئەویشدا ئیسپانیا ئەو هەنگاوەی نا. چونکە ئەویش بەرامبەر بە بەریتانیا داخی لەدڵ بوو و بۆ دەرفەتێک دەگەڕا هەتا شکستێک تووشی بەریتانیا بکات. هۆکارەکەشی ئەوەبوو پاش ڕێککەوتنی جەنگی حەوت ساڵە بەریتانیا زۆر مافی دەریایی و بازرگانی ئیسپانییەکان زەوت کردبوو. زۆری نەخایاند هۆڵەنداش چوویە پاڵیان. بەو چەشنە وێڕای بەرەی ئەمریکی، بەرەیەکی فراوانی ئەورووپی دژ بە بەریتانییەکان لە پرسی ئەمریکادا دژ بە ویست و مانەوەی بەریتانییەکان دروست بوو.[٣]

---

١ - عبد العزيز و نعنعي : المصدر السابق ، ص ٨٣ .

٢ - اسماعيل احمد ياغي : معالم التاريخ الأمريكي ، ص ٨٧ .

٣ - رافت غنيمي الشيخ : امريكا و العالم ، ص ٤٥ .

هاوکات کۆمەڵێک وڵاتی دیکەی وەک (روسیا، پرووسیا، دانیمارک، سوید، پورتوگال، صقلیەو ئیمپراتۆریەتی پیرۆزی رۆمانی) لەنێوان خۆیاندا هاوپەیمانییەکی (بێلایەنبوونی چەکداری) یان بەست بۆ پاراستنی مافە بازرگانییەکانیان لەئاست دەرستوەردانی بەریتانیادا. بەو چەشنە زۆربەی وڵاتانی ئەورووپا دژ بە ویست و بەرژەوەندیەکانی بەریتانیا هەنگاویان نا. وێڕای ئەوەی ئێرلەنداش لە ناوخۆوە هەڕەشی راپەڕین و هەنگاو بەرەو سەربەخۆیی لێدەکرد. هەموو ئەمانە پێکەوە بوونە هۆی شکستی سەختی بەریتانیا لە ئەمریکادا.[1]

یارمەتی فەڕەنسی بۆ ئەمریکییەکان بەردەوام بوو، هاوکات هەردوو هێزی ئیسپانی و فەرەنسی پێکەوە لە هەموو ناوچەیەکەوە هێرشیان دەبردە سەر هێزە بەریتانییەکان. تەنانەت لە ساڵی ١٧٧٩ دا هێرشیان کردە سەر کەشتیگەلێکی بەریتانیا کە نزیکەی شەست و شەش کەشتی لەخۆدەگرت و زیاد لە شەست هەزار سەربازی بەریتانیای لەخۆدەگرت. بەڵام دواجار هێرشەکە سەرکەوتوو نەبوو.

لە ساڵی (١٧٨٠) دا هێزە بەریتانییەکان هێرشێکیان بردە سەر هێزە ئەمریکییەکان و گەمارۆیەکی سەختیان لەسەر دانان کە لە ئاکامدا جەنەراڵ (بنیامین لنکۆڵن) ناچار بوو تشاراستون بدات بەدەستەوە و نزیکەی پێنج هەزار سەربازیش خۆیان بدەن بەدەستەوە. بەڵام هێزە ئەمریکیەکانی دیکە بەرگریەکی سەختیان گرت و نەیانهێشت سەرکەوتنەکانی بەریتانیا درێژە بکێشن.[2]

هەندێ جار ناپاکی ناوخۆیی لەنێو ئەمریکیەکاندا سەریهەڵدەدا، نموونەی ئەوەش ناپاکیەکەی جەنەڕال (بندیکت ئارنۆڵد) کە لەپای وەرنەگرتنی پۆستی باڵاتر، لەگەڵ بەریتانیەکاندا دەستی تێکەڵکرد، بەڵام خێرا پیلانەکانی ئاشکرا بوون و بە ناچاری هەڵهات و وەک سەرکردەیەک لەنێو سوپای بەریتانیدا دژ بە ئەمریکیەکان بەشداری جەنگی کرد.کۆتا شکستی سەختی بەریتانیەکان ئەوکات بوو کە سەرکردەیەکیان لە شاری یورکتون پاشەکشەی کرد. هۆکارەکەشی هێرشی جۆرج واشنتۆن بوو کە بە سوپایەکی تێکەڵی ئەمریکی و فەڕەنسیەکانەوە بە نزیکەی شانزە هەزار جەنگاوەرەوە هێرشی بردە سەری. ناچار لە تشرینی یەکەمی ساڵی (١٧٨١) دا

---

١ - تشارلز و ماري بيرد : س – پ ، ج ١ ص ١٢٦ .

٢ - صالح زهر الدين : موسوعه الامبراطورية الأمريكية ، ص ١١٨ .

سەرکردە بەریتانیەکە خۆی دا بەدەستەوە. هاوکات نزیکەی حەوت هەزار سەربازی بەریتانی بەدیل گیران.[1]

## دانووستان و ڕێککەوتننامەی پاریسی ١٧٨٣:

لە ساڵی (١٧٨٢) بەدواوە و پاش کۆتایی چالاکیە سەربازییەکان، چالاکی دیبلۆماسی دەستییێکرد بەو هیوایەی ڕێککەوتنی ئاشتی ئەنجام بدرێت.ئەمەش پێویستی بە بەهرە و لێهاتوویی هەریەک لە جۆن ئادەمز و جۆی جی و فرانکلین بوو. پێشتر مەرجی هاوپەیمانی نێوان فەڕەنسا و بەریتانیا ئەوەبوو هیچکامیان سەربەخۆ ڕێککەوتنی ئاشتی نەبەستێت. لە کاتێکدا هەریەک لە بەریتانیا و ئەمریکا ئامادەییان هەبوو ڕێککەوتنی ئاشتی ببەستن. بەڵام فەڕەنسا و ئیسپانیا لە هەردوو بەرەی وشکانی و جەنگیشەوە لە جەنگی بەردەوامدا بوون دژ بە ئەمریکا.

لە ساڵی (١٧٨٢) ەوە بە ڕونی مەرامی فەڕەنسا دەرکەوت کە هێندەی بیری لای بەرژەوەندییەکانی خۆی و ئیسپانیای هاوپەیمانیەتی، هێندە بیری لای بەرژەوەندیەکانی ئەمریکییەکان نیە.[2]

لە دوای مانگی ئازاری هەمان ساڵەوە وەفدی ئەمریکی و بەریتانی بە نهێنی دەستیان بە دانووستان کرد و لەسەر سنوورەکانیش ڕێککەوتن بەو چەشنەی سنووری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە کەناراوی زەریای ئەتڵەسیەوە هەتا ڕووباری مسیسپی و لە دەریاچە گەورەکانی باکوورەوە هەتا فلۆریدا لە باشووە لەخۆبگرێت.

فەڕەنسیەکان بەو ڕێککەوتنە نیگەران بوون و بە شکاندنی ڕێککەوتنی ئەمریکی فەڕەنسییان لەقەڵەمدا و لە جەنگی دژ بە بەریتانیەکاندا نەوەستان و دانیان نەنا بەو ڕێککەوتنەی ئەمریکا و بەریتانیادا هەتا دواجار بەریتانیا توانی لە چەند هەڵمەتێکدا سەرکەوتنی گەورە بەسەر فەڕەنسی و هۆڵەندی و ئیسپانی و هێزە ئەوروپیەکانی دیکەدا بەدەست بهێنێت. ئەمەش دیدی فەڕەنسییەکانی گۆڕی و بە ناچاری بیریان لە ئاگربەست کردەوە و لە سێی ئەیلوولی (١٧٨٣) دا لە پاریس ڕێککەوتننامەیەک

---

١ - ديب علي حسن : س – پ ، ل ١٣١ .

٢ - الان نفينز و : س – پ ، ل ٨٧ .

بەسترا و تیایدا ئەمریکییەکان زۆر لەوە زیاتریان دەستکەوت کە خۆیان چاوەڕێی بوون. فەرەنساش ناوچەی سەنگال و دوورگەی توباکۆی بۆ گەڕایەوە کە لە جەنگی حەوت ساڵەدا لەدەستی دابوو ن. ئیسپانیاش دوو دورگەی دەستکەوت. هۆڵەنداش بە تەنیا و بە جیا لە ساڵی (١٧٨٤) دا لەگەڵ بەریتانیادا ڕێککەوتننامەیەکی بەست.[١]

گرفتی دواتری ئەمریکیەکان خۆگونجاندن بوو لەگەڵ هێزە بیانییەکانی دەوریان، لەلایەکەوە بەریتانیەکان لە دوورگەکانی هیندی ڕۆژئاواوە بازاڕیان بە ڕوی کالا و کەشتیە ئەمریکیەکاندا داخست. ئیسپانیاش هەمان هەنگاوی نا. فەرەنساش کۆمەڵێک مەرجی قورسی لەسەر بازرگانی ئەمریکی دانا. بەلام ئەوەی خاڵی بەهێزی هەمیشە سەرکەوتنی ئەمریکییەکان بوو، یەکبوونی ویلایەتەکان بوو دژ بە مەترسی و هەڕەشەکانی دەرەوە.

---

١ - صلاح احمد هريدي : س- پ ، ل ٨١ .

## (بارودۆخی ئەمریكا پێش دانانی دەستوور)

باوردۆخی سوپای ئەمریكی لە كاتی شۆڕشەكەدا خراپ بوو، لەبەر ئەوەی ویلایەتەكان ژمارەیەكی پێویست سەربازی پێشكەش بە وڵات نەكرد، بڕی ئەو پارەیە دابین نەدەكرا كە پێویست بوو بۆ شەڕەكان، تەنانەت جل و بەرگی سەربازەكان لە ڕادەبەردەر كۆن و خراپ بوو خۆراكیان كەم و بێ بەها بوو، لەبەر ئەمانە كۆنگرێس دەسەڵاتی ئەوەی نەبوو خۆی لەم باوردۆخە دەرباز بكات.[1]

كۆنگرێس پێكهاتبوو لە كۆمەڵێ نێردراوی داگیرگەكان، كاروباری ئەوان تایبەت كرا لە بەڕێوەبردنی جەنگەكان وبانگهێشت كردنی ویلایەتەكان بۆ پێشكەش كردنی ئەو ئەركانەی لەسەریان بوو، وەك چاودێری كردنی شەڕەكان و پێشنیاركردنی هەندێ پلانی جەنگ، تا یەكی ئازاری ساڵی (١٧٨١)، كۆنگرێس هیچ پلەیەكی ڕەسمی بەدەست نەهێنا، دواتر بەپێی بەندەكانی ئیئتیلاف دەسەڵاتی كۆنگرێس گۆڕدرا بۆ حكومەتێ كە دەسەڵاتێكی دیاریكراوی هەبوو، دیارە ئەمەش ڕووی نەدا تا هەندێ لە بیرمەندەكان هەستیان بەوە كرد كە پێویستە هەندێ دەسەڵاتی یاسا ببەخشرێتە حكومەتی مەركەزی تا بتوانێ بە وردی و سەركەوتوویی چاودێری جەنگ بكات، لە (٧)ی حوزەیرانی (١٧٧٦) كۆنگرێس بڕیاریدا لەسەر ئەم بنەمایە و لیژنەیەكیان پێكهێنا بە سەرۆكایەتی (جان ریكنسون) هەرچەندە ئەو سەرقاڵی كاروباری جەنگەكان بوو، پلانەكە گرنگیەكی ئەوتۆی پێ نەدرا ئەگەر چی ئەندامەكان ناو بەناو دەستی دەستیان پێ دەكرد، بەڵام دوای خۆ بەدەستەوەدانی ژەنەڕاڵ (برغوین) و پیاوەكانی حەماسەتی گەلی ئەمریكی گەشتە سنورێكی یەكجار بەرز،[2] لەوكاتەدا لە تشرینی دووەمی (١٧٧٧) كۆنگرێس ئەمەی بە هەل زانی و دوای ئەوەی هەندێ ڕاستكردنەوەی لە دەستوری پێشوودا كرد هەندێ پێشنیاری خستە بەردەم دەسەڵاتی ویلایەتە جیاجیاكان، لەو كاتەشدا كێشەی زەویەكانی ڕۆژئاوا دەركەوت، كاتێ (ماریڵند) پێویستی بە پڕوپاگەندەی فرجینای پاشایەتی بوو لەسەر هەندێ زەوی كە سوور بوو لەسەر ئەوەی دەبێت هەموو ویلایەتەكان لە موڵكایەتی هاوبەش بن، ویلایەتەكان ڕەتیان كردەوە ڕازی بن لەسەر ئیئتلاف، چونكە زەوی و زارەكان نەكەوتنە دەستی حكومەتی ئیئتلاف، بەڵام ماریلند سەركەوتنی بەدەست

---

١ - فرحات زيادة و ابراهيم فريجي: تاريخ الشعب الأمريكي،ص ٦٣.

٢ - د. طليعة الصياح و راغب العلي: تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية، ص ٧٩.

هێنا بەسەر هەندی ویلایەتدا کە بۆیان نەبوو داوای ئەو زەویانە بکەن، لە دوایدا ئەمەی بۆ چووە سەر و ئەوان بەو مادانە ڕازی بوون و لە ساڵی (١٧٨١) ڕەزامەندی لەسەر ئیئتلاف دەربڕا لەبەر ئەوە مادەکانی ئیئتلاف ڕێگەی بە کۆنگرێسدا بەبێ ئەوەی جیاوازی بکات لە نێوان هێزی جێ بەجێ کردن و دەستور و یاسادا.[1]

هەروەها سەرپشکردنی (کۆنگرێس) تا پەیڕەوی ئەم شێوازی دەسەڵاتە بکات یان لە ڕێگەی چەند لیژنە و فەرمانبەرێکەوە کە دایناون، بڕیاریدا ڕێکەوتن لە نێوان ویلایەتەکاندا ڕێکەوتنێکی ئیئتلافی بێت و بتوانێ بە گوێرەی توانای خۆی لەڕووی (سەربەخۆی و دەسەلات و ئازادی)یەوە پارێزگاری بکات لە هەموو ویلایەتەکان و هەموو دەسەڵاتێکیش بپارێزێت کە بە ئاشکرا ڕێگەی نەدابێت بە ویلایەتە یەکگرتووەکان لە کۆنگرێسدا کۆببنەوە و هێزی ئەو مادانە درێژبوونەوەی ئەنجومەنی یاسادانانە، لەبەرئەوە کۆنگرێس بەرپرسە لە بەرامبەریان نەک گەل، هەروەک چۆن دەسەڵاتێکی ڕاستەوخۆی نیە بەسەریدا، هەموو ویلایەتێک ژمارەیەکی یەکسان نوێنەری هەبوو، هاوڕێیەتی نێردراوی ئەو ویلایەتانەیان دەکرد و هەموو نێردراوێک دەنگێکی هەبوو لە گشت کێشەیەکدا، مەسەلە گرنگەکان (٢\٣)ی دەنگەکانی لەسەر بوو واتە ڕێک کەوتنی (٩) ویلایەتیان لە کۆی هەر (١٣) ویلایەتەکە،[2] بەڵام ڕێکخستنەوەی مادەکان پێویستی کرد هەر ویلایەتێک ڕێکبکەوێت بەپێی بڕیارێک کە ئەنجومەنی یاسادانان دەری دەکات، پێویستە لەسەر هەر ویلایەتێک شوێنکەوتووی هەڵسوکەوتی ویلایەتەکانی تربێت بۆ ئەوەی ببێت بە پلانێک بۆ بەهێزکردنی پەیوەندی ڕێکەوتنەکەیان و نەهێلانی کەنارگیری و دوورکەوتنەوە و سەربەخۆیی لە بەڕێوەبردنی ویلایەتەکانی تردا، بۆ چارەسەرکردنی کێشە و ئاڵۆزییەکانی سنوری خۆیان و لەگەڵ پێدان و وەرگرتنی ئازادی جیاواز، ئەو دەسەڵاتە (کۆنگرێس)، ڕێگەپێدرا بوو شمولی ئەو ڕەنگە هاوبەشەی دەکرد کە لە نێوان ویلایەتەکاندا هەبوو، وەک بڕیاردانی جەنگ و ئاشتی و چارەسەرکردنی سیاسەتی دەرەکی و دانانی بنەمایەکی گشتی بۆ ڕەخنە و کێشانە و پێوانە و بەڕێوەبردنی کاروباری هندیە نیشتەجێ بووەکانی دەرەوەی

١ - اسماعيل احمد ياغي: معالم التاريخ الأمريكي الحديث،ص ٩٠.

٢ - فرانک اشر: س- پ، ل ٦٠-٦١.

ویلایەتەکان، بەڵام ئەم خراپی چارەنووسە ڕێگەی نەدا باج بسەپێنرێت بەسەر گەلدا بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ، لەبەرئەوەی ویلایەتەکان لەکاتی قوربانیدانیاندا دژی کۆنگریسی ئینگلیزی پەیوەست بوون بە سنوردارکردنی ئەم مافە بۆ دام و دەزگا تەشریعیەکان نەک شتەکانی تر. [1]

هەرکات ئەم سەربەخۆیە سەری گرت و ئەم مەبدەئە لە عەقڵی خەڵکدا سامناک نەبوو کە تەنازولی لێ بکەن، کۆنگرێس لە ڕووی دارایییەوە بە دەستەوەستانی مایەوە و دەسەڵاتەکەی توانای نەبوو میزانیە تایبەتیەکەی خۆی دیاری بکات و داواکاری ویلایەتەکان جێ بەجێبکات، بۆیە بە تەنیا هەندێ دەسەڵاتی بازرگانی بە دەستی ویلایەتەکانەوە مایەوە، کۆنگرێس لەم ڕووەوە هیچ مافێکی نەبوو، جگە لە بەستنی پەیماننامە بازرگانیەکان لەگەڵ دەوڵەتی بێگانەدا، بەڵام بازرگانی ناوخۆیی لە نێوان ویلایەتەکاندا کەس نەبوو ڕێکی بخات یان بەڕێوەی بەرێت، ئەمەش بووە بنەمایەک بۆ جیاوازی لە نێوان ویلایەتەکاندا، کاتێ ناکۆکی بکەوتایەتە نێوانیانەوە لە ڕووی بەرژەوەندی بازرگانیەوە، هەموو ویلایەتێک هەوڵی دەدا لە پشتی بەرژەوەندی تایبەتیەکانیەوە بێ، و بەبێ گوێ دانە بەرژەوەندی گشتی کاری خۆی دەکرد، ئەم حاڵەتەش بەو شێوازە بەردەوام بوو تا دەستورێک دانراو دەسەڵاتەکان جێگیر بوون وڵات لەسەر شێوازە ئاسابیەکەی خۆی دەڕۆشت. [2]

### مێژووی دەستوور لە ئەمریکا

ئەو شالاوە کۆچکردنە بەرفراوانەی دوای دۆزینەوەی کیشوەری ئەمریکا ئەو وڵاتەی گرتەوە، بوو بەهۆی دروست بوونی چەند ویلایەتێک لە هەرێمە جیاجیاکاندا لە نێوان سالانی (١٦٠٧- ١٨٧٨) دا، لەو دەمانەشدا (فرجینیا) کە یەکێک لەو ویلایەتانەی ئەمریکایان پێکدەهێنا لە ساڵی (١٦١٩)دا، دەست پێشخەرییەکی گرنگی کرد لەمەڕ دانانی سیستەمێکی حوکمڕانی ئەنجامدا، هەر بۆیە لە ڕۆژی (٧/٣٠)دا ئەم ویلایەتە یەکەمین نوێنەری حکومیان لە ئەمریکادا بۆ خۆیان هەڵبژارد و هەر لەم ڕۆژە دیارەدا دەستەیەکی یاسادان کە لە دادوەر و قازی و ڕاوێژکارە یاساییەکان پێکهاتوون کۆبوونەوە. [3]

---

١ - د. عبدالفتاح حسن ابوعلية: تاريخ الامريكتين والتكوين السياسي،ص ٦٣.

٢ - د.ناهد ابراهيم دسوقي:دراسات في التاريخ الأمريكي،ص٦٥-٦٨.

٣ - د.محمد محمود النيرب: المدخل في تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية، ص١١١.

ئەم هەوڵدانەش خۆی لە دروست کردنی سیستەمێکی حوکمڕانیدا دەبینێتەوە، چونکە یاسادانەرەکان هەر لە (فرجینیا)دا دەستیان بە دانانی یاساو سیستەم کرد، یەکێک لەو یاسایانەی ئاماژە بە دەسەڵاتی حوکم لە ویلایەتەکەیان دەکات، دەقێکی تێدایە و دەڵێت: (دادوەر بەبێ پشت بەستن بە دەسەڵاتی یاسادانان بۆی نیە باج بسەپێنێ). [1]

بەڵام لە ویلایەتی (ماساشوسیتس)دا دەسەڵاتی ئۆتۆمی لە هەندێ ڕووەوە پێچەوانەی دەسەڵاتی حوکمڕانی (فرجینیا) بوو.

ئەمە زیاتر ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە دەسەڵاتی حوکمڕانی لە نێوان ویلایەتەکاندا جیاوازییان لەگەڵ یەکتردا هەبووە.

سەرجەم داگیرگە ئینگلیزیەکان لە ئەمریکا کە خۆی لە سیانزە ویلایەتدا دەبینیتەوە، لەنێوان ساڵانی (١٦٠٧- ١٧٧٦) دروست بوون، سیستەمی یاسای هەر داگیرگەیەک جیاواز بوو لەگەڵ داگیرگەیەکی دیکەدا، و ئەم داگیرگانەش بەم سێ شێوازە بوو. [2]

**شێوازی یەکەم:** داگیرگەی پاشایەتی کە ملکەچ بوو بۆ دەسەڵاتی پادشای بەریتانیا. [3]

**شێوازی دووەم:** داگیرگەی خاوەن پەیمان بەپێی ئەو یاسادانانەی لەلایەن پادشای بەریتانیاوە دەرچوو دروست بوو، ئەم داگیرگانەش خاوەنی حوکمی ئۆتۆنۆمی خۆیان بوون لەم جۆرە داگیرگانەدا لایەنگرانی چاکسازی ئایینی. ڕێبازی پرۆستانی لە نیشتەجێ بووندا تێبینی دەکرا، لایەنگرانی ئەم ڕێبازەش توانیان سیستمێکی سیاسی بەپێی ئیرادەی ئازادی خۆیان دابنێن، بەم پێودانگەش (حاکمی) ئەم جۆرە داگیرگانە بە هەڵبژاردنێکی گشتی ڕاستەوخۆ لەلایەن خەڵکەوە بۆ ماوەی ساڵێک هەڵدەبژێردران. [4]

**شێوازی سێیەم:** داگیرگەکانی موڵکدارەکان یاخود (فیوداڵەکان) ئەم جۆرەیان لەلایەن تاجی بەریتانیەوە، بە چەند کەسایەتیەک دەبەخشرا. [5]

---

١ - فرنسيس فريدمان: موجز التاريخ الأمريكي، ص٥٨.

٢ - جوردن س.وود: الثورة الأمريكية، ص٩٨.

٣ - كارلهاينتس دشنر: تاريخ الولايات المتحدة، ص١٤١.

٤ - د.عبد العزيز سليمان و د. عبد المجيد نعنعي: تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية الحديث، ص ٨٤.

٥ - د.محمد محمود النيرب: س- پ، ل ١١١.

دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئەمریکا و بەدەستهێنانی سەربەخۆی ویلایەتەکانی ئەمریکا و ڕزگاربوونیان لە دەست کۆلۆنیالیزمی بەریتانی، چەندین سەرکردە و کەسایەتی بەناوبانگ بەمەبەستی دانانی دەستورێک کۆبوونەوەیەکی گرنگیان سازدا.لە ناوەڕاستی ساڵی (١٧٨٧) لە فیلادلفیا نوێنەرانی ویلایەتەکانی باشوور کە زیاتر بە خاوەن کۆیلە و ئاستی دواکەوتوویی ئابووری ناسرابوون، لەگەڵ نوێنەرانی ویلایەتەکانی باکوور کە پەیوەندییەکی سەرمایەداری گەشەکردوو لە نێوانیاندا هەبوو کۆبوونەوەیەکی فراوانیان بەست، چەندین کەسایەتی بەناوبانگی وەک (فرانکلین، جیفرسۆن، میدسۆن، جۆرج واشنتن و ئادامس) بەشداریان تێداکردوو بیری دروستکردنی دەوڵەتێکی فیدالی بابەتی لێدوانەکانیان بوو.[1]

دوای ڕێکەوتن لەسەر دروستکردنی ئەم جۆرە فیدراڵیەتە، بە پێویستیان زانی دەستورێک بۆ ویلایەتەکەیان دابنێن، دەستوری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بنەماو بەندەکانی لە سێ سەرچاوەی سەرەکیەوە وەرگرتووە.

**یەکەم:** لەسەر بیر و فەلسەفەی ڕۆشنگەری فەرەنسا لە سەدەی هەژدەیەم، بەر لە هەمووشیان (ڤۆلتیر، جان جاک ڕۆسۆ و مۆن تیسکۆ).

**دووەم:** لە نەریتی پەرلەمانی بەریتانی کە ناوەڕۆکەکەی بریتیە لە باڵادەستی یاسا، و ئازادی کەسایەتی کە لە بیردۆزەکانی (لۆک) و (هوبس)دا بەرجەستە بوونە.

**سێیەم:** لەسەر ئەزموونی ئایینی ویلایەتەکانی ئەمەریکا و بیر و بۆچوونی زانا و سەرکردەکانی ئەو سەردەمەی ئەمەریکا وەکو (جیفرسۆن، هامیلتۆن و میرسون) وەرگیراوە.[2]

ئەوانەی دەستووری ئەمریکایان داناوە زۆر وشیارانە هەوڵیان داوە، بۆ ئەوەی یاسای سەرەکی دەوڵەت بەزمانێکی ئاسان بێت و دۆکۆمێنتێکی کورت بێت، بەڕای ئەوان دەستوور بەر لە هەر شتێک بۆ هاوڵاتیان پێویستە کە دەسەڵات بە گەورەکان دەبەخشێت دواتریش بۆ حوکمەتەکە ویست و ئارەزووەکانی گەل جێ بەجێدەکات.

هەتا ساڵی (١٧٧٦) هەموو هەرێمەکانی ئەمریکای باکوور کە (١٣) سیانزە ویلایەت بوون، بە داگیرگەی ئینگلترا دادەنران ئەگەر چی سەربەخۆ بوون، بەڵام لە ڕاستیدا بڕیارەکان لەلایەن کۆنگریسی ئینگلتەراوە دەردەچوون.[1]

---

١ – تشارلز و ماری بيرد: تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية،ج١/ص ١٤٥.

٢ – د.ياسين محمد العيثاوي: السياسة الأمريكية بين الدستور والقوى السياسية، دار اسامة للنشر والتوزيع،الطبعة الاولى،عمان،٢٠٠٩،ص١٤-١٥.

ئەم داگیرگـــانە هەریەکەیـــان ســـەربەخۆیی جیاوازیـــان هەبـــوو، بەڵام هـــیچ پەیوەســتێکی یەکێتـی سیاسـی فەرمـی لە نێوانیانـدا نەبـوو، بەڵام چەنـد هۆکارێـک هەبوون هاوکاری لە نێوان داگیرگەکانی ئەمەریکادا دروست کردبوو، کە بەهۆیەوە کۆدەبوونەوە و لە گیروگرفتەکانیان دەکۆڵیەوە تا ڕێگا چارەیەکی گونجاویان بۆ دەدۆزیەوە، ململانێ لەگەڵ هیندیە سورەکان یەکێک لەو کێشـانەبوو هاوکـاری لە نێوان داگیرگەکاندا دروست کرد، لە ساڵی (١٦٤٣) مەترسی هیندییە سورەکان

وای لە ویلایەتەکانی (ماساشوسـتس) و (کونیکتیکت) و (نیوهـاڤن) کـرد لەیەک نزیـک ببـنەوە و یەکێتـی (نیوئینگلانـد) پێـک بهێـنن و هەر ئەم مەترسـیەش پـاڵی بە فێرجینیاوەنا بەرگری لە کارولینا بکات.[٢]

سـەپاندنی یاسـاکانی بـاج و گـومرگی ئـابووری ئینگلـتەرا لەسـەر داگیرگەکـانی ئەمریکا یەکێکی تربوو لەو هۆکـارانەی هاوکـاری لە نێـوان داگیرگەکانـدا دروسـت کـرد، ئەوە بـوو لە سـاڵی (١٧٦٥) ئەنجـومەنی نەتەوە لە (ماساشوسـتس) بڕیـارێکی دەرکـرد و پەیوەنـدی کـرد بە ویلایەتەکـانی تـرەوە تـا نوێنەرەکانیـان ئامـادەبن بـۆ بەستنی کۆبوونەوەیەک لە نیویۆرک، بۆ بەشداریکردن لە تاوتوێ کردنی بارودۆخی ئەو سەردەمە کە داگیرگەکان لە سەپاندنی ئەو بـاجە زۆرەی ئینگلـتەرا سـەپاندوونی بەسـەریاندا پێیـدا دەڕۆشـتن. کۆبـوونەوەکە لە (٧)ی ئۆکتـۆبەری هەمـان سـاڵدا لەشـاری نیویـۆرک بەسـترا، کـۆنگرە کە بە ئامـادەبوونی نـوێنەری حەوت ویـلایەت بەنـاوی (کـۆنگرەی یاسـای مـۆرکراو) نـاوبرا، ئەم هەڵوێسـتە هاوبەشـەیان بـوو بە وانەکەیەکی گرنگ تا کۆششی زیاتر بکەن بۆ یەکێتـی و چەنـد هەنگاوێکی زیاتریـان نا.[٣]

هەر سیانزە ویلایەتەکە داوای ڕژێمێکیان دەکرد کە دەسـەڵاتی خۆجێیەتیـان کەم نەکـاتەوە، لە سـاڵی (١٧٥٤)دا یەکەم هەنگـاو بـۆ هاوبەنـدییەکی جێگیـر لە نێـوان داگیرگەکانــدا بە کــۆنگرەی (ئەلبــانی) دەســتی پێکــرد، لەو ســاڵەدا نــوێنەرایەتی داگیرگەکـان بە پشـتگیری ئینگلـتەرا لە شـاری ئەلبـانی نزیـک نیویـۆرک کۆبـوونەوە، ئامانج لەو کۆنگرەیە پێکهێنانی جۆرێک لە یەکێتی کۆنفیدراڵی بوو لە نێوان داگیرگە

---

١ - کارلهاینتس دشنر: س- پ، ل ١٣٨-١٣٩.

٢ - محمد محمد صالح: تاريخ اوروپا من عصر النهضة وحتى الثورة الفرنسية(١٥٠٠- ١٧٨٩م)، جامعة بغداد،١٩٨٢،ص٥٣٥.

٣ - محمد محمد صالح: س- پ، ل٥٣٥.

ئینگلیزەکـــان لە ئەمریکـــا، هەروەهـــا چـــۆنێتی بەرگـــری کـــردن لە خۆیـــان و بەرژەوەندیەکانیان لە کاتی شەڕ و ئاشتیدا ئەگەر چی ئەم کۆنگرەیە سەری نەگرت، بەڵام بیرۆکەی یەکێتی لەلای ئەمریکیەکان گەشەی کرد. [1]

ئەم بـاردۆخە تـا سـاڵی (١٧٧٤) بەو شـێوەیە مـایەوە و شـێوازێکی فراوانتـری وەرگرت، کاتێک بە پێشنیاری ئەنجومەنی فیرجینیا نوێنەری داگیرگەکان لە فیلادلفیا بانگێشـــت کـــران و لە (٥)ی ئەیلـــولی (١٧٧٤)دا کۆبـــوونەوە تـــا وتـــووێژ لەســـەر باوردۆخەکە بکەن، لە دەست کەوتەکانی ئەم کۆنگرەیە پێکهێنانی هاوبەندیەک بوو بـــۆ زینـــدوکردنەوەی پچڕانـــی پەیوەنـــدی بازرگـــانی لەگەڵ ئینگلـــتەرا، ئەمەش بە دروستکردنی لیژنەکانی چاودێری لە شار و هەرێمەکان بۆ نەهێنانی هیچ کەل و پەلێـک لە ئینگلتـرا و نەناردنیشـی بـۆ بەنـدەرەکانی ئینگلتـرا، هە لەو کـۆنگرەیەدا دەستەی یاساداناني شۆڕشگێڕییان (کۆنگرەی هەرێمەکان) دامەزراند، ئەم هەنگاوە لەلایەن کۆبوونەوەی ئینگلیزەکانەوە پاڵپشتی لێکرا.پاشان لە (١٠)ی ئایاری ساڵی (١٧٧٥)، کـۆنگرەیەک لە فیلادلفیـا بەسـترا، بەڵام تـا ئەوکـاتەش هـیچ خواسـتێکی سەرەکی بۆ جیابوونەوەی سیستمی سیاسی داگیرگەکان لە ئینگلتەرا نەبوو، تەنها ئامانجیـان چاکردنی بـارودۆخی ئابووریـان بـوو، بەهـۆی بـاجە جـۆر بەجۆرەکانی ئینگلـــتەراوە کە قورســـایەکی زۆری خشـــتبووە سەرشـــانی داگیرگەکـــان و لە بارودۆخێکی خراپدا دەژیان. [2]

لە (٧)ی حـوزەیرانی (١٧٧٦) (ریچـارد هێنـری لـی) پرۆژەیەکـی پێشـکەش بە کۆنگرێس کرد تا نەخشەیەک بۆ یەکێتی کۆنفیدراڵی ئامادە بکات، لە تەموزی هەمان ساڵدا لیژنەی ئەو کۆنگەرەیە پرۆژەی یەکێتی کۆنفیدراڵی وەکو یەکێتیەکی بەردەوام لە نێوان هەر سیانزە (١٣) داگیـرگەکەی ئەمریکـا خستەڕوو، یاسـایەکی تـازەی دە کرد بۆ حوکم کە تیایدا دەوڵەتی حکومەتی ناوەندی دەسەڵاتی دیاری کراوی هەبێت بە شێوەیەکی سەربەخۆ. [3]

کۆنگرەکە لە مانگی تشرینی دووەمی ساڵی (١٧٧٧) ئەو پرۆژەیەی پەسەندنەکرد بە هۆی نارەزایی ویلایەتی ماریلاند و سەرجەم ویلایەتەکانی تر، چونکە وا دادەنێت هەمـوو زەوییەکـانی ڕۆژئـاوا مـوڵکی گشـتیە و کـۆنگرێس دابەشـی دەکـات بەسـەر

---

١ - تشارلز و ماری بیرد: تاریخ الولايات المتحدة الأمريكية،ج١/ص ١١٦.

٢ - د.طليعة الصياح: س- پ، ل٦٧.

٣ - دان ليس:الثورة الأمريكية (دوافعها ومغزاها، ترجمة- سامي ناشد، منشورات مؤسسة سجل العرب، القاهرة،١٩٦٦،ج١/ص٥٩.

حکـومەتە ئـازادە سـەربەخۆکەدا، هەڵوێسـتی ویلایەتـی ماریلانـد تونـد بـوو بـۆ بەهێزبـوونی دەسـەڵاتی ناوەنـدی، بەڵام دوای ئەوەی وتـووێژ و هەڵسـەنگاندنێکی زۆری لە بارەوەکرا کۆنگرێس دەقی یەکێتییەکەی ڕاگەیاند. [1]

هەندێک لە ویلایەتەکان لە ساڵی (١٧٧٦)دا توانیان دەستوری خۆیان دابنێن وەک (نیوهامشـەر، کارولینـای باشـوور، فێرجینیـا، نیوجەرسـی، دیـلاوەر، پەنسـلڤانیا، ماریلانـد و کارولینـای بـاکوور)، هەروەهـا هەردوو ویلایەتـی (جورجیـا و نیویۆرک)یش لە سـاڵی (١٧٧٧)دا دەسـتوزی خۆیـان دانـا، دەسـتوری ویلایەتەکـانی تـریش لە سـاڵەکانی دواتـردا نوسـرانەوە.دوای ڕازی بـوونی هەمـوو ویلایەتەکـان کۆنگرێس پێشنیاری سیسـتەمێکی دەسـەڵاتی تـازەی کـردوو، ڕازی بـوو لەسـەر ئەو دەستورەی کە بە یەکێتـی بەڵێنـدەرایەتی ناسـراوە و هەوڵ دەدات بـۆ کـۆکردنەوەی ویلایەتە ئەمریکیەکان لە یەکێتیەکەدا، بەمەش پێویستی بوونی یەکێتی زۆر زیادی کـرد، تـا لە (١)ی مارسـی (١٧٨١)دا بەنـدەکانی یەکێتـی کۆنفیـدراڵی سـیفەتی یاسـای وەرگرت. [2]

ئەم کۆنفیدراڵیە لەسـەر ژمـارەیەک یاسـا و ڕێسـا دانرابـوو، بەڵام کەم و کـورتی زۆری هەبـوو لەوانە دەسـەڵاتی بـاج دانـانی نەبـوو بەسـەر گەلـدا، چـونکە لە کـاتی جەنگدا دانرابـوو، ڕەچـاوی بـاجی نەکردبـوو، دوای جەنگـیش نەیـدەتوانی دایبنێـت، چونکە زۆربەی دەسەڵاتەکان لە دەستی ویلایەتەکاندا بـوو، واتە هەر دەسـەڵاتێک لە بەرژەوەنـدی ویـلایەتەکە خۆیـدا بـوایە لە دەسـتی حکـومەتی کۆنفیدراڵیـدا نەبـوو، هەروەها توانای کـۆکردنەوەی هێـز و سـزادانی سـەرپێچیکەرانی نەبـوو، نەیـدەتوانی ویلایەتەکەیان ناچار بکات ڕێز بگرن لەو هاوپەیمانیەتە، مافی نەبوو پـارە وپـۆل بـۆ کاروباری حکومەت کۆبکاتەوە، بۆیە لە سـایەی بەنـدەکانی ئەم یەکێتیـەدا دەسـەڵاتی ناوەندی لاواز و دەسەڵاتی ویلایەتەکان بەهێزبوون. [3]

ئەم کەموکورتیـانەی حکـومەتی کۆنفیـدراڵی ناچـاریکردن حکـومەتێکی دەسـەڵات ناوەنـدی بەهێـز بەسـەر ویلایەتەکانـدا پێـک بهێـنن ئەویـش حکـومەتی فیـدراڵیە، بەشـێوەیەک وای لێهـات زۆرێـک لە پیـاوانی ئیشـکەری ئەمریکـا داوایـان دەکـرد پێویستە هاوکاری حکومەتی فیدڕاڵی بکرێت، تـا ئەوکـاتەی کاروبـارەکانی بازرگـانی ڕێک دەخات ئەگەر چی لە سەرەتادا دەترسـان ببێتە دەسـەڵاتێکی دیکتـاتۆری، بەڵام

---

١ - اسماعيل احمد ياغي: معالم التاريخ الأمريكي،ص ٩٠.

٢ - فرحات زيادة: س- پ، ل ٦٥.

٣ - ديب على حسن:الولايات المتحدة الأمريكية،ص١٦٨.

لایەنگری سیستەمێکی یەکێتی فیدراڵی بوون ژمارە و هێزیان زیادی کرد، بەڵام لە ساڵانی (١٧٨٥) تا (١٧٨٦) لەبەر نەبوونی سیاسەتێکی بازرگانی یەکگرتوو زیاتر بیرۆکەی حکومەتێکی فیدراڵی لە ویلایەتەکاندا پتەوترکردوو و لایەنگرانی زیاتر کرد. [١]

لە ساڵی (١٧٨٥)دا ویلایەتی (ماریلاند) دەسەڵاتی تەواوی بەسەر ڕووباری (پۆتۆماک)دا هەبوو دانیشتوانی ویلایەتی فیرجینیا دەترسان لەوەی ماریلاند دەست بخاتە ئەو ئازادیەی هەیانە لەسەر ئەو ڕێگە ئاوییە و ڕێگەی دەریاوانیان لێبگرێت، بۆیە لەو ساڵەدا نوێنەری هەردوو ویلایەتەکە لە کۆشکی ماوتن ڤێرنونی (جۆرج واشنتن) کۆبوونەوە، جۆرج واشنتن لەم کۆبوونەوەدا بەشداربوو، تا باس لە دەریاوانی لەو ڕووبارە و دەریاچەی (چیزاپێک)دا بکەن، بەڵام ئەم کۆنگرەیە گۆڕا بۆ بانگێشکردنی ویلایەتەکانی تر تا کاروباری بازرگانی وڵات ڕێک بخەن بۆیە بڕیاری بەستنی کۆنگرەیەک درا بۆ ساڵی دواتر. [٢]

(جیمس مادیسۆن) نوێنەری فیرجینیا بوو لایەنگری بەهێزی بیرۆکەی یەکێتی بوو، پێشنیاری ئەوەی کرد هەموو ویلایەتەکان کۆببنەوە تا باس لە کاروباری بازرگانی بکەن، (مادیسون) تێبینی ئەوەی کردبوو پشێوی بازرگانی وڵاتی گرتۆتە وەو پێویستە کۆنگرەیەکی فراوان بۆ هەموو ویلایەتەکان سازبدرێت تا پێشنیارەکانیان پێشکەش بە کۆنگرێس بکەن و سیاسەتی گشتی بازرگانی جێبەجێ بکرێت.

لە ساڵی (١٧٨٦)دا لە (ئەناپۆلیس) بە ئامادەبوونی نوێنەری پێنج ویلایەت کۆنگرەکە بەسترا، (جۆرج واشنتن) وەک نوێنەری ویلایەتی فیرجینیا بەشداری کرد بوو، ڕێزێکی زۆری لێگیرا، هەروەها یەکێک لە بەشداربووەکان کەسایەتیەکی بەهێز بوو ناوی (ئەلیکساندەر هاملتون) بوو هەستی بە خراپی بارودۆخەکە کردوو داوای لەویلایەتەکان کرد هەریەکەیان نوێنەری خۆیان دیاری بکەن و لە مانگی مایسی ساڵی داهاتوودا لە فیلادلفیا کۆببنەوە تا لێکۆڵینەوە لە بارەی هەڵوێستی ویلایەتەکان بکەن. [٣]

---

١ – د.حسن صبحي: معالم التاريخ الأمريكي والاوروبي الحديث،دار النهضة العربية، بيروت،١٩٦٨،ل١٣٨.

٢ – الان نفينز و: س–پ، ل ١٣٨.

٣ – كارلهاينتس دشنر: تاريخ الولايات المتحدة، ص ١٤٠.

## دانانی دەستوور

لە ئەنجامدا کۆنگرە پێشنیاری کرد سەرجەم نوێنەرەکانی ویلایەتەکان ساڵی داهاتوو لە فلادلفیا کۆببنەوە بۆ چاک کردنی مادە خراپەکانی دەستوری کۆنفیدڕالی، ئەوەبوو (٢٠)ی مایسی (١٧٨٧)دا دیاریکرا بۆ کۆبوونەوە، بۆ ئەوەی هەریەک لە ویلایەتەکان نوێنەریان بنێرن، تا ئەوکات باسکردنی حکومەتی فیدڕاڵی بابەتێکی قێزەون بوو، بەڵام کاتێک نوێنەرەکان بیستیان (جۆرج واشنتن)بوو بە نوێنەری فێرجینیا، کۆنگرە گەڕایەوە بۆ سەر ڕێگای ڕاست، چونکە شلەژان لە کۆنگرێسدا هەبوو، جۆرج واشنتنیش کەسایەتیەکی بەهێزی هەبوو خزمەتی باشی پێشکەش کردبوو، لەهەمان کاتدا توانای باشی لە چارەسەرکردنی کێشەکاندا هەبوو بەتایبەت ئەم کێشەیە. [1]

لەم کۆنگرەیەدا جل وبەرگی ڕەشی لەبەردابوو کە لە بۆنە ڕەسمیەکاندا لەبەری دەکرد، بەم شێوازەش سەرەنجی ئامادەبووانی بەلای خۆیدا ڕادەکێشا، (جۆرج واشنتن) سووربوو لەسەر بەجێهێنانی یەکێتی ئەوەش ئامانجی بەشداری کردنی بوو لەو کۆنگرەیەدا، لە (١٣)ی مانگی ئایاری (١٧٨٧)دا گەشتە فلادلفیا و لەماوەی کۆنگرەکەدا لەکۆشکی (مۆریسی) ڕازاوەی فلادلفیا دەمایەوە. [2]

جگە لە (ڕۆد ئایلاند) هەموو ویلایەتەکان نوێنەری خۆیان بۆ کۆنگرە نارد بەمەش کۆنگرێس لە مانگی مایسی (١٧٨٧) لە شاری فیلادلفیا بەسترا بە ئامادەبوونی پەنجا و پێنج نوێنەر لەناو نوێنەرەکاندا کەسانی واهەبوو ڕۆڵی کاریگەریان لە مێژووی ئەمریکا بینیبوو، وەک (جۆرج واشنتن، بنیامین برانکلین و جیمس مادیسون)ی سیاسەتمەدار و (جۆرج وایت)ی یاساناس و چەندین کەسانی تری زیرەک و لێهاتوو و شارەزا و بیرمەند بەشداری ئەم کۆنگرەیان کرد. [3]

بەڵام چەند بیرمەندێکی دیکەش هەبوون بەشداریان نەکرد وەک (جۆن ئادامس)ی باڵوێزی ویلایەتە یەکگرتووەکان لە ئینگلتەرا (توماس جیفرسۆن) باڵوێزی ویلایەتە یەکگرتووەکان لە فەڕەنسا، (تۆماس پاین، پاتریک هینری، ریتشارد هینری لی، ساموێل ئادامس و جۆن هانکۆک)، چونکە لە سەرکێشی خواستەکانی

---

١ - فرحات زيادة و ابراهيم فريجي: تاريخ الشعب الأمريكي،ص ٦٨.

٢ - الان نفينز و: س-پ، ل ١٣٩.

٣ - د.حسن صبحي: معالم التاريخ الأمريكي ص٧٨.

ناو کۆنگرە دەترسان، سەرجەم ئەندامانی ناو کۆنگرە جەختیان لەوە دەکرد کەسێک سەرۆکایەتی کۆنگرە بکات، ئەوەبوو بەزۆرینەوەی دەنگ (جۆرج واشنتن)یان کردە سەرۆکی کۆنگرە، واشنتن لە سەرۆکایەتی کۆنگرەدا وەک نەبەردێک دادەنشت و لێهاتووی خۆی نیشان دەدا و لە زۆربەی کۆبوونەوەکاندا بێ دەنگ دەبوو، بەڵام نوێنەران دەیان وت دەتوانن تێڕوانینی (جۆرج واشنتن) لە دەم و چاویدا بخوێنەوە، لە ڕاستیدا (جۆرج واشنتن) پێش دەست بەکاربوونی لیژنەکە هەڵوێستی خۆی دەربڕی بە بوونی دەوڵەتێکی ناوەندی بەهێز. (1)

لەم کۆنگرەیەدا ئەندامان بەندەکانی یەکێتی کۆنفیدراڵیان پشتگوێ خست و دەستیان کردە دانانی دەستورێک بۆ وڵات، ئەم کۆنگرەیە نزیکەی چوار مانگی خایاند و ئەندامانی کۆنگرە بڕیاریاندا کۆبوونەوەکانیان بەنهێنی بێت لە ترسی ئەوەی وتەکانیان بچێتە دەرەوە و جیاوازی سیاسی لە نێوان ویلایەتەکان زیاتر بکات و کار لە شێوازی ڕای گشتی بکات.

لەسەر ئەندامانی کۆنگرێس پێویست بوو شێوازێکی فەرمانڕەوایی وا دابنێت لەگەڵ خواستەکانی هەموو چینەکانی کۆمەڵگەی ئەمریکیدا بگونجێت لە پیشەسازەکان و بازرگانەکان و پیاوانی سەر سنور و خاوەن بارەکان و دانیشتوانی شار، دانانی سیستەمێکی نوێ بۆ وڵات کارێکی ئاسان نەبوو، چونکە هیچ پێشینەیەکی وا لە وڵاتدا نەبوو تا پەند و سودی لێ وەرگیرێت، بەڵام ئەوانەی دەستوریان دانا سەرەڕای زیرەکی و شارەزاییەکەیان، پاڵپشتی تەواوی دەستووریان کرد و هەوڵی سەرگرتنیان دەدا کە ناسراوە بە دەستوری (١٧)ی ئەیلولی (١٧٨٧). (2)

بیری سیاسی هەندێک لە فەیلەسوفەکانی وەک(تۆماس هۆبز) (١٥٨٨- ١٦٧٩)، (جۆن لوک) (١٦٣٢- ١٧٠٤)، (جان جاک ڕۆسۆ) (١٧١٢- ١٧٧٨)، (دیڤید هیوم) (١٧١١- ١٧٧٦)، (مۆنتسکیۆ) (١٦٨٩- ١٧٥٥)، گرنگیان هەبوو لە دانانی دەستوردا سودیان لە بیرە سیاسیەکانیان وەرگرت. (3)

---

١ - لاری الوتیز: نظام الحکم في الولایات المتحدة، ترجمة- جابر سعید عوض، الطبعة الاولی، القاهرة،١٩٩٦، ص١٥.

٢ - د.حسن صبحي: س-پ، ل ٧٩.

٣ - لاری الوتیز: س-پ، ل ٢١.

ئەو دەستورەی دایاننا لە (٧) مادە پێکهاتبوو، ڕێزی لە سەربەخۆیی ویلایەتەکان دەگرت، لە دەستوردا ئاماژە بەوەکرابوو حکومەتێکی ناوەندی پێک بێت جیاواز لە دەسەڵاتی ویلایەتی، توانای دروست کردنی سوپای میلی، بەڕێوەبردنی کاروباری بازرگانی ناوخۆ و دەرەکی و دروستکردن و هەڵسورانی پارەی نوێی پێ بەخشرا، لەهەمان کاتدا لەسەر بنچینەی هاوسەنگی هێز لە دەسەڵاتی ویلایەتەکان کەم کرایەوە تا لە سیاسەتی بەڕێوەبردندا سیستەمێکی دەست بەسەرداگیراو لە نێوان ناوەند و ویلایەتەکاندا پێک بێت. [١]

لە دەستوردا هاتبوو بۆ هیچ ویلایەتێک نیە حوکمێک بکات لە تایبەتمەندی هاوڵاتیانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کەم بکاتەوە، هەروەها بۆ هیچ لایەنێک نیە ئازادی یان موڵکایەتی هیچ مرۆڤێک داگیر بکات، دەستوور دەسەڵاتە گشتیەکان، کارو فرمانی ئەو دەسەڵاتانەی دیاری دەکرد و چۆنێتی پەیوەندی نێوان دەسەڵاتەکانیشی دیاری دەکرد و ماف و ئازادییە بنەڕەتیەکانی مرۆڤیشی دیاری دەکرد. [٢]

ئەندامانی کۆنگرە لەسەر بیروباوەڕێکی تر پێکهاتن کە گرنگیەکی زۆری هەبوو ئەویش بیروباوەڕی جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکانی یاسادانان و دەسەڵاتی جێبەجێکردن و دەسەڵاتی دادوەری، هەریەکە لەوی تر سووربوو لەسەر پاراستنی دەسەڵاتی خۆیان بەپێی کەمکردنەوەی دەسەڵاتی هەریەکەیان بۆ ئەوەی هاوسەنگی لە نێوانیاندا پارێزراو بێت. [٣]

هەڵبژاردنی سەرۆک بۆ ماوەی چوار ساڵ دەکراو بۆی هەبوو چەند جارێک خۆی بۆ ئەو پۆستە هەڵبژێرێت، بریاریاندا دەسەڵاتی یاسادانان دوو ئەنجومەنی هەبێت:

ئەنجومەنی پیران و ئەنجومەنی نوێنەران،ئەوە یارمەتیدان لە چارەسەرکردنی ئەو کێشەیەی کە ویلایەتە بچووکەکان ئەو مافەیان دەست کەوت کە ژمارەی نوێنەرایەتیان لەگەڵ ژمارەی نوێنەرەکانی ویلایەتە گەورەکان یەکسان بێ هەروەک

---

١ - د.صلاح احمد هريدي: دراسات في التاريخ الأمريكي،ص ٨٥.

٢ - یاسین جابر صالح: ئەنسکلۆ پیدیای گشتی، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، چاپی یەکەم، سلێمانی، ٢٠٠٥،٤٦٨.

٣ - د. طليعة الصياح: تاريخ الولايات المتحدة، ص ٨٣.

نە مادەکانی یەکێتی باسی کردبوو بۆئەوەی ویلایەتە گەورەکان خۆیان نەسەپێنن، بەلام دوای گفتوگۆیەکی درێژ و توند پێک هاتن لەسەر ئەوەی هەر ویلایەتێک دوو نوێنەری لە ئەنجومەنی پیراندا هەبێت، نوێنەرەکان هەڵدەبژێرران بۆ ماوەی شەش ساڵ، بەڵام لە ئەنجومەنی نوێنەراندا ژمارەی نوێنەرانی هەر ویلایەتێک بەپێی ژمارەی دانیشتوان دیاری دەکرێت و هەڵدەبژێرێن بۆ ماوەی دوو ساڵ ئەوە باشترین دەستەبەربوو بۆ داپەروەری لە نێوان ویلایەتە گەورەکان و ویلایەتە بچووکەکاندا و باشترین چارەسەر بوو بۆ ڕازیکردنی هەموو ویلایەتەکان. (١)

مافی بوون بە سەرۆکی دەسەلاتی جێبەجێکردن درا بە سەرۆکی یەکگرتن ئەوەی شوێنەکەی بە دەست دەهێنێت لە ڕێگای هەڵبژاردنی دووەم، ئەویش ئەندامانی دەستەی دادوەری دیاری دەکات، بەڕازی بوونی ئەنجومەنی پیران هاوسەنگی لە نێوان هەرسێ بەشەکەی دەوڵەت بە شێوەیەکی جوان و پتەو ڕاستەڕێ دەبێت، یاساکان کە کۆنگرێس دەریان دەکات واتە هەردوو (ئەنجومەنی پیران و نوێنەران) پێویستی بە ڕازی بوونی سەرۆک هەیە پێش ئەوەی جێ بەجێبکرێت، پێویستە لەسەر سەرۆک بۆ بەستنی پەیماننامەکان لەگەڵ وڵاتانی بیانی و دیاریکردنی هەندێ لە فەرمانبەران ڕاوەستێ لەسەر ڕازی بوونی ئەنجومەنی پیران. (٢)

کۆنگرێس دەتوانێت سەرۆک دادگایی بکات یان لە کارەکەی لابدات ئەگەر دەستوری پشتگوێ خست، دواتر دەستەی دادوەری مافی ڕاڤەکردنی دەستور و ئەو یاسایانەی هەیە کە کۆنگرێس دەری دەکات، ئەگەر بینی لەگەڵ دەستور ناگونجێت ئاشکرای دەکات و ڕای دەگەیەنێت جێ بەجێناکرێت لە دادگاکاندا و مافی دادگایکردنی داوەران و لابردنیان دەگەڕێتەوە بۆ کۆنگرێس. (٣)

لە (١٧)ی ئەیلولی (١٧٨٧) دوای ئەوەی کۆنگرێس دەستوری دانا و چۆنێتی ڕازی بوونی ویلایەتەکانیشی دیاریکرد کارەکانی کۆتایی پێهات، ئەم دەستورە جێگەی وتوویژی هەندێک خەڵک بوو، هەندێکیان دەیان وت ئەو دەسەلاتانەی دراون بە حکومەتی ناوەندی دەبێتە هۆکاری سەرهەڵدانی دیکتاتۆرییەتێکی

---

١ - فرحات زيادة و ابراهيم فريجي: س-پ، ل ٧٠.

٢ - د.رأفت غنيمى الشيخ: امريكا والعالم، ص ٤٩.

٣ - د.عبدالفتاح حسن ابوعلية: تاريخ الامريكتين و التكوين السياسي للولايات المتحدة الأمريكية،ص٦٦.

خۆسەپێن، هەندێکی تر گومانیان لەسەرکەوتنی ئەو بارودۆخە نوێیە هەبوو بەهۆی دەستەبەر نەکردنی دەسەلاتی تەواو بۆ راپەڕاندنی کاروباری ولات بە لێهاتووانە، گەل دابەشبوون بۆ ئەوانەی حەزیان لە بوونی حکومەتی ناوەندی بەهێز بەسەر ویلایەتەکان هەبوو، لەگەڵ ئەوانەی حەزیان لە یەکگرتنێک بوو کە تیادا هەر ویلایەتێک مافی تایبەت بەخۆی بپارێزێت،

زۆربەی بەشدارانی کۆنگرە لەگەڵ داننانیان بە هەندێ کەموکورتی لە دەستوردا هاتوون کار لە ویلایەتەکانیان دەکەن بۆئەوەی رازی بن لەسەری بەوەی بڕوایان بەوە هەبوو دەستوور هۆکاری هەرە چاکە بۆ رێ خۆشکردنی کردارەکی لە دەسەلاتدا.[1]

پاش نووسینی ڕەش نووسی دەستور، نوێنەرایەتی ویلایەتەکان لەماوە و کاتی جیاوازدا ڕەزامەندیان دەربڕی لەسەر دەستور، تا (٢١)ی حوزەیرانی ساڵی (١٧٨٨)، (٩) نۆ ویلایەت رازی بوون لە جێبەجێکردنی دەستور دوای ئەو مێژووە و بە چەند هەفتەیەکی کەم هەموو ویلایەتەکان ڕازی بوون لەسەری جگە لە (نورث کارولینا و رود ایلند)، دواتر ئەم دوو ویلایەتەش ناچار بوون ڕازی بن لە ترسی ئەوەی تووشی شپرزەیی ئابووری دەبن ئەگەر هاتوو گۆشەگیربن لەگەڵ ویلایەتەکانی تر.[2]

پاش جێگیربوونی دەستور لە کۆنگرەی فیلادلفیا لەسەر ڕەزامەندی کۆنگرێس، ویلایەتەکان خۆیان ئامادەکرد بۆ هەڵبژاردنی سەرۆکی ولات، لە نێو ئەندامانی کۆنگرێسدا بە هەڵبژاردنی کراوە (جورج واشنتن) بەپێی تەواوی دەنگەگان بوو بە یەکەم سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکان، ئەوەش بەهۆی ئەوەی خۆشەویست بوو لە دڵی خەڵکیدا، جۆرج واشنتن بوو بە یەکەم سەرۆک کۆماری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و (جۆن ئادامس)یش هەڵبژێررا بە جێگری سەرۆک، جۆرج واشنتن لە (٣٠)ی نیسانی (١٧٨٩)دا لە شاری نیویۆرک لە ئاهەنگێکی گەورەدا پۆستەکەی وەرگرت.[3]

---

١ - فرحات زيادة: س-پ، ل ٧٠.

٢ - اسماعيل احمد ياغي: س-پ، ل ٤٩.

٣ - الان نفينز و: س-پ، ل ١٥٠.

## گەشەکردنی دیموکراتیەت

هەرچۆنێک بوو لەگەڵ کەم و کورتیەکانیشدا بەندەکانی ئیئتیلاف هەنگاوێکی فراوان بوو لە پێشکەوتنی دەستوور بۆ یەکگرتنی ویلایەتە جیاوازەکان، ئەم گەشەکردنەش بووە هۆی پێشکەوتنی دیموکراتی لە زۆربەی بوارە جیاوازەکانی ژیان لە وڵاتدا، لە بواری سیاسیدا هەڵبژاردنی سەرۆک لەلایەن گەلەوە بوو، دوای ئەوەی پێشتر پاشای ئینگلیزی تەعینی دەکردن و ئەندامانی ئەنجومەنی باڵای دەزگای تەشریعی کە (لەبەرامبەر ئەنجومەنی یاریدەدەران دێت) هەڵدەبژێردران بۆ ئەوەی لە بری دانان بکرێت، لە سەرەتادا مافی هەڵبژاردن بۆ ژمارەیەکی کەمی خەڵک بوو، پاشان فراوان کرا تا ژمارەیەکی گەورە تری گرتەوە، دوای ئەوەی دەرکەوت لە پاشماوەی وڵاتی ئەمریکا ژمارەیەکی زۆر هەن هەوادارن بۆ دژایەتی کردنی گواستنەوەی دەسەڵات بۆ دەستی گەل، هەروەها هەرکاتێ جوتیاران و پیشەوەران و بازرگانەکان چالاک دەبوون، کاریان دەکرد بۆ گەشەسەندنی دیموکراسی بۆ دارنینی دیاردەی زیادە کوشتن و خۆ بەزلزانین لە پێناو بنیاتنانی شارستانیەتێکی لەبار، بۆیە بە بەردەوامی ئیجتهاد لە کاریدا ڕەنگی دایەوە و تاکەکان هەستیان بە یەکسانی دەکرد، لەوانەش کە بەرەوی بە دیموکراسی دەدا، قەدەغەکردنی مامەڵەی خاوەن ئیمتیازەکان بوو لە ویلایەتەکاندا، دوای ئەوەی ئەو یاسایە هەڵوەشایەوە کە مانەوەی زەوی بوو بۆ کوڕی نۆبەرە (ابن بکر) بە تەنیا،[1] یان بە مانەوەی ئەوانە (زەویەکان) کە موڵک بێت بۆ خێزانەکان بە درێژایی وەچەکان، بایەخ درا بەو زەویانەی لەلایەن ئەوانەی موڵکیان نەبوو، بۆیە حکومەتی ویلایەتەکان دەستی گرت بەسەر هەندێ لە موڵکی تاکەکان کەلایەنگری ئینگلیزەکان بوون و دابەشی کرد بەسەر جوتیارە بچووکەکاندا، وەک (پەنسلفانیا- ماریلند) کە هەردووکیان هی خێزانی (پن وبلتیمور) بوون کە خاوەنداریێتی دەرەبەگی (تنیک) بوون بەرامبەر بە هەندێ قەرەبوو، بەم شێوەیەش ئیمتیازاتی خاوەن موڵک و زەویەکان نەمان، بە نەمانی موڵکەکانیان زۆرینەی زەوییە ئەمریکیەکان دابەش بوو بۆ موڵکایەتی بچووک، پێش شۆڕشی ئەمریکی هەر (٩) لە ویلایەتەکە کەنیسەی ڕەسمیان هەبوو کە باجیان دەسەپاند بەسەر خەڵکیدا بۆ جێگیرکردنی دەسەڵاتەکەیان و (کۆنغۆ الاغاشانیە) کە لە (تەکیە) دەچوو، لە (٣) لەو ویلایەتە

---

١ - فرحات زيادة: تاريخ الشعب الاميريكي،ص ٦٥.

باکووریە ئینگلکانیەکان باوبوو، هەرچەندە خەڵک ئارەزوویان لە نەمانی ئیمتیازەکان بوو بە هەر شێوازێک ببوایە لە بواری ئایینـدا تواناکانیـان دەخسـتەگەر، سـەرەتا دەستیان گرت بەسەر ئیمتیازیاتی کەنیسەی ئینگلکانیە لە ویلایەتەکانی باشووردا لە نێوان ساڵانی (١٧٧٦- ١٧٨٦) لە پێناوی ئەوەی کە (کۆنغۆ الاغاشانیە) کەنیسـەیەکی ڕەسمی نەبێت تا ئەو کاتەی دوای چەند وەچەیەک ئەم سەرکەوتنەیان هاتەدی.[١]

بزافـی دیموکراسـی بـابەتی فێربـوونی لە خـۆگرت، دەرکەوت کە حـوکمی زاتـی تەرکیـزی لەسـەر گەل دەکردەوە، داواکاری لە تـاک ئەوەبوو بـایەخ بـدان بە کـارە جیاجیاکـان کە دەسـت نـاکەوتن تەنیـا بە فێربـوون نەبێـت بـۆیە کـاری لەسـەر زیـادبوونی قوتابخـانەی سـەرەتایی و پێشکەوتنی ئوسلوبەکەی دەکرد (جیفرسـۆن) لەو بارەوە نووسیویەتی (هیوام وایە گرنگی فێربوونی گەل بە دەرەجەیەک لە ئامێز بگرێت، لەبەرئەوەی من بڕوام وایە ئەو بۆ چوونە باشترین گرنتییە بۆ پاراستنی ئازادی).[٢]

حکـومەتی ئیئتلافـی بـۆ ڕێکخسـتنی ئەمریکیەکـان لە چارەسـەرکردنی کێشـەی زەویەکانی ڕۆژئاوادا کە داگیر نەکراوە هەستا بە خزمەتکردنێکی گەورە، ئەوەش بۆ ئەوەی ئەو ڕێـگە دیموکراسـیە بگـرێتەبەر کە لە سـاڵی (١٧٨٧) (یاسـای کرێکـارانی ڕۆژئـاوای) دانـراوە، بەپێـی ئەوە ڕێـگە درا بە خەڵکـی بـۆ نیشـتەجێ بـوون لەو زەویانەی کەوتبوونە باکووری ڕووبـاری (ئوهـایو) ویلایەتـی تـازەی پێشکەوتوو لە ناوچەکەدا بنیادنرا گەشەکردنی ئەو ویلایەتانە بە شێوەیەکی پلە کاری و دانایی و یەکسانی دروست بوو، سەرەتا کۆنگرێس زەویەکانی بۆ چەند پارچەیەک دابەشکرد بۆ هەریەک لەوانە حاکمێک و قازیەکی دانا،[٣] هەرکاتێ ژمـارەی دانیشـتوانی یەکێـک لە ویلایەتەکان بگەشتایەتە (٥) هەزار کەس دەزگـایەکی تەشریعی (یاسـادانان)ی بۆ پێکدەهێنرا کە لە دوو ئەنجومەن پێکدەهات، ئەگەر ژمـارەی دانیشـتوان بگەشـتایەتە (٦٠) هەزار کەس ئەوا ئەو ویـلایەتە بەچوونە نـاو یەکگرتنەکە قەوارەیەکـی تـایبەتی

---

١ - بۆ زانیاری زیـاتر بڕوانـە (الکسـي دو توکفیل: عـن الدیمقراطیـة فـي أمریکا، ترجمـة- بسـام حجار،معهد الدراسات الاستراتیجیة، الطبعة الاولی،بیروت،٢٠٠٧).

٢ - فرحات زیادة: س-پ، ل ٦٦.

٣ - لیـدیا بجورنلوند:دامەزرانـدی ئەمریکـا و دەسـتوورەکەی، وەرگێڕانـی-ئەبـو بەکـر خۆشـناو، چاپخـانەی ڕوون،چاپی یەکەم،ساڵی ٢٠٠٧،ل١١٠-١١٢.

دەبـــوو، ئەم شـــێوازە لە دوا دواییـــدا جێبەجێکـــرا پـــاش ئەوەی لە پێکهێنـــانی ویلایەتێکیتـــردا سـنوور و چوارچێـوەی باسـیفکی فـراوان بـوویەوە هەتـا کـۆی هەموویـان گەشـتە (٤٨) ویـلایەت، ئەمریکـاش بە چارەسـەرێکی دادپەروەرانە ئەو کێشـەیەی چارەسـەرکرد و لەگەڵ بنەماکـانی دیموکراسـیەتی ڕاسـتەقینە دەگونجـا لەجێگەی ئەوەی ئەو پارچە داگیرکـراوانە واسـەیر بکـرایە کە کۆنترۆڵ بکرێت و سوودی لێ وەربگیرێت، مـامەڵەیەکی یەکسانی لەگەڵدا دەکرا و بەرز بوو یەوە بۆ ئاسـتی ویلایەتەکـانی تـر، بەمشـێوەیە بەپـاکی مـایەوە و لەهەمـوو ناشـیرینیەکی داگیرکاری دوور بوو. [١]

## تێکۆشان لە پێناو مافەکانی تاکدا

پێشەکی دەستوور بەپێی سیستمێکی تازەی سیاسی ئەمریکی دەڕوات کە پشت بەم پرەنسیپانە دەبەستێ:

١. دروست کردنی یەکێتیەکی تۆکمەتر، لە دابینکردنی داواکارییەکانی بەرگری هاوبەش بۆ بڵاوکردنەوە و چەسپاندنی دادپەروەری و دابینکردنی باشترین ئازادی بۆ ئەنجومەنەکانی ئێستا و داهاتوو، تاپێش ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی بۆ (مافەکانیـان هەڵسوکەوتی لێوەبکرێ) دوای هەمـوو خەڵکی کەوتبوو بە سیفەتی ئەوەی مرۆڤن بـۆ هـیچ حوکمێـک نـیە بـێ بەشـی بکـات، بەڵام باشـترین ڕێـگەیە بـۆ دابینکردنـی دادپەروەری و باشترین ئازادی (لەوکاتەدا وەک ئەمڕۆ). [٢]

٢. بابەتی ئاڵوگۆڕی حزبی بوو، کاتێ بۆ یەکەمجار دەستور داڕێژرا و خرایە بەردەم ویلایەتەکـان بـۆ پەسـەندکردنی مادەکـانی، هـیچ ئامـاژەیەکی تـاکلایەنی لە شیکردنەوەکان بۆ دانەرەکانی تێدا نەبوو، ئەمەش دانەرانی دەستور وایـان دانـاوە حـوکمی نەتەوەی دروسـتکەری تـازە دەسـتووردار بـوو بە ڕەچـاوکردنێکی زۆر کە پاراستنی مافەکانیان کە پێویستی پاراستنی زیاتر نەبوو، ئەمەش پشتگیرەکانی تری سیسـتمی فیـدراڵی دەریانخسـتووە ژمـارەی زیـاتری مافەکـان دەبـێ بەهـۆی زیـاتر

---

١ - فرحات زيادة: س-پ، ل ٦٧.

٢ - د.رأفت غنيمى الشيخ: امريكا والعالم، ص ٤٨-٤٩.

بوونی بەرپرسیارێتیەوە بێت واتە مافە بنەڕەتیەکان و ئەوەی کە دیاری نەکراون دووچاری دەستدرێژی حکومەت نەبن.[1]

سەرەڕای ڕووخاندنی پشتگیری فیدراڵیەت بۆ جەنگی دارشتنی دەستوری ساڵی (١٧٨٧) توانییان لەگەڵ دژەکانیاندا لە بەرپرسیارێتیان لە دەسەڵاتی حکومەتی نەتەوەیی تازەدا چەند سازشێک بکەن و داوای ئەوەیان کرد دەقی دەستوری کۆمەڵێ پاراستنی دیاریکراوی مافەکانی تاکی تیادابێ.[2]

لەوە زیاتر چەند بەڵێنێک یان پێشگیرەکانی فیدراڵی تریان وەرگرت و لە هەندێ کۆنگرەکاندا کە لەویلایەتەکاندا بەسترابوون یارمەتیدانی ڕەزامەندی لەسەر دەستکاری بە پەسەندکردنی دەستور، هەڕەشەی لە هەندێ لە ویلایەتەکان دەکرد بە پەسەندکردنی دەستور، چەند گرنتیەکی دەست نەکەوت بە ڕازی بوون لەسەر بەڵگەنامەی مافەکان پشتگیرانی فیدڕاڵیەت هەستان بەجێ بەجێکردنی بەڵێنەکانیان لە ساڵی (١٧٨٩)دا کۆنگرێسی ویلایەتە یەکگرتووەکان دەستکاری دەیەمی کرد لە دەستوردا و بەهاتنی ساڵی (١٧٩١) بەڵگەنامەی مافەکان کە دەستکاری یەکەمی دەستور لەلایەن ژمارەیەکی پێویست پەسەندکرا ڕاشکاوانە مافەکانی دەپارێزێ کە دەستوری بێ، بە تایبەت لە بارەی فراوان کردنی پاراستنی مافەکانی باس نەکرا بوون بۆ مەترسی لە کاتێکدا باسی مافێکی دیاری کراو کرابوو.[3]

---

١ - کارلهاینتس دشنر: س-پ، ل ١٤٠.

٢ - د.صلاح احمد هريدي: دراسات في التاريخ الأمريكي،ص ٨٤.

٣ - ديب علي حسن:الولايات المتحدة الأمريكية،ص١٧٥.

## کۆبوونەوەی دەستووری

لە ساڵی (١٧٨٦) لەشاری (انـاپولس) لە ویلایەتی ماریلاند کۆنگرێس کۆبوونەوەیەکی بەست بۆ تاوتوێکردنی ئەو کتێبانەی پەیوەندییان بە مادەی یەکگرتنی کۆنفیدراڵیەوە هەبوو، لەو کۆبوونەوەیەدا پێشنیارێک لە لایەن هاملتون و هەندێکی ترەوە پێشکەشکرا تێیدا ویلایەتە یەکگرتووەکانیان بانگ کرد بۆ کۆنگرێس ئەمەش بەوەی کە دواکرا لە فلادلفیا، کۆنگرێس کۆبوونەوەیەک بکات لەو بارەیەوە، ئەم کۆبوونەوەیە کرا لە ڕۆژی (١٤)ی مایوی (١٧٨٥) و ئامانجی ئەم کۆبوونەوەیە چاوگێڕانەوە بوو بە مادەکانی یەکگرتن و کۆنفیدراڵی تێدا لە حکومەتێکی تازە نزیکی بکەنەوە، بەڵام گۆڕینی مادەکانی یەکگرتن و کۆکردنەوەی لەسەر ویلایەتەکانی کارێکی ئاسانە.[1]

### دانانی دەستوور

بەم شێوەیە ئەندامانی کۆنگرێس دەستوری لە (٥)ی ئایاری ساڵی (١٧٨٧) هەر لەو شارەی بڕیاری سەربەخۆییان تێدا دەرکرد بوو کۆبوونەوە بۆ دانانی سیستەمی فەرمانڕەوایی و دیاریکردنی چۆنیەتی ئەو حکومەتەی کەدەیانەوێت دایبمەزرێنن، ئەم کۆنگرەیە بەناوبانگترین بیرمەندانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی تێدابوو، ژمارەی نوێنەرەکان (٥٥) کەس بوون.[2]

لەو پیاوە مەزنانەی کە لە حوکم و مەیدانی شەڕەکاندا ڕابردووی بە ناوبانگیان هەبوو ئەمانە نوێنەری ویلایەتەکان بوون جگە لە رود ئایلاند، کە کۆماریان دامەزراند لەوانە (جۆرج واشنتن وهاوڕێکانی) ئەمە کوتایە هەرچەندە بەرهەڵستیان هەبوو بۆ بڕیاردانی ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی، بەڵام لەسەر هەموو شتێکەوە دڵسۆزییان بۆ ویلایەتەکان هەبوو، هەروەها مادیسۆن لە هەمووان زیاتر بەشداری کرد لە ئیشکردنی بۆ دەستوور جگە لەمانە پیاوی سیاسی و یاسایی و ڕۆژنامەنووسی بەشداری دانانی دەستوریان کرد و هەمووشیان لە (فیلادلفیا) یەکێتی بە هێزی هەمیشەیی و ئیجابی نەتەوەی تازەیان دانا.[3]

---

١ - د.عبد العزيز سليمان و د. عبد المجيد نعنعي: تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية الحديث، ص ٨٦

٢ - فرحات زيادة و ابراهيم فريجي: ص ٦٤.

٣ - مايكل كامن:الدستور في ثقافة الأمريكية، ترجمة- أحمد ظاهر،دار الفارس للنشر والتوزيع،الطبعة الاولى، عمان،١٩٩٦،ص٧٧.

**دەسەڵاتی دام و دەزگاکان:-**

**١.دەسەڵاتی یاسادانان**

ئەم دەسەڵاتە لە هەردوو (ئەنجومەنی نوێنەران و ئەنجومەنی پیران) پێکدێت، بە هەردوو ئەنجومەنەکەش دەوترێت کۆنگرێس.

هـۆی سـەرەکیش لە پێکهێنـانی ئەم دوو ئەنجـومەنەدا لە لایەک پاراسـتنی هاوسـەنگی نێـوان ویـلایەتە گەورەکـان و بچووکەکـان و لەلایەکـی تریشـەوە دەرخستنی شێوەی (دەوڵەتێکی یەککگرتوو) بوو.[1]

**أ. ئەنجومەنی پیران (مجلس الشیوخ)**

بەپێـی بـڕگەی (٣) لە مـادەی یەکەمـی دەسـتوری ئەمریکـی: (ئەنجـومەنی پیـران پێکـدێت لە (٢) ئەنـدام بـۆ هەر ویلایەتێـک، کە لەلایەن دەسـتەی یاسـادانەرانی ئەو ویـلایەتەوە دیـاری دەکـرێن، و مـاوەی ئەنـدامێتی لەم ئەنجـومەنەدا شـەش سـاڵە، هەروەها ئەو کەسەی دەبێتە ئەندام لە ئەنجومەنی پیران، دەبێت لە (٣٠) ساڵ کەمتر نەبێت، وە (٩) ساڵ بەسەر دانیشتنی لەو ویلایەتەدا تێپەڕبووبێ).[2]

مەبەست لە پێکهێنانی ئەم ئەنجومەنە ڕاگرتنی هاوسـەنگی تەرازووی دەسـەڵاتە لە نێـوان ویلایەتەکانـدا بـێ گوێـدانە ڕووبەرەکەی بـۆئەوەی ویـلایەتە گەورەکـان خۆیان بەسەر ویلایەتە بچووکەکاندا زاڵ نەکەن، هەر ویلایەتەش بتوانێت خەسڵەتە تایبەتیەکانی خۆی بپارێزێت.[3]

کـۆنگرێس کە پێشـتر ئاماژەمـان بـۆ کـردووە لە دوو ئەنجـومەنی سـەرەوە پێکهاتووە، چەندین وەزیفە و دەسەڵاتی سەرەکی خۆی هەیە لەوانە:

١. دەتـوانی بە زۆریـنەی (٢/٣)ی دەنگەکـانی هەردوو ئەنجـومەکە گۆڕانکـاری لە دەستوردا بکات.

٢. لە چوارچێوەی سنووری دەسەڵاتەکانی خۆیدا یاسا بۆ ئەمریکا دەربکات.

٣. توانای دانان و لابردنی گومرگ و باجی هەیە.

٤. پەسـەندکردنی بـودجەی حکـومەتی فیـدڕاڵی و کـۆنترۆڵی جـێ بەجێکردنیشـی دەکات.

---

١ - المادة(١) الفقرة(١) من الدستور الأمريكي.

٢ - المادة(١) الفقرة(٣) من الدستور الأمريكي.

٣ - د.ياسين العيثاوي: السياسة الأمريكية بين الدستور والقوى السياسية، ص٤٢-٤٣.

٥. بەپێی دەستور مافی لابردنی سەرۆک و کەسایەتیەکانی دیکەی هەیە لەسەر حوکم.

٦. دەسەڵاتی بە سەرۆک کۆمار بەخشیوە، کە جەنگ لە کاتی پێویستدا ڕایگەیەنێت.

٧. مافی سزادانی ئەندامەکانی هەیە لە کاتی سەرپێچی کردنیان لە سیستمی کارکردندا، دەتوانێ بە (٢/٣)ی دەنگی ئەنجومەن ئەندامانی سەرپێچی کاری کۆنگرێس دەربکات.[١]

ئەم دوو ئەنجومەنە لەبەڕێوەبردنی کارەکانیاندا پشتیان بەپێکهێنانی لیژنەی بەردەوام دەبەست ئەم لیژنانە دابەش دەکرێن بەسەر هەموو لایەنەکانی چالاکی یاسادانانەوە، ئەم لیژنانە هەڵدەستن بە بەستنی کۆڕی گشتی، دەسەڵاتی یاسادانان بۆی هەیە چەند لیژنەیەکی لێکۆڵینەوە دیاری بکات وەک خۆی پۆستی هەیە داوای ئەو کەسە بکات کە زانیاری پێی بۆ سودی کۆنگرێس.[٢]

لە حاڵەتی پەیدابوونی ناکۆکی لە نێوان هەردوو ئەنجومەنەکەدا لەسەر پرۆژە یاسایەک، ڕێگەی شیا و دروست کردنی لیژنەیەکی تایبەتە کە پێی دەڵێن لیژنەی ڕێککەوتن (لێک نزیکبوونەوە) کە لە ئەندامانی هەردوو ئەنجومەنەکە پێکدێت، هەوڵ ئەدەن بۆ نزیککردنەوەی دید و بۆچوونەکان، بەڵام لە حاڵەتی شکست هێنانی ئەم لیژنەیەدا پێویستە واز لەو پرۆژەیە بهێنرێت کە ناکۆکن لە سەری.[٣]

### ب. ئەنجومەنی نوێنەران (مجلس النواب)

ئەم ئەنجومەنە بە هەڵبژاردنی ڕاستەوخۆ لەلایەن دەنگدەرانەوە دروست دەبێت، لەسەر ئەو بنەمایەی هەر ئەندامێک نوێنەرایەتی (٣٠) هەزار کەس بکات، و ماوەی ئەندامێتی لەم ئەنجومەنەدا دوو ساڵە، دەستوری ئەمریکا چەند مەرجێکی بۆ ئەندامەتی ئەم ئەنجومەنە داناوە، دەبێت ئەو کەسەی دەپاڵێورێ تەمەنی لە (٢٥) ساڵ کەمتر نەبێت و هەڵگری ڕەگەزنامەی ئەمریکی بێت و نابێت ماوەی بە دەستهێنانی ڕەگەزنامەشی لە (٧) ساڵ کەمتر بێت.[٤]

---

١ - ديب على حسن:الولايات المتحدة الأمريكية،ص١٤٠-١٤٢.

٢ - د.ياسين العيثاوي: السياسة الأمريكية بين الدستور والقوى السياسية،ص٤٧.

٣ - هەمان سەرچاوە،ل٤٨-٤٩.

٤ - محمد محمود النيرب: س-پ،ل١١٥.

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت بەپێی ڕێژەی دانیشتوانەکانیان ژمارەی نوێنەرانی هەرێمەکان جیاوازە دەستوری ئەمریکی لە بڕگەی (٢) لە مادەی یەکەمیدا، ئاماژەی بە مەرجێکی دیکەش کردووە کە دەڵێت: (ئەوەی خۆی بەربژێر، دەبێ ئەمریکی بێ و خەڵکی خودی ئەو ویلایەتە) بێ.[١]

ئەمەش ڕێگرە لە بەردەم ئازادی تاکە کەسی ئەمریکیدا لەمەڕ خۆپاڵاوتنیان لە ناوچە جیاجیاکانی ئەمریکادا، جگە لەمپەرخستنە بەردەم مافی خۆ هەڵبژاردنیان کە دەشێ بەو هۆیەوە جاری واهەبێ کە نوێنەری ناشایستە بگاتە ئەنجومەنی نوێنەران.

تا یاسایەک دادەنرێت پێویستە لەلایەن هەردوو ئەنجومەنی پیران و نوێنەرانەوە (ڕازی بن لەسەری) بۆ دانانی یاسا نابێت هێز بە تەنها لە دەستی یەک لایەن دابێت، هێز و دەسەڵات دابەشکراوە لە بەینی هەردوولادا، ئەم دابەشکردنە کراوە لەبەر ئەوەی دانەری دەستوورەکان نهێنی هەڕەشەی دڵی مرۆڤ دەزانن کە مرۆڤ برسی هێزە، لەبەرئەوە دانەرانی دەستور بۆ دانانی یاسا هێزیان دابەشکردووە لە نێوان دوو گروپدا بۆ دانانی یاسا هیچ هێزێکیان نەداوە بە سەرۆک.[٢]

### ٢. دەسەڵاتی جێبەجێکردن

بەپێی دەستوری ئەمریکی سەرۆک بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ لەلایەن گەلەوە هەڵدەبژێردرێت بەڵام لە ڕووی کردارییەوە هەڵبژاردنی سەرۆک دەسەڵات بەچوار قۆناغدا تێدەپەڕێ، قۆناغی یەکەم بەوە دەست پێدەکات حزبە سیاسیەکان خۆیان هەڵدەبژێرن پاشان هاولاتیان هەڵدەستن بە هەڵبژاردنی هەڵبژێردراوەکانی سەرۆکایەتی کە ئەمانیش لە جیاتی گەل سەرۆک دەوڵەت و جێگرەکەی هەڵدەبژێرن ئەنجا هەڵبژاردنەکە دەنێردرێت بۆ ئەنجومەنی پیران تا ئاشکرایان بکات.[٣]

جا ئەو کەسەی زۆرترین دەنگ بە دەست دێنێت (ژمارەی دەنگەکانی هەڵبژێردراوی سەرۆکایەتی) ئەوا دەبێتە سەرۆکی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، پێویستە سەرۆکی هەڵبژێردراو ئەم مەرجانەی تێدابێت:

أ. پێویستە هاولاتیەکی لەدایک بووی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بێت.

---

١ - المادة(١) الفقرة(٢) من الدستور الأمريكي.

٢ - محمد محمود النيرب: المدخل في تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية،ص١١٦.

٣ - د.محمد مصطفى صفوت: الجمهورية الحديثة، دار المعارف،الاسكندرية، الطبعة الاولى،١٩٨٥،ص٥١.

ب. پێویسته ماوەی نیشتەجێ بوونی لە ولاتە یەکگرتووەکاندا لە (١٤) ساڵ کەمتر نەبێت.

ج. پێویستە تەمەنی لە (٣٥) ساڵ کەمتر نەبێت.[١]

ب. دەسەلاتەکان:

سەرۆکی ئەمریکا خاوەن دەسەلاتی جێبەجێکردنە و هەر خۆی سەرۆکی بالادەستە، بۆیە بەڕێوەبردنی کاروباری ئیداری لە دەسەلاتدا هەندێک لە فەرمانبەرە گەورەکانی تایبەت لە مەکتەبی جێبەجێکاری سەرۆک کار دەکەن بۆ بەڕێوەبردنی کارەکان یارمەتی سەرۆک دەدەن.[٢]

سەرۆک فەرماندەیەکی سەربازییە، سەرۆک هەر چوار ساڵ جارێک هەڵدەبژێرێت و نابێت بۆ زیاتر لە (٨) ساڵ ئەو پۆستەی بەدەستەوە بێت، سەرۆک کابینەکەی وا دەبێت: (وەزیری دەرەوە، وەزیری دارایی، وەزیری بەرگری، وەزیری داد، وەزیری ناوخۆ، وەزیری کشتوکاڵ، وەزیری بازرگانی، وەزیری کار، وەزیری تەندروستی و خزمەتی مرۆڤایەتی، وەزیری ئاوەدانکردنەوە و نیشتەجێ بوون، وەزیری پەیوەندییەکان، وەزیری وزە، وەزیری پەروەردە، وەزیری جەنگاوەرەکان و وەزیری ئاسایش)کە لەپاش ڕووداوەکانی (١١)ی سیپتمبری ساڵی(٢٠٠١) دانرا..[٣]

دەستوری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەسەلاتێکی جێ بەجێکردنی فراوانی بە سەرۆک کۆمار بەخشیوە، بۆیە هەر لەو ڕوانگەیەوە جاری وا هەبووە سەرۆک کۆمار بە(دیکتاتۆری دەستور)ی ناوبراوە، چونکە لەیەک کاتدا سەرۆکی دەوڵەت و سەرۆکی دەسەلاتی جێ بەجێکردنیشە. (دەسەلاتی ڕاپەڕاندنیش لە لایەن سەرۆک کۆمارەوە پەیڕەو دەکرێ بەتایبەت کە ڕژێمی سەرۆکایەتیە سەرۆک کۆمار ڕاستەوخۆ لەلایەن گەلەوە هەڵدەبژێردرێ و بەپێی دەستوری فیدراڵی، دەسەلاتی زۆری هەیە).[٤]

---

١ - المادة(٢) الفقرة(١) من الدستور الأمريكي.

٢ - ارسنت صربيفن:نظام الحكم في الولايات المتحدة الأمريكية،ترجمة- محمد عبد المعز،القاهرة،١٩٥٤،ص١٠٣.

٣ - د.ياسين العيثاوي: السياسة الأمريكية بين الدستور والقوى السياسية،ص٣٩.

٤ - وايث ابراهيم و واحيد رأفت: القانون الدستوري،مطبعة الانجلو المصرية، القاهرة،١٩٧٣،ص٣٤٠.

هەر لەبەر ئەوەشـە هەر تاکێک لە ڕێبـازی گەل لایـدا دادگـای (بـاڵا) بـۆی هەیە سزای بدات. سەرۆکی دەوڵەت ئەم تایبەتمەندیانەی خوارەوەی هەیە:

**١. دیاریکردن و لابردنی وەزیرەکان:**

لە وڵاتە یەکگرتووەکانـــدا نـــاوی وەزیرەکـــان بە ســـکرتێرەکانی دەبرێـــت، دیاریکردنیـــان لەلایەن ئەنجـومەنی پیـرانەوەیە و هەر بەهەمـــان شـێوەش مـافی لابردنیانی هەیە، وەزیرەکان لە دەسەڵاتدا بەشداری سـەرۆک نـاکەن بەڵکو یـارمەتی ئەدەن، بەپێی بڕوای خۆی بیروڕاکانیان وەردەگرێت یان وەریناگرێت، ئەو وەزیرەی کە سیاسەتی سەرۆکی دەوڵەتی بەدڵ نیە دەتوانێ وازبهێنێت.[١]

٢. دیـاریکردنی گەورە فەرمـانبەرە فیـدراڵیەکان دوای ڕەزامەنـدی ئەنجـومەنی پیران، دەتوانێت لاشیان بەرێت بە ڕێبازی یاسایی خزمەتی شارستانی.[٢]

٣. ســەرۆک ڕابەری سیاســەتی دەرەوەی دەوڵەت یەکگرتــووەکە دەکـات و وا دانراوە سەرۆک هێمایە بۆ نەتەوە و گەل و نوێنەری گەلە لەبەردەم دەوڵەتانی تـردا و پێشـوازی لە نێـردراوە دیبلۆماسـیەکانی دەوڵەتـان دەکـات و باڵوێزەکـانی وڵات دیاری دەکات و هەروەهـا خـاوەنی مـافی ڕێککەوتنە لەگەڵ دەوڵەتـی تردا لەڕێگەی یـــارمەتی یاریـــدەدەرەکانیەوە لە وەزارەتـــی دەرەوە، هەر ســـەرۆکی دەوڵەتە کە ڕێکەوتننـــامە و هاوپەیمـــانی نێـــودەوڵەتی دەبەســـتێت، بەڵام پـــاش ڕەزامەنـــدی ئەنجومەنی پیران و دەسەڵات دەبێت دان بنێت بە حکومەتە تازەکاندا.[٣]

٤. لە دەســـەڵاتەکانی ســـەرۆک ئەمەیە کە ســـەرکردایەتی ســـوپا دەکـــات و بەسـەرۆکی گەورەی سـوپا دادەنرێت خۆشـی شـەڕ و جەنگ بەڕێوە دەبات. بەڵام لەسـەر بڕیـاردانی شـەڕ کۆنگرێسـیش تیایـدا هاوبەشـە، سـەرۆک دەتـوانێ داوا لە کـۆنگرێس بکـات بـۆ ئەوەی چەنـد دەسـەڵاتێکی کـاتی (استسـنائی) فراوانـی بـداتێ دەربـارەی جەنـگ بـۆ ڕووبەڕووبـوونەوەی ئەو بـارودۆخە ناکـاوانەی ڕووبەڕووی گەل دەبنەوە.[٤]

---

١ – محمد محمود النيرب: س–پ،ل١١٧.

٢ – بدون مؤلف:معلومات وحقائق عن الولايات المتحدة الأمريكية،١٩٥٦،ص٢٢.

٣ – محمد محمود النيرب: س–پ،ل١١٧.

٤ – د.صلاح احمد هريدي: دراسات في التاريخ الأمريكي،ص ٨٦.

٥. سەرۆک خاوەنی مافی لێبوردنە و بۆی هەیە لە تاوانبار ببوورێت و ڕاستەوخۆ دوای حوکمدان یا لەکاتێکدا لە بەندیخانەدا بێت، هەروەها بۆی هەیە لێبوردن دەربکات، سەرۆک بۆی هەیە لە حاڵەتی شەڕی ناوخۆ و ڕاپەڕین و شۆڕشدا پاش وەستانی دژایەتیەکە لێبوردنی گشتی دەربکات. [1]

### ٣. دەسەڵاتی دادگایی باڵای فیدراڵی

ئەم دەسەڵاتەش خۆی لە دادگای باڵای ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا دەبینێتەوە، کە قورسایی و مەزنیی تایبەتی خۆی هەیە بۆ نموونە:

دەسەڵاتی دادوەری بەپێی بڕگەی (١) لە مادەی (٣)ی دەستووری ئەمریکی بە تەنها بە دادگای باڵای ئەمریکا بەخشراوە، ئەم دەسەڵاتەش بەردەوام لە چاودێری هەردوو دەسەڵاتی یاسادانان و جێ بەجێکردندایە بۆ ئەوەی لە سنووری خۆیان دەرنەچن، (بە گوێرەی دەستوری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا) کۆنگریس بەرپرسە لە دەسەڵاتی یاسادانان، هەر کاتێک کۆنگریس سنووری خۆی ببەزێنێ و دەسەڵاتێکی زێدەتر بەیەکێ لەبریکارەکان یان پیشەیەکی دیکە بدات، دادگای باڵا دەتوانێ ئەم زیدەڕۆییەی کۆنگریس پووچەڵ بکاتەوە. [2]

دەسەڵاتی دادوەری بەخشراوە دادگای باڵای فیدراڵی و هەندێک دادگای نزمتر لەلایەن سەرۆکی وڵاتەوە بۆ هەتا هەتایە دامەزران، هەربۆیە دادگای باڵا دەستەبەری پاراستنی سەرجەم ئازادی هاوڵاتیان و مافە مەدەنی و سیاسیەکانیانە، چونکە ئەم دادگایە لە سنور و بازنەی ڕای گشتیدا کاردەکات و هێز و توانای خۆی لە جەماوەرەوە وەردەگرێ.

دادوەر (فلیکش فرانکفۆر) سەبارەت بە دەسەڵاتی دادگای باڵا دەڵێت:

(دەسەڵاتی دادگا کە نە ماڵی هەیە و نە شمشێر، بە شێوەیەکی ئاسایی و بەردەوام دەسەڵاتی خۆی لە متمانەی خەڵکیەوە وەردەگرێت). [3]

دادگای باڵا بەیەکێ لە گرنگترین دەزگاکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەژمێردرێت، بەڕاستی ئاوێنەیەکی ڕوونە بۆ دەرخستنی سەرجەم بیرو بۆچوونەکانی کۆمەڵگەی ئەمریکی، لە ڕووی سیاسیەوە دادگا لە بەهێزکردنی

---

١ – كارلهاينتس دشنر: تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية الحديث، ص ١٤١.

٢ – المادة(٣) الفقرة(١) من الدستور الأمريكي.

٣ – د.ياسين العيثاوي: السياسة الأمريكية بين الدستور والقوى السياسية،ص٥٠.

یەکێتی ئەمریکادا ڕۆڵێکی گرنگ دەبینێ، لە ڕووی کۆمەڵایەتیشەوە هەمان ڕۆڵ دەبینێ لە پاراستنی سەرجەم ئازادیەکانی هاوڵاتیاندا، بۆیە بە پاسەوان و لێکدەرەوەی دەستوور دەژمێردرێت.

هەروەها ئەم دادگایە لە هەموو ئەو کێشە یاساییانە دەکۆڵێتەوە کە ڕەنگە لەکاتی پەیڕەوکردنی دەستوور و یاسا فیدراڵیەکان و پەیمانە مۆرکراوەکاندا بێنە پێش، هەروەها لەو کێشانە دەکۆڵێتەوە کە ڕەنگە لەنێوان دوو ویلایەت یان لە نێوان چەند ویلایەت یان لەگەڵ بێگانەدا ڕووبدەن. (١)

ئەمەش پاش ئەوەی کۆنگرێس ڕەزامەندیان لەسەر دەردەبڕێت، لەپاڵ دادگای فیدراڵیشدا هەر ویلایەتە و بۆ ڕێکخستنی کاروباری دادوەری خۆی خاوەنی دادگای تایبەت بە خۆیەتی، دەسەڵاتەکانی دادگای فیدراڵیش خۆی لەمانەی خوارەوەدا ئەبینێتەوە.

١. چاودێریکردنی ئەو یاسایانەی لە دەستووردا هاتووە.

٢. پیاچوونەوە بەو کێشانەدا لە نێوان دەسەڵاتی فیدراڵی دەسەڵات و لایەنەکاندا یان لە نێوان ویلایەتەکان خۆیاندا ڕووئەدات.

٣.چاودێریکردنی یاسای ویلایەتەکان بۆ دڵنیابوون لەوەی تاچەند لەگەڵ دەستووری فیدراڵیدا دەگونجێت، لەپاڵ هەموو ئەمانەشدا سەرۆکی ئەم دەزگایە بەپێی دەستووری فیدراڵی هەڵدەسێت بە دوو کاری زۆر گرنگ: (٢)

أ. سەرۆکایەتی ئەنجومەنی پیران دەکات لە کاتێکدا ئەم ئەنجومەنە هەڵئەستێ بەدادگایی کردنی سەرۆکی وڵات.

ب. سەرۆکی وڵات لە کاتی دەست بەکاربوونیدا دەبێت لەبەردەم سەرۆکی دادگای فیدراڵیدا سوێندی دەستوور بخوات. (٣)

دەسەڵاتی حکومەتی ناوەندیش بەشێوەیەکی گشتی هەریەکە لە کاروباری (دەرەکی، بەرگری، ڕاگەیاندنی جەنگ و ئاشتی و کاروبارەکانی دارایی و بازرگانی) دەگرێتەوە و دەسەڵاتەکانی تریش بۆ ویلایەتەکان خۆیان جێهێڵراوە، دەسەڵاتی ئەم دادگایە ئەوەندە فراوانە دەتوانێ خودی سەرۆک کۆماریش بانگێشی دادگایی کردن

---

١ – كمال المنوفي: أصول النظم السياسة المقارنة، شركة الربيعان للنشر والتوزيع،الكويت،١٩٨٧، ص٢٥٩.

٢ – لارى الوتيز: نظام الحكم في الولايات المتحدة الأمريكية،ترجمة-جابر سعيد عوض،الجمعية المصرية للنشر،القاهرة،١٩٩٦،ص ٢٢١.

٣ – د.ياسين العيثاوي: السياسة الأمريكية بين الدستور والقوى السياسية،ص٥٤.

بکات، یەکێک لە دیارترین دەسەڵاتەکانیش لە کێشەی (وترگیت)دا بە دەرکەوت، لە ڕۆژی (٢٤)ی یولیوی ساڵی (١٩٧٦) بڕیاری دەربارەی کێشەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دژی نکسون دەرکرد، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە دەبێ هەموو ملکەچی دەستووربین و بەبێ جیاوازی، بێگومان ئەم بڕیارە بووە هۆی خراپی چوونە پێشەوەی ڕووداوەکان دواجار بووە هۆی لە کارخستنی نکسون لە (٨)ی ئۆغستسی هەمان ساڵدا.[١]

دادگای باڵا لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا لەسەرووی هەموو دەسەڵاتی دادگاییەوە دادەنرێت، دەسەڵاتی دادگایی لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا بەم شێوەیە.

١. دادگای باڵای فیدراڵی.

٢. دادگای پیاچوونەوە.

٣. دادگای بەشەکان یان دادگا سەرەتاییەکان.

٤. دادگا تایبەتیەکان. [٢]

لە سەردەمی ئێستادا دادگای باڵا لە سەرۆکێک و (٨) ئەندام پێکدێت بە ڕەزامەندی ئەنجومەنی پیران لەلایەن سەرۆکەوە دیاری دەکرێت، ئەندامێتی لەو دادگایەدا دیاری نەکراوە لە ڕووی کاتەوە، بەجۆرێک کە لەکارەکەی خۆیدا بەردەوام دەبێت مادام باش کارەکانی بەڕێوە دەبات. [٣]

کەم و کورتیەکانی سیستمی ڕامیاری

هەرچەندە کۆنگرێس لە سەرجەم لایەنەکانی ژیاندا پێشکەوتنێکی بەرچاوی بینی، بەڵام لە هەندێ حاڵەتدا دەسەڵاتێکی ئەوتۆی نەبوو تا هەموو چاکسازیەکان جێبەجێ بکات، کەم و کورتیەکانیش ئەمانەن:

١. شەرعیەت و دەسەڵاتێکی ڕاستەوخۆی بەسەر گەلدا نەبوو لەبەر ئەوەی لە بەڕێوەبردنی بازرگانیدا توانایەکی تەواوی نەبوو.

٢. لەجێ بەجێکردنی یاسادا کەمتوانا بوو، دادگایەکی مەرکەزی بۆ شیکردنەوەی ئەو یاسایانە نەبوو.

٣. بە هۆی خەرجکردنی ئەو هەمووە پارە زۆرەی کە لە شەڕدا سەرف دەکرا باری ئابووری ڕووی لە خراپیبوون کرد، ئاڵوگۆڕکردنی دراو کە نرخەکەی دابەزی

---

١ - ديب علي حسن:الولايات المتحدة الأمريكية،ص١٥٢.

٢ - د.ياسين محمد العيثاوي: س-پ،ص٥٣-٥٧.

٣ - لاری الوتيز: س-پ، ل ٢٢٢.

بوو بە هۆی دانەنانی لەسەر بنەمایەکی پتەو و باڵادەست بوونی ئینگلیز و فەرەنسا لە دانانی ڕێگری زۆر لەپێناو ئاڵوگۆڕی بازرگانیدا و سوود بینین لەلاوازی کۆنگرێس و بێتوانایی ئەمریکا لە بەرگریکردن.

٤. هەروەها قەدەغەکردنی بەکارهێنانی کەشتیە ئەمریکیەکان لە ڕووباری میسپی لەلایەن ئیسپانیەکانەوە.

٥. ئەمیرەکانی مەغریب لە باکووری ئەفریقا داوایان لە ئەمریکا کرد بڕێکی زۆر پارە بدەن بەمەغریب لەبەرامبەر ڕێگەدانی کەشتیە ئەمریکیەکان تا بە سەلامەتی لە ئاوەکانی مەغریبدا هاتوچۆ بکەن.

٦. لە هەمانکاتدا کۆمەڵێک کێشەی سنووری لە نێوان ویلایەتە ئەمریکیەکاندا دروست بوو کە زۆرجار بوو بە هۆی شەڕو دانانی خاڵی گومرگی لەسەر بەروبوومی ویلایەتەکانی تر لەسەر سنوورەکانیان، ئەمەش پێشکەوتنی بازرگانی دواخست. (١)

### دانانی یاسا لە ئەمریکا

١. ئەندامێک لە ئەنجومەنی نوێنەران لیستەکەی خۆی دەدات بە ئەندامەکانی تری ئەنجومەنەکە، لیستەکە بیروباوەڕی خۆیەتی بۆ یاسا.

٢. کۆمیتەی ئەنجومەنەکە، لیستەکە دەخوێنیتەوە و دەنگی خۆیان دەدەن، ئەگەر کۆمیتە ڕەفزی لیستەکە بکاتەوە ئەوە ئەو یاسایا لە ناودەچێت و ئەگەر کۆمیتەکە ڕازی بێت بە لیستەکە بە زۆرینەی دەنگ ئەدا دەچێت بۆ مەجلیسی گشتی.

٣. هەموو ئەنجومەنەکە لیستەکە دەخوێننەوە و دەنگی خۆیان دەدەن ئەگەر هەموویان ڕازی نەبوون ئەوا ئەو یاسایە ڕەفز دەکرێت و ئەگەر کۆمیتەکە ڕازی بێت بە لیستەکە ئەوا دەچێتە بەردەم هەموو ئەندامانی ئەنجومەنی پیران.

٤. کۆمیتەی ئەنجومەنی پیران لیستەکە دەخوێننەوە ئەگەر ڕازی بن بە لیستەکە ئەوا دەچێتە بەردەم هەمووئەندامانی ئەنجومەنی پیران.

٥. پیرەکان (سیناتۆرەکان) لیستەکە دەخوێننەوە ئەگەر ڕازی نەبن پێی ئەوا ئەو یاسایە لە ناودەچێت و ئەگەر ڕازی بن ئەوا ئەو یاسایە ڕادەگەیەنرێت و دەبێتە بڕیار و دەچێتەلای سەرۆک.

---

١ - فرحات زيادة و ابراهيم فريجي: تاريخ الشعب الاميريكي،ص ٦٧-٦٨.

٦. ئەگەر سەرۆک ئیمتیازی هەبێت (رازی نەبێت) بڕیارەکە دەگەڕێتەوە بۆ کۆنگرێس، ئەگەر هەردوو ئەنجومەن پیران و نوێنەران دەنگی خۆیان بدەن بە رێژەی (٢\٣) ئەوا ئەو بڕیارە دەبێتە یاسا. سەرەڕای ئەوەی کە سەرۆک ڕازی نەبێت.

٧. ئەگەر سەرۆک ڕازی بێت بەو بڕیارە یان ئەگەر کۆنگرێس بە (٢/٣)ی دەنگەکان ڕازی بێت بە بڕیارەکە ئەوا دەبێتە یاسا.[١]

## فیدڕالیەت

باوکە دامەزرێنەرانەکان بڕیاریان دا بە دابەشکردنی دەسەڵات لە نێوان دوو ئاستی حوکمدا ئاستی وڵات بە گشتی یان ئاستی نەتەوەیی و ئاستی ویلایەتەکان، و نەبوونی توانای مادەکانی سیستمی کۆنفیدراڵی (١٧٨١- ١٧٨٧) لە دروستکردنی حوکمێکی زیندو و بۆ زەوی ئەمریکیەکان بوو بەهۆی هەڵسانی نێراوکانی کۆنگرەی دەستووری زیاتر لە دەسەڵات بەحوکمی ناوەندی.[٢]

مادەکانی سیستمی کۆنفیدڕاڵی وەکو پردێ وابوو لە نێوان ئەو سیستمی حوکمەی کە کۆنگریسی کیشوەری دروستی کردووە، لە ماوەی قۆناغی شۆڕش و نێوان سیستمی حوکمی فیدڕاڵی کە دەستوری ئەمریکی دروستی کردووە لە ساڵی (١٧٨٧) لەبەرئەوەی لە بیری پەیوەندیدارەکاندا ئەزموونی دەسەڵاتی ناوەندی بەریتانیای دەسەڵاتدار ڕوون بوو، لە کاتی قۆناغی شۆڕشیدا دانەرانی مادەکان ئەو دەستورە کۆنفیدڕاڵیان دامەزراند لە ویلایەتە سەربەخۆکاندا، بەڵام ئەم مادانە داوای دەسەڵاتی سەپاندنی ماڵ و سەربازانەی لە ویلایەتەکانیان دەکرد و نەیدەبەخشیە کۆنگرێس، لە کۆتایی ساڵی (١٧٨٦) چالاکی حوکمدار بە کۆنگرەی دەستوری ئەمریکی فیدراڵیەت جێگەی کۆنفیدڕاڵیەتی گرتەوە، فیدڕاڵیەتیش سیستمێکە دەسەڵاتی یەک حکومەتی ناوەندی یان نەتەوە دابەش نەکرێ لەگەڵ حکومەتەکانی ویلایەتەکاندا، دەستور داوای حکومەتێکی دەستوری دەکرد کە لەهەندێ لە بوارەکاندا خاوەنی دەسەڵاتی باڵا بێت، بەڵام حکومەتی ویلایەتەکانی نەکردووە بە

---

١ - ديب علي حسن: س-پ،ل١٤-١٤٥.

٢ - محمد محمود النيرب: المدخل في تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية،ص١١٧.

یەکەی کارگێری پاشکەوتەکە بە حکومەتی ناوەندی، پاراستنی مافی ویلایەتەکان بە چەند شێوەیەک دانراوە. [1]

**یەکەم:** دەستکاری دەیەمی دەستور ڕوونی کردووەتەوە کە ژمارەیەک لە بواری کارکردنی حکومی هەیە تایبەت کراوە بۆ ویلایەتەکان بۆ نموونە بە شێوەیەکی گشتی حکومەتی ویلایەتەکان بەرپرسیارن لە بەڕێوەبردنی بوودجەکەیان لەگەڵ دانان و جێبەجێکردنی یاسا کە لە زۆر بواردا کاردەکاتە سەر ژیانی دانیشتوان. [2]

**دووەم:** پاراستنی ویلایەتەکان لە ڕێگەی نوێنەرایەتی کردن لە ئەنجومەنی پیرانی ئەمریکادا بۆ هەر ویلایەتێک ژمارەی دانیشتوانی هەر چۆنێ بێ دوو ئەندامی داناوە لەو ئەنجومەنەدا.

**سێیەم:** دەستەی هەڵبژاردنی دانا کە ویلایەتەکان هەڵی دەبژێرن بە شێوەیەک کە هەر ویلایەتێک بەلای کەمەوە سێ نوێنەری هەبێ.

**چوارەم:** لە کاتی دەستکاری دەستووردا خۆی ڕەچاوی بەرژەوەندی ویلایەتەکانیانی کردووە لەبەرئەوەی هەردەستکارییەکی دەستور پێویستە ڕەزامەندی سێ چارەکی هەموو دەستەی یاسادانەرەکانی لەسەر بێ لە ویلایەتەکاندا کە ڕەزامەندی (٢/٣)ی ئەندامانی ئەنجومەنی کۆنگرێس لە دەست بە سەراگرتنی ویلایەتە گەورەکان دابەشکرد. [3]

---

١ - د.صلاح احمد هريدي: س-پ،ل٨٧

٢ - ستيظن فنسنت بنية:أمريكا،ص ٨٠

٣ - ديب على حسن:الولايات المتحدة الأمريكية،ص١٩٠-١٩١.

## ژیانی ئابووری وسیاسی و کۆمەڵایەتی

دوای ئەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکان دەستیگرت بەسەر زەویەکانی خۆرئاوای کەناری ڕووباری مسیسپی تا زەریای باسیفیکیدا ژمارەی دانیشتوانی ئەو ناوچانە بە تایبەت لە دۆڵی مسیسپی دەستیانکرد بە زیادبوون، ئەوە بوو ژمارەی دانیشتوانی وڵاتە یەکگرتووەکان لەساڵی (١٧٩٠) (٣,٩٢٩,٠٠٠) کەس بووە، لەساڵی (١٨٣٠) زیادی کردووە بۆ (١٢,٨٦٦,٠٠٠)، بەڵام لە سەرژمێری ساڵی (١٨٥٠)دا گەشتە نزیکەی (٢٣,١٩١,٠٠٠) وە (٩٥%)ی دانیشتوان لە ساڵی (١٧٩٠)دا لە ڕۆژهەڵاتی چیای ئەپلاتشیان نیشتەجێ بوون، لەساڵی (١٨٥٠) ڕێژەی ژمارەی دانیشتوان (٥٥%) زیاتر بوو، ئەوەندە بەسە بەڵگە بێت لەسەر گرنگی زەویەکانی خۆرهەڵات کە (٤٥%) بێت، ڕێژەی دانیشتوان لەو ماوە کەمەدا ئەم زیاد بوونەی ژمارەی دانیشتوان لە ماوەی (١٠) ساڵدا واتە (١٨٢٠- ١٨٣٠) شتێکی ئاسایی و سروشتی بووە و ژمارەی کۆچبەران لە (٥٠٠) هەزار تێپەڕی نەدەکرد، بەڵام لە ماوەی ئەو (٢٠) ساڵەی بەدوای ئەو (١٠) ساڵەدا هات دوو ملیۆن و (٥٠٠) هەزار کۆچ کردوو هاتنە ناو وڵاتەوە و زۆربەیان خەڵکی بەریتانیای مەزن و ئیرلەندە و ئەڵمانیا بوون.[1]

ویلایەتە یەکگرتووەکان دوای ئەو شۆڕشەی تیایدا ڕوویدا (٥) شاری گەورە زیاتری تیانەبوو کە ژمارەی دانیشتوانی هەریەکە لەو شارانە لە (٨) هەزار تێپەڕی نەدەکرد، دواتر لە ساڵی (١٨٥٠)دا ژمارەی ئەو شارانەی هاوشێوەی ئەو (٥) شارە بوون گەشتنە (١٤١) شار کە ئەم شارانە (١٦%)ی دانیشتوانی وڵاتیان پێکدەهێنا.

لە هۆکارەکانی زیادبوونی پیشەسازی لە وڵات وازهێنانی پیاو و ژن و منداڵ بوو لە کشتوکاڵ و کۆچ کردنیان بوو بۆ شارەکان بۆ کارکردن لە پیشەسازییە جیاوازەکاندا. ژمارەی ئەو کۆچکردووە ئەورووپیانەی هەوڵی کارکردنیان ئەدا زیادی ئەکرد.[2]

لە سەرژمێری ساڵی (١٨٦٠)دا هاتووە سێیەکی دانیشتوان بۆ دابین کردنی بژێوییان پشتیان بە کشتوکاڵ بەستووە، خاوەن کارگەکانیش بە هاتنی کۆچ کردووەکان دڵخۆش دەبوون، چونکە پێویستیان بە کرێکار هەبوو، ئەمەش پاش

---

١ - فرحات زيادة و ابراهيم فريجي: تاريخ الشعب الأمريكي،ص ٨٤.

٢ - تشارلز و ماري بيرد: تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية،ج١/ص ٢٤-٢٥.

گەورەبوونی بەرنامەی پیشەسازی لە وڵاتدا، بەبێ ئەوەی گوێ بدەنە ڕەگەز و ئایینی کۆچبەران بەڵکو تاکە مەبەستیان سوود وەرگرتن بوو لەکارەکەی.

بەهۆی ئەمانەوە دەرگاکانی ئەمریکا بۆ گەڵنی جیهان کرانەوە، ئارەزووی کۆچکردووە ئەوروپییەکان بۆ کۆچکردن زیادی دەکرد بە هۆی ئەو چەرمەسەریەی لە جیهانی کۆن لە ناوەڕاستی سەدەی ڕابردوودا بە سەریاندا هاتبوو.[1]

ناڕەحەتی گوزەران لە ئینگلتەرا گەشتبووە ئاستێ بەرپابوونی بزووتنەوەیەک لە نێوان کرێکاراندا بە مەبەستی بەدەستهێنانی هەندێ مافی سیاسی، بزووتنەوەکەش بە (تشارلست) ناسرا، جووتیارەکانی ئیرلەندای کاپولیک خراپترین گوزەرانیان هەبوو لە بەرئەوەی ژێردەستەی دەرەبەگەکانی ئینگلیز بوون، لەسەریان پێویست بوو کرێی زەویەکەیان بدەن بە دەرەبەگە ئینگلیزەکان و (١/١٠) بدەن بە کەنیسەی (الانكليكانيە) بەو سیفەتەی کەنیسەیەکی ڕەسمیە، ئەمەش بەپێی ئەو یاسانەبوو کە پەرلەمانی ئینگلیز دایانابوون و لە ڕاستیدا دادپەروەرانە نەبوون.

لە نێوان ساڵانی (١٨٤٥- ١٨٤٦)دا برسێتی ڕووی لە زیادبوون دەکرد، هۆکاری ئەم زیادبوونەش کەمبوونەوەی بەروبوومی پەتاتە بوو، پەتاتە خواردنێکی سەرەکی ژیانیان بوو، کەم دەستیەکی زۆر ڕووی تێکردن و زۆرێکیشیان لە برسا مردن، تەنانەت زۆریان دەمیان لە گژوگیای سەر ڕێ گیردەکرد بەو هیوایەی برسێتیان نەهێڵێ، بەلام دواتر بە مردوویی لە لاڕێگاکاندا دەبینران.[2]

لەبەر ئەوە بۆ بەدەست هێنانی بژێوی و بەدەست هێنانی ئازادی، بە خێرایی ڕوویان لە ئەمریکا دەکرد، ژمارەی کۆچکردوان زیادی دەکرد بەڕادەیەک کە لەماوەی (٢٠) ساڵدا ژمارەیان زیاتر لە نیوەی چینی کرێکارانی ئیرلەندا بوو.

چەندین کارگە دەهێنرانە ناو شارە گەورەکانەوە کە لە دروستکردنی هێڵی ئاسن و بەندەرلێداندا یارمەتیدەربوون و هەستیان بەخۆشی دەروونی و نەفس بەرزی دەکرد، لە ئاکامەکانی شۆڕشی فەرەنسی ساڵی (١٧٨٩) بڵاوبوونەوەی دڵەڕاوکێ بوو لە وڵاتانی ئەوروپادا، ڕادیکاڵیەکانی ئەڵمانیا هەوڵی سەرکەوتنیان ئەدا بەسەر تاکڕەویدا کە خۆی لە دەسەڵاتی پاشا و میرنشینەکاندا دەبینیەوە، ئەگەرچی سەرەتا لە شۆڕشەکەیاندا سەرکەوتنیان بەدەستهێنا، بەڵام هێندەی نەبرد تووشی

---

١ - فرحات زيادة و: س- پ، ل ٨٦.

٢ - هەمان سەرچاوە.

بەرەنگاربوونەوە و سزای سەخت بوون، لەبەر ئەوە کۆچیان کرد بۆ جیهانی تازە بۆ دەست پێکردنی ژیانێکی نوێ و ڕزگاربوونیان لەو توند وتیژیەی بەرامبەریان دەکرا ژمارەیان دەگەشتە زیاد لە (٢) ملیۆن کەس کە هەندێکیان ئەگەڕان بەدوای پیشەسازی و بازرگانی لە ناو شارە گەورەکاندا، هەندێکی تریشیان کە دەچوونە ئەو وڵاتەوە کشتوکاڵیان دەکردە کە پیشەی خۆیان بوو.[١]

سەرەڕای ئەمانە هەندێ کۆمەڵی ئایینی (کەسانی ئایین پەروەر)ی وڵاتانی ئەڵمانیا و سویسرا و ئەسکەندەنافیا وڵاتی خۆیان بەجێهێشت و چوونە ئەمریکا، باری ئابووری وای لە هەندێ لە سکوتلەندیەکان کرد وڵاتی خۆیان بەجێ بهێڵن و بەدوای ژیانێکی خۆش و ئارامدا بگەڕێن.

ئەو کۆچە گەورەیەی کە لە سەدەی (١٩)دا کرا بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکان جیاوازی هەبوو لە گەڵ کۆچ کردووە دواکەوتووەکاندا کە دەهاتن و دڵنیابوون لەوەی لە ئەمریکا سیستمێکی ئابووری هەیە پێویستی پێیانە و لە دابین کردنی پێویستیەکانی ژیانیان ئیشیان بۆ دەکات و ئاستی ژیانیان بەرز دەبێتەوە و ئەتوانن لەوێ بە ئارامی بژین. ئەمەش پێویستی بەدەستی کار هەبوو، بەڵام کۆچبەرە پێشکەوتووەکان بۆ پاراستنی داهاتووی خۆیان و ڕزگاربوون لە تاریکی ستەمی جارانیان هاتبوون، لەگەڵ ئەوەشدا نەیاندەزانی حاڵیان بەرەو کوێ دەچێ و لەسەر چ زەویەک جێگیر دەبن، ئەم کۆچەش لە باکووری خۆرئاوای ئەوروپاوە دەستیپێکرد و زۆربەی کۆچبەرە یەکەمینەکان بوون و لەچوونە ناوەوەیان بۆ ئەمریکا هیچ نارەحەتیەکیان بۆ ئەمریکا دروستنەکرد.[٢]

ئەم دوو کۆمەڵە لە ڕووی نەریت و سروشتەوە جیاوازیەکی ئەوتۆیان نەبوو، ئەمریکیەکانیش بە سنگێکی فراوانەوە میوانداریان کردن و سوودیان لە تواناکانیان وەردەگرتن، بەڵام دواتریش بێ تاقەتی ئەمریکیەکان لە ئاست کۆچکردووەکاندا دەبینین، کاتێک لە باشووری ئەوروپاوە بەکۆمەڵ و لێشاو بۆ وڵاتەکەیان دێن.

---

١ - دیب علی حسن:الولايات المتحدة الأمريكية،ص١٠٤-١٠٥.

٢ - فرحات زيادة و: س- پ، ل ٨٦.

**یەکەم: پێشکەوتنی پیشەسازی**

لەو ماوەیەدا پێشکەوتنێک لە ژیانی ئابووری ئەمریکیەکاندا لە بواری کشتوکاڵ و پیشەسازی و... بە شێوەیەکی بێوێنە ڕوویدا.

شۆڕشێکی پیشەسازی لە ئەوروپا لەسەر دەستی زانا داهێنەرەکانی زانستی سروشت هاتەکایەوە، ئەمەش زانا داهێنەرە ئینگلیزیەکان پێی هەستان وەک (جیمس واط)(١٧٣٦- ١٨١٩) کە ئامێری هەڵمی داهێنا، (رتشارت ارکرایت ١٧٣٢- ١٧٩٢) یەکەم کەس بوو ئامێری چنینی لۆکەی داهێنا (صاموئیل کرومیتون ١٧٥٢- ١٨٢٧) ئامێری هەلاجی داهێنا، ئەم داهێنراوانە گەشتنە ولاتی ئەمریکا و کاریگەریەکی گەورەیان لەسەر ژیانی ئابووری ئەمریکا هەبوو.

لە سەردەمی کۆماری ئەمریکادا (ئیلاوتنی ١٧٩٤) جیکەنەی لۆکەی داهێنا کە لە جیاکردنەوەی لۆکە لە ناوکەکەی ڕۆڵێکی گرنگی هەبوو بە تایبەت دوای ئەوەی بە ئامێری هەڵمی کاری دەکرد، پیاوێک دەیتوانی بەم ئامێرە (١٠٠٠) بوند لۆکە شیبکاتەوە لەکاتێکدا بەبێ ئەم ئامێرە نەیدەتوانی یەک بۆند لۆکە زیاتر شیبکاتەوە، لەو کاتەدا بەکارهێنانی کەشتی هەڵمی (شوێنی کەشتی چارۆکەداری) گرتەوە، داهێنەران بە داهێنراوەکانیان و بە یارمەتی پیاوانی ئیشکەری ئەمریکی ڕواڵەتی زەوی و تەنانەت دەریاکانیشیان گۆڕی. [1]

ڕاستە ئەمریکیەکان زۆرێک لە داهێنراوەکانیان لە ئینگلتەرەوە وەردەگرت وەک ئامێری زانا (وەت) و شەمەندەفەری زانا (جورج سیتفنسون)(١٧٨٠- ١٨٤٨) کە دوو ئامێری هەڵمی بوون ئامێری (ئارکرایت کروچتون) کە تایبەت بوو بە ڕستن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەمریکیەکان خۆشیان گەشە و برەویان دا بە و ئامێرە هەڵمییەی کەشتی دروستیکرد کە ئەمەش لە هۆکارەکانی گواستنەوەی دەریاییدا سەرسوڕهێنەر بوو. (صموئیل مورس) تەلگرافی داهێنا کە بە هۆی پەیوەندیەکانی ئەم ئامێرەوە سەرانسەری وڵاتە یەککرتووەکانی لەیەک نزیک دەکردەوە. داهێنەرانی تریش مەکینەی دروومان و ئامێری دورێنەیان داهێنا. [2]

لەگەڵ هەموو داهێنانێکدا کە دەردەرکەوت پیاوە پیشەسازەکان ئامادەیی خۆیان دەردەبڕی بۆ وەرگرتنی ئەو داهێنراوە، پاشتر هەڵدەستان سەرمایەی پێویستیان بۆ

---

١ - فرحات زيادة: س ـب، ل٨٦.

٢ - تشارلز و ماري بيرد: تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية،ج١/ص ٢٤-٢٥.

ـابین دەکرد و کرێکاریان ئامادە دەکرد بۆ بەرهەمهێنانی دواتر ئەگەڕان بەدوای بـازاڕدا بـۆ سـاغکردنەوەی ئەو بەرهەمە، کەرەسـتە سـەرەتاییە پێوسـتیەکانی پیشەسازی وەک (خەڵوز، ئاسن، قورقوشم، مس و تەختە) ئاسن لەوڵاتدا بەدەست دەهێنـران بە وروژان و ڕژانـی کرێکـارە ئەوروپیەکـان و چوونیـان بـۆ کـارگە و کانگاکـان بـزووتنەوەی پیشەسـازی تەشـەنە و گەشـەی کـرد، بە دەسـتهێنانی سەرمایەی پێویست بۆ ئەو پیشەسازییە کارێکی ئاسان بوو، ئەو بەرووبوومی دانەوێڵە و لۆکە و ئاڵتونەی ئەمریکا بۆ جیهانی کۆنی دەنارد بازرگانی ئەمریکای بووژاندەوە، لەهەمان کاتیشدا سەرمایەی پێویستیشی بۆ ئەمریکا دابینکرد، خاوەن سەرمایە ئینگلیزی و ئەوروپیەکان لە ئەمریکا سەرمایەگوزاریان دەکرد، چونکە سـوودێکی زیاتریـان دەسـتدەکەوت وەک لەوەی تەنهـا لە وڵاتـی خۆیـان سـەرمایەگوزاری بـکەن، لەلایەکـی دیـکەوە ئەگەر تەنهـا لە وڵاتـی خۆیـان سـەرمایەگوزاریان بکـردایە ئەو قـازانجە زۆرەی کـارگە ئەمریکیەکانیـان دەست نەدەکەوت. [1]

لە بەرفراوانـی بازاڕەکـانی ئەمریکـا و توانـای سـاغ کـردنەوەی شـتومەکەکان مەرجەکانی پێشکەوتنی پیسەشازی لە ئەمریکا ئاسان بوو، کە ئەمەش پیشەسازانی لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا چالاک کرد بووە هۆی بەرزکردنەوەی بەرژەوەندیە سیاسـی و ئابووریەکان و کاریگەری لەسـەر لایەنی سیاسـی هەبوو لە کۆمەڵگەی ئەمریکیدا کە وەک خاوەن کێڵگە گەورەکانی باشووریان لێهاتبوو.

گرنگترین بەروبوومە کشتوکاڵیەکانی باشوور تا کۆتایی سەدەی (١٨) برنج و لـۆکە و تـوتن بـوون جـگە لەوەش بازاڕەکـان داوای زیـاتری بەرهەمـی چێنـراوی لۆکەیـان دەکرد تـا وای لێهات چاندنی لـۆکە سـاڵ بەسـاڵ زیـادی دەکـرد و دواتـر ڕێڕەوی سیستمی ئابووری باشووریان گۆڕی، ئیتر ئەوانەی کشتوکاڵیان دەکرد بە ژیانێکی لەسەرخۆ و دڵئارامی ئەژیان. [2]

جوتیارەکان لە بەدەستهێنانی زەوی تـازە بـۆ چاندنی لـۆکە پێشبڕکێیان دەکرد، ئەمەش وای لێکردن بەرەو ڕۆژئاوا پەلبهاون تا گەیشتنە ڕووباری مسیسپی، پاشان لەوێش تێپەڕین و چوونە نـاو لویزیانـا و تەکسـاس، فراوانبـوونی سـنوری زەویە

---

١ – فرحات زيادة: س-پ، ل ٨٨.

٢ – بدون مؤلف:موجز التاريخ الأمريكي،ص ١٠١.

کشتوکاڵیەکان بەو شێوەیەی باسمانکرد وایکرد خاوەن زەویەکان زۆر پێویستیان بە ئیشی کۆیلەکان بێت، لەهەمان کاتیشدا هەڵسوکەوتیان لەگەڵ ڕەش پێستەکان زۆر خراپ بوو.

تەماحی خاوەن زەویەکان بۆ قازانج کردن لە بەرهەمی لۆکە وایلێکردن کاری قورسی وا بە کۆیلەکان بکەن کە لە سەرووی توانای زنجەکانەوە بێت، ئەمەش گرنگترین هۆکاری هەلایسانی جەنگی ناوخۆ بوو. بەڵام ئەم پێشکەوتنە چڕەی بەرهەمهێنانی لۆکە زۆری نەخایاند لەبەرئەوەی ئەو زەویە تەختانەی بۆ کشتوکاڵ گونجا و بوون، لە ڕۆژئاوادا ببوونە موڵکی خەڵکی و دەستیان بەسەردا گیرابوو، گەشتیاران ڕوویان لە ویلایەتی تەکساس کرد، بەڵام زەویەکانی بێ پیت بوون، چونکە زۆر بەکارهێنرابوون، لەهەمان کاتیشدا ڕێگەیەکی هونەری وایان نەبوو تا جارێکی تر زەویەکەی پێ بژێننەوە، لەبەر ئەوە لۆکە ئەو پێگە و پایە گرنگەی خۆی لەدەستدا کە جاران لەسیستمی ئابووریدا هەیبوو، تاوای لێهات ڕێژەی پێشکەوتنی بەرهەمی لۆکە لە نێوان سالانی (١٨٥٠- ١٨٦٠) لە (٢٥%) تێ نەدەپەڕی، لەکاتێکدا بەرهەمە پیشەسازیەکانی باکوور لەچاو پێشوتریدا ڕێژەکەی چەندجارە زیادی کردبوو.[١]

بەرهەمی ئاسن و پێستە سەرکەوتنی بەسەر بەرهەمی لۆکەی باشووردا بەدەستهێنا، پیشەسازی سەرکەوتنی بەدەست هێنا و کشتوکاڵ بێ توانابوو لەوەی چیتر بتوانێ پلەو پایەی خۆی بپارێزێ، شۆڕشی پیشەسازی ئەمریکی ئەگەر هۆکارەکانی گواستنەوە لەگەڵیدا پێشنەکەوتایە و هەنگاوی لەگەڵدا هەڵنەگرتایە نەدەگەشتە ئەو ئاستەی کە ئەمڕۆ پێی گەشتووە.[٢]

ساڵی (١٨٠٧) سەرەتای دەستپێکردنی بزووتنەوەی گواستنەوە بوو، ئەمەش کاتێک بوو کە فولتون بۆ یەکەم جار توانی بە کەشتی هەڵمی گەشتێکی سەرکەوتوو بەسەر ڕووباری هدسوندا بکات، پاش (٤) ساڵ لەو مێژووە کەشتی هەڵمی لەسەر ڕووباری مسیسپی هاتوچۆی دەکرد و بەروبوومەکانی لە بەشێکی ئەمریکاوە بۆ بەشەکەی دی دەگواستەوە، بەندەرە درێژەکانیش لە گواستنەوەدا ڕۆڵێکی گرنگیان دەبینی، لەوانە بەندەری ئیری (١٨٢٥) لە نێوان ڕووباری هدسون و دەریاچەی

---

١ - فرحات زيادة و ابراهيم فريجي: تاريخ الشعب الأمريكي،ص ٨٩.

٢ - بدون مؤلف:موجز التاريخ الأمريكي،ص ١٠٢.

ئیری و زنجیره بەندرەی پنسلڤینا (١٨٣٤) کە (نیویۆرک و فلادلفیا) دەگرێتەخۆ و کەنارەکانی ڕۆژهەڵاتی ئەگەیاندە ویلایەتەکانی ڕۆژئاوا،

هێڵی ئاسن لە گرنگترین و خێراترین هۆکارەکانی گواستنەوە بوو کە زۆری نەبرد شارە گەورەکانی قەراغ دەریای بە یەکترەوە پەیوەستکرد و لەهەمان کاتیشدا نەیبەستەوە بە شارە ناوخۆییەکانی وەک(شیکاغو وسانت لویس و کلیڤلند)، هۆکارەکانی گواستنەوە خزمەتی ئابووری ئەمریکیەکانی کرد لە ئاڵوگۆڕی بەروبوومە جیاوازەکانی وەک دانەوێڵە و گۆشت و... هتد لە ڕۆژهەڵاتەوە بۆ ڕۆژئاوا و بە پێچەوانەشەوە.[١]

فراوانبوونی بازاڕەکان بۆ سەرف کردنی بەروبوومە پیشەسازیەکان لە هۆکارەکانی نیشتەجێ بوون بوو لە خۆرئاوا، کارگەکانی دروستکردنی کاڵای چنراو ئاسن زۆر بوون، زۆری بەسەردا تێنەپەڕی هەندێ شوێنی خۆرئاوا بوون بە سەنتەری گرنگی ئاڵوگۆڕی بازرگانی و چەند شارێکی پیشەسازییان تیا دروست بوون، دانیشتوانەکەی زیادیان کرد و کرێکارەکانیش ئەوەندەی تر قەرەباڵغیان کرد، ئەم پێشکەوتنە چڕ وپڕە بەپێی ڕۆژگار کاری کردە سەر سروشتی ئەمریکیەکان بەشێوەیەک لەکۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا بێ وێنە بوو، وای لە ئەمریکیەکان کرد پێ لەسەر هەموو شتە گەورە و گرنگەکان دابنێن، ئەمریکیەکان سروشتیان ژێربارکرد و خۆیان حەساندەوە بە شێوەیەک ئەمریکیەکان لەو ماوە کورتەدا بوونە گەورەترین و دەوڵەمەندترین گەلی جیهان.[٢]

## دووەم: ڕێکخستنی دارایی

لە کاتێکدا کۆنگرێس لە دەستوردا بە دوای چەند گۆڕانکاریەکدا دەگەڕا، لەلایەکی ترەوە (هاملتۆن) کە چاودێری دارایی بوو خەریکی کارکردن بوو بۆ دانانی پلانێک بۆ ڕێکخستنی دارایی، کە وڵات لەو سەردەمەدا پێویستی پێی بوو، یەکەم کار کە ڕووبەڕووی بووەوە کێشەی قەرزی نیشتمانی بوو، بۆیە ڕووی کردە دانەوەی ئەم قەرزانە و پشکە کۆنەکانی لابرد و لە شوێنیدا چەند پشکێکی تازەی دانا لە پێناو ئەمەدا داوای لە کۆنگرێس کرد گرنگی بدات بە کاروباری دانەوەی ئەو قەزانەی کە

---

١ - فرحات زیادة و: س- پ، ل ٨٩.

٢ - هەمان سەرچاوە،ل٩٠.

ویلایەتە یەکگرتووەکان کردبووی لە ماوەی شۆڕش و چاودێری کردنی جەنگەکاندا بە بیانوی ئەوەی ئەم قەرزانە بۆیە وەرگیران تا لە بەرژەوەندی گشتیدا خەرج بکرێت نەک بۆ بەرژەوەندی ویلایەتەکان، هەروەها لەسەر ئەم کارەی خۆی بەردەوام بوو، لە کۆتاییدا بووە هۆی بەرزبوونەوەی ئاستی دارایی لە وڵاتدا.[1]

(هاملتون) لەلایەن گەل و ویلایەتەکانەوە، بە چاوی ڕێزەوە سەیر دەکرێ دواجار بەهۆی کارەکانیەوە، لە ئەنجامدا حکومەتی فیدراڵی بنچینەیەکی دارایی بە دەستهێنا، بەمەش توانی سوی قەرزەکان کەم بکاتەوە ئەمەش وەک قازانج دەگەڕایەوە بۆ خەزێنەی دەوڵەت، هەروەها لەم پیلانەیدا پشتی دەبەست بە سێ جۆر دەستکەوت، لەوانەش توانای حکومەتی فیدراڵی بۆ دانانی باج، بۆیە پێشنیاری دانانی باج و گومرگی کرد لەسەر ناردن بە ڕێگایەک کە ببێتە هۆی هاندانی پیشەسازی و بازرگانی و پارێزگاری کردنیان لە نارەحەتیە دەرەکیەکان، بەمەش دەیتوانی لەیەک کاتدا دوو ئامانج بپێکێ، ئەوانیش بریتی بوون لە دڵنیایی کردنی بەروبوومی دارایی حکومەت و پارێزگاریکردنی بازرگانی و پیشەسازی لە وڵاتدا.[2]

فاکتەری دووەم کە پشتی پێ بەستبوو ئەو داراییە بوو کە بە فرۆشتنی زەویەکانی ڕۆژئاوا دەستی کەوت کە بە موڵکی حکومەت دانران، هۆکارێکی تر کە پشتی پێ بەستبوو گەڕانەوەی ئەو باجە فراوانە بوو کە لەسەر هەندێک لە بەرهەمە نیشتمانیەکان بە تایبەت مەی و جۆرەکانی دی دانرابوون، لە پێناو ئەمەشدا گرنگی زۆریدا بە بیردۆزی پارەدار کردن و چۆنیەتی بەڕێوەبردن، بۆیە بڕیاری دامەزراندنی بانک درا بە ناوی (بانکی ویلایەتە یەکگرتووەکان) ئەم بانکە مافی بەڕێوەبردنی دراو و کاروباری دارایی تیادا درا بوو. دروستکردنی ئەم بانکە تا ساڵی (١٧٩١)ی خایاند، بانکەکە سەرمایەیەکی هەبوو بە ئەندازەی (١٠) ملیۆن دۆلار، حکومەت ئاڵوگۆڕی بە پێنج بەشەوە دەکرد و گەلیش ئاڵوگۆڕی بە چوار بەشەوە دەکرد لەو پێنج بەشەی تر.[3]

هەروەها ئەم بانکە سەرپشک کرا و مافی دەرکردنی پارەی پێدرا تا بتوانێ نرخی سکەکان دابنێ و قەبالەی (سەنەد) حکومەت بەڕێوە بەرێت، کاریگەری ئەم پلانە لەسەر پلەوپایەی ماڵ و دارایی وڵات شتێک دیار و ئاشکرا بوو، ئەو سەنەدە

---

١ - د. طليعة الصياح و: تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية، ص ٩١.

٢ - محمد محمود النيرب: المدخل في تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية،ج١أص١٢٧.

٣ - عبدالعزيز سليمان و:تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية الحديث،ص٩٩.

تازانەی خەڵکی ئاڵوگۆڕیان پێوە دەکرد لەلایەن حکومەتی فیدراڵیەوە شێوەی پارەی ئاڵوگۆڕیان وەرگرتبوو، ئەمە بووە هۆی زیادکردنی ئەو پارەی کە ئاڵوگۆڕی پێوە دەکرا و پاڵنەرێک بوو بۆ بازرگانی و پیشەسازی، هەروەک ئەو کاغەزە پارانەی بانکەکە دەری دەکرد زیاتر بوو لە چەندێتی ئەو پارەیەی ئاڵوگۆڕی پێوەدەکرا، لە هەمان کاتدا باجە گومرگیەکان هەڵدەستان بە پارێزگاری کردنی پیشەسازی و یارمەتی بوژاندنەوەی حاڵەتی ئابووریان دەدا، لە بەرامبەریشدا خاوەن بازرگانیە پیشەسازیەکان لەم پلانە نوێیەدا زۆر خۆشحاڵ بوون، بەڵام زۆربەی بەکاربەران بە تایبەت ئەوانەی خاوەن زەوی بوون دڵنیابوون لەوەی زۆربەی ئەو باجانە دەکەونە سەر ئەوان، بۆیە پێش ئەوەی کۆنگرێس بریاری لەسەر بدات بەربەرەکانیان دەکرد.[1]

## سێیەم: رێکخستنی دەوڵەت

بۆ زانینی رێکخستنی کاروباری بەرێوەبردنی ئێستا پێویستە بگەرێینەوە بۆ پێرەوکانی ژیانی سیاسی لەو وڵاتەدا، کاتێک واشنتن لە ساڵی (١٧٨٩) دەستیگرت بەسەر حوکمرانیدا، هەر لەو کاتەدا چەندین نارەحەتی و ناخۆشی هاتنە رێی رێکخستنی حکومەت کە پێویست بوو تەسلیمی ئەم بارە بێت تا ئەوەی خەڵکی پرسیاریان دەکرد ئایا لە توانای حکومەتی یەکگرتووی کۆماریدا هەیە لەسەر کارەکانی لە وڵاتدا بەردەوام بێت کە لە هەموو لایەکەوە کەوتبوونە روو لە فراوان بوون، ئایا ئەتوانێ لە نێوان بەرژەوەندیە ناوخۆیە دارایەکان و بەرژەوەندیە نەتەوەیە گشتیەکاندا هاوسەنگی ڕ اگرێ؟ ئایا دەتوانێ خۆی ئامادە بکات بۆ رووبەڕووبوونەوەی فراوانبوونی ئابووری، لەگەڵ ئەوەشدا کە پێرەوی تازەی وڵات زۆر بەوردی دانرا بوو، بەڵام پشتی بەهیچ دابونەریتێکی ئابووری پێشوو نەبەستبوو کە بتوانێ ئەو بۆشاییەی بۆ پڕ بکاتەوە و بەئاسانی دڵنیابێ لەجێ بەجێکردنی، یان لەسەر بۆچونێکی گشتی وەستابێ کە پشتگیری لێبکات، بۆ نموونە لە ئەوروپادا هەموو حکومەتێکی شۆڕشگێڕ لەپاش ماوەی حکومەتەکەی پێش خۆی

---

١ – محمد محمود النیرب: س-ب،ج١أل ١٢٨.

پەندی وەرگرتبوو ئەمیش بەهۆی ئەوەی لە ڕابردوودا داراییەکی باش و چەندین پسپۆڕی بەتوانای لە بەڕێوەبردنی حکومەتەکانیاندا هەبوو.[1]

بەڵام هیچ شتێک لەمانە نەڕەخسابوو بۆ حکومەتی تازەی ویلایەتە یەکگرتووەکان، لەبەر ئەوەی حکومەتەکە هیچ میراتیەکی بۆ نەمابوو مەگەر هەندێک لە نووسەران و خەزێنەی بەتاڵ و بارێکی قورسی قەرز نەبێت، لەگەڵ ئەوەشدا لێرەدا دوو هۆکاری سەرەکی هەبوون کە پاڵپشتی دەستوور و حکومەتە تازەکەیان دەکرد و گرەنتی مانەوەیان پێدەدا، یەکێک لەوانە بیری حکومەتی بوو کە بە مانای یەکگرتنەوەی تەواو دێت لەناو تاکەکانی کۆمەڵدا بە شێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا،ئەمەش پابەندە لەسەر ڕای زۆرینە لەگەڵ پارێزگاری کردن لە بنچینەیەکانی ئەم تاکانە و هەروەها پارێزگاری کردن لە ڕای کەمینەکانی دی و دەرخستنی ڕای خۆیان، هەروەها بۆ گەشتنیان بە حوکم و دەسەڵات هەروەک لە ڕابردوودا پێش کۆک بوون لەسەر دەستور لەلایەن ویلایەتە جیاوازەکانەوە باسکراوە.[2]

بەڵام هەندێک هەر بە ئاواتەوە بوون ئەم شتە بێتەدی، ئەوانیش فیدراڵیەکان بوون کە حکومەتێکی بەهێزی ناوەندیان دەویست، لەلایەکی دیکەوە کۆمەڵێکیش نەیاری ئەمانە بوون کە داوای حکومەتی مەرکەزی بێهێزی مەرکەزیان دەکرد، پێیان باش بوو زۆربەی دەسەڵاتەکان بە تاکی بمێننەوە، بەڵام کاتێک دەنگ درا لەسەر دەستورێکی گشتی، هەموویان پێوەی پابەندبوون ئەمەش لەبەر ئەوەی نەوەک پشێوی و ئاژاوە بڵاوبێتەوە، ئەوانەی دژی فیدراڵی بوون بە ڕێگایەکی ئاشتیانە هەوڵی دەستکاریکردنی یاساکانیان ئەدا، بەمەش ناکۆکییان لەگەڵ فیدراڵیەکاندا لەوەدا بوو کە دەیانویست چاودێری بۆ دەستوور بکەن نەک هەوڵی لادانی بدەن، لەو کاتەشدا شتێک دروست بوو کە ئەمریکیەکان بتوانن حوکمی دیموکراتی پراکتیزە بکەن، هەروەها هۆکاری دووەم ئەوەبوو زۆربەی ئەوانەی دەسەڵاتیان گرتبووە دەست هەر خۆیان بوون دەستووریان دانابوو، بۆیە هەرچی هەوڵیان هەبوو لە ڕێگەی پشتگیری کردن و برەوپێدانیدا دەیانخستە گەڕ چونکە دروست کراوی دەستی خۆیان بوو، هەروەها دڵسۆز بوون و توانایەکی باشیان هەبوو (جۆرج واشنتن) سەرۆکایەتی دەکردن کە بە باوکی ئەمریکیەکان ناوی

---

١ - د.رأفت غنيمى الشيخ: امريكا والعالم، ص ٥٣.

٢ - تشارلز و مارى بيرد: تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية،ج١/ص ١٦٠.

دەرکـرد، ئەم کەسـە ئەوە نەبـوو کە زیرەکیەکـی لە توانـا بەدەری هەبـێ، بەڵام ڕاپەڕێنەری کارەکـان بـوو و خـاوەنی کەسـیەتیەکی زۆر بەهێـز بـوو کە لەلایەن خەڵکیەوە ڕێزی لێدەگیرا، هەرکاتێک ڕاستەقینەی بـۆ دەرکەوتـایە لە بەرامبەریـدا وەک شاخ ڕادەوەستا، بۆیە لە بەرامبەردا خەڵک خۆشیان دەویست و بە نموونەی کەسـی خـۆڕاگری نەتەوەیـی دایانـدەنا، بەم شـێوەیە پەیوەنـدی تونـد وتـۆڵی هەبـوو لەگەڵ ئەنـدامانی کـۆنگرێس و لە کاروبـاری حزبـی و جیـاوازی کـردن لە نێـوان خەڵکیـدا خـۆی بەدوور دەگـرت هەوڵیـدا کە وەک نـوێنەری پێـڕی گشـتگیری خـۆی بنوێنێ، هەروەها لە ماوەی سـەرۆکایەتیدا هەوڵـی داوە پلە وپایە و متمـانە و ڕێزی خەڵکی بە دەست بێنێ.[1]

دوای هەڵبژاردنی بۆ سـەرۆکایەتی کۆنگرێس، هەوڵـی بە هێزکردنـی ئیدارەکەیـدا، لە مـاوەیەکی کورتـدا تـوانی لیژنەیەکـی چـاودێری دانێـت بەسـەر هەریەک لە بەڕێوەبەرایەتیەکانی دەرەوە و جەنگ و دارایی، لەسەر کاروبـاری دەرەوە، واشـنتن (تۆمـاس جیفرسـۆن)ی دانـا لەبەر ئەوەی توانـایەکی دبلۆماسـی گەورەی هەبـوو ئەمەش لە کاتێکدا سەفیری ویلایەتە یەکگرتووەکان بوو لە فەڕەنسا.[2]

جەنەڕاڵ (هێنری نـوکس) کە پیـاوێکی خۆشەویست بـوو لە نـاو خەڵکیـدا لەسـەر کاروبـاری جەنگـی و (ئەسـکەندەر هـاملتون)ی لەسـەر کاروبـاری دارایـی دانـا کە پیـاوێکی زۆر چـاک بـوو توانـایەکی فراوانـی هەبـوو لە کاروبـاری داراییـدا، پاشـان کۆنگرێس پلەی داواکاری گشتی داهێنا کە لەو کاتەدا وەک پلەی ڕاوێژکاری یاسایی بـوو، واشـنتن بـۆ ئەم پـلەیەش (ئەدمونـد ڕانـدولف)ی لە ڤێرجینیـا دیـارکرد،ئەوەش شـتێکی زانـراوە کە (واشـنتن و هـاملتون) بەلای فیدراڵیەکانـدا ئـارەزووی زیاتریـان هەبـوو، لە کاتێکـدا (جیفرسـۆن و ڕانـدولف) دژی فیـدراڵی بـوون، لە ئەنجامـدا ئەمە بووە هۆی سەرهەڵدانی دوو حزبی جیاواز لەو کاتەدا،[3] لە دوای ئەمەوە کۆنگرێس لقێکـی تـازەی دانـا بە هـۆی ئەو یاسـایەی لە سـاڵی (١٧٨٩) کـاری پێـدەکرا کە بە بەهێزترین یاسای تەشریعی دانراوە کە لە دواییدا بە لقی ناسراوە، ئەم یاسـا تازەیە دەقێکی تایبەتی دانا بۆ پێکەوەنانی دادگای باڵا کە پێکهاتبوو لە (دادوەری دادوەران) و پێنج قـازی تـر، لە دواییـدا ژمارەیـان زیـادیکرد، ئەمەش بـووە هـۆی دامەزرانـدنی

---

١ – فرحات زيادة و ابراهيم فريجي: تاريخ الشعب الأمريكي،ص ٩٢.

٢ – د. طليعة الصياح و راغب العلي: تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية، ص ٨٩–٩٠.

٣ – د.عبد العزيز سليمان و د. عبد المجيد نعنعي: تاريخ الولايات المتحدة، ص ٩٨.

چەندین دادگای فیدراڵی لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا، هەموو ئەم دادگایانە بوونە پارێزەی بەرژەوەندیەکانی حکومەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان و بوونە هۆی بە هێزکردن و جێ بەجێکردنی یاساکان و توند وتۆڵ کردنی دادگاکانی ویلایەتەکان و ئەنجومەنی یاسادانان بۆ ئەوەی بتوانن هەر یاسایەک دژی دەستوور بێ هەڵی بوەشێننەوە، توانی چاودێری مافی تاکەکان بکات لە هەموو ویلایەتەکاندا و هەموو چەوساندنەوەیەک لەلایەن حکومەتە خۆجێیەکانەوە بخرێتە سەریان لێیان دوور بخرێتەوە،[1] بە هۆی ئەوەی پەیوەندیەکی ڕاستەوخۆ لە نێوان گەل و حکومەتی فیدرالیدا دروست بوو، لەگەڵ ئەوەشدا زۆرێک لە فیدراڵیەکان لەوە دەترسان چەند دەسەڵاتێکی جیاواز ببنە هۆی هاندانی حکومەت بۆ دەست بەسەراگرتن و چەوساندنەوەی خەڵکی و پێشێلکردنی مافی هەندێ لە ویلایەتەکان و ئەندامەکان، بۆ هەستکردن بەوە کۆنگرێس لە ساڵی (١٧٩١) بڕیاری دانانی هەشت بەندی دا بۆ چاوگێڕانەوە بە دەستووردا بۆ ئەوەی ببێتە هۆی پاراستنی مافە گشتیەکان، یەکێک لەم بەندانە ئەوەبوو نابێ کۆنگرێس سەرپشک بێت لە دانانی هەر یاسایەک کە بتوانێت ئاین بکاتە ڕەسمی و دەست بگرێت بەسەر ئازادی قەسەکردن و ڕۆژنامەگەریدا، یاخود ڕێگر بێ لەبەردەم کۆبوونەوەی خەڵکی بۆ داواکردن و بەرزکردنەوەی مافە خوراوەکانیان، مەبەست لەم چاوخشاندنەوەیە بە دەستووردا کە لە خاڵی دەیەمدا هاتبوو ئارامی بەخشین بوو بەو خاوەن بیرانەی یارمەتیدەری حکومەتەکانی ویلایەتەکان بوون، ئەمەش بە هۆی هێشتنەوەی دەسەڵاتیان و پارێزگاری کردنیان لە دەست خستنەناو کاروبارەکانیانەوە لەلایەن حکومەتە فیدراڵیەکانەوە.[2]

**چوارەم: دۆخی ژنان لە ئەمریکا**

لە ماوەی سەدەکانی ڕابردوودا بە هۆی ئەو داب و نەریتە کۆمەڵایەنی و ئاینیانەی کە هەبوون، پیاو بەشێک لە مافەکانی ژنی زەوتکردبوو، کۆمەڵگای مرۆڤایەتی بە ژەند یاسایەکی دانراوی دەستی مرۆڤ بەڕێوەژوو، لەناو ئەو یاسایانەدا کۆمەڵێک چەمکی کۆمەڵایەتی هەڵە بنیادانراوە، لەوانە جیاوازی کردن لە

---

١ - فرحات زيادة: س-پ، ل ٩٣.

٢ - فرانكلن اشر:س-پ،ل٧٥.

نێوان مرۆڤەکان و دابەشکردنی کۆمەڵگا بۆ چەند چینێکی کۆمەڵایەتی کە تیایدا هەر چینێک بە کۆیلە سەیری چینی خوارووی دەکرد، چلە وپایەی کۆمەڵایەتی هەر لە سەرەتاوە بە شێوەیەکی خراپ بووە، هەموو ئەو ئەفسانەو بیروباوەڕانەی کە ژنیان لە پیاو بە کەمتر دادەنا کاریگەری بە هێزیان هەبوو لە سەر پلەوپایەی کۆمەڵایەتی ژنان لە بواری یاسادا.[١]

نایەکسانی کۆمەڵایەتی و سیاسی لە ژیانی ژنانی ئەمریکادا بە شێوەیەکی دیاربوو، لە یاسای گشتی ئەمریکادا کچی شوونەکردوو لە زۆر لایەنەوە چێژی لە مافی شەرعی خۆی وەردەگرن، دەیتوانی سامانی خۆی هەبێت و داوای یاسایشی هەبێت، بەڵام ژنی هاوسەردار لە ڕووی یاساییەوە بوونی نەبوو، پیاوەکەی خاوەنی هەموو ویست و بڕیارەکانی بوو و مافی موڵکدارێتی نەبوو، ژنان دەبوو باجی موڵکیەت بدن لە کاتێکدا لە بەرامبەر ئەمەدا هیچ نوێنەرایەتیەکان نەبوو، پیاوان خاوەنی دەسەڵاتێکی شەرعی بوون بەسەر ژناندا، تا ئەوەی بۆیان هەبوو لێیان بدەن و بەندیان بکەن، یاساکانی جیابوونەوە و بەرپرسیارێتی منداڵ لە دوای جیابوونەوەی هەموو لە بەرژەوەندی پیاوانم بوو، ژنان بەرامبەر منداڵەکانیان هیچ مافێکیان نەبوو و ناچاربوون ملکەچ بن بۆ ئەو یاسایانەی کە لە دروستکرنیدا هیچ ڕۆڵێکیان نەبوو،[٢] ژنان بۆیان نەبوو کاری ئامۆژگاری و ڕێنیشاندەری ئاینی و پزیشکی و پارێزەری بکەن لە جیهاندا و هەستێکی نادروستیان بەرامبەر ژنلن دروست کردبوو، زۆربەی پیشەو کارەکان بەڕووی ژناندا داخراوە، ئەوەی ژنان وەریاندەگرت زۆر کەمترە لەوەی پیاوان لە هەمان شوێندا وەریاندەگرت، هەموو ئەو ڕێگایانەی ژنان بە سەروەت و سامان دەگەیەنێت بە ڕوویاندا داخرابوو، هیچ ئامرازێک بۆ خوێندنی ژنان لە کۆمەڵگادا نەبوو، هەموو پێگە زانستیەکان بە ڕوویاندا داخرابوون، لە چەند حاڵەتێکی دیاریکراودا نەبێت ژنان بۆیان نەبوو بەشداری کاری کڵێسا بکەن، و هیچ شێوەیەک مافی دەنگدانیان نەبوو، بە تەواوی بێبەشکرابوون لە باوەڕبوون بەخۆو بەوەی شانازی بە ژن بوونی خۆیانەوە بکەن و بەتەواوی کردبوونیان بە پاشکۆ.[٣]

---

١ - هواردزن: التاريخ الشعبي للولايات المتحدة،ج١/ص١٧٥-١٧٦.

٢ - فريشتة نورائي:س-ث،ل٩٠؛ تشارلز وماری بيرد: س- پ، ج٢/ص٣٥٨.

٣ - هواردزن: س-پ،ج١/ص٢٠٦.

ژنان لە کۆمەڵگای ئەمریکی ئەوکاتدا بە هۆی ئەو داب و نەریتە کۆمەڵایەتی و ئاینیانەی هەبوون لە سادەترین مافی ژیانیان بێبەش بوون، سەرەڕای خراپی گوزەرانی ژنان، بەردەوامبوونی گوزەرانی ژنان بەم شێوەیە کاریگەری لەسەر ژنان بە شێوەیەک دروستکرد کە هەوڵ و کارو چالاکیەکانیان دەستپێدەکەن تا بتوانن ئەم باردۆخە بگۆڕن و گوزەرانی خۆیان چاک بکەن. سەر ئەنجام سەرەتاکانی هەوڵ و خۆپیشاندان و مانگرتنەکانی ژنان بۆ بەدەستهێنانی مافەکانیان دەرکەوت. (١)

سەرەتای هەوڵەکانی ژنان بۆ یەکەمین جار لە ڕۆژگاری شەڕی سەربەخۆیی ئەمریکا لە ساڵی (١٧٧٥-١٧٨٣) دابوو، ژنان درکیان بە مافە سیاسی و ئابووری و پیشەییەکانی خۆیان کردو داوای مافی هەڵبژاردنیان کردوو ڕووبەڕووی دەسەڵاتە تۆتالیتارییەکانی ئەو سەردەمە بوونەوە، (ئەبیگایل ئادامس) هاوسەری (جۆن ئادامس)بوو کە یەکێک لە ڕێبەرانی سەربەخۆیی ئەمریکا و دووەمین سەرۆکی کۆماری وڵات و یەکێک لە نووسەرانی ڕەشنووسی دەستووری وڵاتە یەکگرتووەکان بوو، بەیاننامە ناسراوەکەی (خانمەکانمان لە بیربن) بە بیری هاوسەرەکەی دەهێنایەوە، تا بە نووسینی یاسا نوێیەکان لە جاڕنامەی سەربەخۆییدا خانمەکانمان فەرامۆش نەکەین و دەسەڵاتێکی بێ سنوور نەدرێنە دەست مێردەکانیان، ئەوەشی وت ئەگەر وا نەبوو ئێنە خانمەکانمان بۆ شۆڕەش هاندەدەین و خۆمان بە پابەندج نازانین بۆ لە بەرچاوگرتنی یاسا یەک کە لە داڕشتنیاندا ڕۆڵمان نییە و ناتوانین لە کۆی داڕێژەرانیدا نوێنەانێکمان هەبێ،[2] دوای وەرگرتنی نامەکەی جۆن ئادمەز لە وەڵامدانەوەی بۆ کاربەدەستێکی دیکەی داڕێژەری یاسای نوێ و جاڕنامەی سەربەخۆی کە خوازیانری مافی دەنگدان بوو بۆ تەواوی پیاوان چ موڵکدار بن بێ موڵک، ئەوەی بیر هێنایەوە ڕاستە بونیادی ئاکاری دەوڵەت لەسەر بنەمای ڕەزامەندیتی خەڵک، بەڵام ئەگەر مافی دەنگدان بە هەموو کەسێک بدەین، چ ئەوانەی کە خاوەن مۆڵکن و چ ئەوانەی کە موڵکیان نیە، ئەوکاتە گروپەکانی دیکەی وەک چنان و ئەو لاوانەی کەفوکوڵێکی بە هاواریان پێیە، داوای مافی دەنگدان دەکە، بەمەش هەموو دەچنە یەک ئاستەوە و جیاکاری نامێنێت،

---

١ - هەمان سەرچاوەی،ج١/ص١٩٢.

٢ - کازیوە صالح:فیمنیست ناسی وبزوتنوەوەی سیاسی،ک-ڕەهەند،ژمارە(١٨-١٩)،چاپخانەی ڕەنج،ل٣١.

جاڕنامەی سەربەخۆیی ئەمریکا هەر وەک جاڕنامەی مافەکانی مرۆڤ لە فەڕەنسا، هیچ مافێکی بۆ ژنان دانەنا.[1]

(فرانس رایت) ئەم خاتوونەی کە بە بیرێکی پێشکەوتوو خوازانەوە لە ساڵی (١٨٢٧)دا سەردانی ئەمریکای کرد، هەندێک سەرەتاکانی بزووتنەوەی ژنان بەم سەردانەی ئەم خاتوونە سکۆتلەندییە دادەنێین، کە بە لێداونەکانی لە بارەی مافی ژن ئامادەبووانی سەرسام کرد، بزووتنەوەی فێرخوازی ژنان، بە سەرۆکایەتی ئەم خاتوونە کە سەرۆکی بزووتنەوەی فراوزانخوازی بوو دەستی بەکار و چالاکیەکانی کرد، ئەم ژنە بە درێژایی ژیانی لە پێناو دەستەبەرکردنی دادپەروەری کۆمەڵایەتیدا هەوڵی دەدا، فرانسیس رایت پێیوابوو یەکسانی ئەو بنەمایەیە کە دەبێت بە فەرمی بناسرێت هەرچەندە بە کردەوە نایەکسانی فەرمانڕەوایە.[2]

## خۆپیشاندان و مانگرتنەکانی ژنان

لە ساڵی (١٨٢٠) ژنە هەژارەکان بۆ ناڕەزایی دەربڕین بەرامبەر ئەو باردۆخە خراپەی کە تیایدا دەژیان، ڕژانە سەر شەقامەکانی شاری نیوینگلاند لە ویلایەتی ماسا تشتوستس، ئەمەش بەسەرەتای کاروانی مافی ژنان دادەنرێت، ژنان لە بەرامبەر کرێیەکی کەمدا کە بە بەراورد لەگەڵ کرێی پیاوانی هاوپیشەدا زۆر کەم بوو لە کارگە بچووکەکانی قوماشدا بۆ ماوەی (٨) سەعات کاریان دەکرد، ئەمەش زیاتر کارەساتەکەی کەورەترکردو ڕەنگدانەوەی خراپی لەسەر باری تەندروتتیشیاهەبوو (شۆڕەشی لاوازەکان) ئەو ناوەیە کە بۆ ئەم بزووتنەوەیە بەکاردەهینێت، ژنان لە پێناو بەدەست هێنانی باردۆخێکی گونجاوتردا لە بواری کارکردنیان بە هۆی یاخیبوونەکانیانەوە ڕووبەڕووی بەکەمزانین دەبوونەوە و سووکایەتییان پێدەکرا، بەڵام ئەمە کاریگەری لەسەر ژنان نەبوو بەڵکو بەردەوام بوون و داواکارییەکانیان زۆرتر دەبوون و لە ساڵی (١٨٢٤)دا لە پێناوی کەمکردنەوەی کاتچمێری کارو زیادکردنی کرێ و پێداویستەکانی تریاندا زیاتر لە (٢٠٠) ژن خۆپێشاندانێکیان سازکرد، ژنان لەسەر مانگرتنەکانیان بەردەوامبوون، لە ساڵی (١٨٣٤) دا لە کارگەیەکی لۆکە لە ماساتشنتوستس خۆپێشاندانێک سازدرا،

---

١ - کۆمەڵێک نوسەر:ڕەوتەکانی فیمنیزم،و-کارزان محمد،چاپی یەکەم،چاپخانەی تەوار،سلێمانی،٢٠٠٨،ل٢٢.

٢ - بدون مؤلف:موجز التاريخ الأمريكي،ص ٩٦.

ئەم مانگرتنە بە ڕووداوێکی مێژوویی گرنگ دادەنرێت کە دواتر بووە سەرەتای دروستبوونی یەکەم کۆمەڵەی ژنان لە ئەمریکا لە ساڵی (١٨٤٢)، لە ساڵی (١٨٤٣)دا خۆپێشاندان و مانگرتنەکان بەردەوام بوون، یەکێ لەو پیاوانەی سۆزی بەرامبەر بەم کارەی ژنان نەبوو دەڵێت خۆپیشاندانێک سازکرا لە لایەن ژمارەیەک لە کچە گەنجەکانەوە کە لە سەرەتادا (١٦) کەس بوون، پاشان لە ڕێپێوانی دووەمدا ژمارەیان گەشتە (٤٠) کەس، ئەم ڕێپێوانە بەردەوام بوو تا ژمارەیان گەشتە (٤٢) کەس کە بە بێ سوود بۆ ماوەیەک لەسەر شەقامەکان مانەوە.[1]

کاروانی (نان و گوڵ) بریتی بوو لە مانگرتن و خۆپیشاندانەکانی ژنان لە ساڵی (١٨٥٧)لە نیویۆرک، کە بە هەزاران ژن ڕاژنە سەر شەقامەکان و نارەزاییان لە بەرامبەر ئەو باردۆخە دەردەبرِی کەتیایدا دەژیان، دواتر سەندیکایەک بۆ ژنان دانمەزرا، بەرگریکردن لە مافەکانی ژنان یەکێک بوو لە گرنگترین ئامانجەکانی ئەم سەندیکایە، ئەم بزووتنەوەی(نان و گوڵ ە بووە هۆی دروستبوونی بزووتنەوەیەکی کارا لە ناوخۆی ئەمریکادا، کە داوای مافی هەڵبژاردن و چەند داوایەکی تریاتن دەکرد، ناوی ئەم بزووتنەوەیە(سوفراجستب) بوو کە ڕەگ و ڕیشەی لەکاتی خەبات دژی کۆیلایەتی سەریهەڵداوە.[2]

---

١ – هواردزن: التاريخ الشعبي للولايات المتحدة،ج١/ص١٩٣.

٢ – هواردزن: س-پ،ج١/ص١٩٤.

## سەردەمی جۆرج واشنتن (١٧٨٩- ١٧٩٧ز)

دواکاری کۆنگرێس هەڵبژاردنی سەرۆک بوو، ناوی (جۆرج واشنتن) بۆ ئەم پۆستە لەسەر زمانان بوو، هەر بۆیە کۆنگرێس بە زۆرینەی دەنگ لە (٣٠)ی نیسانی (١٧٨٩)دا بۆ سەرۆکی کۆمار هەڵیانبژارد، ئاهەنگێکی قەشەنگ لە شاری نیویۆرک رێکخرا و بە چەپڵەڕێزان پێشوازییان لە (جۆرج واشنتن) کرد، مەراسیمی سوێند خواردنی وەک یەکەمین سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکای بەرێکرد و رەنگی تێکچوو بوو، لەبەردەم ئینجیلدا سوێندی خوارد بەرگری لە وڵات و دەستور بکات و ئەو ئەرکەی پێی سپێردراوە بە باشی رایپەڕێنێت.

کەسێکی بەتوانا بوو، زانیاری باشی لەو بارەوە هەبوو، گەورەی و شکۆمەندی لە کەسایەتیدا دیاربوو. پاش هەڵبژاردنی بە سەرۆک کۆمار، بەردەوام هەوڵی رێکخستن و رێکوپێکردنی کاروبارەکانی دەدا، هەر کارێک لە ئەستۆی ئەودا بوایە، بەجوانی دیقەتی دەدا و جێ بەجێی دەکرد، لەپێش هە بڕیارێکیدا چاوپیاخشاندنێکی بۆ دەکرد و ئینجا بڕیاری دەدا، تەنانەت بڕیارە لاوەکیەکانیشی گرنگی پێوە دیاربوو. [1]

لە چوارچێوەی کارەکانیدا زیاد لەپێویست کاری دەکرد و کاروبارەکانی رۆژانەشی لە پێرستێکدا دیاری دەکرد، لەبارەی ئەو ئەرکانەی لە ئەستۆی بوون پرسیاری لە کۆنگرێس دەکرد، تا باشتر کارەکانی راپەڕێنێت، گفتوگۆیەکی زۆر کرا لەسەر ئەوەی چ نازناوێک لە سەرۆک بنێن، ئەوەبوو نازناوی (باوکی)ی بەسەردا برا، هەر بۆیە (جۆرج واشنتن)دەیوت (ئەو کەسەی لە شێوەی باوکێکدا بێت بۆ وڵاتاکەی، من دەزانم بە چی وەڵام دەداتەوە). [2]

### کاتێك (جۆرج واشنتن) بوو بە سەرۆك كۆمار، هیچ پاڵپشتییە

ک لە دەستور نەدەکرا، تەنانەت زۆر لە جەماوەر دژایەتییان دەکرد، ئەمەش بەهۆی ململانێی پارتی فیدراڵی کە (ئەلکسەندەر هاملتۆن) پێشڕەوی بوو لەگەڵ پارتی دژە فیدراڵییەکان و کۆماریخوازەکان بوون دواتر بەدیموکراتەکان ناسران و

---

١ - تشارلز و ماری بیرد: س-پ،ج١/ص١٥٩.

٢ - دیب علی حسن:س-پ،ل٢٠٥.

(تۆمـاس جیفرسـۆن) پێشــەوایان بـوو، ئەم جیـاوازی و دابەشـبوونە بەدرێـژای ســەردەمی جـورج واشـنتن بەردەوام بـوو، ئەلکســەندەر هـاملتۆن ئـارەزووی بەهێزکردنی دەسـەڵاتی فیدراڵی هەبوو، کە چینە دەوڵەمەند و خاوەن سامانەکانی دەگرتەوە، لە بەرامبەردا (تۆماس جیفرسـۆن) کە لایەنگری چینە هەژار و جوتیارە موڵکدارە بچووکەکان بوو، داوای جێبەجێکردنی دێربەدێری دەستوری دەکرد نەک لەلایەن دەسـەڵاتی فیـدراڵییەکانەوە بقـۆزێتەوە بـۆ (جـۆرج واشـنتن)بەدرێژایـی سـەردەمی فەرمـانڕەوایی کـاری بۆ بە هێزکردنـی دەسـەڵاتی ناوەنـدی دەکـرد، هەر بۆیە لەلایەن کۆماریخوازە دیموکراتیەکانەوە بەدیکتاتۆر ناودەبرا.[١]

(جۆرج واشـنتن) هێنـدە زیـرەک و ڕێچـکە شـکێن نەبـوو، بەڵکـو جێبەجێکـارێکی بەتوانابوو، هەر کارێکی بە باش بزانیایە بە شـانازییەوە جێبەجێی دەکرد، خەڵکیش خۆشیان دەویست و وایان دائەنا وێنەی شکۆمەندی نەتەوەی ئەمریکایە، پەیوەنـدی ئەنـدامان و کارمەنـدانی کـۆنگرێس لەچڵەپـۆپەدا بـوو، هەوڵـی چەسـپاندنی بیـری نەتەوەیـــی ئەمریکـــی دەدا، هەوڵیـــدەدا بە درێژایـــی هەردوو مـــاوەی ســـەرۆک کۆماریەکەی بە جۆرێک حوکمڕانیان بکات کە لە سەروو دژایەتی پارتەکانەوە بێت.[٢]

یەکێـک لە هۆکـارە گرنگەکـانی هەڵبژاردنـی بـۆ ئەم پۆسـتە خوڕەوشـتی بـووە، چـونکە حەزی بە تـێکەڵاوی ئەو کەسـانە نەکـردووە کە لە ئاسـتی ئەودا نەبـوون، وردبین ودان بەخـۆداگر وجدیی بـووە، کەسـێکی وتـاربێژ نەبـوو. سـەرنجی گشـتی راکێشێت، بەڵام سام و هەیبەتی هەبوو، لە جێبەجێکردنـی ئەو ئەرکەی لەسەرشـانی بوو هەرگیز دوا نەدەکەوت، کەسێک بوو ئامادەیی بەخشینی ماڵ و خودی خۆیشـی هەبووە لەپێناو سەرخستنی گەلەکەی و بەدیهێنانی خواستەکانی ئەو گەلەدا، لەپاش هەڵبژاردنی جۆرج واشنتن بۆ سـەرۆک کۆمـاری ویـلایەتە یەکگرتووەکـانی ئەمریکـا، (جۆن ئادامس)یان بۆ جێگری سەرۆک هەڵبژارد و شـاری نیۆیـورک وەک پـایتەختی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.[٣]

---

١ - د.طليعة الصياح و راغب العلي: س- پ، ل٩٠.

٢ - فرحات زيادة و: س-پ، ل ٩٢.

٣ - بدون مؤلف:موجز التاريخ الأمريكي،ص ٤٩.

## سیاسەتی ناوخۆی واشنتن

جۆرج واشنتن دەستی کرد بە دامەزراندنی چەند وەزارەتێکی پێویست و گرنگ و بۆ هەریەکە لەو وەزارەتانەش کەسانی کارامە و لێهاتووی دانا تا کاروبارەکانی وەزارەتەکەی بە باشـــی ڕاپەڕێنێــت، وەک وەزارەتـــی دارایـــی و (ئەلکســـەندەر هاملتۆن)ی کرد بەوەزیری ئەم وەزارەتە، وەزارەتی دەرەوە (تۆماس جیفرسۆن)ی کرد بە وەزیری ئەم پۆستە، وەزارەتی جەنگی، جەنەڕاڵ (هێنری نوکس)ی بۆ ئەم پۆستـه هەڵبـژارد، هەروەهـا پۆسـتی چـاودێری گشـتی درایە (ئەدمۆندراندۆلف)، هەروەهـا دادگـای بـاڵای دامەزرانـد و (جـۆن جـای) دادوەری کـردە سـەرۆکی ئەو دادگایە، هەروەها (جۆرج واشنتن) سێ بەڕێوبەرایەتی و سیانزە دادگای دیکەی لە ویلایەتەکاندا دامەزراند.[1]

لەپاش دامەزراندنی ئەم وەزارەتانە و دانانی وەزیر بۆ هەریەک لەو پۆستانە و دەست بەکاربوونیـان ڕووبەڕووی چەنـدین کێشـە بـوویەوە، یەکێک لەو کێشـانەی ڕووبەڕووی حکـومەتەکەی (جـۆرج واشـنتن) بـوویەوە کێشـەی دارایـی بـوو، بـۆیە وەزیری دارایی (ئەلکسەندەر هاملتۆن) بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە خۆی یەکلا کردەوە، چونکە کۆنگرێسـی ئەمریکی لە کـاتی جەنگـی سـەربەخۆییدا لە وڵاتـانی تـر قەرزێکـی زۆری کردبـوو، حکـومەتیش توانـای نەبـوو ئەو قەرزانە بـداتەوە کە تـا دەهات زیاتر دەبوو.[2]

ئەلیکســەندەر هـاملتۆن چەنـد کـارێکی دارایـی ئەنجامـدا، یـارمەتی دروسـتبوونی حکومەتێکی ناوەندی بەهێزی یەکگرتوویدا، توانی لەمـاوەی دوو سـاڵدا چارەسـەری قەرزەکان بکات و بیداتەوە، توانـای دارایـی وڵاتـی زیـاترکرد و ئـابووری بەهێزکـرد، سوربوو لەسەر پەرەپێدان و بوژاندنەوەی ئابووری بازرگانی و پیشەسازی وڵات، بۆیە لەساڵی (١٧٩١)دا بانقی نیشتمانی دامەزراند و لقی تریشـی لە ویلایەتەکانـدا بـۆ کردەوە، ئەمەش لەڕێی قەرزکردنی پارەوە لە ویلایەتەکاندا.[3]

---

١ - فرحات زيادة و: س-پ، ل٨٤-٨٥

٢ - محمد محمود النيرب: س-پ،ج١/ل١٢٧.

٣ - هەمان سەرچاوە،ل١٢٨.

هەروەها یارمەتی دامەزراندنی خانەی سکەلێدانی دا و باج و لە پێناوی پاراستنی بەروبوومەکانی ناوخۆ گومرگی بەسەر شتومەکە دەرەکییەکاندا سەپاند، ئەم کارانەی (هاملتۆن)، بەلای(جیفرسۆن) و لایەنگرانیەوە لە سەرەتاوە پەسەند نەبوون، چونکە لە دەستوردا ئاماژە بە دامەزراندنی بانک و سەپاندنی باجی لەو جۆرە نەکرابوو، بەڵام هاملتۆن جەختی لەسەر ئەو دەسەڵاتەی حکومەتی ناوەندی دەکردەوە کە توانای بەجێگەیاندنی کاری وای هەیە، ئەمە و لەکاتێکدا بەبێ بوونی بانکێک، ناتوانرێت ئابووری وڵات بەرەوپێش ببرێت و قەرزی وڵاتەکانیشی بداتەوە، ئەم کارانەی هاملتۆن بارودۆخی ئابووری و دارایی ویلایەتە یەکگرتووەکانی لە سەرجەم بوارەکانی ئابووریدا گەشەپێکرد و بەرەو پێشەوەی برد، یەکێکی دی لە کێشەکانی سەردەمی حکومەتەکەی (جۆرج واشنتن) دەستوور بوو، هەر بۆیە یەکەم هەمواركردنی دەستوور لە (١٥)ی کانونی یەکەمی (١٧٩١) لەسەردەمی ئەمدا کراوە، هاوکات (دە) بەندی دی بۆ دەستوور زیادکراوە کە بە بەیاننامەی مافەکان دەناسرێت، مافەکانی تاکە کەسی تیادا ڕەچاوکراوە وەک ئازادی ڕادەربڕین و ڕۆژنامەوانی و بەبێ دادگا کەس تاونبار ناکرێت و... هتد.[١]

لە ساڵی (١٧٩١)دا پایتەختی حکومەتی فیدراڵی لە زەوییە زۆنگاوەکاندا بنیاتنرا، لەسەر پۆتۆماک، هەروەها سیستمی بانکی نەتەوەیی لەهەمان ساڵدا بنیادنرا، لە ساڵی (١٧٩٢)دا پۆستەخانە لەلایەن کۆنگرێسەوە دامەزرا و دراویش دەرکرا. لەپاش کۆتایی هاتنی خولی یەکەمی سەرۆک کۆماری کە چوار ساڵ بوو، جۆرج واشنتن توانی بۆ جاری دووەم و خولی دووەمی سەرۆک کۆماری، زۆرینەی دەنگەکانی بەدەستبێنێ لە ساڵی (١٧٩٣)دا، بوو بە سەرۆک کۆماری وڵات ئەمەش لە دەستووردا ڕێگەپێدراو بوو کە سەرۆک کۆمار پاش تەواوبوونی خولی یەکەمی سەرۆک کۆماری بۆ جاری دووەم خۆی هەڵبژێرێتەوە و ببێتەوە بە سەرۆکی وڵات.[٢] پێکهاتەی حکومەتەکەی جۆرج واشنتن لە هەر دوو خولی سەرۆک کۆماردا و لە ماوەی هەشت ساڵدا بەم شێوەیە بووە:

---

١ - ديب علی حسن:الولايات المتحدة الأمريكية،ص٢٠٢.

٢ - كارلهاينتس دشنر: تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية الحديث، ص ١٤٥.

| پۆست | کەسی پۆست پێدراو | ماوەی پۆستەکانیان |
| --- | --- | --- |
| جێگری سەرۆک | جۆن ئادامس | ١٧٨٩-١٧٩٨ |
| وەزیری دەرەوە | تۆماس جیفرسۆن | ١٧٨٩- ١٧٩٣ |
| | ئەدمۆندراندۆلف | ١٧٩٤- ١٧٩٥ |
| | تیمۆسی پیکرینگ | ١٧٩٥- ١٧٩٧ |
| وەزیری دارایی | ئەلکسەندەر هاملتۆن | ١٧٨٩- ١٧٩٥ |
| | ئۆلیڤەر والّکۆت | ١٧٩٥- ١٧٩٧ |
| وەزیری جەنگی | هنری نۆکس | ١٧٨٩- ١٧٩٤ |
| | تیمۆسی پیکرینگ | ١٧٩٥- ١٧٩٦ |
| | جایمس مکنری | ١٧٩٦- ١٧٩٧ |
| دادوەری باڵا | ئەدمۆندراندۆلف | ١٧٨٩- ١٧٩٣ |
| | ولیام براندفۆرد | ١٧٩٤- ١٧٩٥ |
| | چارلس لی | ١٧٩٥- ١٧٩٧ |

لە ساڵی (١٧٩٤)دا شۆڕشێک لە ڕۆژئاوای بەنسلڤانیادا بەرپابوو بە (شۆڕشی ویسکی) ناودەبرێت، ئەویش لە ئەنجامی ئەو باجە زۆرانەی حکومەتەوە سەریهەڵدا کە خرابووە سەر بەرهەمەکانیان بەتایبەتی ویسکی، بەڵام (جۆرج واشنتن) و ئەلکسەندەر هاملتۆن توانییان بەهۆی سوپاوە شۆڕشەکە سەرکوت بکەن و دایمرکێننەوە.[1]

### سیاسەتی دەرەوەی واشنتن

پاش سەربەخۆ بوونی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و پێکهێنانی حکومەتی فیدراڵی لە ساڵی (١٧٨٩)دا و دانانی سەرۆک بۆ ئەو حکومەتە بە سەرۆکایەتی جۆرج واشنتن و دانانی وەزارەتەکان و وەزیرەکان و ڕێکخستنی کاروباری ناوخۆی وڵات، لەسەر ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پێویست بوو بەهەر

---

١ - دیب علی حسن: س-پ،ل ٢٠٣-٢٠٤.

شێوەیەک بێت، وەک هەر وڵاتێکی دی سەربەخۆ پەیوەندی لەگەڵ وڵاتانی دیکەدا هەبێت، لێرەدا سیاسەتی دەرەوەی حکومەتەکانی (جۆرج واشنتن) دەخەینەڕوو: [1]

### یەکەم- لەگەڵ فەڕەنسا

ئەو ساڵەی جۆرج واشنتن دەسەڵاتی گرتەدەست، هەمان ئەو ساڵە بوو شۆڕشی فەڕەنسی (١٧٨٩) بەرپابوو کە بنەماڵەی پادشایەتی بۆربۆن کۆتایی بە دەسەڵاتیان هێنرا، تا ئەم کاتەش بە پێی رێککەوتنی ساڵی(١٧٧٨) فەڕەنسا هاوپەیمانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بوو، هەربۆیە فەڕەنساش چاوەڕێی یارمەتی و پشتگیری ئەمریکیەکانی دەکرد، چونکە فەڕەنسییەکان لە شۆڕشی سەربەخۆییدا یارمەتییەکی زۆری ئەمریکیەکانیان دا، بەڵام (جۆرج واشنتن) مادەکانی دەستوری بەجۆرێک شیدەکردەوە تا ویلایەتە یەکگرتووەکان لە جەنگی ئەوروپا بپارێزێت، هەروەها نەیدەویست دەست لە کاروباری وڵاتان وەربدات، خوازیاریش بوو ئەوانیش دەست نەخەنە نێو کاروباری ئەمانەوە تا بتوانێت کاروباری وڵات باشتر بکات و بە دوور بێ لەجەنگی وڵاتانی دی. [2]

بەڵام چین و توێژەکانی گەلی ئەمریکی جگە لە فیدراڵییەکان و لایەنگرانی جۆرج واشنتن پێچەوانەی ئەم هەڵوێستەی سەرۆک بوون و بە باشیان دەزانی یارمەتی فەڕەنسا بدەن، بەڵام (جۆرج واشنتن) سووربوو لەسەر بێلایەنی وڵاتەکەی، ئەوەی زیاتر یارمەتیدا تا لەم هەڵوێستەیدا سەربکەوێت ئەو تیرۆرکارییە بوو کە لە فەڕەنسا لەسەر دەستی یەعقوبیەکان سەریهەڵدا و ژمارەیەکی زۆر خەڵکیان کوشت، ئەمەش دژی هەموو جۆرە دیموکراسیەک بوو کە گەلی ئەمریکا گرنگی زۆری پێدەدا، ئەگەر چی هەر سەکەوتنێکی فەڕەنسیەکان لەلایەن کۆمارییەکانەوە بە دژی زۆرداری و چەسپاندنی ئازادییان دادەنا. [3]

### دووەم- لەگەڵ ئینگلتەرا

لە سەردەمی جۆرج واشنتندا پەیوەندی لەگەڵ ئینگلتەرادا باش نەبوو، چونکە ئینگلتەرا سەرەڕای ئەوەی چەند سەنتەر و قەڵایەکیان لە باکووری رۆژئاوای

---

١ - فرنسيس فريدمان:موجز التاريخ الأمريكي،ص٦٨.

٢ - تشارلز و ماري بيرد: تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية،ج١/ص ٢٠٤.

٣ - فرحات زيادة و ابراهيم فريجي: تاريخ الشعب الاميريكي،ص ٩٢.

ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا هەبوو، لە لایەکەوە هانی هندییە سوورەکانیان دەدا دژی ئەمریکییەکان بە مەبەستی گەڕانەوەی ناوچەکانیان لە لایەکی دیکەشەوە، لەدەریادا کەشتییەکانی ئینگلیز ڕێگەیان لە کەشتییەکانی ئەمریکا دەگرت و سەرنشینەکانیشیان دەگرتن و بە بیانووی ئەوەی سەربازی ئینگلتەرایی هەڵهاتوون بەریان نە دەدان، بۆیە لەساڵی (١٧٩٤)دا، (جۆرج واشنتن، جۆن جای) نارد بۆ چارسەرکردنی کێشەی دەریا، ئەوەبوو (جۆن جای) پەیماننامەیەکی لەگەڵدا بەستن کە دەسەڵاتی ئینگلیزی لە ناوچەکانی ڕۆژئاوا چۆڵ کرد، بەڵام باسێکی لە بارەی کێشەی دەریاوە نەکرد، ئەمەش بووە جێی نارەزایی ئەمریکیەکان، ئەم پەیماننامەیە بووە هۆی وروژاندنی فەرەنسییەکان کە ئینگلیزەکان لە دژی دەجەنگان.[1]

### سێیەم- لەگەڵ ئیسپانیا

لەسەردەمی سەرۆکایەتیدا (جۆرج واشنتن) پەیماننامەیەکی لەگەڵ ئیسپانیادا مۆرکرد، بە پێی پەیماننامەکە سنووری فلۆریدای دیاری کرد، مافی دەریاوانی لە ڕووباری (میسیسپی)دا بەدەست هێنا لەگەڵ مافی داگرتنی بارە کەشتیەکانیان لە بەندەری (نیوئۆرلیانز)دا، ئەم پەیماننامەیە بە پەیماننامەی (پاینکنی) دەناسرێت.[2]

### چوارەم- لەگەڵ میرەکانی ڕۆژئاوای عەرەبی:

پێش پێکهێنانی حکومەتەکەی جۆرج واشنتن، کێشە لە نێوان ویلایەتە یەکگرتووەکان و ئەمیرەکانی ڕۆژئاوای عەرەبیدا سەریهەڵدابوو، بەڵام کاتێک جۆرج واشنتن بوو بە سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکان، لەکانوونی یەکەمی (١٧٨٩)دا ستایشی سوڵتانی مەراکیش کرد، سوڵتانیش وەک دانپێدانانێک بە حکومەتەکەی جۆرج واشنتن، چەند نوێنەرێکی خۆی بۆ ئەمریکا نارد، بەڵام کاتێک دژی جەزائیر هاوپەیمانی لەگەڵ ئینگلترا بەست، ئەوەبوو جەزائیرییەکان لە ساڵی (١٧٩٣)دا کەشتیەکی ئەمریکیان بە (٢١٧) سەرنشینەوە دەستگیرکرد، تا ئەو کاتەی پارەیەکی زۆریان درایە بەرنەدران، بۆیە ساڵی (١٧٩٤) کۆنگرێس کەشتیگەلی جەنگی پێکهێنا

---

١ - د.عبدالعزيز سليمان و د.عبدالمجيد نعنعي:تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية الحديث،ص١٠١.

٢ - د. طليعة الصياح و: تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية، ص ٩٢.

و له هه‌مـــان ســـاڵدا هێرشـــێکی تێکشـــکاویان کـــرده ســـه‌ر ته‌رابلـــوس و (دای) فه‌رمانڕه‌وای ته‌رابلوس داوای دوو ملیۆن باجی ساڵانه‌ی لێکردن. [1]

بـۆیه دواتـر ڕێکه‌وتننـامه‌یه‌ک له نێـوان میـری تـونس و ته‌رابلـوس له‌لایه‌ک و. ئه‌مریکـا له‌لایه‌کـی دیـکه‌وه به‌سـترا، که‌شـتیوانی و هـاتووچۆی ئه‌مریکییه‌کـانی له ده‌ریـای ناوه‌راسـتدا زیـاترکرد، به‌مه‌ش تـا سـاڵانی (١٧٩٧) ویـلایه‌ته یه‌کگرتووه‌کـان چه‌نـدین ڕێکه‌وتننـامه‌ی له‌گه‌ڵ فه‌رمانڕه‌واکـانی تـونس و ته‌رابلـوس و جه‌زائیـر و مه‌راکیشـدا به‌سـت به مه‌به‌سـتی بازرگـانی و چـاککردنی بازرگـانی ئه‌مریکـی و یارمه‌تیدانی که‌شتیه بازرگانیه ئه‌مریکیه‌کان، به‌مه‌ش ده‌سه‌ڵات و هێزی ویلایه‌ته‌کان له ناوچه‌که‌دا زیادی کرد. [2]

جـۆرج واشـنتن تێگه‌یشـتنه مه‌زنه‌که‌ی خـۆی له حکومه‌ته‌که‌یـدا سـه‌لماند، زۆر وریـابوو تـا له مـاوه‌ی سـه‌رۆکایه‌تیدا مـۆرکێکی شـکۆداری پـێ ببه‌خشـێت و له که‌ژاوه‌ی سه‌رۆک و ڕێوڕه‌سمه‌کاندا هه‌ڵسوکه‌وتی شاهانه بکات، له حکومه‌ته‌که‌یدا به‌خـت یـاوه‌ری بـوو چـونکه دوو یاریـده‌ده‌ری هه‌بـوو کاریـان بـۆ هه‌یبه‌تـی ده‌سـه‌ڵاته‌که‌ی ده‌کـرد، له سـه‌رویانه‌وه (جـۆن ئـادامس)ی جێگری بـوو، له ڕاسـتیدا له‌پێکهێنانی حکومه‌ت و دانانی پیاوه‌کانیدا سه‌رکه‌وتوو بوو. [3]

له پـێش هه‌ر بڕیارێکیـدا ده‌ربیکـردایه چـاو پێداخشـاندنێکی وردی بـۆ بـابه‌ته‌که ده‌کرد، له‌گه‌ڵ که‌سانی جێ متمانه‌ی خۆیدا گفتوگۆی له بـاره‌یه‌وه ده‌کرد، ئه‌مـانه‌ش زیاتر هانده‌ری سه‌که‌وتووی (جۆرج واشنتن) بـوون له مـاوه‌ی سـه‌رۆک کۆماریـدا، (جۆرج واشنتن) له خـولی یه‌که‌مـی سـه‌رۆک کۆماریـدا تاکه‌کـانی ئه‌مریکـا ڕێزێکـی زۆریان لێگرت، به‌ڵام پاش ئه‌وه‌ی بوو به سه‌رۆک کۆمار بۆ جاری دووه‌م ڕه‌خنه‌ی روخێنه‌ر و سه‌رزه‌نشـتکارانه‌ی به‌ره‌و ڕووبـوویه‌وه، هه‌روه‌هـا دژایه‌تـی نێـوان دوو پـارته‌که به تـایبه‌تی دژایه‌تـی پـارتی کۆمـاری بـۆ (جـۆرج واشـنتن) زۆر بێتـاقه‌تی کردبوو، ئه‌مه‌ش به‌هۆی ئه‌و هه‌ڵوێستانه‌ی له به‌رامبه‌ر وڵاتانی ده‌ره‌وه‌دا هه‌یبوو. [4]

به (جـۆرج واشـــنتن)یان ده‌وت تاوانبــاری ته‌ڵه‌که‌بـاز، ته‌نـانه‌ت رق و کیـنه‌ی دوژمنـانی گه‌شـته ئاسـتێک له یه‌کێـک له ڕۆژنـامه به‌کرێگیراوه‌کانـدا به وێـنه‌ی

---

١ – فرحات زيادة و ابراهيم فريجي: س-پ،ل١٠١.

٢ – هه‌مان سه‌رچاوه.

٣ – فرانک تيسلويت:الثورة العظمى،تر-لجنة من الاساتذة،دار الشرق الجديد،بيروت،١٩٥٥،ص٣٦.

٤ – فرانكلن اشر: س-پ،ص ٧٥.

تاوانبارێک نیشانی بدەن کە چاوەڕێی پەتی سێدارەیە و لە خوارووی وێنەکەشەوە دەنووسن (پێویستە ئەمە چارەنووسی بێت) تەنانەت کاتێک کۆنگرێس ویستی لە کۆتا خولی دووەمی کۆماریدا کۆببێتەوە بۆ بڕینەوەی موچەیەک بۆ سەرۆک کۆمار، یەکێک لە نوێنەران ئاماژەی بەوەکرد (هەر کەسێ ویستی پیرۆزبایی لە سەرۆک کۆمار بکات، با تەنها بەڕای کەسی خۆی بێت چونکە من هیچ تێڕوانینێکی چاکم بۆ سەرۆک کۆمار نیە) ئەمەش (جۆرج واشنتن)ی زیاتر نیگەران کردبوو، هەروەها نەیارە ئەمریکیەکانی دڵخۆش نەبوون بەوەی (جۆرج واشنتن) بۆ جارێکی تر ببێتە سەرۆک کۆمار. [1]

(جۆرج واشنتن) لەم جۆرە هێرشکردن و تێڕوانیە نارەوایانەی بە ئاشکرا دەکرانە سەری، چونکە ئەم تۆمەتانەی بەناڕەوا دادەنا و بە شایستەی کەسێکی دەزانی ئاسایی بێت، نەک کەسێکی وەک ئەو، بۆیە بێ ئومێد بوو، زۆر بێزار بوو لە سیاسەت.

بۆیە بۆ جاری سێیەم ئەو پۆستەی ڕەتکردەوە و ڕازیبوو بەوەی دووری بخەنەوە و جارێکی تر کورسی دەسەلاتی پێ نەدرێتەوە، بۆیە پاش کۆتایی هاتنی ماوەی حوکمڕانییەکەی لە نامەیەکی گرنگدا وتاری ماڵئاوایی لە گەلی ئەمریکا کرد و وازی هێنا لە پۆستەکەی، ئەم وتارە یەکێکە لە بەڵگە مێژووییەکانی گەلی ئەمریکا و شانازی پێوە دەکەن. [2]

لەو نامەدا بە شێوەیەکی ئاشکرا و گشتی گەلی ئەمریکی لە زیادەڕۆیی کاروبارەکانی پارتەکان ترساند، لە کاروباری دەرەوەشدا ئامۆژگاریکردن ڕێگە بگرن لە دەربڕینی هەستی ناسک و بەکارهێنانی زاراوە و ڕستە سۆزدارییەکان و وێژەییەکان لە بۆنە نێودەوڵەتیەکانداوە، لەگەڵ هەموو نەتەوەکاندا بە نیەتی پاک و ویژدانەوە ڕەفتار بکەن. پێویستە خۆمان بەدوور بگرین لە دەربڕینی ڕق و کینە بەردەوام و بێ بنچینە بەرامبەر بە دەوڵەتانێک و دەربڕینی پەیوەندییەکی بەهێز لەگەڵ دەوڵەتانێکی تردا. [3]

گەلێک خۆی بە ڕق و قینی بەردەوام ڕاهێنابێت، یان بێ هۆ خۆشەویستی بۆ گەلێک بنوێنێت، لە ڕاستیدا کۆیلەی هەواو ئارەزووی خۆیەتی، دەبێت هەوڵ بدەین

---

١ – منصف السليمي: القرار السياسي الأمريكي،الطبعة الاولى،مركز الدراسات العربي الاوروبي، ١٩٩٧،ص٢٣٣.

٢ – محمد محمود النيرب: المدخل في تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية،ص١٣٤.

٣ – بدون مؤلف:موجز التاريخ الأمريكي،ص ٥١.

ولاتەکەمـــان لە دەســـتێوەردانی دەرەوە بپـــارێزین.گەلی ئەمریکـــا لە دروســـتکردنی پەیوەنـــدی دەرەکـــی و نێودەوڵەتیـــدا لەگەڵ گەلنـــی دیـــکەدا نە دۆســـتایەتی و نەدوژمنایەتی هەمیشەیی ناکات، چونکە هیچ کامیان لەگەڵ بنەمای دەوڵەتی ئەمریکا نـاگونجێن، دوای ئەم وتـارە و کۆتـایی هـاتنی دەسـەلاتی لە (٣)ی ئـازاری (١٧٩٧)دا گەڕایەوە بـۆ مـاڵ و کـێڵگەکەی خـۆی لە (ماونـت ڤیرنـون) و پـاش دوو سـاڵ لە خانەنشـینی لە (١٤)ی کـانوونی یەکەمـی سـاڵی (١٧٩٩)دا بە نەخۆشـییەکی کوشـندە کۆچی دوایی کرد. [1]

---

١ - ديب على حسن:الولايات المتحدة الأمريكية،ص٢٠٥.

له ساڵی (١٧٩٧) کاتێ (جۆرج واشنتن) ماوەی سەرۆکایەتییەکەی تەواوبوو، هەوڵیدا له بارودۆخە سیاسیەکه پاشەکشه بکات و بگەڕێتەوە باخچەکەی (ماونت ڤارنون) بۆ ئەوەی ئەو بەشەی ژیانی ماوە له بارودۆخێکی هێمنی و خۆشیدا بیباتەسەر، له دوای ئەم (جون ئادامس) له ساڵی (١٧٩٧- ١٨٠١) فەرمانڕەوایی گرتەدەست که هەڵبژێردراوی حزبی فیدراڵی بوو (ئادامس) لەسەر بۆچوونەکانی سوور بوو و گوێی نەگرت له ڕێنمایی و ئامۆژگاریەکانی (هاملتۆن) ئەمە بووە هۆی دروستبوونی دووبەرەکی لەناو ڕیزەکانی حزبی فیدراڵیدا، له ئەنجامی بەستنی پەیمان له ساڵی (١٧٩٥) له نێوان ئەمریکا و ئینگلتەرەدا ناکۆکی دەرکەوت، پەیوەندییەکانی دەرەوەی ئەمریکا شێوا، چونکه شەڕ له نێوان ئەمریکا و فەرەنسادا هەڵگیرسا، لەبەرئەوەی فەرەنسا ئەوەی بە پێشێلکاری مافەکانی خۆی دەزانی و ئەم پەیوەندیە نەچووە سەر ڕێرەوە سروشتیەکەی تا ئەو کاتەی (ناپلیۆن) له فەرەنسا هاتە سەرکارو پێشوازیەکی گەرم و دۆستانەی له نوێنەری ئەمریکا کرد.[1]

له ماوەی سەرۆکایەتی (جۆن ئادامس)کۆنگرێس که زۆربەی ئەندامەکانی سەر به پارتی فیدراڵی بوون چوار یاسای داناوە که کاریگەری زۆر خراپی لەسەر وڵات هەبووە.

**یەکەم:** ڕێگە نادات هیچ بێگانەیەک ببێتە هەڵگری ڕەگەزنامەی ئەمریکی ئەگەر ماوەی مانەوەی لەو وڵاتە (چواردە) ساڵ نەبێت نەک (پێنج) ساڵ که لەوەوپێش هەبوو.

**دووەم:** بۆ دەسەڵات هەیە هەر بێگانەیەک دووربخاتەوە که گومانی لێ بکات.

**سێیەم:** ماف ئەدات بە سەرۆک بە دوور خستنەوەی هەموو بێگانەیەک یان بەندکردنیان له ڕۆژانی جەنگدا.

**چوارەم:** هەر پیلانێک دژی کاروباری دەوڵەت یاخود ڕەخنەگرتن له کارمەندە گشتیەکانی دەوڵەت، تاوانێکە دژی ئاشتی دەوڵەت. [2]

بۆیە خەڵکی ئەم یاسا توندوتیژانەیان بە هۆکاری کوشتنی ئازادی تاکە کەس لەقەڵەم ئەدا، لەبەرئەوە (جیفرسۆن) و (مادیسۆن) بەرگریان لەم یاسایانە نەکرد و هەستان بە گرێدانی کۆبوونەوەی هەردوو ئەنجومەنی (ڤیرجینیا) و (کەنتاکی) که دوو ئەنجومەنی یاسادانان بوون، دوو یاسایان دەرکرد که دژایەتی چوار یاساکەی

---

١ - د.عبد العزيز سليمان و د. عبد المجيد نعنعي: تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية الحديث، ص ١٠٠-١٠١.

٢ - د. طليعة الصياح و راغب العلي: تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية، ص ٩٢.

پێشوویان دەکرد و داوای هەڵوەشاندنەوەیان دەکرد و داوایان ئەکرد مافیان هەبێ بۆ هەڵوەشانی هەر یاسایەک کە کۆنگرێس دەری دەکات دائەنرێ بەوەی دژی دەستوورە،[1] دوای ساڵی (١٨٠٠) وڵات ئامادە بوو بۆ گۆڕینی دەسەڵات، هەر لەگەڵ تێکۆشانی فیدراڵیەکان لەماوەی سەرۆکایەتی (واشنتن وئادامس) و هەوڵدانیان بۆ بەهێزکردنی حکومەتی فیدراڵی و دەرخستنی بەشێوازێک کە جێگای باوەڕبێت و بنەماکانی دەسەڵات زۆر پتەو و بەهێز بێت، لەگەڵ ئەوەشدا زۆر ئاگایان لەخەڵکی گشتی نەبوو و لەسەر پاراستنی مافەکانیان لە دەسەڵاتدا کاریان نەئەکرد لەبەرئەوەی بۆچوونەکانیان ئۆرستوکراتیانە بوو، لە ئەنجامدا (جیفرسۆن) و جووتیارە بچووکەکانی چواردەوری لەگەڵ پیشەساز و کرێکارەکان هەوڵیاندا بۆ دامەزراندنی حکومەتێک کەلەسەر بەرژەوەندیەکانی گەل دامەزرابێت نەک لەسەر بەرژەوەندی تایبەت و هەوا و ئارەزوویان، بۆیە لە هەڵبژاردنی ئەو ساڵەدا سەرۆکایەتیەکەی بردەوە. فیدراڵیەکان زۆر لە سەرۆکایەتی (جیفرسۆن) ترسان، لەبەرئەوەی وایاندادەنا بێ باوەڕێکی ئاژاوە چیە، لەبەرئەوە هەوڵ ئەدا بۆ بەدەستهێنانی ئەو ئامانجانەی دوور لە ئامانجی گشتی بۆ خۆی دایهێناون.[2]

## سەردەمی تۆماس و جیفرسۆن (١٨٠١ - ١٨٠٩ز)

دوای ئەوەی بۆ یەکەم جار لە ساڵی (١٧٦٩) (تۆماس جیفرسۆن) تێکەڵ بە دنیای سیاسیەت بوو، تووشی ناڕەحەتی و ئاستەنگی زۆربوو، لەپێناو ئازادیدا هەوڵێکی زۆری دا بۆ رزگارکردنی کۆیلەکان لە کۆیلایەتی، ئەمەش دوای ئەوەی لە یەکەم دانیشتنی کۆبوونەوەی ئەنجومەنی نوێنەرانی داگیرکراودا بەشداری کرد، لە تەمەنی (٢٦) ساڵیدا دەستی کرد بە ئیشی پارێزەری، دوابەدوای ئەو دانیشتنە هەنگاوی نا بەرەو شۆڕشی ئەمریکی و لەگەڵ چەند هاوەڵێکی رێککەوتن لەسەر پچڕاندنی هاوردەی بەریتانی بۆ ئەمریکا، (جیفرسۆن)ی گەنجی لێزان لە ساڵی (١٧٧٤) نامەیەکی بەناوبانگی نووسی لەژێر ناونیشانی تێڕوانینێکی پوخت لە یاسای ئەمریکای بەریتانیا، هەر لەوکاتەدا کتێبێکی نووسی لەسەر یاسای ئەمریکی.[3]

---

١ - تشارلز و ماری بيرد: تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية،ج١/ص ٢٠١.

٢ - ديب علي حسن:الولايات المتحدة الأمريكية،ص٢٠٨.

٣ - د.عبدالعزيز سليمان نوار ود. محمود محمد جمال الدين:تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية(من القرن السادس عشر حتى القرن العشرين)، دار الفكر العربي،القاهرة،٢٠٠١، ص٩٠.

بێگومـان (جیفرسـۆن) بەردەوام بـوو لەسـەر ڕاگەیانـدنی نـامەکە و بـانگەوازی سـەربەخۆی، بۆیە کاتێک لە ساڵی (١٧٧٥) چووە نـاو کۆنگرەی کیشـوەری داوای لە ڕادەرەکانی کرد لە داڕشتنی ڕەشنووسـەکەدا هاوکاری بکەن و تیایدا هەڵگرتنی چەک و تەنـانەت خوێنڕشـتنیش لەپێنـاو بەرگریکـردن لە مـافی ویلایەتەکـان و ئەمریکیەکان ڕابگەیەنن.

لە ڕاگەیەنراوی سەربەخۆیی ساڵی (١٧٧٦) (جیفرسۆن) ئاشکرای کرد ئامانجی سـەرەکی حکـومەت پارسـتنی مـافی ژیـان و داواکـاری خۆشگوزەرانیە، ئەوەشـی ئاشـکرا کـرد هەمـوو مرۆڤەکـان خـاوەنی چەنـد مـافێکی تـایبەتی خۆیـانن و هـیچ حکومەتێک ناتوانێت پێشێلیان بکات. سەرەڕای ئەوەی توانای حکومەت لە توانایی و ڕازیبوونی ئەوانەی حکومەتەکە پێک دەهێنن سەرچاوە دەگرێت، هەروەها ئەوەشی وت کە بوونی حکومەتە باشەکان، پاراستنی مافە خوداییەکانە.

(تۆمـــاس جیفرســـۆن) دوای تەواوکردنـــی خوێنـــدنی یاســـایی لە ویـــلایەتە یەکگرتووەکان بوو بە لێکۆڵەرەوە بۆ کۆنگرەی کیشوەری، دوای ئەوەش لە ساڵی (١٧٧٦) ڕەشنوسـی بانگەشـەی سـەربەخۆیی کـرد، لە سـاڵی (١٧٧٩)شـدا لەکاتێکدا تەمەنی (٣٦) ساڵ بوو سەرۆکی هێزی دیموکرات بوو، هەر لەم ساڵەشدا بە حاکمی

فیرجینیـا هەڵبژێـردرا، بێگومـان ئەم کـارەش قورسـاییەکی نائاسـایی خسـتبووە سەرشـــانی، بەتـــایبەت دوای ئەوەی بـــۆ جـــاری دووەم لە ســـاڵی (١٧٨٠) هەڵبژێـردرایەوە.[1] لە کـۆنگرەی سـاڵی (١٧٨٣- ١٧٨٤) (جیفرسـۆن)لە تـوێژینەوەی سیستمی ڕەخنەی دەیەم سـەرکەوتنی بەدەسـتهێنا، دواتر لە ماوەی نێوان ساڵانی (١٧٨٥- ١٧٨٩) لەسـەر داوای سـەرۆکی یەکەم (جـۆرج واشـنتن) بـوو بە باڵیۆزی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە پاریس، وەک خۆی دەڵێ' لە ڕێگای هاتنەوەم لە پاریسەوە بەرەو نیشتمان بە پۆستە وتارێکی سـەرۆک واشـنتنم پێگەیشت، بڕیـاری دامەزراندنی منی دابوو بە پۆستی وەزیر، زۆر دڵگران بووم بەم هەواڵە، چونکە من دەمویست بگەڕێمەوە پۆ پاریس بۆئەوەی کۆتایی ئەو شۆڕشە ببینم کە لە فەڕەنسا هەڵگیرسابوو.هەروەها دەمویست بگەڕێمەوە بۆ نیشتمان و لە ژیانی سیاسی دوور بکەومەوە و لەگەڵ خێزان و هاوڕێکانم ژیانێکی ئاسایی بەسەر بەرم، ئەم هەستەی خۆمم لە نامەیەکدا بۆ سەرۆک دەربڕی، بەڵام ئەوەشم وت هەر بڕیارێک سـەرۆک دەیدات من نکوڵیم لێ نیە، پاشـان وتـارێکی دیکەم پێگەیشت ئەمەش دوای ئەوەی

---

١ - الكسي دو توكفيل: عن الديموقراطية في أمريكا، ص١٣.

گەیشتمە (مۆنتسلیۆ) تیایدا سەرۆک جەختی کردەوە لەوەی ئارەزوو دەکات ببمە وەزیر، بێگومان ئەمەش وای لەمن کرد پۆستی وەزیری قبوڵ بکەم".[1]

بەمجۆرە لەسەر بڕیاری سەرۆکی یەکەم تۆماس جیفرسۆن لەدوای گەڕانەوەی لە فەرەنسا بوو بە وەزیری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، ئەمەش لە ئەیلولی (١٧٨٩) و لەو پۆستەیدا مایەوە تا ساڵی (١٧٩٣) لەم ساڵەدا بە بیانووی پێویستی لەسەر هەوڵەکانی هاملتۆن بۆ سەپاندنی سیستمی مەرکەزی دەستی لەکارکێشایەوە، لە پەیمانی (جۆن ئادامس)دا لەساڵانی نێوان (١٧٩٧- ١٨٠١) تۆماس جیفرسۆن پۆستی جێگری سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی بەدەستهێنا و لەو ماوەیەدا لە هەوڵەکانی بۆ باوەڕ پێهێنانی حکومەتی مەرکەزی دەستبەرداربوون لە دەسەڵات بۆ دەسەڵاتەکانی ناوخۆیی بەردەوام بوو.[2]

لە دوای نزیکبوونەوەی ماوەی تەواوبوونی سەرۆکایەتی جۆن ئادامس گفتوگۆ لەسەر هەڵبژاردنەکان بۆ سەرۆکایەتی ساڵی (١٨٠١) دەستیپێکرد، (جیفرسۆن) خۆی ئەم هەڵبژاردنەی بە شۆڕشی ساڵی (١٨٠٠) ناودەبات وەک شۆڕشی ساڵی (١٧٧٦)، بەڵام جیاوازی ئەم شۆڕشە ئەوەبوو کە بە چاکسازی بیروهۆش و ئاشتیانە و جگە لەوەش لەسەر ڕای گەل و پێشنیارەکانی گەل پێشکەشکرابوو، نەک بە زەبری شمشێر.[3]

لە دەستووری کاندیدکراواندا هاتبوو هەر کەسێک دەنگ دەدات دەبێت دوو دەنگ بدات یەکێکیان بۆ سەرۆک و ئەویتریان بۆ جێگرەکەی، هەر کاندیدکراوێک زۆرترین دەنگ بەدەست بێنێت دەبێت بە سەرۆک و ئەوەشی کەمتر بوو دەبێت بە جێگری سەرۆک، بەو شێوەیە هەڵبژاردنەکان دەستیپێکردو ئەنجامەکەشی بەمجۆرە بوو: (تۆماس جیفرسۆن) (٧٣) دەنگ، (ئارۆن بیر) (٧٣) دەنگ، (مستەر ئادامس)(٦٥) دەنگ، (بینکی) (٦٤) دەنگ، بەمجۆرە یەکسانیەک لە نێوان دەنگەکانی (تۆماس جیفرسۆن و ئارۆن بیر) بەدیدەکرێت ئەمەش ناخۆشیەکی زۆری خستبووە نێوان هەردوو سەرکردە و خۆشیەکی زۆریشی خستبووە دڵی فیدراڵیەکان، بەو نیازەی ڕێگە لە هەڵبژاردنەکان دەگرن و کەسێک لە کۆمارییەکان لە ئەنجومەنی پیران هەڵدەبژێرن. بەڵام(تۆماس جیفرسۆن)لەسەر ئەنجومەنی نوێنەران بە سێیەم

---

١ - دیب علی حسن:س-پ،ل٢١١.

٢ - کارلهاینتس دشنر: تاریخ الولایات المتحدة، ص ١٥٠.

٣ - د. طلیعة الصیاح و راغب العلي: تاریخ الولایات المتحدة الأمریکیة، ص ٩٣.

ســەرۆکی ویــلایەتە یەکگرتووەکــان ڕاگەیەنــرا، چــونکە بەپێــی دەســتوور تەنهــا ئەنجومەنی نوێنەران بۆی هەبوو ئەنجامی هەڵبژاردنەکان دیاری بکات.[1]

(جیفرسۆن) لە (٤) ئازاری ساڵی (١٨٠١) لە شاری واشنتن بوو بە سەرۆک و ئەم شارەی کردە پایتەخت و لە ئاهەنگی سەرۆکایەتیدا هیچ دیاردەیەکی کۆن بەدی نەدەکرا، لەبەرئەوەی زۆر ڕقی لە خۆدەرخستن بوو. (جیفرسۆن) پێشوازی کرد لە نوێنەری بەریتانی کە جلێکی زۆر سادە و جووتێ پێڵاوی بەسەر پێوە کردبوو، بەلام باڵوێزی بەریتانی جل و بەرگی فەرمی جوانی لەبەردابوو، لە یەکەم وتاریدا وەک سەرۆکی ولاتە یەکگرتووەکان خۆی نیشاندا، ئارەزووی خۆی دەرخست بۆ یەکێتی نەتەوە و یەکبوونی بۆچوونەکانیان کە لەوەوپێش دووبەرەکی و هەڵوەشان لە ڕیزەکانیاندا هەبوو و تکای لە هەموو لێپرسراوان کرد لە ڕامیاری ولاتدا بەپێی توانا ئاسانکاری بکەن لەبەرئەوەی توندڕەوی سیاسی وەک توندڕەوی ئایینی وایە کە ئەبێتە هۆی ڕووخانی کۆمەڵگا و لاوازبوونی یەکێتی ریزەکانیان، ئاشکرای کرد حکــومەتەکەی لە توانایــدا هەیە بە شــێوەیەکی دادپەروەرانە و ڕوون و ئاشــکرا کاروبارەکانی بەڕێوەبەرێ و سەروەت و سامان لە پێناوی بەرژەوەندی گشتیدا سەرف بکات و بەپێی توانا گرنگی بدات بە پشتگیری کردنی ئاشتی و سیستمی گشتی و ڕێگەدان بە خەڵکی تا مافی هەڵسوڕانی کاروباری خۆیان هەبێت، هەوڵ بدەن چۆن بیانەوێ داهات کۆبکەنەوە، لە بواری کاروباری دەرەوەدا پێویستە لەسەر حکومەتەکەی پارێزگاری بکات لەو هاوڕێیەتیەی لەنێوان ئەمان و گەڵنی بێگانەدا هەیە تا ئەبێتە هۆی دروست بوونی کۆمەڵێک پەیماننامە کە بیانخاتە شەڕەوە.[2] بۆ سیاسەتی دارایی هەوڵیدا بە هەڵوەشانی ئەو باجانانەی خەڵکیان بێزار کردبوو کە بووە هۆی هەڵگیرسانی شۆڕش (پەنسلڤانیا) و هەڵوشانی ئەو خەرجیە زۆرانەی لە دامەزراوە جەنگییەکاندا بەکاردەهات و ڕزگاربوون لە قەرزە نیشتمانیەکان بە زووترین کات کاتێ لە کۆشکی سپی بوو شوێنی ڕەسمی سەرۆک هەوڵیدا بۆ لەناوبردنی هەموو تایبەتمەندیە ئەرستۆکراتیەکان کە بە سەرۆکایەتیەوە هەڵواسرابوون، هەستا بە هەڵوەشانی خوونەریەتی پێشوازیە ڕەسمیەکان کە لە هەموو هەفتەیەکدا دەبەسترا و هەموو ناسناوێکی قەدەغەکرد.[3]

---

١ - محمد محمود النيرب: المدخل في تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية،ص١٤٢.

٢ - فرحات زيادة و ابراهيم فريجي: تاريخ الشعب الأمريكي،ص ١٠٠.

٣ - د.عبد العزيز سليمان نوار واخرون: تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية، ص ٩١.

## دەسەڵاتداری لە سەردەمی تۆماس جیفرسۆندا

(تومــــاس جیفرســــۆن) لە دوای کۆتـــایی هێنـــان بە گوتـــاری یەکەم دانـــراوی سـەرۆکایەتی هەڵبژاردنەکەی خۆی بە شۆرشێک پێناسە دەکات و وتارەکەشی لە مێژوودا بە وتـارێکی شۆرشـگێرانە نـاودەبرێ، چـونکە گـوێزانەوەی دەسـەڵاتە لە پارتێکەوە بۆ پارتێکی دی بەشێوەیەکی ئاشتیانە.

لە دوای دەسەڵات گرتنەدەست شاری واشنتنی کرد بە پایتەخت، پێشتر شـاری نیۆیـورک پایتەخـت بـوو، ئـاهەنگی پۆسـتەکەی نەکـرد و خـۆی نیشـان ئەدا سـەرکەوتووە، چـونکە رقـی لە خـۆ دەرخسـتن و خۆنوانـدن بـوو. هەرچەنـدە فیدراڵیەکان دژایەتی (جیفرسۆن)یان دەکرد، بەڵام گەل پشتگیری سیاسەتەکانیانی دەکـرد، چـونکە لە سـەردەمی خۆیـدا بـاج و سـەرانەی کەمکـردەوە و بـودجەی سەربازیشی کەمکردەوە، چەندین پلانیشی دارشت بۆ رزگابوون لە قەرزی گشتی وڵات، بەرێوبەرایتەکەشی بە ئاسانکار و کەمکردنەوەی خەرجی جیاوازبوو لەوانەی پێش خۆی، لەسـەردەمی ئەمـدا دۆزینەوەکـانی لـویس و کلارکی ئەنجامـدراون و رووبەری وڵاتیش زۆر فراوان بووە بە تـایبەت لە دوای کرینی لویزیانا زۆر هـانی خەڵکی دەدا بۆ کۆچکردن بۆ ناوچەکانی رۆژئـاوا و هـانی بێگانەکانیشـی دەدا بۆ کـۆچکردن بـۆ ئەمریکـا، زۆر هانـدەری دیموکراسـی بـوو لە وڵاتـدا و مەسـەلەی هاورێبوونی لەگەڵ سەرجەم گەڵندا بە شتێکی گرنگ دادەنا و هیچ پەیماننامەیەکشی نەدەبەست کە ئازادی سنووردرا بکات.[1]

لە سەردەمی خۆیدا ژمارەیەکی زۆری لە فیدراڵیەکانی بۆ لای خۆی راکێشـا و مافی هەموو ئەوانەشی دا کە بە هۆی یاسای بێگانە و ئاژاوە چیەکانەوە زەرەرمەند بـوون، هەمـوو ئەو کەسانەشـی ئـازادکرد حـوکمی زینـدانی کردنیـان بەسـەردا سەپێنرابوو. پلان و بەرنامەکانی حکومەت و کاروبارەکانی دەوڵەت لە سـەردەمیدا بەئاشتی خوازی و چاک سازی ناسرابوو ئەمەش لە سارێژکردنی برینەکانی گەلی ئەمریکـی رۆڵێکـی گەورەی بینـی، هەروەهـا هەمـوو رێورەسـمێکی پـایەبەرزی رەتکردەوە کە سەرکردەکانی پێش خۆی گرتبوویانە بەر، وەک لابردنی هەموو ئەو کەسانەی لەکاتی دەرچووندا لە دەوروپشتی بوون و خزمەتیان دەکرد، جگە لەوەی

---

١ - فرحات زيادة و ابراهيم فريجي: س- پ، ل ١٠٠.

ـ گفتوگۆکردن لەسەر هەر بابەتێک کە بیانەوێ لە خوانێکی زۆر سادەدا پێشوازی ـ میوانەکان دەکرد. [1]

هەوڵێکی زۆری دا بۆ ئەوەی ناکۆکی نێوان خەڵک کۆتایی پێبهێنێ، زۆرێک لە ـگلیزەکان پاڵنەر بوون بۆ ئەو ناکۆکیە، داوای لە گەلەکەی دەکرد پارێزگاری لە ـەکێتی نیشتمانەکەیان بکەن مادام ئەمریکی بن گوێ نەدەن بە دەمارگیری سیاسی ـ ئایینی و گەشە بدەن بە سەروەت و نەتەوایەتیان. لەکاتی دەسەڵاتی ئەمدا هەموو کەسێ خاوەنی مافی تایبەتی خۆی بوو، بۆ نموونە ئەو کرێکارەی ئەوەی بە ڕەنجی شانی خۆی پەیدای دەکرد هی خۆی بوو نە دەبوو هیچی لێ وەربگیرێ، پێویست ـوو حکومەتیش پارێزگاری لە گیانی ئەو کەسانە و ویلایەتەکانیش بکات.

جگە لە ئازادی ئایین و ڕۆژنامەگەری مافی تاکە کەسیش لە سەردەمیدا زۆر پارێزراو بوو، ڕێگەی نەدەدا هیچ کەسێک بەبێ دادگاییکردن زیندانی بکرێت، ـادگاییکردنیش لە ڕێگەی دەستەی سوێند خۆرانەوە بەڕێوەدەبرا، دادگاییکردنی هەموو تاوانبار و خراپەکارێکیش هەر بەپێی یاسا بوو، لەسەردەمیدا بەکارهێنانی نازناوی ڕەتکرایەوە، جیاوازی نەدەکرد لە نێوان کەسێکی خاوەن پایە و کەسێکی ئاساییدا، هەروەها داوای لابردنی حوکمی پێداچوونەوەی بڕیاری دادوەری کردووە لەلایەن دادگای باڵای وڵاتەوە کە کۆنگریس بڕیاری لەسەرداوە. [2]

بۆ بابەتە ستراتیژییەکانی لە نێوان تاکەکانی خێزان و بۆ دابەشکردنی میرات لە نێوانیاندا یاسایەکی تایبەتی دانا جگە لە ڕەتکردنەوەی هەقی کوڕە گەورە، هەروەها ڕەتکردنەوەی دانی باج بە ئاینێک کە ئاینی خۆیان نەبێت، یاسایەکیشی بۆ فێربوونی هەموان دانا بۆ ئەوەی خەڵکە هەژارەکان ئامادە بکات لە مافەکانی خۆیان تێبگەن و پارێزگاری لێبکەن و حەز و ئارەزووی خۆیان بهێننەدی و ژیرانە کاری لەسەر بکەن. زۆر هانی خەڵکی داوە بۆ کارکردن لە کاروبارە کشتوکاڵیەکان و زیادکردنی بەرهەمە ناوخۆییەکان، هەوڵێکی زۆریشی داوە بۆ پارێزگاریکردن لە مافی ویلایەتەکان، وەک خۆی دەڵێت (من پشتگیری لە هەر ویلایەتێک دەکەم بەپێی ئەو مافەی لە دەستووردا پێیدراوە پارێزگاری لە دەسەڵاتی خۆی بکات).

هەروەها شێوەی پاشایەتی بۆ بەڕێوەبردنی دەوڵەتی ڕەتکردەوە، چونکە گواستنەوەی دەسەڵات بوو لە پاشایەکەوە بۆ پاشایەکی تر بەشێوەی پشتاوپشت،

---

١ - محمد محمود النيرب: س- پ، ل ١٤٢.

٢ - کارلهاینتس دشنر: س- پ، ل ١٥١.

هەموو دەسکەوتەکانی حکومەت لە سەردەمی ئەمدا بۆ داوای گشتی بەکاردەهێنرا بـۆ پێـدانی قەرزی نەتەوەیـی، هەمـوو دەسـەڵاتەکانیش بـۆ بەشـی جێبەجێکـردن دەگوێزرانەوە. [1]

کاروبـای بازرگـانی ویـلایەتە یەکگرتووەکـانیش لەگەڵ هەمـوو نەتەوەکـان بەبێ بەستنی هیچ هاوپەیمـانیەتیەک لەنێوانیاندا بازرگـانیەکی ئـازاد بووە، چاودێریکردنی وردی هەڵبژاردنیش لە ڕێگای گەلەوە بووە و هەموو کات بڕیاری زۆرینە شـایەتی جێ بەجێکردن بووە بەبێ ئەوەی چاوی پیادا بخشێنێتەوە، میلیشیاکانی بەشێوەیەک ڕێکخسـتووە لە بەرژەوەنـدی گەلەکەیـدا بێـت و بکرێـت بە سـوپایەکی ڕێکخـراو، هەروەها دەسەڵاتی مەدەنی دابوو بەسەر دەسەڵاتی سەربازیدا، بۆیە ئامادە بوو بۆ پارێزگـاری کـردن لە هەمـوو ئەو شـتانەی لە دەسـتووردا داڕێـژراوە گیـانی خـۆی بەخت بکات.

هەروەهـا بـۆ پاراسـتنی ئاسـایش و ڕێگرتن لە بەرپـابوونی شـۆڕش هەڵبژاردنی لەنـاو گەلـدا دانـا، ئاشـتی و ئاسـایش جـێگەی ڕق و کینەی گرتبـووەوە و کـڕین و فرۆشتنێکی زۆر لەناو وڵاتدا بەرجەستە دەکرا و یارمەتی خەڵکی دەدا بۆ ئەوەی بە هەمـوو لایەکـی وڵاتـدا بڵاوببـنەوە. (تۆمـاس جیفرسـۆن)لە مـاوەی دەسـەڵاتیدا دوو کـاری گرنگـی ئەنجامـدا بـۆ حکـومەتەکەی، یەکەمیـان فیـدراڵیەت و دووەمیشـیان نەهێشتنی شەڕ لە هیچ شوێنێکدا. [2]

بابەتی کاروبارە سەربازییەکان لە سەردەمیدا تەنها بریتبوون لە بەرگریکردن لە نـاوخۆ تـا ئەو کـاتەی هێرشـێکی ڕاسـتەقینە دەسـتپێدەکات، دروسـتکردنی هێزێکـی دەریـایی کە تەنهـا بەشـی ئەوە بکـات پارێزگـاری لە کەنارەکـان بکـات لە چەتە و جەردە، سـەبارەت بە مەسـەلە سـەربازییەکان دەڵێـت (مـن پشـتگیری لەوە نـاکەم لە کاتی ئاشتیدا هێزێکی هەمیشەییمان هەبێت، چونکە ئەمە تەنها خەڵکی دەترسـێنێت و ڕای گشتیمان لێ هەڵەسێنێ).

لە سەردەمیدا ویلایەتە یەکگرتووەکان لە پەیمانی پاشاکان بۆ بەرپاکردنی جەنگ دژی بنەماکـانی ئـازادی بەشـداری نەکـردووە، بەشـداریش نەبـووە لە گۆڕەپـانی کوشتن و بڕین و پەیوەست نەبووە بە پەیماننامەی نوێ لەگەڵ دژەکانی ئەورووپا، ڕێگری ئەوەشی کردووە مەزهەبێک دەسەڵاتێکی یاسایی هەبێت بەسـەر مەزهەبێکی

---

١ - بدون مؤلف:موجز التاريخ الأمريكي،ص ٥٤.

٢ - فرنسيس فريدمان:موجز التاريخ الأمريكي،ص٧٢.

تردا. سەبارەت بە بەشی جێبەجێکردن وتوویەتی ونکردنی بەشی جێ بەجێکردن لە بنەماکانی کۆنفدرایسۆن، پێش هەر مادەیەکی دیکە جێگەی گەشەی خراپەیە، هەروەها وتوویەتی لە کۆمەڵگەیەکی گەورەدا هیچ شتێک بە ئەندازەی پارچە و بەشەکانی جێ بەجێکردن کێشە دروستکەر و ئازارگەیەنەر نیە، بچووکترین بابەت لەم جۆرە بەشە بە ئەندازەی گرنگترین ڕاستکەرەوە و ئاراستە بردن کات دەخایەنێت و جێگەی هەر کاتێکی دیکە دەگرێت. [1]

(تۆماس جیفرسۆن) لەبارەی سەرۆکایەتیەکەیەوە بەوە پێناسەی خۆی دەکات کە هیچ نیە جگە لەوەی بریکاری هەر تاکێکی گەلەکەیەتی، بەمجۆرە هاوکاری و هاوبەشیکردنی(تۆماس جیفرسۆن) هەموو گەلی گرتبووە و هەموو گەل دڵخۆش بوون لە سەردەمیدا. (تۆماس جیفرسۆن) بە هەموو هەوڵ و توانایەکی خۆیەوە هەوڵیدەدا بۆ ڕازیکردنی هەموو چین و توێژەکانی گەل، دڵنیابوو لەوەی بۆ جاری دووەمیش سەرکەوتنی بەدەست دێنێت لە ئەنجامی هەموو ئەو کارە چاکانەی لە سەردەمی سەرۆکایەتی یەکەمیدا ئەنجامی دابوو، لە بەهاری ساڵی (١٨٠٥) بۆ جاری دووەم لە هەڵبژاردندا سەرکەوتنی بەدەستهێنا. [2]

### سیاسەتی تۆماس جیفرسۆن

دژە فیدراڵیەکان لەگەڵ ئەوەبوون کە بەرەو ڕۆژئاوای وڵات فراوانخوازی بکەن، ئەمە یەکێک بوو لە بەرنامەکانیان، لە سەردەمی (جیفرسۆن)دا لەساڵی (١٨٠٠) گەورەترین دەستکەوتەکانیان بەدەستهێنا، کە کڕینی زەوییەکانی (لویزیانا) بوو لە فەرەنسا، کە فەرەنسا خۆی ئەم پێشنیارەی کرد، چونکە لە هاوپەیمانی نێوان بەریتانیا و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەترسا زەوییەکانی لە کیس بچێت.

(جیفرسۆن) دەیوست دۆستایەتی لەگەڵ سەرجەم نەتەوەکاندا هەبێت، هیچ پەیماننامەیەک لەگەڵ وڵاتانی دەرەوە نەبەسترێت کە ئازادی سنووردار بکات. لە کاتی شۆڕشی فەرەنسیدا دژە فیدراڵیەکان لەگەڵ شۆڕشگێران بوون، بەپێچەوانەی فیدراڵیەکان چونکە ئەمان شۆڕشیان بە ململانێی نێوان ستەم ئازادی دەزانی. [3]

---

١ - محمد محمود النيرب: المدخل في تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية،ص١٤٣.

٢ - ديب علي حسن:الولايات المتحدة الأمريكية،ص٢١١.

٣ - د.عبد العزيز سليمان نوار واخرون: تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية، ص ٩١.

ئەوانەی پاڵپشـتیان لە پـارتەکەی جیفرسـۆن دەکـرد (کرێکـاران و جوتیـاران و خەڵکی باشوور و بۆرجوا بچووکەکان) بوون لە سـەرکردە دیارەکـان کە هاوکـار و پشـتیوانی بـوون (مادیسـۆن، جـیمس مـۆنرۆ) لەگەڵ ئەوەی (مادیسـۆن) لە (پەڕاوی فیدراڵی)دا لەگەڵ هاملتۆن نووسراوی بڵاودەکردەوە و ئاماژەی بەوە دەدا پارتەکـان دەبنە مـایەی گرفت بۆ وڵات، یەکێک بوو لە بەرگریکـارانی دەستوور، بەڵام دواتر بۆچوونی گۆڕا وهاوڕابوو لەگەڵ فراوانبوونی بەشداری سیاسی لە هەموو وڵاتدا.

(جیفرسـۆن) هەمیشـە ترسـی لە دەسـەڵاتی فیـدراڵی بـوو، دەترسـا لەوەی بەرەو دیکتاتۆریەت بچێت، بەتایبەت پێش خولی سـەرۆکایەتی خۆی ئەم ترسـەی هەبوو. لەبەرئەوە بیـروڕای دەربـارەی فیدراڵیەکان بـاش نەبـوو، بەم شـێوەیە لەبارەیـانەوە دەدوا: کۆمەڵێـک لە مشـەخۆران دابوویـان بەلای فیدڕاڵیەکانـدا ئەمە بـوویە هـۆی ئەوەی لەناو هەردوو ئەنجومەنەکەدا دەنگی ئەوان زاڵ بێت، بەڵام زۆری نەخایاند، چـونکە بە ڕۆیشـتنی ئەوان جێدەسـتیان لەق دەبێـت، هەوڵیانـدا بـانکی مەرکەزی لە ویـلایەتە یەکگرتووەکـانی ئەمریکـا لەسـەر شێوازی بەریتـانی دابمەزرێت لە (١٧٩١) کۆنگرێسـیش ڕێـگەی پێـدا، بـانکەکە بـۆ حکـومەت کـاری دەکـرد، لەبەرئەوەی دژە فیدڕاڵیەکان کەوتنە خۆیان و وتیان نابێت دەستوور لێکدانەوەی جیای بۆ بکرێت و بە ویستی تاکە کەسی بەکار بێت.[1]

(جیفرسۆن) هێندەی پیاوێکی بیرمەند و فەیلەسوف بوو ئەوەنـدە پیـاوی کرداری نەبوو، ئەو پرسیارەی کاریان لە سەر دەکرد ئەوەبوو ئەو کۆمەڵگە ڕۆشنبیرە چییە کە دەبێت ویـلایەتە یەکگرتووەکـانی ئەمریکـای لەسـەر بنیـات بنرێت، لەگەڵ ئەوەدا (جوردن سن وورد)ی نووسەر باس لەوە دەکات ئەندامانی ئەم پارتە خەڵکی ناوەند بـوون و زۆر ڕۆشـنبیر و دەسـت ڕۆیشـتوو نەبـوون تەنهـا (جـۆرج مادیسـۆن و ریتشـارد هنـری) نەبێـت کە فیرجینـی بـوون، لەبەرئەوە لە سـەرەتادا نەیانـدەتوانی بەرامبەر بەرنامەکانی فیدراڵەکان بوەستنەوە.

(جیفرسـۆن) سـەرەڕای دژایەتـی زۆری فیـدراڵیەکان بەڵام دیسـانەوە لە خـولی دووەمـی سـەرۆکایەتی لە سـاڵی (١٨٠٤- ١٨٠٨) سـەرکەوتنی بەدەسـتهێنایەوە. بەگشـتی وڵات لە سـاڵانی (١٨٠٠- ١٨٢٠) لە سیسـتمی یەک پارتیـدا مـایەوە، هـیچ لایەنێکی دیکە جگە لە دژە فیدراڵیەکان بۆ کاندیدکردنی سـەرۆکایەتی پێشنەکەوت،

---

١ - فرحات زيادة و ابراهيم فريجي: س- پ، ل ١٠١.

وڵات له بــوونی پــارتی ئۆپۆزســیۆن دوور بــوو، لەبەرئەوە ســـەردەمەکەی بە سەردەمی (ڕازیبوون و پێکەوە گونجان) دەناسرێت.[1]

## یەکەم: سیاسەتی ناوخۆی ئەمریکا

ڕۆژ بەڕۆژ پارتی دژە فیدراڵی لە وڵات سەرکەوتنی بەدەستدەهێنا و لەکات و شێوازی جیادا،دەسەڵاتی دەگرت بەسەر کۆمەڵگای ئەمریکیدا لە ساڵانی (١٨٠٠-١٨٢٤) پارتی دەسەڵاتدار بوو، بەڵام لە (١٨٢٤) پەرتەوازە بوون لەپارتەکە ڕوویدا، دیسان لە ساڵی (١٨٥٤) لەسەر بابەتی کۆیلە پەرتەوازە بوون ڕوویدا، لە ساڵی (١٩٣٣) چاکسازی لەم پارتەدا کراوە، لەوکاتەوە وەک پارتی سەرەکی لە وڵاتدا بەشداری حوکمڕانی وڵاتی کردووە و لە شانۆیی سیاسی و ململانێکاندا تا ئەمڕۆش بەشداربووە.[2]

دوای جەنگی ساڵی (١٨١٢)ی نێوان ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و بەریتانیا، یەکێتی نەتەوەیی تەواو هاتە ئاراوە کە باشترین کاردانەوەی ئەم جەنگە بوو، باشترین بەرەنگاربوونەوەی ئەو مەترسیانە بوو کە لە ئەنجامی ناکۆکیە ناوخۆییەکاندا دروست دەبوو، ئەگەر بهاتایە و ئەم ناکۆکیە بەردەوام بوایە دەبووە ڕێگر لە بەردەم یەکگرتنی ویلایەتەکانی و گرانی جێ بەجێکردنی پلانەکەی (جیفرسۆن) دەرکەوت، کە داوای کۆت و بەندی دەسەڵاتی حکومەتی فیدراڵی دەکرد، لەهەمان کاتدا داوای دیموکراتیەکی سەربەستی دەکرد کە لە دەسەڵاتی نەتەوەیەکان بەدەربێت، دیاربوو کە لێپرسراوەکانی دژە فیدراڵی لەسەرو هەمووشیانەوە (جیفرسۆن) ناتوانن ئەم بەرنامەیە پەیڕەو بکەن، وایان لێهات دەستبەرداری ئەو بیروڕایانە بن کە داوای کەمکردنەوەی دەسەڵاتی دەوڵەتیان دەکرد، لەبەرئەوە گەڕانەوە بۆ بەرنامەکانی فیدراڵیەکان، ڕووداوەکان ئەوەیان سەلماند وڵات پێویستی بە دەوڵەتێکی فیدراڵی بەهێزە، بەڵگەش بۆ ئەمە پەلهاویشتن بۆ ناوچەکانی (لویزیانا) و شەڕکردن لەگەڵ میرەکانی خۆرئاوا و بازرگانی نەکردن لەگەڵ وڵاتانی دەرەوە و جەنگی (١٨١٢) لەگەڵ بەریتانیا بوو، دواتر ئەم هەستە نەتەوەییە بنیاتنانی بانکی نەتەوەیی و پیشەسازی نەتەوەیی لێ بەرهەم هات و گومرگ خرایە سەر ئەو شمەک و کاڵایانەی لە دەرەوە دەهاتن، بۆ بازرگانی

---

١ - ستيظن فنسنت بنية:أمريكا،ص ٨٦-٨٧.

٢ - محمد محمود النيرب: المدخل في تاريخ الولايات،ص١٥٠.

لەپیشەسازی ناوخۆ و گرنگیان دەدا بە کاروباری سەربازی و سوپایی بۆ پاراستنی کەنارەکان. [1]

**دووەم :سیاسەتی ئابووری**

دژە فیدڵیەکان لەگەڵ گەشەپێدانی پیشەسازی و بازرگانی نەبوون، چونکە خەڵکی باشوور (کە لایەنگریان بوون) بەهۆی هۆکاری سروشتی ناوچەکەیان بنەمای ئابوورییان کشتوکاڵ بوو، هەر لەبەرئەوە دژی زیادکردنی باجی گومرگی بوون، چونکە ئەمان بەرهەمە کشتوکاڵیەکانیان دەنارد بۆ ئەورووپا و بە پێچەوانەوە بەرهەمە پیشەسازییەکانیان لەوێوە هاوردە دەکرد، بەم زیادکردنی باجە نرخی کەل وپەلی هاوردە بەرز بوویەوە، لەلایەکی دیکەوە ئەمەیان بە سیاسەتێکی قۆرخکاری دەزانی بۆ هەوڵەکانی (جوتیاران و پیشەوەران و کرێکاران) و هۆکارێک بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی سەرمایەی بازرگانی و خاوەن پیشەسازییەکان و سەرمایەدارە گەورەکان، لەبەرئەوە دەبینین (جیفرسۆن) باجە گومرگیەکانی لەسەر کەل وپەلە نیشتمانیەکان لابرد بەتایبەتی باجی (ویسکی).

بەهەموو شێوەیەک لەگەڵ بەرزکردنەوەی ئاستی کەرتی کشتوکاڵی بووە، هەروەها دابەشکردنی زەوی بەشێوەیەکی دادپەوەرانە و گرنگیدان بە چینی جوتیاران بە نموونە دەبینین لە سەردەمی (جیفرسۆن) کە هەندێ لە پۆستە گرنگەکانیان پێدرابوو وەک (مادیسۆن) کە وەزیری دەرەوە بوو (ئەلبیرت جالاتین) وەزیری دارایی کە نوێنەری چینی جوتیاران بوون. [2]

خاڵێکی دیکە کە پێداگرییان لەسەر دەکرد، دژی بەرزکردنەوەی بودجەی حکومەتی ناوەندی بوون لەسەر حسابی ویلایەتەکان، چونکە بودجەی هەموو ویلایەتەکان وەک یەک نەبوو و جیاوازییان هەبوو، هەندێک ویلایەت زۆر و هەندێکی دیکەیان کەم بوون، هەروەها دژی دامەزراندنی بانکی ناوەندی بوون، چونکە پێیان وابوو ئەمە پێچەوانەی دەستوورە و لەم بارەیەوە شتێک تێیدا باسی لێوە نەکراوە، دەترسان لەم رێگەوە بەهێزتر بوونی چینی سەرمایەدارای لێ بکەوێتەوە. [3]

---

١ - فرحات زيادة و ابراهيم فريجي: تاريخ الشعب الأمريكي،ص ١١٣.

٢ - بدون مؤلف:موجز التاريخ الأمريكي،ص ٥٠.

٣ - فريشتة نورائي:س-پ،ل٦٢.

## پارتە سیاسییەکانی ئەمریکا

ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کۆمارێکی یەکگرتووی فیدراڵیە و سەرۆکی کۆمار لە ولاتدا نوێنەرایەتی بەرزترین پایەی دەسەڵاتی ڕاپەڕاندن دەکات کە ماوەی چوار ساڵ و بە هەڵبژاردن سەرۆکایەتی دەگرێتە دەست، هەروەها کۆنگرێس بە باڵاترین دەسەڵاتی یاسادانان دادەنرێت و ئەمەش لە دوو ئەنجومەنی سەرەکی پێکهاتووە، یەکەمیان (ئەنجومەنی پیران) دووەمیان (ئەنجومەنی نوێنەران) کۆنگرێس لە سەردەمی (هوفەر)دا دەسەڵاتێکی زۆری هەبووە لە وسەردەمەدا مافی ڤیتۆی هەبوو ئەم ڤیتۆیەش بووە هۆی سەرهەڵدانی ناکۆکی کۆشکی سپی و کۆنگرێس لە سەردەمی سەرۆکایەتی کارتەر و ریگان، بەڵام دواتر دادگای باڵای ئەمریکا ئەم ڤیتۆیەی هەڵوەشاندنەوە، بەمەش دەزگای ڕاپەڕاندن لە ولات سەرکەوتنێکی مەزنی بەدەستهێنا، ویلایەتە یەکگرتووەکان لەڕووی کارگێڕیەوە لە (٥٠) ویلایەتە پێکهاتووە بۆ هەر یەکەیان پەرلەمانێکی تایبەتی هەیە، ئەوانیش بە هەمان شێوە لە دوو ئەنجومەن پێکدێن، حاکمی ویلایەتەکەش سەرۆکایەتی دەسەڵاتی ڕاپەڕاندن دەکات و وەزیرەکانیش لە بەڕێوەبردنی کاروباری ویلایەتەکاندا یارمەتی دەدەن.[١]

پارتە سیاسیەکان لەم ولاتەدا هەر لە سەرەتای سەربەخۆییەوە تا ئەمڕۆ لەسەر بنچینەی دیموکراتی پەیڕەوی ژیانی سیاسی خۆیان دەکەن و بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ خۆی لە کێبڕکێیەکی دیموکراتیانەی نێوان پارتە سەرەکییەکانی ولاتە یەکگرتووەکاندا دەبینێتەوە بەتایبەت لە نێوان پارتی کۆماری کە دروشمەکەی (فیل)ە لە ساڵی (١٨٥٤) دامەزراوە و بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ میراتگیری پارتی فیدراڵی بوو کە (ئەلکسەندەر هاملتۆن) لە ساڵی (١٧٨٧) دایمەزراندووە، ماڵ و دارایی لە دەوری خۆی کۆکردۆتەوە، بەڵام هەر لە ساڵی (١٨٢٠)وە پارتی فیدراڵی بوونی نەما جگە لە (جۆن ئادامس)کەس نەگەیشتنە پلەی سەرۆکایەتی لە سەرۆکە ناودارەکانی پارتی کۆماری (جۆرج واشنتن و جۆن ئادامس و هاملتۆن و تۆماس جیفرسۆن و ئەبراهام و پیودو روزفێلت و ئایزنها ور جیراڵد فۆرد و نیسکۆن و ڕۆناڵد ریکان جۆرج بۆشی باوک و جۆرج W بۆشی کوڕ) بوونە سەرۆکی ئەمریکاو لە پارتی کۆماری ئەمریکا بوون.[٢]

---

١ - رالف غولدمان: من الحرب الى سياسة الاحزاب، ترجمة- فخري صالح، الدار الاهلية،الاردن،١٩٩٦،ص١١٦.

٢ - ديب على حسن:الولايات المتحدة الأمريكية،ص٢٩٣.

جیابوونەوەیەک لە ناو کۆماریە جیفرسۆنیەکان دروستبووە، ئەم جیابوونەوەیە لە کۆمەڵێکی پارێزگـار بـوون بە سـەرکردایەتی (جـۆن کێنسـی ئـادامس) لە سـاڵی (١٧٦٧ بـۆ ١٨٤٨) کە ئەمە بووە مـایەی لەدایکبوونی پـارتی کۆمـاری نەتەوەیـی کە دواتـر ژمـارەیەکی زۆر لە لایەنگرانـی پـارتی کۆمـاری بەرهەڵسـتکاری کـۆمەڵایەتی چوونە پاڵیان، حیزبی کۆماری بەوە ناسراوە بانگەشەی دەکرد بۆ دەست تێوەردانی زیـاتری دەوڵەت لە ژیـانی گشـتیدا، سـەرکردەی ئێسـتای (هـاری بلبلـۆ) لە سـاڵی (١٩٤٧) لەدایک بووە، ئەم پارتەش لە کـانوونی دووەمـی سـاڵی (١٩٩٣) هەڵیـانبژارد بۆ ئەم پۆستە. [١]

(پارتی دیموکرات) ئەم پارتەش لە بنـاغەدا درێژەپێدانێکی ڕێکخستنەکانی پـارتی کۆمــاری بــوو کە ســەرۆک (جیفرســۆن) دایمەزرانــد و لە دروشــمە دیارەکــانی (گوێدرێژە)ە لەسـاڵی (١٨٤٨) دایمەزراندووە بەهـۆی نـاکۆکی نێوان کۆمارییەکان و جیفرسۆنیەکان، ئەمانە لەگەڵ ئەو جیابوونەوەیە دابوون کە (جـۆن کێنسـی ئـادامس) ســەرکردایەتی دەکــرد (پــارتی دیمــوکراتی کۆمــاری) بەمەش لە کــاتی جەنگــی جیــابوونەوە بواریـــان ڕەخســـاند بـــۆ لەدایکبـــوونی پـــارتی کۆمـــاری ئێســـتا، جیابوونەوەیەک لە ڕیزی دیموکراتیەکانی باکور و باشـوور ڕوویـدا، دیموکراتەکان ناسراون بەوەی لایەنگری زیاتری دەسەڵاتی فیدراڵی سیاسی و کۆمەڵایەتی دەکەن، ئەم پارتە لە ئێستادا (کریستۆ ڤەد دۆڵد) سـەرکردایەتی دەکـات، ئەم کەسـە لە سـاڵی (١٩٤٤) لەدایک بووە. [٢]

لە سەرۆکە ناودارەکانی پارتی دیموکراتی (تۆمـاس جیفرسـۆن ئەندۆجاکسـۆن و جرۆفر کلیفلاند و دورۆولسـن و فـرانکلین ڕوزفێڵت و جـۆن کینەدی و جۆنسـۆن و جیمـی کـارتەر و بیـل کلنتـۆن جیمس مادیسـۆن و جیمس مـۆنرۆ و جـۆن کوینسـی ئادامس و جیمس نۆکس بۆرک) چەندین سـەرۆکی تـر لەم پـارتە بـوونەتە سـەرۆکی ئەمریکا. [٣]

چەنـد پـارتێکی تـر هەبـوون لەپـاڵ ئەم دوو پـارتەدا وەک (پـارتی گەل، پـارتی ئازادی، پارتی ئەمریکی یەکەم، پارتی کرێکارانی سۆسیالیستی، پارتی کۆمۆنیزم) کە

---

١ – فرحات زيادة و ابراهيم فريجي: تاريخ الشعب الاميريكي،ص ٩٦.

٢ – لاری الوتيز:نظام الحكم في الولايات المتحدة الأمريكية،تر.جابر سعيد عوض،الجمعية المصرية لنشر المعرفة والثقافة العالمية،القاهرة،١٩٩٦،ص٧٥.

٣ – ديب علی حسن:س–پ،ل٢٩٤.

ـه شێوەیەکی ڕەسمی لە ساڵی (١٩٥٤) مۆڵەتی کارکردنی یاسایی لە (سەندرایە)وە، ئەندامەکانیان بەگومانی سیخوڕی بۆ یەکێتی سۆڤیەت لە گەرمەی جەنگی ساردا زیندانی کران و دوورخرانەوە.

لە ڕاستیدا ئەم پارتە بچووکانە کاریگەرێکی ئەوتۆیان لەسەر ژیانی سیاسی ئەمریکا نیە بەهۆی سیستەمێکی کۆمەڵایەتی و ئابووری وڵات کە زیاتر لەگەڵ پەیڕەوی پارتە گەورەکانی وڵاتدا یەکدەگرێتەوە، جگە لەو پارتانەش دوو پارتی دیکە هەبوون لەوانە حیزبی شیوعی کە لەساڵی (١٨١٩) دامەزراوە، ئێستا (گاس هوڵت) سەرکردایەتی دەکات و نزیکەی (١٢) هەزار لایەنگری هەیە، لەساڵی (١٩٤٥) نزیکەی (٧٥) هەزار لایەنگری هەبووە، حیزبی دواڕۆژ کە (ڕۆس بیرۆ) دایمەزراندووە لە (٢٥)ی ئەیلولی ساڵی (١٩٩٥) دامەزراوە.[١]

لەپێش شۆڕشی سەربەخۆیی لە داگیرگەکاندا پارتێکی ڕێکخرا و نەبوو، تەنها ئەوەی هەبوو چەند گروپێکی بچووک بوون، بۆ نموونە ئەو گروپانەی پاڵپشتی پادشا بوون پارێزگار بوون لە پادشا بە (توریز) ناودەبران، گروپێکی دیکە هەبوون کە ناودەبران بە (هویجز)ەکان کە بەرگریان دەکرد لە دەسەڵاتی نوێنەرایەتی ناوخۆیی و داخوازی حوکمی خۆیی بوون بۆ داگیرگەکان.

لە سەردەمی سیاسیشدا بە هەمان شێوە پارتی سیاسی بوونی نەبوو، هەموو داگیرگەکان بەیەک بیروباوەڕەوە شۆڕشیان دەکرد و بەشدارییان لە شۆڕش دەکرد، (جۆرج واشنتۆن)ی سەرکردەی شۆڕش و سەرکردەکانی دیکە دەیانویست ئەم شێوە سیاسەتە بەردەوامی هەبێت. لە سەروبەندی دانانی دەستوریشدا هیچ پارتێکی سیاسی بوونی نەبوو، لایان وابوو سیستمی بەڕێوەبردن بێ بوونی سیستمی پارتایەتی باشترە، لەبەرئەوە دەبینین یەکەم هەڵبژادنی سەرۆک کۆماری کە (جۆرج واشنتۆن) بووە کاندیدی هیچ پارت و لایەنێک نەبوو، بەڵکو لەلایەن گەلەوە کاندید کرا و هەڵبژێرا، هەروەها لە ڕێی مادده دەستورییەکانی وەک دابەشکردنی دەسەڵاتەکانی (جێ بەجێکردن، یاسادانان، دادوەری) و پەیڕەوکردنی فیدراڵی و هەڵبژاردنی سەرۆک کۆمار لەلایەن ئەنجومەنێکی هەڵبژێراو لەلایەن گەلەوە ویستوویانە وڵات لە کاریگەری پارت بپارێزن.[٢]

---

١ - لاری الوتیز: س-پ،ل٨٧

٢ - بدون مؤلف:موجز التاريخ الأمريكي،ص ٤٨-٥٠.

له بنەڕەتدا پەیڕەوکاری پارتەکان له دەستووردا باسی لێوە نەکرابوو و ڕێگەشی پێ نەدرابوو، بەڵام دواتر گۆڕان لەو ماددەیەی دەستوور کرا، پارتی سیاسی بەشدار نەبوو له دروستکردنی یەکەم ئیدارەی حکومەتی وڵات واتە ئیدارەی (واشنتن) چونکه تێڕوانینی باوکانی دامەزرێنەر له ناویاندا (مادیسۆن و جۆرج واشنتن) سەبارەت له بوونی پارت هەڵوێستی دژیان هەبوو، لایان وابوو بوونی پارت له هەر کۆمەڵگەیەکدا دەبێتە هۆی پەرتبوونی کۆمەڵگا و زاڵبوونی بەرژەوەندییە تایبەتیەکان هان دەدات و ڕاگەیاندنی پارت هەڕەشەیە بۆ سەر کۆمەڵگا.(جۆرج واشنتن) دەربارەی پارتە رامیاریەکان دەیوت: (پارت دەبێتە هۆی کات بەفیڕۆدان و سەرقاڵکردنی ئەنجومەنی گشتی و هانی کۆمەڵ دەدات و هەستیان دەجوڵێنێت بێ ئەوەی بنەمایەکی هەبێت، ترسی ساختە و بێ بنەما دێنێتە کایەوە، دوژمنکارییەکان گڕ دەدات ئاژاوە و پشێوی دەنێتەوە، دەرگا لەبەردەم قەڵەمڕەوی بێگانە و حکومەت له ڕێگەی ئەو کەناڵانەوە کە ئارەزووەکانی پارت دەستەبەریان دەکات، لەبەر ئەوانە سیاسیەت و ئیدارەی وڵات دەکەوێتە ژێر سیاسەت و ئیدارەی دەوڵەتێکی دیکەوە)، هەروەها له وتەی ماڵئاواییشدا دەڵێت: (لەدایک بوونی ئەم ئوممەتە، تازەیە لەوانەیە ڕۆحی پارتی بوون بیکوژێت). [1]

## ١-پارتی فیدراڵی

وەک ئاماژەمان پێکرد له سەرەتادا پارت له دروستکردن و دامەزراندنی وڵاتدا بوونی نەبوو، مێژووی دروستبوونی پارتەکان دەگەڕێتەوە بۆ پێکهێنانی یەکەم حکومەتی دوای شۆڕش، له قۆناغە جیاجیاکانی ئیدارەی وڵاتدا پارتەکان ڕووبەڕووی یەکتر بوونەوە، بیروڕا جیاوازەکانی نێوان ڕابەرانی شۆڕش دەربارەی کایە جیاوازەکان بووە هۆی دروستبوونی دوو پارتی جیاواز، لەگەڵ ئەوەی له سەرەتاوە پارتە سیاسیەکان بە بەراورد لەگەڵ پارتەکانی ئەمڕۆدا لاواز بوون و بەشێوەیەکی ڕێکخراو نەبوون. [2]

پارتی فیدراڵی وەک یەکەمین پارت له ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا له ساڵی (١٧٨٧) لەسەروبەندی پرۆسەی چەسپاندنی دەستوور بەسەرکردایەتی

---

١ - محمد محمود النيرب: المدخل في تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية، ج١،ص١٢٩.

٢ - د.عبد العزيز سليمان و د. عبد المجيد نعنعي: تاريخ الولايات المتحدة، ص ٩٨.

ـحیكمـەندەر هـاملتۆن) دروسـت بـوو. بـابەتی چەسـپاندنی بنەماكـانی دەسـتوور ـسەرەتای دەركەوتنی بیروڕا جیاوازەكان بووە كە لە پاشتردا دوو بیرۆكەی جیاواز ـدروست بـوو، نە دانێـت(هـاملتۆن و هاوڕێكـانی) كە ناسـرابوون بەفیـدراڵیەكان ـجیفرسۆن و هاوڕێكانی كە ناسرابوون بەدژە فیدراڵیەكان.[1]

فیـدراڵیەكان پارتێـك بـوون داوای كەمكـردنەوەی دەسـەڵاتی زۆرینـەی گەلیـان ـدەكـرد، لە بەرامـبەردا ویسـتیان لە گەڵ دامەزرانـدنی حكـومەتێكی یەكگرتـووی ـمەركەزی بەهێـزی فیـدراڵی بـوو، ئەرسـتۆكراتیەكان بە حـوكمی ڕۆشـنبیری و ـبەرژەوەنـدییان دەسـتبگرن بەسـەر دەسـەڵاتدا، هەر هەواڵێـك بـۆ لەنـاوبردنی ئەم ـیەكێتـیە بـدرێت بەرەنگـاری ببـنەوە، چـونكە ویلایەتەكـان خـاوەنی بەرژەوەنـدی ـهۆبەشن، لەبەرئەوە پێویستە ئەو یەكێتیە بپارێزرێت.[2]

فیدراڵیەكان لایان وابوو پێویستە ڕاڤەیەكی فراوانتر بۆ دەستوور بكرێت و مـافی ـزیاتر بەدەسـەڵاتی ناوەند بدرێت، بۆ ئەمەش پشتیان بەوە بەستبوو كە دەستوور ـنەرمە و دەتواندرێت چۆنت بوێت وابگونجێت، توانییـان بـۆ چەسپاندنی دەسـەڵاتیان ئەمە بقۆزنەوە، بۆ نارەزاییەكانی دژە فیدراڵیەكان سـەبارەت بە دەسـتوور وەڵامیـان ـلە چەند خاڵێكدا خستبووە ڕوو:

١. ڕێگنەدان بە هیچ پارتێك بۆ كۆنترۆڵكردنی سیاسەتی یەكێتی فیدراڵی.

٢. گەرەنتیـدان بـۆ دابەشـكردنی هەرسـێ دەسـەڵاتی (جێبەجێكـردن، یاسـادانان و دادوەری).

٣. دەستوور گەرەنتی ئەوەی تێدایە مافی ویلایەتەكـان بپارێزرێت و دەسـەڵاتیان پێدەدات.

٤. ڕەشنووسی (یاسای مافەكان) دەخرێتە ناو ناوەڕۆكی دەستوورەوە.[3]

فیدراڵیەكان هەرچۆنێك بێت لە شەڕی دەستووردا سەركەوتن، كاتێك حكومەت پێكهات (جۆرج واشنتن) هاملتۆنی كردە وەزیری دارایی و (جیفرسۆن)ش وەزیری دەرەوە (جـۆن جـای) سـەرۆكی دادگـای بـاڵا كە متمـانەی پێیـان هەبـوو پشـتی پـێ بەستبوون.

---

١ - فریشتە نورانی:س-پ، ل ٦٠.

٢ - هواردزن: التاريخ الشعبي للولايات المتحدة،ج١/ص ١٦٨.

٣ - لاری الوتیز:نظام الحكم في الولايات المتحدة الأمريكية،ص١٨.

(هاملتۆن) کاریگەری زۆری لەسەر ئیدارەی حکومەتی (جۆرج واشنتن) هەبوو، لەبەرئەوە کاتێک وەزیری دارایی بوو توانی لە بواری ئابووری چەند گۆڕانێک بکات کە پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد.[1]

بینیمان بەرنامە ئابووریەکەی هاملتۆن بەشێک لە هاولاتیان دژی بوون، هەر لەبەرئەوە ئەمەش هۆکارێک بوو بۆ دروستبوونی لایەنی بەرامبەر (دژە فیدراڵی). ئەوانەی هاوکار و پاڵپشتی هاملتۆن بوون بریتی بوون لە خاوەن موڵکدارە گەورەکان و بازرگان و پیشەوەران و ویلایەتەکانی باکوور و چینی ناوەندی شارەکان، لەو سەرکردە دیارانەی کە لە پارتەکەی هاملتۆن بوون و ڕۆڵیان تێدا هەبووە (جۆرج واشنتن و جۆن ئادامس) بوون.[2]

واشنتن لە ماوەی فەرمانڕەوایدا هەوڵیدا خۆی بە بالاتر لە پارتەکەی بزانێت و لە یەکەم خولی سەرۆکایەتیدا توانی سەرکەوێت بەسەر ململانێی(هاملتۆن وجیفرسۆن) دا و ئەم دوو بیروڕا جیاوازە لە کابینەکەی خۆیدا بهێڵێتەوە، بەلام لە خولی دووەمی سەرۆکایەتیدا (١٧٩٣) ئەم سیاسەتەی درێژەی نەکێشا و بەردەوام نەبوو، بەڵکوو پاڵپشتی هاملتۆنی کرد، پشتگیری لە حکومەتێکی مەرکەزی بەهێز دەکرد.[3]

سەبارەت بە سیاسەتی دەرەوە دووبارە لە سەردەمی حکومەتی (واشنتن)ەوە، لەنێوان ئەم دوو پارتەدا جیاوازی دروست بوو، لەبەر ئەم ناکۆکیانە دەبینینجیفرسۆن لە ساڵی (١٧٩٣) دەست لەکار دەکێشێتەوە. فیدراڵیەکان لایان وابوو دەبێت پەیوەندییەکانی دەرەوە لەسەر بنەمای بازرگانی بێت نەک سیاسی، بەڵکو پێویستە لەسەر ئاستی سیاسی سیاسەتێکی بیلایەنانە پەیڕەو بکرێت، بۆ نموونە لە شۆڕشی فەڕەنسیدا، فەڕەنسیەکان داوای یارمەتییان لەویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کرد، بەلام فیدراڵیەکان وەلامی داواکەیانیان نەدایەوە و پاڵپشتیان نەکردن، بە پێچەوانەوە دژە فیدراڵیەکان لەگەڵ شۆڕشی فەڕەنسی بوون.[4]

---

١ - جوردن س.وود:الثورة الأمريكية،ص١٩٤.

٢ - وليم لانجر: موسوعة تاريخ العالم، مؤسسة فرانكلين،القاهرة،١٩٦٨،ج٦/ص١٩٩٢.

٣ - هواردزن: س- پ، ل ١٦٩.

٤ - د. طليعة الصياح و راغب العلي: تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية، ص ٩١.

فیدراڵیەکان ئەم دوورە پەرێزیەیان زیاتر بوو بەتایبەت دوای لە مەقصەلە دانی نویسی شازدە) و پەیڕەوکردنی سیستمی مەقصەلە لە شۆڕشدا، واشنتۆن لە ساڵی ١٧٩٣) ڕاگەیاندنێکی بڵاوکردەوە و ئاماژەی بەوەدا وڵاتەکەی پێویستی بە هێمنی و ئارامییە و پێویستە سیاسەتی دەرەوەیان لەسەر بنەمای ڕەفتاری دۆستانە بەرامبەر بە میللەتانی دەرەوە ئاراستە بکرێت. لە بەرامبەردا (جیفرسۆن) لە دەسەڵاتی هاملتۆن دەترسا کە لە سیستمێکی ئەوروپی نزیک بێت بەتایبەت بەریتانیا. [١]

لەگەڵ ئەوەی (هاملتۆن) بیری لە حکومەتێکی ناوەند و بەهێزی دەکردەوە، بەڵام بیری لە حکومەتێکی پادشایی نەدەکردەوە، بەڵکوو ویستی لەگەڵ دەسەڵاتێکی ئازاد و سەربەخۆدا بوو، بەڵام (جیفرسۆن) لە بیرەوەریەکانی خۆیدا ئاماژە بەوە دەکات و دەڵێت: (هاملتۆن نەک تەنها باوەڕی بە پادشایەتی بوو بەڵکوو باوەڕی بە پادشایەتیەک بوو کە لەسەر گەندەڵی بنیات نرابێت). [٢]

ئەمە تەنها بۆچوونی (جیفرسۆنی) ڕکابەری (هاملتۆن)ە، ئەگینا نکۆڵی لە گەورەیی کەسایەتی هاملتۆن ناکرێت، ڕەنگە هەر ئەوەندە بەس بێت کە هاملتۆن و هاوڕێکانی بەوە بناسرێت کە چەسپێنەری دەستوورن، (هاملتۆن) بیری لە ڕێکخستن و یاسا کردۆتەوە، لەگەڵ تێکڕژانی جیاوازییەکانی نێوان پارتی (فیدراڵی و دژە فیدراڵی)، ڕاگەیاندن و ڕۆژنامە ڕۆژانە و هەفتانەکان لەو ململانێیانەدا بەشداریان دەکرد، لەیەک کاتدا هەواڵەکان لە هەموو ناوچەکان بڵاودەبوونەوە. [٣]

(جۆن ئادامس)ی کوڕە جووتیار لە ساڵی (١٧٩٦) وەک دووەم سەرۆک کۆمار هەڵبژێرا، هەمان بیروڕای فیدراڵیەکانی هەبوو، بەڵام زۆر وابەستەی ئامۆژگارییەکانی (هاملتۆن) نەبوو کەسایەتیەکی سەربەخۆ خواز بوو، حەزی بە ملکەچکردن نەبوو بۆ هیچ کەسێک تەنانەت بۆ (هاملتۆن)ش، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە سەردەمی ئەمدا ململانێی نێوان فیدراڵیەکان و دژە فیدراڵیەکان توندتر بوو، بە تایبەت دوای ئەوەی هەندێک بڕیاری لە سەردەمەکەی خۆیدا دەردەکرد لەوانە:

١. بێبەشکردنی کەسانی بێگانە لە پۆستی سەرۆک کۆماری.

---

١ - فریشتة نورائي:س-پ، ل٦٣.

٢ - جیفرسون الرئیس الفیلسوف من کتاباتة، اشرف علی التحریر- برنارد مایو، ترجمة- د.محمد عبدالمعز نصر،مکتبة النهضة المصریة،القاهرة،١٩٥٩،ص٢٢٢.

٣ - تشارلز و ماری بیرد: تاریخ الولایات المتحدة الأمریکیة،ج١/ص ١٧٦.

٢. ماوەی پێدانی ڕەگەزنامەی ئەمریکی بۆ هاوڵاتیانی بێگانە لە (٥) ساڵەوە کرد بە (١٤) ساڵ.

٣. سەرۆک کۆمار مافی دوورخستنەوە و بەندکردنی بێگانەی هەیە.

٤. هەر کەسێک دژی دەوڵەت بیەوێت پیلان دابنێت دوور دەخرێتەوە، ئەم کارەش لە پێناو ئاشتیدا دەکرێت، بۆ ئەم کارانە ئەنجومەن هەندێک لە ویلایەتەکانی وەک (فیرجینیا و کونتیکیت) لە دژی وەستانەوە و داوای بەرپەرچدانەوەیان کرد، چونکە لایان وابوو دژی دەستوورن و دژی مافی ئازادی تاکە کەسن، لەبەرئەوە دژە فیدراڵیەکانیش دژی وەستانەوە و (جیفرسۆن) سەرکەوتنی حکومەتی بەستەوە بە ویستی گەلەوە نەک بەرژەوەندی و ئارەزووی تاکەوە.[1]

بە کورتی فیدراڵیەکان لە یەکەم و دووەم پۆستی سەرۆک کۆماریدا سەرکەوتن، بەڵام ئەم سەرکەوتنە زۆری نەخایاند و بەردەوام نەبوون لە کاروباری سیاسی وڵاتدا و لە ساڵی (١٨١٦) ئەم پارتە کۆتایی پێ هات، ئیدی سیستمی یەک پارتی دەستی بەسەر وڵاتدا گرت، دژە فیدراڵیەکان پارتی ڕکابەریان نەبوو، تا ساڵی (١٨٢٠) پارتی ڕکابەر بە سەرکردایەتی (جۆن کینسی ئادامس) (کۆمارییە نەتەوەییەکان) دروستبوو.[2]

## ٢-پارتی دژە فیدراڵی

(جیفرسۆن) دامەزرێنەری پارتی (دژە فیدراڵی) لە سەردەمی (جۆرج واشنتن)دا وەزیری دەرەوە بوو، هەر لە سەردەمی (واشنتن)دا جیفرسۆن و مادیسۆن لەگەڵ زۆرینەی کەسایەتیەکانی (نیویۆرک) پەیوەندییان هەبوو، هەوڵیان ئەدا بۆ دروستکردنی کۆڕ و کۆمەڵ دژی (هاملتۆن)، بەم شێوەیە سەرەتایەکی بچووک لە پارتی لاوی دژە فیدراڵی دروست بوو، ئەم پارتە دەیویست بیروباوەڕەکانی شۆڕشی ئەمریکی زیندوو بکاتەوە و حکومەتی گەل بۆ گەل بگەڕێتەوە و لە بەرامبەر ویستی چینی دەسەڵاتداری دەوڵەمەند پارێزگاری بکات لە ویستی زۆرینەی خەڵک.[3]

---

١ - فرحات زيادة و ابراهيم فريجي: تاريخ الشعب الاميريكي،ص ٩٩.

٢ - لارى الوتيز:نظام الحكم في الولايات المتحدة الأمريكية،ص٧٩.

٣ - ديب علي حسن:س-پ، ل٢١١.

بیروباوەڕی (جیفرسۆن و مادیسۆن) دەربارەی پارتەکان کەجیاوازییان هەبوو ـەگەڵ (واشنتن) کە ئەم پارتەکانی بە شەیتان ناوزەند دەکرد، بەڵام ئەوان دژی ئەم ـۆچوونە بوون و دژی ئەو کۆسپ و تەگەرانەش بوون کە دەخرانە بەردەم کۆمەڵ ـو گروپ و پارتەکان و بە لادان لە دەستووری لە قەڵەم دەدا.

لە ساڵی (١٧٩٣) (جیفرسۆن) دەستی لەکارکێشایەوە، بەڵام لە کۆتایی خولی ـووەمی سەرۆکایەتی (جۆرج واشنتن)دا چالاکیەکانی لە ڕێگەی پارتەکەیەوە بەردەوامی هەبوو بۆ گرتنەدەستی دەسەڵات، ئەوەبوو پارتی دژە فیدراڵی لە ساڵی (١٧٩٦) (جیفرسۆن)یان کاندید کرد بۆ پۆستی سەرۆک کۆماری، بەڵام لە بەرامبەردا (جۆن ئادامس) بە زۆرینەیەکی کەم ئەم سەرکەوتنەی بەدەستهێنا.[١]

(جیفرسۆن) لە خۆکاندیدکردن بۆ سەرۆکایەتی کۆڵی نەدا و ئەوەی زیاتر هانیدا ناڕەزایی خەڵکی بوو لە سیاسەتی فیدراڵیەکان کە گوێیان نەدەدا بە داواکاری خەڵکی، پشتگیری جوتیار و بازرگانە بچووکەکان، پاڵپشتی گەورەی هەبوو. لە ساڵی (١٨٠٠) (جیفرسۆن) هەڵبژێرا بۆ پۆستی سەرۆک کۆماری و یەکەم سەرۆک بوو لەسەر لیستی دژە فیدراڵی کە هەڵبژێراوە، لەو ساڵەدا ئەم پارتە بە تەواوی لەدایکبوو، بۆ یەکەم جار پرەنسیپی بەرهەڵستکاری لە شێوەی پارتدا خۆی بینیەوە و سیستمی پارتی بە شێوەیەکی فەرمی لەو ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا دانی پێدانرا.[٢]

(جیفرسۆن)ی هەڵبژێراو دەسەڵاتی گرتەدەست و بە وتارێک دەستی پێکرد کە تیایدا بانگەشەی دەکرد بۆ یەکێتی پێکەوە ژیان و نەهێشتنی کێبڕکێی و پارێزگاری لە یەکێتی و یەکپارچەیی وڵات و هەوڵدان بۆ سەرخستنی دەسەڵاتی نوێنەرایەتی و ئاماژەی بەوەدا خەڵک ئازادە چۆن دەژی و چی دەکات و هەوڵی ڕێکخستنی سیستەم و یاسا دەدات.[٣]

بیر و فەلسەفەی (جیفرسۆن) لە دوو سەرچاوەوە سەرچاوەی گرتبوو، یەکەم فەلسەفەی رزگاریخوازی فەرەنسی، دووەم ژیانی تایبەتی خۆی کە لە ژینگەیەکی کشتوکاڵیدا لە فیرجینیا ژیابوو. دروستبوونی ئەم دوو پارتە لەسەر بنەمای جیاوازی بیروڕاکانیان دەربارەی بارودۆخەکانی ئەو سەردەمەی وڵات دروست

---

١ - جيفرسون الرئيس الفيلسوف من كتاباته: س-پ، ل ٢٢٤.

٢ - الكسي دو توكفيل: عن الديمقراطية في أمريكا،ص١٣.

٣ - محمد محمود النيرب: س-پ،ج١/ ل ١٤٣.

بوو، ئەم جیاوازیانەش لە هەندێک لایەنەوە بوو، لەوانە: دەربارەی دەستوور و فەرمانڕەوایی وڵات، دژە فیدراڵیەکان لە سەروبەندی پەسەندکردنی دەستووردا (٣) خاڵیان خستەڕوو:

١. ئاماژەیان بۆ ئەوە کرد ئەم دەستوورە خزمەت بە ئەرستۆکراتیە دەوڵەمەندەکان دەکات کە بە هۆیەوە دەتوانن حکومەتی ناوەندی بەهێز دابمەزرێنن و دەستبگرن بەسەر سیاسەتی گشتی وڵاتدا.

٢. کاریگەری خراپی هەیە لەسەر مافی سیاسی و سەربەخۆیی سیاسی ویلایەتەکان.

٣. زۆر بابەت لە دەستووردا ئاماژەی پێ نەکراوە کە پەیوەندی بە ئازادی تاکەوە هەیە.[1]

(دژە فیدراڵیەکان) لەگەڵ ئەوەبوون دەستوور کاری پێبکرێت، بەڵام دەستکاری نەکرێت و راڤەیەکی وشەیی بۆ بکرێت واتە لێکدانەوەی چڕی هەبێت نەک نەرم کە بە ویستی تاکە کەس بەکاربێت، لەبەرئەوە دەبینین لەگەڵ فیدراڵی دەسەڵاتی زۆرینەدا بوون و دەیانویست شێوە حکومەتێکی فیدراڵی پەیڕەو بکرێت، بەڵام بە پێچەوانەی فیدراڵیەکان، دژی بەهێزکردنی دەسەڵاتی ناوەند بوون چونکە لایان وابوو لە دەستووردا بەهێزی دەسەڵاتی ناوەند بوونی نیە.[2]

ئازادییە تاکە کەسییەکان و دیموکراسی یەکێکی دیکە بوو لەو خاڵانەی کە دژە فیدراڵیەکان هەڵوێستەیان لەسەر دەکرد، لایان وابوو پێویستە دەسەڵاتی قۆرخکاری لەلایەن چینی سەرمایەدارانەوە سنووردار بکرێت و گواستنەوەی دەسەڵاتەکان بۆ چینە کۆمەڵایەتیەکانی دیکەی وەک جوتیار و خاوەن پیشەکان، چونکە (جیفرسۆن) لای وابوو ئەو چینانە ڕەنگە لە کۆندا باش حوکمیان کردبێت، بەڵام مەرج نیە لە داهاتووشدا بە هەمان شێوەبن.

(جیفرسۆن) باوەڕی بە ئازادی تاک و گەل هەبووە، حەزی دەکرد بە یەکسانی و دیموکراسی و سنووردارکردنی دەسەڵاتی کڵێسا و خاوەن موڵکە گەورەکان، وەک دەبینین بۆنەی ئەرستۆکراتیەکان و ڕێوڕەسمی ئاهەنگە فەرمیەکانی نەهێشت،

---

١ – لاری الوتيز: س–پ، ل ١٨.

٢ – د.طليعة الصياح و راغب العلي: س– پ، ل٩٠.

هەروەها ئارەزووی بۆ ئازادیخوازی ناو کشتوکاڵیەکان هەبوو، هەوڵیدا ئازادی فێربوون و ڕۆژنامەگەری لە وڵاتدا پەرە پێبدرێت.[1]
هاتنی (جیفرسۆن) بۆ (کۆشکی سپی) بووە هۆی ئەوەی دیموکراتیەت گەشەبکات، چونکە ڕێزی بۆ خەڵکی ئاسایی دادەنا و ئاماژەی بەوە دەدا کەسی ئاسایی و پیاوی دەسەڵاتدار یەکسانن، چونکە هەموو کەسێک بە ئازادی و یەکسانی دروست بووە، تەنها لە ڕووی توانا و هێزەوە نەبێت کە لە یەک جیاوازن، بەڵکو لە ڕووی بیرکردنەوە و عەقڵانیەت و ڕەوشتەوە یەکسان و ئازادن ئەگەر هەرکەس بە چاکترین شێواز تواناکانی بەکاربێنێت، باوەڕی بە هەندێک لە بیروبۆچوونەکانی (جۆن لۆک) هەبوو، وەک گەیشتن بە مافی سروشتی و گیانی ئازاد و خۆشگوزەرانی گەل و تاک، مافی شۆڕش دژی ستەمکاری، ئەم بیر وبۆچوونانەی (جیفرسۆن) بوونە بنچینەی هزری ئازادیخوازی ئەمریکا.
(جیفرسۆن) لەسەر ئازادییە تاکە کەسیەکان سوور بوو و پێی لەسەر دادەگرت، لە مانگی (١)ی ساڵی (١٨٠٨) بازرگانی کۆیلەی قەدەغەکرد.[2]

## هەردوو حزبە سیاسیەکە و ڕێبەرەکانیان

لە کۆنگرێسدا کاری بەرەنگاریکردن لە باجەکان بووە هۆی دوورخستنەوەی پەیوەندیەکانی خاوەن بەرژەوەندییە بازرگانیە پیشەسازیەکان لەلایەک و کشتیاران و پیشەسازیە بچووکەکان لەلایەکی ترەوە، هاملتۆن سەرکردایەتی فیدڕاڵیەکانی دەکرد، وجیفرسۆنیش سەرکردایەتی دژە فیدرالیەتەکانی دەکرد، کە لە دواییدا بە کۆمارییەکان ناسران، هاملتۆن کابرایەکی بەسام و هەیبەت و بەویقار بوو، زیرەکیەکی زۆری هەبوو ئەم سیفەتانەش بووە هۆی ئەوەی کە (جۆرج واشنتن) ئاوڕی لێ بداتەوە و لە ڕۆژانی شۆڕشدا نزیکی بکاتەوە لە خۆی، ڕۆڵێکی گەورەی گێڕا لە گەمارۆدانی (یورکتون) و دوای شۆڕش بووە نەقیبی پارێزەران لە نیویورک، کاتێک واشنتن ویلایەتی ڕێکخست بە چاودێری دارایی بینی کە ڕێسایەکی دروست وەدەست کەوتووە، بۆیە پێویستە بیکاتە نموونەیەک لە ڕێکخستنی ماڵ و دارایی بەڕێوەبردنی زیرەکانەدا، لەگەڵ ئەوەشدا لە هەندێ کەم و

---

١ - محمد محمود النیرب: س-پ،ج١/ ل١٢٩-١٣٠.
٢ - دیب علی حسن:س-پ، ل٢١١.

کورتی کە پێوەی لکابوون بە دوور نەبوو، کەسێک بوو زوو توڕە دەبوو، هەروەها پێش ئەوەی شەڕ کۆتایی پێ بێت ناکۆکی و شەڕە قسەی زۆر کەوتە نێوان ئەو و (واشنتن).[1]

هەروەها لە کاتێکدا هەردووکیان لە وەزارەتدا بوون ناکۆکی لە نێوانیاندا دروست بوو، ئەمەش کێشەیەکی زۆری بۆ کاروباری دەوڵەت دروست کرد، هەر بەهۆی ناکۆکیەوەدەسەڵاتەکەیان (سەرۆکایەتی) بە دەستی یەکێک لە دوژمنەکانیان لە دەست چوو، بەڵام) جیفرسۆن(زیاتر لەوەی کەسێکی کارگێڕی و بەڕێوەبردن بێت پیاوێکی فکری بوو، زۆرتر خوی بە فەلسەفە دابوو و لەگەڵ زانینی چەند زمانێک زانیارییەکی گشتگیری هەبوو، هەروەها زانستەکانی مۆسیقا و بیرکاری و بیناکاری دەزانی و لە چەندین بواری وەک ڕووەک و گیانلەبەر و پەروەردە و سیاسەتی ئابووری شتی دەنووسی، لەبەرئەوەی رای خۆی زۆر بە ڕاشکاوی دەردەبڕی و پێی وابوودەبێت ئەمریکا وەک ویلایەتێکی کشتوکاڵی بمێنێتەوە، لەبەرئەوەی پێی وابوو بە بڕوای ئەو پێویستە یەکسانی لە نێوان گەلدا بمێنێتەوە چونکە شاری گەورە و بەرژەوەندی پیشەسازی گەورە و دامەزراوە داراییە بازرگانیەکان ئەبنە هۆی جیاوازی لە نێوان ئەندامانی کۆمەڵگادا، ئەگەر گرنگیدانی هاملتۆن لە بوارەکانی ڕێکخستنی ئابووری و بەڕێوەبردندا بوبێت،[2] ئەوا هەموو هەوڵەکانی (جیفرسۆن) ئەوەبوو بتوانێت گەورەترین ڕێژەی ئازادی و بەختەوەری ببەخشێ بە ئەندامەکانی، هەر ئەم بۆچوونانەش وایکرد سەرکردەیەکی بە هێزی کۆماری بێت و سووربێت لەسەر پارێزگاری کردنی ویلایەت و ئەندامەکانی، ئەمەش لە بەخت باشی نەتەوەی ئەمریکیە کە دوو کەسی وەک (هاملتۆن وجیفرسۆن)ی لێ هەڵدەکەوێت لەبەر ئەوەی یەکێکیان نموونەی ڕێکخستن و بەڕێوەبردن بوو، ئەوی دیکەیان نموونەی سەربەستی و یەکسانی بوو، بەهۆی ئەمەوە لە دواییدا وڵات توانی هاوسەنگیەک لە نێوان ئەو دوو هەوڵدارە پێویستەدا بۆ دیموکراسی و نیشاندانی حوکمێکی بەرز و بڵند لە وڵاتدا دروست بکات، فیدراڵیەکان حەزیان بەوەبوو دەسەڵاتەکانی حکومەتی فیدڵی فراوان بن، چونکە بە بڕوای ئەوان دەستوور ڕاڤەیەکی فراوانی بۆ دەکرا، پێویستە پێکهاتەی ئەم

---

١ - فرحات زيادة و ابراهيم فريجي: تاريخ الشعب الأمريكي،ص ٩٥.

٢ - بدون مؤلف:موجز التاريخ الأمريكي،ص ٥٢.

ـستووره به شێوەیەک بێت کە لە چوارچێوەی دەستوورەکەدا جێی بێتەوە، ئەمە
ئەو شتەبوو کە ئەگەر نەبوایە حکومەتی فیدراڵی نەیدەتوانی بە شێوەیەکی
تێروتەسەل دەست بەکارەکانی بکات، لە بەرامبەردا کۆمارییەکان حەزیان بە پابەندی
حکومەتی فیدراڵی هەبوو، چونکە لە دیدگایەکی تەسکەوە سەیری دەستوریان
دەکرد، ئەمەش وای لە هاملتۆن کرد (لەپاش دانانی حکومەتی فیدراڵی بەهێز
سەرپشک بێ لە دانانی پلانە داراییەکان و جێ بەجێکردنی بە شێوەیەکی توند کە
لەگەڵ باجەکانی سەر خەڵکی یەک بگرێتەوە. [1]

جگە لە جیاوازی لە ڕوانگەی هەریەک لە حزبەکان و حکومەت و دەسەڵاتەکان،
کۆمارییەکان لەو باوەڕەدا بوون کە پلانە داراییەکەی هاملتۆن هۆکارێکە دەتوانێت
هەوڵی کشتیاران و کرێکاران و بازرگانان و پیشەسازییەکان بقۆزێتەوە و سوودی
سەرمایەداران و بازرگانە گەورەکان و خاوەن پیشەسازەکانی تێدابێت، بۆیە
(جیفرسۆن) بە نهێنی چەند نامەیەکی نارد بۆ (جۆرج واشنتن) و لەم بیروبۆچوونانە
ئاگاداری کردەوە و ئەوەشی تێدا خستبووە ڕوو کە ترسی هەیە لە قۆستنەوەی
بەرژەوەندی گشتی گەل و مافەکانیان و بەفیڕۆچوونیان و جەختی لەسەر ئەوە
کردبوویەوە کە زۆربەی ئەندامانی کۆنگرێس پشتگیری هاملتۆن دەکەن،
لەبەرئەوەی ئەم پلانانەی ئەو ئەبێتە هۆی بەدەستخستنی سوود و قازانج بۆیان. [2]

لەمەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە گەشەکردنی ئەم دوو حزبە و بەرەوپێش
چوونیان لەسەر چەند هۆکارێکی ئابووری بونیادنرا بوون و لە سەرنجامی ئەم
تێکۆشانە ئابووریەدا کۆمەڵێکی زۆر لە کشتیارانی (پەنسلڤانیا) بە ڕووی حکومەتدا
هەڵگەڕانەوە، ئەمەش لە دژی سەپاندنی باج بەسەر مەیی و جۆرەکانیدا کە دەست
دەکەوتی زۆربوو بۆ زۆرینەی خەڵکی لە ویلایەتەکانی (پەنسلڤانیا و ڤیرجینیا و
نورث کارولینا)، هەروەها زۆربەی ئەم ویلایەتانە دەستیانکرد بە دروستکردنی
ویسکی کەئەمانەش بەهۆی سەختی هۆکاری گواستنەوەوە بە گرانی
دەگواسترانەوە بۆیە شۆڕشێکیان لە بەرامبەریاندا بەرپاکرد و هەڵگەڕانەوە وماڵی
باج کۆکەرەوەکانیان سوتاند لەبەرئەوەش شۆڕشەکەیان زوو کپ کرایەوە و بوو بە
هۆی بەهێز بوونی (جیفرسۆن)، حزبی کۆماری بە تایبەت (جیفرسۆن) وازی لە

---

١ - فرحات زيادة و ابراهيم فريجي: س-پ،ل ٩٦.

٢ - ديب علي حسن:س-پ،ل ٢١٢.

پلەوپایەی وەزیری دەرەوە هێنا و ئاوڕیدایەوە بەلای کاروباری حزبەکەیدا.[1] لەم سەروبەندەدا گێژاوێکی سیاسی لە ئەوروپادا سەریهەڵدا کە کاریگەری گەورەی لە جێگیرکردنی ئەم دوو حزبەدا هەبوو، لەم کاتەدا لە ساڵی (١٧٨٩) شۆڕشی فەڕەنسی هەڵگیرسا و هەر لە هەڵگیرسانیەوە شێوازی ژیانی کۆمەلایەتی گۆڕی و بنەماکانی دەسەلاتی پاشا و ئەمیر و پیاوە تایبەتەکان و پیاوانی ئایینی گەڕاندەوە بۆ گەل، بەلام ئەم ڕووداوە زۆرێک لە ئەمریکی و ئینگلیزەکانی خستە قینەوە، بۆیە (ئەدموند بورک) کە کەسایەتیەکی سیاسی ئینگلیز بوو دژی ئەم شۆڕشە وەستاو دژی ئەوانیش بوو کە هەڵیانگیرساندبوو، لەلایەکی ترەوە (تۆماس پاین) یەکێک بوو لەوانەی بەرگری لە ئەمریکیەکان دەکرد و کۆتایی بەقسەکانی (ئەدموند) هێنا و کتێبێکی بلاوکردەوە بە ناوی (رایتس ئون مان) بە دانانی مافەکانی مرۆڤ کە هاودەم بوو لەگەڵ نامەیەکی دەستخۆشی کە بەدەستی (جیفرسۆن) نوسرا بوو، ئەمەش ئالوگۆڕێکی زۆری پێکراو لەم دەست بۆ ئەو دەستی پێکراو بوو بە قسەی سەرزاری زۆربەی کۆمەڵگە ئەمریکیەکان.[2]

هەروەها ویستی شۆڕشی فەڕەنسی بە شۆڕشی ئەمریکیەوە گرێ بدات دەیوت: (بڵێسەیەکی بچووک لە ئەمریکادا پەیدابوو، ئاگرێکی وای خستەوە نەدەتوانرا بکوژێنرێتەوە). هەروەها لە بیروبۆچوونەکانی ئەوەبوو مرۆڤ هەمیشە بەرەو ئازادی هەنگاو دەنێت و هەوڵی بنیاتنانی سیستمێکی حوکمی ئەدات کە لەگەڵ ئارەزووەکانیدا بگونجێت، ئەم بیروبۆچوونە لەنێوان گروپەکانی کۆماریەکاندا شایەنی گرنگیپێدان بوو، ئەوانەی کەوتنە دژایەتی (هاملتۆن و لایەنگرەکانی لەدەوڵەمەندەکان و کەسە ناودارەکان) هەستان بە دامەزراندنی کۆمەڵە دیموکراسیەکان و کەوتنە چاودێری ڕووداوەکانی شۆڕشی فەڕەنسی و دەکەوتنە ئاهەنگ گێڕان لەهەر کاتێکدا رادیکاڵیە فەڕەنسیەکان سەرکەوتنیان بەدەست بهێنایە، بەلام ئەم دیاردەیە دژی بۆچوونەکانی فیدراڵیەکان و فەلسەفەکەیان بوو لەژیاندا، بۆیە کەوتنە سنوردانان بۆ کۆمەڵە دیموکراسیەکان و کردەوەکانیان هەتا گەیشتە ئاستێک گورتینی هەندێکیان بەرز بوویەوە تارادەیەک داوای ئاشکراکردنی جەنگیان دەکرد دژی فەڕەنسا بۆ لەناوبردنی ئەو بزووتنەوەیە لە ئەمریکا، کاتێک

---

١ - جيفرسون الرئيس الفيلسوف من كتاباته: س-پ، ل ٢٢٢.

٢ - جوردن س.وود:الثورة الأمريكية،ص١٩٦.

جەنگ لە نێوان فەڕەنسا و ئینگلتەرادا هەڵگیرسا ساڵی (١٧٩٣) هەستی ئەمان لەگەڵ ئینگلتەرا بوو بە تایبەت کە زۆرینەیان پەیوەندی بازرگانییان لەگەڵ فەڕەنسا هەبوو و ئارەزووی پچڕاندنیان دەکرد، بەڵام کۆماریەکان ئارەزوویان بەلای فەڕەنسیەکاندا بوو، هەرچەندە واشنتن بێلایەنی ئەمریکای دەربڕی. [١]

سەرەتایەک لەسەر فیدراڵی خوازی و دژە فیدراڵیەکان لەئەمریکادا گەشەی کرد، پاش ئەوەی دەستوور وەک گرنگترین ڕێسا بۆ فەرمانڕەوایی کردن دانرا، خەڵکی لەوە دڵنیابوون کە دەستوور کاری پێ دەکرێت، لەویلایەتەکانی ئەمریکادا دوو گروپی جیاواز دەرکەوتن، کە هەریەکەیان جۆرێک لەسیستمیان لا پەسەند بوو، کە بە فیدراڵی و دژە فیدراڵیەکان ناسرا بوون.

فیدراڵیەکان ئەوانە بوون کە دەوڵەتێکی ناوەندی بەهێزیان دەویست، دژە فیدراڵیەکان ئەوانە بوون کە ئارەزووی دەوڵەتێکی لاوازیان دەکرد لەگەڵ دەسەڵاتی ویلایەتە جیاوازەکان لەیەک کاتدا، پاش چەسپاندنی دەستوور لە ئەمریکادا خەڵکی زۆر بە توندی پارێزگارییان لەو دەستورە دەکرد، چونکە دەترسان لەوەی ئاژاوە بکەوێتە وڵاتەوە، چونکە پێیان وابوو دەستوور زامنی ئازادی و مافەکانی هاوڵاتی ئەو وڵاتە دەکات، دژە فیدراڵیەکان دەیانویست بە شێوازێکی ئاشتیانە گۆڕانکاری لە دەستووردا بکەن، ئەمانە لە ڕاڤەکردنی دەستووردا لە فیدراڵەکان جیاواز بوون، لێرە بەدوا ئەمریکیەکان پەیڕەوی فەرمانڕەوایی سیستەمی دیموکراسیان کرد، ئەوەی زیاتر یارمەتی چەسپاندنی دەستووریدا دانەری دەستوور خۆیان بوون، چونکە ئەمانە کە دەستورەکەیان دانا دواتر خۆیان پیادەی دەستوورەکەیان کرد. [٢]

(جۆرج واشنتن) و (هاملتۆن) ئارەزوویان بە لای فیدراڵیەکاندا دەڕۆیشت، ئەمە لە کاتێکداجیفرسۆن و ڕاندولف دژە فیدراڵیان پێ باش بوو، کە ئەمەش بووە هۆی دروستبوونی دوو هێزی سیاسی جیاواز لەو وڵاتەدا، کاتێک دادگای باڵا لە ساڵی (١٧٨٩) لەلایەن کۆنگریسی ئەمریکی لە قازی و حاکمەکان پێکهێنرا، لێرەوە دادگای فیدراڵی پێکهێنران، ئەم دادگایانە پارێزەری بەرژەوەندییەکانی حکومەتی فیدراڵی بوون، هەڵدەسان بە جێ بەجێکردنی یاساکان لە ویلایەتەکاندا، هەموو شتێکیان بەرپەرچ دەدایەوە کە پێچەوانەی دەستوور بوایە، بەرگرییان دەکرد لە مافی تاکە

١ - فرحات زيادة و ابراهيم فريجي: س-پ، ل٩٧.

٢ - هواردزن: التاريخ الشعبي للولايات المتحدة،ج١/ص ١٦٨.

کەس، ڕێگەیان دەگرت لە زۆرداری ناو ویلایەتەکان، لێرەوە پەیوەندی نێوان گەل و حکومەتی ئەمریکا دروست بوو. [١]

## پارتی دیموکراتی ئەمریکا

دوای ئەوەی تۆماس جیفرسۆن لە ساڵی (١٧٨٩) لە فەرەنساوە گەڕایەوە بۆ ئەمریکا لەو ماوەیەدا ناکۆکی کەوتە نێوان (جیفرسۆن و هاملتون)کە وەزیری دارایی بوو، لە ئەنجامی ئەمەدا بەرەی (جیفرسۆن) پارتێکیان بە ناوی (پارتی دیموکراتی ئەمریکا) دامەزراند کاتێ (جیفرسۆن) هەڵبژێرا بە سەرۆکی پارتەکە و دواتر پاڵێورا بۆ سەرۆک کۆماری. [٢]

(جیفرسۆن) سەرۆکی پارتی دیموکرات پێی وابوو ئەمریکا وەک وڵاتێکی کشتوکاڵی بمێنێتەوە، بڕوای بە یەکسانی نێوان ڕۆڵەکانی گەل هەبووە، وای بۆ دەچوو شارە گەورەکان و بەرژەوەندی پیشەسازی و دامەزراوە داراییەکان و بازرگانیەکان گەشەپێدانیان لە ئەستۆی تاکەکانی کۆمەڵگایە، بۆیە دەبێت یەکێتی و نزیکایەتی لە نێوان ڕۆڵەکانی گەلدا دروست بکرێت، ئەمانە وایانکردجیفرسۆن بە گونجاوترین کەس دابنرێت بۆ سەرۆکایەتی حیزبی دیموکرات، ئەم کەسە زۆر جەختی دەکردەوە لە پارێزگاریکردن لە مافی تاکەکان و ویلایەتەکان.

دیموکراتەکان پلانەکانی هاملتۆنیان بۆ دانانی باج لەسەر گەل و ویلایەتەکانیان وا دەبینی کە دەیەوێت لە بەرژەوەندی سەرمایەداران و بازرگانەکان ئیستیغلالی هەوڵی جوتیاران و کرێکاران و پیشەوەران دەکات،(جیڤرسۆن) بەرامبەر بە ئامانجەکانی هاملتۆن لە پلانە داراییەکەیدا هۆشیار بوو. [٣]

گرنگترین سەرۆکەکانی پارتی دیموکراتی کە بوونە سەرۆکی ئەمریکا

١- (تۆماس جیفرسۆن) یەکەم سەرۆکی ئەو پارتەیە و کاری گرنگی ئەنجامدا لەو کارە گرنگانە کڕینی ناوچەی لویزیانا بوو لە فەرەنسا کە شەڕەکانی ناپلیۆنی بەهەل زانی و ئەم کارەی ئەنجامدا.

٢-(جیمس مادیسۆن) (١٨٠٩- ١٨١٧) لە سەردەمی ئەمدا لە ساڵی (١٨١٢)دا جەنگی نێوان بەریتانیا و ئەمریکا هەڵگیرسا.

---

١ - د.عبدالعزيز سليمان و د.عبدالمجيد نعنعي: س-پ، ل ٩٨.

٢ - لاری الوتيز:نظام الحكم في الولايات المتحدة الأمريكية،ص٨١.

٣ - فرحات زيادة و ابراهيم فريجي: تاريخ الشعب الأمريكي،ص ٩٩.

٣-(جیمس مۆنرۆ): (١٨١٧- ١٨٢٥) له سەردەمی ئەمدا بنەمای مۆنرۆ ڕاگەیەنرا کە ناوەڕۆکەکەی بریتیە لە (ئەمریکا بۆ ئەمریکیەکانە) ئەمەش لەدژی دەستێوەردانی وڵاتانی ئەوروپا لە وڵاتانی تازە سەربەخۆیی ئەمریکای لاتین بوو.

٤- (ئەندرۆ جاکسۆن) (١٨٢٩- ١٨٣٧) ئەم سەرۆکە شێوازێکی نوێی لە دیموکراسی هێنایە کایەوە کە بە (دیموکراسی جاکسۆنی) ناسرا و لە سەردەمی ئەمدا کێشەی بانکی ئەمریکا سەریهەڵدا.

٥- (جیمس نوکس پۆک) (١٨٤٥- ١٨٤٩) لەم سەردەمەدا جەنگ لەگەڵ مەکسیکدا بەرپابوو، کالیفۆرنیا و نیو مەکسیکۆ خرانە سەر سنوری ئەمریکا، کێشەی ویلایەتی ئاریگۆن کۆتایی هات و یەکلاکرایەوە.

٦- (زکاری تایلۆر) (١٨٤٩- ١٨٥٠) تەمەنی هەبوو لە کارەکانیدا توندڕەو بوو، چونکە لە کوشتنی هیندیە سوورەکاندا ڕۆڵی هەبوو، بەو بۆنەیەوە ناوبانگی دەرکرد، بە پاڵەوانی جەنگی مەکسیک دادەنرێت.

٧- (میلارد ڤیلمۆر) (١٨٥٠- ١٨٥٣) ئەم سەرۆکە دژی سیاسەتی دەست تێوەردان بوو لە ناکۆکی و ململانێی دەرەکیدا، هەروەها کارێکی گرنگی ئەنجامدا ئەویش بەستنی پەیمانی بازرگانی بوو لەگەڵ ژاپۆندا.

٨- (فرانکلین بێرس) (١٨٥٣- ١٨٥٧) ئەم سەرۆکە دەسەڵاتی لاواز بوو چونکە لە هەل ومەرجێکی ئاڵۆز و نالەباردا دەسەڵاتی گرتە دەست، کە ناکۆکی و دووبەرەکی لەنێوان دیموکراتی و کۆمارییەکاندا لەسەر ئازادکردنی کۆیلەکان سەریهەڵدا بوو.[1]

٩- (جیمس بۆکانان) (١٨٥٧- ١٨٦١) ئەم سەرۆکە هەوڵی ئەوەی دا هاوسەنگی لە نێوان بەرەی لایەنگری ئازادی کۆیلەکان و بەرەی دژی ئازادی کۆیلەکان بهێنێتە ئاراوە، بەڵام لەلایەن توندڕەوەکانی هەردوولاوە تۆمەتبار کراو بەبێ هەڵوێست لەقەڵەمدرا.

١٠- (ودرۆ ولسن) (١٩١٣- ١٩٢١) لە سەردەمی ئەمدا جەنگی جیهانی یەکەم ڕوویدا کە ئەمریکا بەشداری تێداکرد لە (١٩١٧)دا وڵسن خاوەنی (١٤) ڕێبازێکە کە بە ناوی خۆیەوە ناسرا، خاوەنی بیرۆکەی کۆمەڵەی گەڵنە.

---

١ - الان بالمر:موسوعة التاريخ الحديث،١٧٨٩-١٩٤٥،تر- سوسن فيصل السامر ويوسف محمد امين،دار المأمون للترجمة والنشر،بغداد،١٩٩٢،ج٢/ص٣٥٦.

١١-(فـرانكلين ديلانـۆ رۆزفێلـت) (١٩٣٣- ١٩٤٥) بـۆ سـڕینەوەی شـوێنەواری قەیرانی ئابووری جیهانی بەرنامەیەکی ڕیفۆرمخوازی لەبواری ئابووریدا گرتەبەر، ئەمریکا لەم سەردەمەدا بەهۆی هێرشـی ژاپۆن بۆ سـەر دوورگەی هاوای بڕیاری چـوونە گۆڕەپـانی جەنگیـدا، (رۆزفێلـت) لەمـاوەی سـێ خـولی سـەرۆکایەتیدا سەرۆکایەتی وڵاتی گرتەدەست.

١٢-(هـاری ترومـان) (١٩٤٥- ١٩٥٣) ئەم سـەرۆکە بـوو کە دژی شـارەکانی هێرۆشـیما و نەکـازاکی ژاپـۆنی لە سـاڵی (١٩٤٥)دا بڕیـاری بەکارهێنـانی بۆمبـای ئەتـۆمی دا، هەر لە سـەردەمی ئەم سـەرۆکەدا بـوو حکـومەتی ئیسـرائیل لە (١٩٤٨) دامەزرا و نەتەوە یەکگرتووەکانیش لەم سەردەمەدا پێکهێنرا کە لە کۆتـایی هێنـان بە کێشـە جیهانیەکـانی ڕۆڵـی دەبینـی، وە دامەزرانـدنی هاوپەیمـانی سـەربازی بـاکوری ئەتڵەنتی (NATO) ساڵی (١٩٤٩) لە کاتی سەرۆکایەتی هاری تروماندا بوو.

١٣- (جون کینەدی) (١٩٦١- ١٩٦٣) سەرهەڵدانی قەیرانـی موشـەکی سۆڤێتی کە لە کوبا جێگر کرابوون، بۆ یەکەم جار پەیوەندی ڕاستەوخۆی تەلەفۆنی لە نێوان کرملین و کۆشـکی سـپی دەسـتپێکرد، بنـاغەی کەمکردنەوەی چەکی ئەتۆمی دانرا، ئەم سەرۆکە لەلایەن (لی ئۆزوالد) لە شاری دالاس تیرۆرکرا.

١٤- لینـدۆن بینـز جۆنسـۆ (١٩٦٣- ١٩٦٩) لەم سـەردەمەدا جەنگـی عەرەب- ئیسرائیل لە حوزەیرانی (١٩٦٧) هەڵگیرسا، جەنگی نێوان ئەمریکا و ڤێتنام توند بوو.

١٥- (جیمس کـارتەر) (١٩٧٦- ١٩٨٠) لەم سـەردەمەدا پەیوەنـدی نێوان چـین و ئەمریکـا پـتەو بـوو، بەسـتنی پەیمـانی کامدیڤیـد لەسـاڵی (١٩٧٨) لەنێـوان مصـر و ئیسرائیل لەژێر چاودێری ئەمریکادا، پەیمـانێکی بەسـت لە نێوان خۆیـان و سۆڤیەت بۆ کەمکردنەوەی چەکی ئەتۆمی سـاڵی (١٩٧٩)، قەیرانـی بـارمتە گیراوەکـانی نـاو باڵوێزخـانەی ئەمریکـا لە تـاران کە بـووە هـۆی دۆڕانـدنی (کـارتەر) لە هەڵبژاردنـی ساڵی (١٩٨٠)دا.

١٦- (بیل کلنتۆن) (١٩٩٢- ٢٠٠٠) کلنتۆن بواری خۆش کرد بۆ ڕیفۆرمکاری لە سـتراتیژی نـاوچەیی ئەمریکـا کە لەلایەن کـابینەی بـۆش لە سـاڵی (١٩٩٠) دەسـتی پێکرد، بەڵام کابینەی کلنتۆن وەک کابینەکانی پێش خۆی ناچاربوو دەست و پەنجە لەگەڵ بواری ستراتیژی و باری هێزداریدا نەرم بکات، بەگەڕ خستنی پەیمانی سالت لەگەڵ (بـورەس یەلتسـین) سـەرۆکی ڕووسـیا لە (١٩٩٢) بـۆ کەمکـردنەوەی چەکـی ئەتـۆمی، چەسـپاندنی ئاشـتی لە بۆسـنە و هەرزگۆڤینیـا، سـوپای لە کۆسـۆڤۆ

ـەرکـرد.[1] دوا سـەرۆکی ئەم پـارتە کە لە سـەرەتای سـاڵی (٢٠٠٩) لە ئەمریکـا ـەسەڵاتی گرتە دەست(ئۆباما) کە بەپێی بانگەشەکانی جێی هیوای گشتیە.[2]

١٧- (بـاراک ئوبامـا) (٢٠٠٩ – ٢٠١٧) (٤٤) چـل وچـوارەمین سـەرۆکی ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە سەر بە پارتی دیموکراتە و یەکەم سەرۆکی ڕەش پێستە کە دەسـەڵات وەربگرێـت لە ئەمریکـا ئەمەش بـۆ خـۆی بە خـاڵی وەرچەرخـان دا دەنرێـت لە مێـژووی سیاسـیی ئەمریکـادا وگرنکتـرین ڕووداوەکـانی سـەردەمی کشانەوەی سـوپای ئەمریکـا بـوو لە عێـراق و داخسـتنی گرتوخـانەی گوانتانـامو و قۆناغێکی نوێ لە سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا بەرامبەر  روسیا و ئەوروپا.

١٨- جۆبایـدن (٢٠٢١ – ٢٠٢٥) (٤٦)  چـل و شەشـەمین سـەرۆکی ولایەتە یەگرتووەکانی ئەمریکایە بە پارتی دیموکرات .

### پارتی کۆماری

پـارتی کۆمـاری یەکێـک بـوو لەو دوو پـارتە سیاسـیەی وڵاتە یەکگرتووەکـانی ئەمریکا کە داوای سیستەمی فیدراڵی دەرکرد بگرە لە جیهانیشـدا، مێمڵەکەی پـارتی دیموکراتی بـوو، لەو کاتەدا جۆرج واشـنتن سـەرۆکی لیژنەی دەسـتووری بـوو بـۆ دارشـتنی دەسـتوور و هەروەهـا لە مـاوەی خـولی یەکەمـی سـەرۆکایەتی جـۆرج واشنتن توانی پارتی بەرانبەر ببەزێنێت و کاروبـاری وڵات بگرێتە دەست، لە سـاڵی (١٨٠٠) بەرامبەر بە (جۆن ئادامس) لە هەڵبژاردندا دایمەزرێنێت، پلانی دارایی دائەنـا و بەشـێوەیەکی تونـد جێبەجێـی دەکـرد، تونـد بـوو لەسـەر دانـانی بـاج، ئەو ڕێکخستنانەی دایمەزراندبوون لەسەر ئەو باج و سـەرانانە وەسـتا بـوو، لەم کـارەی هاملتۆنـدا کە باجەکـانی سـەپاند دیموکراتخوازەکـان دژی بـوون وەک پێشـتریش باسمان کردووە، ئەم سیاسەتەی هاملتونیان بە قۆرخکردنی کرێکاران و جوتیاران دائەنـا لەپێنـاو بەرژەوەنـدی سـەرمایەدار و بازرگانەکانـدا، کاتێـک جەنگـی نێـوان بەریتانیا و فەرەنسا لە سـاڵی (١٧٩٣) دەسـتیپێکرد هەسـتیان بەلای ئینگلتەرەدا بـوو کە جـگە لەوەی لە ئینتیمایانـدا خۆیـان یەکلاکردبـووە وە بـۆ ئینگلـتەرە، بەڵام لەوە دەترسان پەیوەندییان لەگەڵ بەریتانیا بپچڕێت، چونکە دیموکراتخوازەکان حەزیـان

---

١ - دیب علی حسن:س-پ،ل ٢٩٠-٢٩٢.

٢ - د.ئاراس فەریق زەینەل:ئۆباما و پرسە هەستیارەکان، چاپخانەی چوارچرا،چاپی یەکەم، سلێمانی، ٢٠١٠، ل١٧.

بە لای فەڕەنسیەکاندا بوو، ئەمانیش پەیوەندی بازرگانیان لەگەڵ ئینگلتەرەدا هەبوو، دەیانویست بەرژەوەندییەکانیان پارێزراوبن.[1]

دیارترین ئەو سەرۆکانەی حزبی کۆماری کە بوونە سەرۆکی ئەمریکا.[2]

١-(جۆرج واشنتن) (١٧٨٩- ١٨٩٧) لەسەردەمی ئەمدا دەیان گۆڕانکاری گەورە هاتەکایەوە، دەستکەوتی گەورە بەدەست هات، لەوانە دانانی دەستوور بوو کە بووە هۆی جێگیرکردنی ماف و ئەرکی هاولاتی و دەسەلاتداران لەو ولاتەدا و زیاتر بنەماکانی دیموکراسی چەسپاند.

٢- (جۆن ئادامس) (١٧٩٧- ١٨٠١) لە خولی سەرۆکایەتی ئادامسدا ململانێیەکی توند هەبوو لە نێوان پارتی کۆماری و پارتی دیموکراتیدا.

٣- (ئەبراهام لنکولن) (١٧٦١- ١٨٦٥) گەورەترین دەستکەوتی بۆ نەتەوەی ئەمریکا مسۆگەر کرد بە ئازادکردنی کۆیلەکان و زاڵبوونی بەسەر ئاژاوە و جەنگی ناوخۆیی لە ئەنجامی گرتنەوەی ویلایەتەکانی باشوور کە جیابوونەوەی خۆیان لە دژی یاسای ئازادکردنی کۆیلەکان ڕاگەیاندبوو.

٤- (ئەندرۆ جۆنسۆن) (١٨٦٥- ١٨٦٩) هەرێمی ئالاسکای لە ڕووسیای قەیسەری کڕی.کۆماریە توندڕەوەکانی حزبەکەی خۆی لە ئاوەدانکردنەوەی ویلایەتەکانی باشووردا دژایەتی سیاسەتەکەی جۆنسنیان کرد.

٥- (یۆلیس گرانت) (١٨٦٩- ١٨٧٧)،لەم سەردەمەدا ئەمریکا لە (١٨٧٣)دا پەلاماری کۆلۆمبیای دا، پەیمانی واشنتن لەگەڵ بەریتانیادا بەسترا.

٦- (ڕۆشەرفۆرد هێز) (١٨٧٧- ١٨٨١) ئەم سەرۆکە سیاسەتێکی نەرم و نیانی لە بەرامبەر ویلایەتەکانی باشوور گرتەبەر، بایەخێکی گەورەییدا بە ڕیفۆرمی خزمەتگوزاری مەدەنی.

٧- (جروڤرکلیفلاند) (١٨٨٥- ١٨٨٩) لە سیاسەتی دەرەوەدا بەرنامەیەکی ریفۆرمی سەربەخۆی گرتەبەر، هەڵوێستێکی توندی وەرگرت لە کێشەی سنووری لە فەنزوێلا.[3]

٨- (بنیامین هاریسون) (١٨٨٩- ١٨٩٣) یەکەمین کۆنگرەی ولاتانی ئەمریکی لە ساڵی (١٨٨٩) بەسترا، یاسای گومرگی ماکنلی پەسەندکرا.

---

١ - محمد محمود النیرب: س-پ،ل١٢٩.

٢ - الان بالمر: س-پ،ل ٣٥٦.

٣ - لوقمان خەیاڵی: س-ث،ل٢٤.

٩- (جروڤــر كليڤلانــد) (١٨٩٣- ١٨٩٧) به هاوكــارى و يــارمەتى ئەمريكــا لە سـەردەمى ئەمدا شۆڕشى كوبا لە دژى ئيسپانيا بەرپابوو، دواتريش جەنگى نێوان هەردوو وڵات سەريهەڵدا.

١٠- (وليم مـاكنلى) (١٨٩٧- ١٩٠١) جەنگى نێوان ئەمريكا ئيسپانيا سـەريهەڵدا، ئەمريكـا لە ئەنجـامى ئەم جەنــگەدا (١٨٩٧- ١٨٩٨) دەســتيگرت بەســەر هەردوو دوورگەى كوبا و فليپيندا.

١١-(تيودور رۆزفێلت) (١٩٠١- ١٩٠٩) جێگرى سەرۆك ماكنلى بوو هەوڵيدا بۆ سەرگرتنى سياسەتى ئەمريكا لەناو وڵاتانى لاتيندا، ناوبژيوانى ڕووسيا و ژاپۆنى كرد بۆ كۆتايى هێنان بە جەنگى نێوانيان، بەستنى پەيمانى ئاشتى (پورتسموس) لە ساڵى (١٩٠٥).

١٢- (وارن هاردنــگ) (١٩٢١- ١٩٢٣) ڕۆژگــارى ســەرۆكايەتى ئەم كەســە بە گەندەڵترين سەردەمى مێژوويى سەرۆكايەتى ئەمريكا دادەنرێت بە هۆى زۆركارى و ڕسواييەوە كە دواتر پەردەيان لەسەر هەڵماڵرا.

١٣-(كالڤن كولدج) (١٩٢٣- ١٩٢٩) كەسێكى سادە و دەستپاك بوو، گەلى ئەمريكا خۆشـيان دەويسـت، باجەكـانى كەمكـردەوە و دژى دەسـتێوەردان بـوو لە كەرتـى پيشەسازى و كشتوكاڵ.

١٤- (هربـرت كـلاك هـوفر) (١٩٢٩- ١٩٣٣) لەم سـەردەمەدا قەيرانـى ئـابوورى جيهانى سەريهەڵدا، لە ئەنجامى مايە پووچى (وۆڵ ستريت) لە نيويۆرك.[1]

١٥-(دوايـت ئايزنهـاوەر) (١٩٥٣- ١٩٦١) پـێش گەيشــتنى بــۆ ســەرۆكايەتى ســەركردەى سـوپاى هاوپەيمانــان بـوو لەجەنگـى دووەمـى جيهانـدا، لە بەرامـبەر هێرشـى سـێ قـۆڵى فەڕەنسـا و بەريتانيـا و ئيسـرائيل بـۆ سـەر مصـر لە (١٩٥٦)دا هەڵوێستى توندى وەرگرت، لە سـاڵى (١٩٥٨) لە چوارچێوەى پڕۆژەى ئايزنهاوەر هێزى دەريايى نارد بۆ لوبنـان، سـەرەتاى قۆنـاغى كرانەوە لەگەڵ يەكێتـى سـۆڤيەت دەستپێكرد.

١٦- (ريچـــــــــارد نيكســـــــــۆن) (١٩٦٩- ١٩٧٤) كێشـــــــــەى ڕيسوابوونى(ۆتەرگێت)گەورەترين ڕووداوى سـەرۆكايەتى بـوو، پەيمـانى كەمكردنـى چەكى كيمياوى (ستراتيژى) (سالت) لەگەڵ يەكێتى سۆڤيەت ئيمزاكرد ساڵى (١٩٧٢)،

---

١ - ديب علي حسن: س-پ،ل ٢٩٢.

لەژێر فشاری دادگای باڵای ئەمریکا بەهۆی (ۆتەرگێت)ەوە کە ئەو دەستی تیابوو وازی لەسەرۆکایەتی هێنا.[1]

١٧- (جیراڵد فۆرد) (١٩٧٤- ١٩٧٦) جێگری نیکسۆن بوو، پاشان بووە سەرۆک و فەرمانی کشانەوەی هێزەکانی ئەمریکای لە ڤێتنام دەرکرد، بە ڕازیبوونی فۆرد و کیسنجەری وەزیری دەرەوەی ئەو کاتە، شۆڕشی کوردی لە ساڵی (١٩٧٥) دامرکایەوە.

١٨- (ڕۆناڵد ڕیگان) (١٩٨٠- ١٩٨٨) بڵاوکردنەوەی موشەکی کرۆز لە ئەوروپای ڕۆژئاوا دژی یەکێتی سۆڤیەت، پرۆژەی دەستپێشخەری جەنگی ئەستێرەکان.

١٩- (جۆرج بۆش) (١٩٨٨- ١٩٩٢) داڕشتنی ستراتیژی نوێی سەربازی لەگەڵ ڕاگەیاندنی ستراتیژی ناوچەیی لەلایەن ناوبراوە وە بنەمایەکی پتەوی دامەزراند، بەڵام گەلێک ڕەخنەی ئاڕاستە کران ئەو ڕەخنانە ئەوەیان دەرخست بە هیچ جۆرێک ناکرێ بە چارەسەرێکی هەمیشەیی لە قەڵەم بدرێ، ئازادکردنی کوێت لە هێرشی داگیرکاری عێراق (١٩٩١)، هەڵوەشاندنەوەی هاوپەیمانی (وارشۆ) و یەکێتی سۆڤیەت (١٩٩١) مسۆگەر کردنی ناوچەی ئارام بۆ کوردستانی عێراق لە بەهاری (١٩٩١)، دوا سەرۆکی ئەم پارتە.

٢٠- (جۆرج W بۆش) (٢٠٠٠- ٢٠٠٨)ە، ڕووداوەکانی (١١)ی سێبتمبەری (٢٠٠١) و ڕاگەیاندنی شەڕ لە دژی ڕێکخراوی (القاعدە) و ئەفغانستان و پرۆسەی ئازادی عێراق و ڕوخاندنی دیکتاتۆریەتی (سەدام حوسێن) لە ساڵی (٢٠٠٣).

٢١- (دونالد ترامپ) (٢٠١٧ –٢٠٢١) لە ساڵی ١٩٤٦ لە ئەمریکا لە دایک بووە (٤٥) چل و پێنج مین سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە لە پارتی کۆماری، جگە لەوەی ملیاردێرە، بەڵام ئامانجی بەهێز کردنی ئەمریکایە لە سیاسەتەکانی دەرەوەی بە زیادکردنی بودجە و خەرجیە سەربازییەکانی ئەمریکا و شانازی بەوە دەکات لە ڕێکخراوی داعشی لە ناو بردوە و لە ساڵی (٢٠١٩) لە سەر دەستی ئەم سەرۆکە گۆرانکاری گەورە ڕوودەدات و بە تایبەتی دوای سەردانەکەی بۆ عیراق و زیادکردنی ژمارەی سەربازەکانی لە ڕومادی و کەرکوک ئەمەش بۆ خۆی ئاماژەیەکی روونە لە سیاسەتی دەرەوەی ترامپ.

---

١ - الان بالمر: س-پ،ل ٣٥٦.

## جەنگی نێوان ئەمریکا و بەریتانیا (١٨١٢ز)

پەیوەندییەکانی ئەمریکا بە بەریتانیاوە لە خراپەوە بۆ خراپتر دەچوو بەهۆی هەندێک رووداوی دەست درێژی کردنە سەر کەشتیە ئەمریکیەکان، لەوانە کەشتیەکی بەریتانی لە ساڵی (١٨٠٧) داوای لە کەشتیەکی سەربازی ئەمریکی کرد، هەندێک لە کەشتیوانە هەڵاتووەکانی بەریتانی رادەست بکاتەوە کاتێ ئەمریکیەکان داواکەیان ڕەتکردەوە، بەریتانیەکان هێرشیان کردەسەر کەشتیە ئەمریکیەکە و ناچاریان کردن خۆیان رادەست بکەن، بەمەش کەشتیوانە بەریتانیەکان سەرکەوتن بۆ ناو کەشتییەکە دوای ئەوەی سەرووی کەشتیەکەیان بەخوێن سوورکرد، ئینجا سێ کەشتیوانی ئەمریکی و یەکێ لە کەشتیوانە بەریتانیە ڕاکردووەکان دەستگیرکران، لەهەمان کاتدا هەندێک لە هۆزە هندیەکان هێرشیان کردە سەر ناوچەکانی باکووری ڕۆژئاوای ویلایەتەکانی ئەمریکا.[١]

ئەمریکیەکان بڕوایان وابوو هەندێک لە ئینگلیزەکان هانی ئەم هۆزانەیان داوە تا هێرش بکەنە سەر ئەمریکیەکان، ئەمەش بویە هۆی زیاتر دوورخستنەوەی ئەمریکیەکان لە ئینگلیزەکان و بووە هۆی لێکتێنەگەیشتن و لە ساڵی (١٨١٢) جەنگ ڕاگەیاندرا دژی بەریتانیا، ئەم جەنگە لە سەردەمی سەرۆکایەتی مادیسۆندا بوو.[٢]

هەندێک لە مێژوونووسە ئەمریکیەکان وای بۆ دەچن کە جەنگی ساڵی (١٨١٢) هەڵەیەکی گەورە بوو و هیچ پاساوێکی نیە لەبەر چەند هۆکارێک، لەوانە ئەنجومەنی پادشایەتی تایبەتی بەریتانیا پێش ڕاگەیاندنی جەنگ بە دوو ڕۆژ ئەو بڕیارەی خۆی هەڵوەشاندەوە کە بریتی بوو لە ڕێگریکردن لە بازرگانی ئەمریکی و سەرپشک کردنی کەشتیوانی بەریتانیەکان بۆ پشکنینی کەشتیە ئەمریکیەکان و گەڕاندنەوەی کەشتیوانە هەڵاتووەکان، بەڵام ئەم هەواڵە ڕاگەیانرا بوو بە ئەمریکا، ئەم جەنگەیان بەو شێوەیە نە دەبینی ئەوەندە کێشەیەکی گەورە بێت کە بە ڕێگە چارەی دیپلۆماسی چارەسەر نەکرێت، هەروەها ئەم جەنگە داواکاری گەلی ئەمریکی نەبوو و هەندێک لە ویلایەتەکانی باشوور و ڕۆژئاوا حەزیان لەم جەنگە نەدەکرد، چونکە بەرژەوەندییەکانی دەخستە مەترسیەوە،[٣] یەکێ لە هەڵەکانی تری جەنگیش ئامادە نەبوونی سوپای ئەمریکی بوو بەهۆی خراپی باری ئابووری لە بوجەدا هەروەها

---

١- فرحات زيادة و ابراهيم فريجي: تاريخ الشعب الأمريكي،ص ١٠٥.

٢- ستيفن فنسنت بنيه: امريكا، ص٩١.

٣- فرحات زيادة و ابراهيم فريجي: س- پ، ل ١٠٥.

کەمی سەرباز کە ژمارەیان نزیکەی (٧) حەوت هەزار دەبوو و خراپی ڕێکخستنیان، سەرەڕای ئەمەش ئەم جەنگە بەدوای خۆیدا کێشەیەکی دارایی لە وڵاتدا بەرپاکرد کە ڕێگری کرد لە بەردەم کۆنگرێسدا لە ساڵی ئایندەدا نەتوانێت بودجەی وڵات دەست نیشان بکات، بودجەی وڵات بە شێوەیەکی هەست پێکراو دابەزی.[1]

هەڵمەتە سەربازیە ئەمریکیەکان لەم جەنگەدا سەرکەوتوو نەبوون کاتێ ویستیان کەنەدا بگرن، بە تێکشکاوی گەڕانەوە، ئەو کارەی کە توانیان لەم ڕووەوە بیکەن، ئەمریکیەکان توانیان بەرپەرچی هێرشەکانی بەریتانیا بدەنەوە لە ویلایەتی (نیویۆرک) و سوپای بەریتانی نزیکەی (٥) هەزار جەنگاوەریان لە نزیک شاری واشنتن دابەزاند و ڕووبەڕووی ژمارەیەکی زۆری ئەمریکیەکان بوونەوە، بەڵام پێش ئەوەی شەڕەکە دەست پێ بکات ئەمریکیەکان گەڕانەوە بۆ واشنتۆن، سوپای بەریتانی دوایان کەوت و چوونە ناو شارەکەوە و ئاگریان بەردا لە کۆشکەکانی حکومەت و کۆشکی سپی و لەکارخستنی جموجۆڵی بازرگانی، بەڵام تەنکی ئاوی کەناری دەریا ڕێگر بوو لە بەردەم بەرەوپێشەوە چوونی پاپۆڕە بەریتانیەکان ڕووەو قەڵای (ماکنری) کە هێزێکی پاراستنی ئەمریکی تیادا بوو کە نەیدەهێشت هێزی سەربازی بەریتانی بەرەوپێش بچێت بۆ (بلتیمۆر)،[2] ئاڵای ئەمریکی شەکاوە بوو لەسەر ئەو قەڵایە، لەوکاتەدا گەنجێکی ئەمریکی کە ناوی (فرنسیس سکوت) بوو، لەسەر پشتی پاپۆڕێکی بەریتانی ئەم ئاڵایەی ئەمریکی بینی لەگەڵ شەماڵی بەیانیدا دەشەکایەوە (کاتێک کە ناردبوویان بۆ کاری گۆڕینەوەی دیلەکان لە نێوان ئینگلیزەکان و ئەمریکیەکاندا) هەستی جووڵا لەم کاتەدا شعرێکی کاریگەری بۆ هات و لە پاشدا کرا بە سروودی نیشتمانی ئەمریکا، ناونیشانی سروودەکە (ستار سپانغلیرباتر) واتە (ئاڵای درەوشاوە بە ئەستێرە) بوو، بەڵام کەشتیگەلی ئەمریکی لەگەڵ ئەوەی کە ژمارەی کەم بوو کەچی توانی ئازایەتی ڕۆڵەکانی بنوێنێت و بە تواناییان دەرخات لە هونەری شەڕدا، لە چەند شەڕێکدا توانیان بەسەر پاپۆڕە جەنگیە ئینگلیزەکاندا سەرکەون و (٣٠٠) پاپۆڕی بازرگانیش بەدیل بگرن، بەڵام گەورەی کەشتیگەلی بەریتانی بە زۆری بەشەکانیەوە توانای ئەوەی پێدابوو کە

---

١- د. طليعة الصياح و راغب العلي: تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية،ج١/ ص ٩٦.

٢- محمد محمود النيرب: المدخل في تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية،ص١٥٢.

هەموو بەندەرەکانی ئەمریکا گەمارۆ بدات، بەم شێوە بازرگانی دەرەکی لە وڵاتدا شکستی خوارد.[1]

ئەوەی نامۆ بوو لە پەیمانی (گنت)ی کانووی یەکەم (١٨١٤) کەبینرا بڕیاری کۆتایی هێنانی جەنگدرا، بەڵام باس لەو هۆکارانە نەکرا کە بووە هۆی هەڵگیرسانی ئەم جەنگە وەک مەسەلەی فڕاندنی دەریاوانەکان و مەسەلەی بێ لایەنی ئەمریکا لە کاتی جەنگدا (مەبەست جەنگی فەرەنسا و بەریتانیایە)، دوای تێپەڕبوونی دوو ڕۆژ بەسەر ئیمزاکردنی پەیماننامەیەکدا پاڵەوان (اندروجاکسۆن) توانی سەرکردایەتی سوپایەکی گەورە بکات و لە نزیک (نیواورلینز) دەست بگرێت بەسەر هێزێکی ئینگلیزی گەورەدا، (لەبەرئەوەی هەواڵی پەیمان بەستنەکە هێشتا نەگەیشتبووە ئەمریکییەکان)، ئەم سەرکەوتنە خۆشی خستە ناو ڕیزی ئەمریکیەکانەوە، بەم کارە جاکسون بووە پاڵەوانێکی ناودار و بەهۆی ئەم کارو گیان فیداکارییەوە کە نیشانیدا بووە (٧)حەوتەمین سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکان.[2]

## بارودۆخی ئەمریکا لە پاش جەنگ

جیفرسۆن گۆڕانکارییەکی گرنگی نەکرد لەو سیاسەتەی فیدراڵیەکان پەیڕەویان دەکرد یاخود لەو دامەزراوانەی دروستیان کردبوو، سەرباری ئەوەی بەرەنگاری کردەوەکانیان دەکرد، داوای مافی هەر ویلایەتێکی دەکرد بەتەنیا، ئەمە ڕاستی قسەکەی (هاملتۆن)دەردەخات کە دەیوت: (جیفرسۆن شۆڕشگێڕە)، پوختەی ئەو کارانەی (جیفرسۆن)کردنی بویە هۆی زیادبوونی دەسەڵاتی دەوڵەتی فیدراڵی نەوەک لابردنی گۆڕانکاری تێیدا.[3]

کارەکانی تەنها گونجاندنێک بوون لەگەڵ پێداویستەکانی سەردەمدا، چونکە ئەو گیانەی کە لە هەستی نەتەوەییدا سەریهەڵدا بوو تەنها لە بیری خەڵکدا گەمارۆ نەدرابوو، بەڵکو کاریگەری کردە سەر کارەکانی دەوڵەت، هەر لەم کردەوانەیەوە کاتێک فەرەنسا لە ساڵی (١٨٠٠) هەرێمی (لویزانا)ی لە ئیسپانیا بردەوە بەپێی

١- فرحات زيادة و ابراهيم فريجي: تاريخ الشعب الأمريكي،ص ١٠٦.
٢- د.عبدالعزيز سليمان و د.عبدالمجيد نعنعي:تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية الحديث،ص١٠٦-١٠٧.
٣- بدون مؤلف:موجز التاريخ الأمريكي،ص ٥٢.

ڕێکەوتننـامەیەکی نهێنـی، لەوکـاتەدا جیفرسـۆن بانگەشـەی دەکـرد بـۆ لکانـدنی ئەو هەرێمە بە موڵکەکانی ئەمریکاوە ئەمەش لەبەر دوو هۆکار:

١. لەبەرئەوەی پەلهاویشتنی بەرەو ڕۆژئاوا بە کارێکی باش و ئاسایی دائەنا بۆ پێشکەوتنی گەلی ئەمریکی.

٢. لەبەرئەوەی دەترسا لە بوونی فەڕەنسا لە سنوورەکانی ئەمریکادا و لەهەمـان کاتدا فەڕەنسـا هێزێکی زۆری هەبـوو، ئەمەش مەترسـی دەسـت درێژی کردنی لـێ دەکرا.[١]

جێی ئاماژەیە جیفرسۆن ئەم کارەی دەکرد لەگەڵ ئەوەشدا کە دەستوور ڕێگەی نەئەدا بە سەرۆک زەوی بێگانە بکڕێت و وبیلکێنێت بە ویـلایەتە یەکگرتووەکانەوە، ڕێـگەی نەئەدا ئەو مافـانەی کە دانیشـتوانی نـاوچە ئەمریکیەکـان هەیـانە بـدرێت بەخەڵکی ناوچە نوێیەکان، ئەوەی زیـاتر جێی سەرسـوڕمان بـوو (جیفرسـۆن) دوای ئەوەی بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە پەیوەست بن بە دەسەڵاتی دەوڵەتـی فیدراڵیەوە و داوای دەکرد هیچ کەسێک لە دەستوور لانەدات، بەڵام دەسەڵاتێکی (جیفرسۆن)بۆ ئەوەی خۆی (ئەمریکا) لە شەڕ دوورخاتەوە یاسایەکی نوێی بە کۆنگرێس دەرکـرد، لە سـاڵی (١٨٠٧) کە بازرگـانی دەرەوەی بە تەواوی نەهێشـت، ئەمـیش پـێش هـاتنی ئەو کارە بوو کە ئەمریکا دەیویست خۆی لە دەوروبەر دابڕێت، ئەم یاسایەش بووە هـۆی ئەوەی نـاڕەزاییەکی زۆر لەلایەن چینـی بازرگـان و خـاوەن بارەکـانەوە دەربېڕێـت، بەدوای ئەمانیشـدا جووتیارەکـانیش ناڕەزاییـان دەربـڕی، چـونکە بـووە هۆی ڕێگرتن لە فرۆشتنی بەروبوومەکانیان.[٢]

بەڵام یاسای ساڵی (١٨٠٧) هەڵوەشێنرایەوە و لە جێگەی ئەوە یاسایەکی تر دانرا لە سـاڵی (١٨٠٩) کە ڕێـگەی ئەدا بەوەی ئەمریکیەکـان بازرگـانی بـکەن لەگەڵ سەرجەم وڵاتە بێگانەکاندا جگە لە فەڕەنسـا و بەریتانیـا. لە نـاوەڕۆکی ئەو یاسـایەدا بـڕگەیەک هەیە ڕێـگە ئەدات بە بازرگـانی لەگەڵ هەریەک لەو دوو وڵاتە بە شـەڕ هاتووە بەمەرجێک دەسـت درێژی نەکەنە سـەر کەشتیە ئەمریکیەکان، نـاپلیۆن بەم بڕیارە ڕازی بوو و بەڵێنی پێدان، بەڵام بەریتانیا هەروەک خۆی مـایەوە، هەرچەنـدە

---

١- فرنسيس فريدمان:موجز التاريخ الأمريكي،ص٧٦-٧٧.

٢- د.عبدالعزيز سليمان و د.عبدالمجيد نعنعي:تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية الحديث،ص٩٢.

زۆر لە بارەی جەنگ و خراپەکاریەکانیەوە دەوترێ، بەڵام هەر ئەم جەنگە پاڵشتێکی بەهێزی بنەمای یەکێتی نەتەوەیی بوو، دیمەنێک بوو لە دیمەنەکانی سەربەرزی نەتەوەی، پێگەی ئەمریکیەکانی بەرز کردەوە لەلای بەریتانیەکان و گیانی نەتەوەی لەناو ئەمریکیەکاندا وشیارکردەوە.[1]

سەرکردەکانی وڵات لە سەردەمی سەرۆکایەتی واشنتنی دووەمەوە کاریگەر بوون بە بیری سیاسی ئەوروپیەکان، مەیلی یەکێ لە حزبەکان بەلای فەرەنسادا بوو و ئەوی تریان بەلای ئینگلیزدا، بەڵام ئێستا پیاوانی هەردوولا و باشکردنی باری ئابووری، هەروەها خۆدزینەوە لەو ڕووداوانەی لە دەرەوەی سنوورەکانیاندا ڕووی دەدا، چونکە شەڕ و گەمارۆ و بچڕانی پەیوەندی بازرگانی ئابووری وڵات تووشی ئیفلیجی کردبوو، بۆیە پێویست بوو ببوژێنرێتەوە، هەر شەڕیش بوو پێویستی کرد لەسەر ئەمریکیەکان کە پارەیەکی نوێ دەربکەن و هێزێکی گەورە و بنکەی بەرگری بە توانا دروست بکەن، جیاوازەکانی پێ بپارێزن، ڕێگەی هاتوچۆ دروست بکرێت تاکو بەشە جیاوازەکانی وڵات پێکەوە ببەستێت کە دەبێتە هۆی پتەوبوونی ویلایەتە یەکگرتووەکان.[2]

یەکێکی تر لە کاردانەوەکانی ئەم شەڕە بەرەنگاربوونەوەی ئەو مەترسیانە بوو کە لە ئەنجامی ناکۆکیە ناوخۆییەکانیدا دروست دەبوو کە ئەگەر بهاتایە و بەردەوام بوایە دەبووە ڕێگرێک لە یەکگرتنی ویلایەتەکاندا، کاتێ داوای کۆت بەندی دەسەڵاتی حکومەتی فیدراڵی دەکرد گرانی جێ بەجێکردنی پلانەکەی (جیفرسۆن) دەرکەوت، لەهەمان کاتدا داوای دیموکراتیەکی سەربەستی وای دەکرد کە لە دەسەڵاتی نەتەوەییەکان بەدەربێت، دەرکەوت لێپرسراوەکانی دەیانەوێت ئەو بیردۆزیە پەیڕەو بکەن، وایان لێهات واز لە هەموو ئەو بیروباوەڕانە بهێنن کە لە دەسەڵاتی دەوڵەت کەم دەکەنەوە، لەبەر ئەمە لە بەڕێوەبردنی وڵاتدا، کردەوەکانی فیدراڵیەکانیان پەیڕەو دەکرد هەروەک فیدراڵیەکان دەرکەوتن، چونکە ڕووداوەکان ئەوەیان سەلماند ئەگەرچی حکومەتەکە لە پارتی فیدراڵی بێت یان کۆمارییەکان گەشەکردنی وڵات پێویستی بە دەوڵەتێکی فیدراڵی بەهێز هەیە بۆ دەرخستنی دەست

---

١- د.عبد العزيز سليمان نوار واخرون: تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية، ص ٩٤.

٢- فرحات زيادة و ابراهيم فريجي: س- پ، ل ١٠٨.

بەسەراگرتنی (لویزیانا) و شەڕکردن لەگەڵ خانەدانەکانی ڕۆژئاوا (المغرب) و بازرگانی نەکردن لەگەڵ بەریتانیا و فەڕەنسا و شەڕکردن لەگەڵ بەریتانیا بەسە.[1]

ئەم هەستە نەتەوەییە نوێیە وای لە کۆنگرێس کرد بانکی نەتەوەیی بونیاد بنێت و پیشەسازی نەتەوەیی هانبدات و گومرگی خرایەسەر ئەو شمەک و کاڵایانەی لە دەرەوە دەهاتن تا پیشەسازی نیشتمانی بپارێزرێ، هێزێکی سەربازی (١٠) هەزار کەسی و چەندین کەشتی جەنگی بونیادنا بۆ پاراستنی کەناراوەکان، کاری گرنگ دانانی ئەو یاسایانە بوو کە دەبویە هۆی پێشکەوتنی بەروبووم و سامان لە وڵاتدا. دابینکردنی هێمنی و ئاسایش و پاراستنی.[2]

لەو هۆکارانەی کە بۆ یەکگرتنی نەتەوەیی پێویست بوون چەند بڕیارێک بوون کە دادگای باڵا دەریکردن، هەرچەندە ئەم دادگایە تا ساڵی (١٨١٥) هیچ سەنگێکی ئەوتۆی نەبوو، بەڵام لە پاش ئەم ساڵە پێگەی ئەم دادگایە بەرزبوویەوە و بڕیارەکانی بە پیرۆز دادەنرا، هەروەها ئەندام بوونی لە حکومەتی فیدراڵیدا گرنگیەکی تایبەتی هەبوو، لەپاش ئەوەی جان مارشال کە (دادوەری دادوەران) بوو چەند بڕیارێکی دەرکرد بووە هۆی گرنگیدان بە دەستوور و پاراستنی دەستوور، لەو بڕیارانەش:

١. دادگای باڵا توانای چاوخشاندنەوەی بە هەر کێشەیەک هەیە کە لە دادگای ویلایەتەکاندا هەبێت، کاتێک ئەو دادوەرە خراپەی هەبێت بۆ دەستووری ویلایەتە یەکگرتووەکان یاخود بڕیارەکانی.

٢. توانای چاوخشاندنەوەی هەیە لە بڕیارەکانی ویلایەتەکاندا و دەتوانێت هەڵیان بوەشێنێتەوە گەرهاتوو گونجا و نەبوون لەگەڵ دەستوور و یاسا گشتیەکاندا، هەروەها توانای چاو خشاندنەوەی هەیە بەو بڕیارەکانی کە کۆنگرێس دەری دەکات.

٣. حکومەتی فیدراڵی هەندێک دەسەڵاتی هەیە کە لەدەستوور دانیە یاخود ئاماژەی پێکراوە بەشێوەی ناڕاستەوخۆ، ئەم دەسەڵاتانە بەکارێکی یاسایی دادەنرێت.

---

١- تشارلز و ماری بيرد: تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية،ج١/ص ٢٠٤.

٢- محمد محمود النيرب: س- پ، ج١/ل ١٥٤.

هەروەهـا حکـومەتی فیـدراڵی هەنـدێ دەسـەڵاتی وەرگـرت کە بەهـۆیەوە تـوانی سیستەمەکانی وڵات یەکبخات، ئەم دیمەنەش دیمەنێکی نەتەوەیی بوو کە دەسـەڵاتی جێ بەجێکرد و دەسـەڵاتی یاسـادانان و لە پاشـاندا دەسـەڵاتی (دادوەری) گـرتەوە (مەبەسـت ئەوەیە سـەرجەم ئەو دەسـتانەی یەکخـران لە نـاوچە جیاوازەکانـدا هەبوون).[1]

## بنەمای مۆنرۆ (مبدأ مونرو)

بنەمـای مـۆنرۆ بنەمـایەکی نەتەوەیـی بـوو کە پـارتی کۆماریەکـان (الجمهـوری) کـاری پێدەکرد و بەهـۆیەوە بـوویە خـاوەنی عەقڵـی خەڵـک، ئەمەش لە هەڵبژاردنـی سـاڵی (١٨١٦)دا دەرکەوت کاتێک پاڵێوراوی کۆماریەکـان (جـایمس مـونرو) بـوو بە سەرۆک. مۆنرۆ کەسێکی بەتوانا و بەهێز نەبوو، بەڵام نیشتمان پەروەرێکی دڵسۆز بوو و هەروەها لە قسەکانیدا سەربەست و قسە لەڕوو بوو و هۆکاری سـەرکەوتنی بەسەر فیدراڵیەکانیدا ناگەڕێتەوە بۆ کەسایەتی خۆی، بەڵکو بۆ چالاکی و گەشـەی حـزبەکەی دەگەڕێـتەوە کە بەرەوپـێش چووبـوون، بەڵام فیـدراڵیەکان هەنـدێک نەخشـەیان پەیـڕەو دەکـرد کە لەگەڵ بیروبۆچـوونی بـاوی نـاو خەڵکـدا دژ بەیەک بـوون، لەوانە فیـدراڵیەکان دژایەتـی بەرهەڵسـتی کـڕینـی (لویزیانا)یـان کـرد کە مەبەسـت لێـی فـراوان خـوازی بـوو بەرەو ڕۆژئـاوا، و بەرگرییەکـی زۆری جەنگی سـاڵی (١٨١٢) یـان کـرد تـا ئەنـدازەیەک کە ویلایەتەکـانی باشـوور هەڕەشـەی جیابوونەوەیان دەکرد لە یەکێتی ئەمریکا.[2]

کاتێ مونرۆ هەڵبژێرا بۆ جاری دووەم ساڵی (١٨٢٠) خەریک بوو بەکۆی دەنگ هەڵبژێرێت، بەڵام تەنها یەک کەس دەنگی پێ نەدا بە بیانووی ئەوەی کە کۆی دەنگ تەنها بۆ (جۆرج واشنتن)دەبێت بمێنێتەوە، لە ماوەی سەرۆکایەتی دووەمی مۆنرۆدا حکومەتی ئەمریکی بیردۆزەیەکی نـوێی دانـا کە پێـی دەوترێت بنەمـای مـۆنرۆ و کـاریگەری گرنگـی هەبـوو لەسـەر سیاسـەتی دەرەوەی ئەمریکـا، ئەم بنەمـایە لەو

---

١- فرحات زيادة و ابراهيم فريجي: تاريخ الشعب الأمريكي،ص ١٠٩.

٢- بكر احمد يعقوب: ظهور امريكا كقوة عظمى ودوروها في بلدان شرق المتوسط،مطبعة شهاب،الطبعة الاولى، اربيل،٢٠٠٨،ص٥٦.

بەیاننـامە سـاڵانەدا هەبـوو کە مـۆنرۆ لە سـاڵی (١٨٢٣) ئاراسـتەی کۆنگرێسـی کردبوو.[1]

ئەم بنەمایە دوو بیروبۆچوونی لەخۆ گرتبوو

**یەکەم:** نەهێشتنی داگیرکردن لە نیوەی ڕۆژئاوای گۆی زەوی (دیارە مەبەست ئەمریکای لاتینە) لەلایەن وڵاتە ئەوروپیەکانەوە.

**دووەم:** ڕێگرتن لە وڵاتە ئەوروپیەکـان لە دەسـتێوەردان لە کاروبـاری نـاوخۆی وڵاتە تازەکان و هەڕەشەکردن لە سەربەخۆییان، هەورەها ئەمریکاش لە کاروباری تایبەتی وڵاتە ئەوروپیەکان خۆی بەدوور بگرێت. گەشەکردنی ئەم دوو بیرە شتێکی لەناکـاو و نـوێ نەبـوو، بەڵکـو لە مێژەوە لە بیـری ئەمریکیەکانـدا بـوونی هەبـوو، دەتـوانین ئەم بیروبـاوەڕە لەوەدا ببینـین کـاتێ (جیفرسـۆن) نـاڕەزایی دەربـڕی بەرامـبەر بە گواسـتنەوەی خاوەنـداریەتی (لویزیانـا) لە ئیسـپانیاوە بـۆ هەر وڵاتێک جگە لەئەمریکـا جگە لەوەش لەسـاڵی (١٨١٩) فلۆریـدای وەرگـرت لەئیسـپانیا پێش ئەوەی هەر وولاتێکی تر داوای ئەم شوێنە بکات.[2]

بەڵام بیروبۆچـوونی دووەم بیرێکـی دابـڕا و نـامۆ بـوون بـوو، ئەتـوانین تێبینـی شـوێنەواری ئەم بیرە لەدوا وتـاری (جۆرج واشـنتندا) بکەیـن لەکاتێکدا نزیـک بـوو لەوەی سـەرۆکایەتی بەجـێ دەهێنێـت، نەتەوەکەی ئاگـادار کـردەوە لە دەسـت تێـوەردانی کاروبـاری وڵاتە بیانیەکـان و هاوپەیمـانی لەگەڵیانـدا، چـونکە ئەمە پەلکێشـیان دەکات بـۆ شـەڕ و ئاژاوە، دوا بەدوای ئەمیش (جیفرسۆن)خەڵکی لەمە ئاگادارکردەوە و تائێستاش ئەم هەستە هەر ماوە.[3]

لە جەنگی جیهـانی یەکەمـدا ئەمریکیەکـان بەو وڵاتـانەی لەگەڵیـدا دژ بە ئەڵمانیـا دەجەنگـان پێیـان وت (شـەریک) نەک (هاوپەیمـان) ئەمەش لەگەڵ ئەو بیروبۆچـوونە ڕێـک دەهـاتەوە کە لە بنەمـای مـۆنرۆدا باسـکرابوو، ئەم بیـری دەسـت تێـوەردانە هۆکـارێکی تـریش کـاری لێکرد کە بریتی بوو لە بڕی مـافی چـارەنووس کە گەلـی ئەمریکـی لەگەڵ گەلە ئەمریکیەکـانی تـری ژێردەسـتی ئیسـپانیا کاتێـک داوای

---

١- د.صلاح احمد هريدي: دراسات في التاريخ الأمريكي، ص١٠٧.

٢- د.ئاراس فەريق زەينەل: ئۆباما و پرسە هەستيارەكان،ل٤٧-٤٨.

٣- محمد محمود النيرب: المدخل في تاريخ الولايات، ج١/ص١٦٨.

ســـەربەخۆیان دەکـرد، ئەم هەوڵەی داگیرگەکانیــان بە بەشــێک لە بــزووتنەوەی دیموکراتی دادەنا کە دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی دەسەڵاتی داگیرکەران.[1]

بۆ دەرکەوتنی ئەم بیرە (بیری دەست تێوەرنەدان) و پەیڕەوکردنی بە شێوازێکی ئاشکرا لە بیری مۆنرۆدا، چەسپاندنی لە بیری ئەمریکیەکاندا کاتێکی زۆری ویست، هۆکـاری سەرهەڵدانیشــی زۆربــوو، لەوانە روســیا هەســتا بە داواکردنــی زەویە داڕێژکراوەکانی باشووری ئالاسکا هەتا هێڵی پانی (٥١)، ئەمە لە کاتێکدا ویلایەتە یەکگرتووەکان بانگەشەی ئەوەی دەکرد ئەم ناوچانە موڵکی خۆیەتی و وای دەبینی لە بەرژەوەندی ئەمریکایە و هەڵوێستی بەرامبەر ئەم کێشەیە بە ئاشکرا و بەبێ پێچ و پەنـا دەربڕێـت، ئەو هەڵوێسـتەش ڕازی نەبـوون بـوو بە هەرداگیرکردنێک کە لە جیهانی نوێدا ڕوویدات لەلایەن هەر وڵاتێکی ئەوروپییەوە، هۆکـارێکی تـری ئەم بیرە دەگەڕێتەوە بۆ سەربەخۆ بوونی ویلایەتەکانی ئەمریکـای باشـوور لە سـاڵی (١٨٢٢) کە بە تێکۆشـانێکی زۆر دژی ئیسـپانیا بەدەسـتیان هێنـابوو، پاشـان درێژبـوونەوەی ئەم تێکۆشـانە لە ئەمریکـای ناوەڕاسـت و مەکسـیک کـارێکی وای کـرد کە هـیچ لە دەستی ئیسپانیادا نەمـا جگە لە (پورتوریکو و کوبـا) ئەمریکیەکـان پێشـوازیان لەم بارودۆخە نوێیەی ئەمریکای باشوور کرد و پێیان وابوو گەڵنـی ئەمریکـای ئیسـپانی لە هەوڵـدان بـۆ بەدەسـتهێنانی ئـازادی و ســەربەخۆیی هەمــان ڕێبــازی ئەمانیــان گرتووە.[2]

هەندێک لە بیرمەندە ئەمریکیەکان وایان دەبینی ئەم کۆمـارە نوێیـانە لە جیهـانی نوێـدا شـێوازێکی برایـانە لە نێوانیانـدا هەیە لە بـاوەڕبوون بە ئـازادی و پەیوەنـدیە ئابوورییەکـان، بـۆیە دەیانویست پارێزگـاری لە سـەربەخۆیی ئەو کۆمـارانە بـکەن، هەرکارێـک دەبــویە هــۆی تێکـدانی هاوکـاری نێـوان ئەم کۆمــارانە و ویــلایەتە یەکگرتووەکان دووری بخەنەوە.[3]

بەڵام هەندێک لە وڵاتە ئەوروپییەکان کە دەترسان لە بڵاوبوونەوەی دیموکراتی و گیانی شۆڕشگێڕی لە نێو میللەتەکەیاندا، کە دەبویە هۆی لە دەستدانی دەسـەڵاتی پادشــاکان، ئەم وڵاتــانە وایــان دەبینــی پێویســتە هێزەکانیــان یەک بــخەن بــۆ

---

١- لاری الوتیز: نظام الحکم في الولایات المتحدة الأمریکیة، ص٣٧٢.

٢- د.عبد العزیز سلیمان ود.محمود محمد: تاریخ الولایات المتحدة الأمریکیة، ص ١٠٠.

٣- تشارلز و ماری بیرد: س- پ، ج١/ل ٢١٠.

بەرەنگاربوونەوەی ئەم شۆڕشانە لەهەر شوێنێک سەرهەڵبدات، بۆ ئەم مەبەستە هاوپەیمانیەتیەک پێکهات لە (ڕوسیا ، پروسیا و نەمسا) کە ناسرا بە هاوپەیمانی پیرۆز و پاش گەڕانەوەی بنەماڵەی بوربۆن بۆ دەسەلات فەڕەنساش هاتە ناو ئەم هاوپەیمانیەتیەوە.[1]

سەرەتای کارەکانیان ڕێگەپێدانی نەمسا بوو بۆ سەرکوت کردن و لە ناوبردنی بزووتنەوە دیموکراتیەکان کە لە دوو دەوڵەتی ئیتالیا (ناپۆلی و پیدمونت) سەریان هەڵدابوو، لە ساڵی (١٨٢٢) هاوپەیمانەکان کردەوەکانی کۆمارەکانی ئەمریکیەکان تاوتوێ کرد و باسی چۆنیەتی گەڕانەوەیان کرد بۆ ژێردەستی ئیسپانیا، ئینگلتەرا ترسا لەم کردەوەیەی وڵاتە هاوپەیمانەکان، چونکە بە هەڕەشەیەکی دەزانی بۆسەر ئەو پەیوەندیە بازرگانیەی کە لەگەڵ کۆمارەکانی ئەمریکای باشووردا هەی بوو، لەبەر ئەم هۆیە وەزیری دەرەوەی ئینگلتەرا (جۆرج کانیگ) وای دەبینی پێویستە بە بەشداری کردن لەگەڵ حکومەتی ئەمریکادا بەیانێک دەربکەن تێیدا دژی هەر دەست تێوەردانێک یان داگیرکردنێکی نوێ لە ئەمریکای ئیسپانیدا بوەستنەوە.[2]

بەڵام حکومەتی ئەمریکی ئەو کارانەی بە ئەنجامی گەیاند لەم ڕێگەیەدا (بنەکەی دەست تێوەرنەدان) بە تەنها ئەنجامیدا، لەو کردەوانەی کە سەریهەڵدا لە بنەمای مۆنرۆدا و پەیوەست بوو بە بڕیارەکانی ئەمریکاوە وتبووی (پێویستە لە ئێستا بەدواوە وا دانەنرێت "مەبەست ئەمریکای لاتینە" ببێتە جێگەیەک بۆ داگیرکردن لەلایەن هەر وڵاتێکی ئەوروپیەوە)، ویلایەتە یەکگرتووەکان وای دادەنا هەر دەست تێوەردانێک لەلایەن ئەم دەوڵەتانەوە لە کاروباری ویلایەتەکانی ئەمریکای لاتین و فشار خستنەسەریان بە خراپی بەسەر خۆیاندا دەشکێتەوە، بەم شێوەیە دەبینین گیانی کەنارگیری لە ئەمریکادا بە شێوازێکی ڕوون دەرکەوت و کاریگەری لەسەر سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا جێهێشت کە لە دوای جەنگی جیهانی یەکەم دەرکەوت و ئەوەی بەرپەرچ دایەوە لە کۆمەڵەی گەڵندا (عصبە الأمم) بەشداربێت و کێشە نێودەوڵەتیەکانی وەلانا.[3]

---

١- فرحات زيادة و ابراهيم فريجي: س- پ، ل ١١١.

٢- د.صلاح احمد هريدي: دراسات في التاريخ الأمريكي، ص١٠٨.

٣- د.رأفت غنيمى الشيخ: امريكا والعالم، ص ٩٣.

## سەرهەڵدانی سیاسەتی کەنارگیری

بنەمـــای مـــۆنرۆ ڕێبـــازێکی سیاســـەتی دەرەوەی ئەمریکـــایە نـــاوی بنەمـــاکە ـەگەڕێتەوە بـۆ داهێنـەرەکەی، کە (جـیمس مـۆنرۆ)ی پێنجەمـین سـەرۆک کۆمـاری ـەمریکایە، ناوەڕۆکی بنەماکە بریتی بوو لە ڕەتکردنەوەی هەر دەست درێژییەک بۆ ـو کاروباری سیاسی ئەمریکا، لەلایەن وڵاتە ئەوروپییەکانەوە.

(جۆرج کانیگ) پێشنیاری دەرکردنی بەیانێکی کرد، لە نامەیەکدا ڕوونـی کـردەوە ـهەردوو کیشوەری ئەمریکا ئەوەی بە دەستمان هێناوە لە ئازادی و سەربەخۆی لە ـاهاتوودا نابنە ڕۆژ و جێگەی هێرش و داگیرکاری نوێ یان داگیرگە لەداهـاتوودا ـەلایەن دەوڵەتـانی ئەوروپـیەوە)، نـامەکە هەر نیـازێکی ویـلایەتە یەکگرتووەکـانی ئەمریکـای ڕەتکـردەوە، وەک ئەوەی وەک لایەنێـک بچێـتە نـاو (شـەڕەکانی نێـوان وڵاتانی ئەوروپا) یان ئەو بارودۆخەی تایبەتە بە ئەوروپاوە.[١]

ڕاگەیانـدنی مـۆنرۆ هاوکـات بـوو لەگەڵ گەشـەکردنی بـزووتنەوەی نیشـتمانی و داگیرکاری تاک بۆسەر ئەمریکا، ئەمانە بوونە مایەی دیاریکردنی سیاسـەتی دەرەوە لەســەر بنەمـای کەنـارگیری بەڕووی ئەوروپـادا، ئەم جـۆرە سیاســەتە کە لەلایەن گەورە پیـاوێکی سیاسـی و سـەرۆکی ئەوکـاتەی ئەمریکـاوە بڵاوکـرایەوە یەکێکە لە ڕووداوە گرنگەکـانی سـەدەی نـۆزدەیەم، چـونکە کـارێکی وا گەورە کـارتێکردنێکی گەورەی بـۆ سـەر ئەو ڕۆژگـارەی وڵاتـی ئەمریکـا هەبـووە، ئەمەش بۆخـۆی وای کـردووە لەکـاتی هەر دەسـت درێـژی و دەسـت تێوەردانێـک بـۆ نـاو وڵاتەکەیـان پشتگیری یەکتر بکەن.

لە دیسەمبەری ساڵی (١٨٢٣) جیمس مۆنرۆ نامەیەکی ئاڕاستەی کۆنگرێس کرد تیایدا سیاسەتی خۆی بەرامبەر ئەوروپا و ئەمریکای لاتین ڕوونکردەوە و نـاوی نـا (بنەمـای مـۆنرۆ) تیایـدا هـاتبوو هەردوو کیشـوەی ئەمریکـا، بەهـۆی ئەو ئـازادی و سەربەخۆیەی هەیانە کراوەنین بۆ داگیرکەرانی وڵاتانی ئەوروپا.[٢]

ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پێشتر دەستی وەرنەداوەتە کاروباری نـاوخۆی ئەوروپا، هەروەها سیستمی سیاسی وڵاتانی ئەوروپا جیاوازە لە سیسـتمی سیاسـی هەردوو کیشـــوەری ئەمریکـــا، ئەم ڕاگەیانـــدنە گرنگیەکـــی گەورەی نەبـــوو لەو

---

١- ولیم لانجر: موسوعة التاریخ العالم، ج١/ص٢٠٠٧.

٢- اسماعیل احمد یاغي: س- پ، ل ١١٧.

سەردەمە، وڵاتانی ئەوروپا پێیان وابوو کە ئەمە پێویست نیە، هەرچی ئەمریکای لاتین بوو ئەمەیان پێ پەسەند بوو، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە درێژایی سەدەی نۆزدە کاری بەم ڕاگەیاندنە کرد بە بیانویەک بۆ ڕێگرتن لە دەستێوەردانی وڵاتانی ئەوروپا لە کاروباری ئەمریکای باشوور.

دەربارەی بنەماکانی مۆنرۆ ئەوەی کە ئەمرۆ بانگەشەی بۆ دەکرد بە کورتی (ئەمریکا بۆ ئەمریکییەکانە) و دەست تێوەردانی ئەوروپا لە کاروباری ئەمریکا زیان بە ئاشتی ئەم وڵاتە دەگەیەنێت، هەروەها پێوستە ئەمریکا دووربکەوێتەوە لە ئاژاوە سیاسیەکانی ئەوروپا، لەم کاتەدا مۆنرۆ و وەزیری دەرەوەی، بیریان لە پرۆژەیەکی گرنگتر دەکردەوە ئەویش بنەمای مۆنرۆیە کە لە(٢)ی دیسەمبەری (١٨٢٣) بڵاوکرایەوە و ئەوەی باسی لێوەکرا لە ژێر مەرج و ڕووداوە جۆر بە جۆرەکان و جەنگەکانی ناپلیۆن ڕوویدابوو.[١]

لە بەرواری (٣)ی کانوونی یەکەمی (١٨٢٣) مۆنرۆ ڕووبەڕووی ئەگەری دەست تێوەردانی دەوڵەتانی پەیمانی پیرۆز بوویەوە و ڕایگەیاند کە هەردوو کیشوەری ئەمریکا لەمەودوا دوورین لە ئەگەری داگیرکاری ئەوروپی نوێ. وڵاتە یەکگرتووەکان بە چاوی گومان سەیری چاوتێبڕینی هەندێ دەوڵەتی هاوپەیمانی پیرۆزی دەکرد لە جیهانی نوێ، بە تایبەتی کە ڕوسیا زیاتر گرنگی بە (ئەلاسکا) دەدا و دەیوست بە دەستی بهێنێت و کۆنترۆڵی بکات.[٢]

ئادامزی وەزیری دەرەوە پێی وابوو ئەم ڕاگەیاندنە هەوڵێکە بۆ دروخستنەوەی ئەمریکا لەکاروبای ئەمریکای لاتین، بۆیە گرنگی بە هاوکاری ئینگلیز نەدەدا و (مۆنرۆ) پێی باش بوو کە ئەمریکا تاک لایەنە سیاسەتی کەنارگیری پەیڕەو بکات، ئەمریکا تا ساڵی (١٩١٧) و دواتریش وەفاداری بنەمای مۆنرۆ بوو لە جێ بەجێکردنی سیاسەتی دەرەوەدا، ئەم یاسایانەش ئەم بنەمایانەی تیابوو:

دانیشتوانی ئەمریکا ڕاستگۆترین سۆزیان بۆ ئەو ئازادی و بەختەوەرییە هەیە کە براکانیان لە مرۆڤایەتیدا بەتایبەت خۆشی لێ دەبینن ئەوانەی لە کەناری ڕۆژهەڵاتی زەریای ئەتڵەسی واتە (ئەوروپا) دەژین، ئێمە دەستمان نەخستە ناو ئەو

---

١- محمد محمود النیرب: س- پ،ج١/ ل ١٦٨.

٢- د.عبد العزیز سلیمان ود.محمود محمد: تاریخ الولایات المتحدة الأمریکیة، ص ١٠٠.

شەڕانەی کە لە ئەورووپا هەڵگیرسا، لەبەرئەوەی نموونەی ئەم دەست تێوەردانە ـەگەڵ سەروەریمان ناگونجێ.[1]

بەڵام ئەگەر دەست درێژی بکرێتە سەر مافەکانمان، یاخود مەترسیەک هەڕەشەمان لێ بکات، لەوکاتەدا دەستەوسان نابین، بەڵکو بەرگری لە خۆمان ـەکەین، ئێمە بەپێی پێویست و لەبەر هەندێ هۆی ڕونیش پەیوەندیەکی ڕاستەوخۆمان هەیە بە هەموو ئەوەی لە ئەمریکا باکوور و باشوور ڕوودەدات هەر کارێک بکرێت لەم ناوچانە لێی بێدەنگ نابین.

لە سەرەتای بیستەکانی سەدەی نۆزدەیەم سیاسەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هەستا بەوەی کە ناسرابوو بە بنەمای مۆنرۆ یان بنەمای بێ لایەن کە ڕاگەیاندنێکە سەرۆکی ئەوکاتی ئەمریکا (جیمس مۆنرۆ) لە ساڵی (١٨٢٣) ڕایگەیاند. مۆنرۆ لە نامە ساڵانەکەیدا کە لە ساڵی (١٨٢٣) پێشکەشی کۆنگرێسی کرد تیایداهاتبوو کە ئەمریکا دوور لە ململانێکانی جیهانی کۆن لە کیشوەرەکەی خۆی بمێنێتەوە، ویلایەتە یەکگرتووەکان تا شەڕی جیهانی یەکەم پەیڕەوی کرد.[2]

بنەماکانی مۆنرۆ جەختیان لەسەر چەند شتێک دەکردەوە لەوانە:

١. جیهانی نوێ (ئەمریکا) لە ڕووی سیستمی سیاسی و داب و نەریتەوە جیاوازە لە جیهانی کۆنی (ئاسیا، ئەورووپا و ئەفەریقا).

٢. بنەمای مۆنرۆ جەختی کردەوە کە ئەمریکا دوورە لە ململانێکانی ئەورووپا و لە کاتی جەنگەکانی شۆڕشی فەڕەنسا و ناپلیۆن دەست لە کاروباری ئەورووپا وەرنادات، هەربۆیە داوادەکات ئەورووپیەکان بەهەمان ئاڕاستە بڕۆن.

٣. سیستمی سیاسی ئەمریکا جیاوازە لەو سیستمە سیاسیانەی کە لە جیهانی کۆن هەبووە، بۆیە لە هیچ بارودۆخێکدا ناگونجێ ئەم سیستمانەی بۆ بگوێزرێتەوە.

٤. ئەمریکا بەرگری لە سەربەخۆیی دەکات.

٥. نامەکە داوای لە ئیسپانیاکرد واز لە داگیرگەکان بهێنێت لەبەرئەوەی لە کاتی دەست تێوەرنەدانی ئەورووپا ئیسانیا بەتەنها ناتوانێت شۆڕشە هەڵگیرسانەوەکان کۆنترۆڵ بکات.[3]

---

١- د.عبد العزيز سليمان ود.محمود محمد: تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية، ج١. ل١٦٨.

٢- د.صلاح احمد هريدي:س- پ، ل ١٠٨.

٣- د.محمد محمد صالح ود. ياسين عبدالكريم:تأريخ اوروپا في القرن التاسع عشر، مطبعة جامعة بغداد، ١٩٨٥،ص٢٢.

## نامەکەی مۆنرۆ بۆ کۆنگرێس

لەسەر داوایەک کە حکومەتی ڕووسیا لە ڕێگەی وەزیری ئیمپراتۆر (قەیسەری ڕوسیا) کە لێرە نیشتەجێیە پێشکەشی کردووە، زانیاری و پێدانی دەسەڵاتی تەواو بۆ وەزیری ویلایەتە یەکگرتووەکان لە (سان بطرسبۆرگ) ناردووە بۆئەوەی لە ڕێگەی دانوسان بۆ گەڕان و ڕێکخستنی ماف و بەرژەوەندیەکانی هەردوو دەوڵەت لە کەناری باکوری ڕۆژئاوای ئەم کیشوەرە، هەروەها داوایەک کە ئیمپراتۆر پێشکەشی حکومەتی بەریتانیان کردووە، ئەویش لای خۆیەوە ڕەزامەند بووە لەسەری، ویلایەتە یەکگرتووەکان لە ڕێگەی ئەو دانوستانە دۆستانەیەوە ئارەزووی لەوەیە کە گوزارشت لە گرنگی گەورە بکات کە بەردەوام هاوڕێیەتی ئیمپراتۆری پێبەخشیوە، هەروەها لەگەڵ گرنگی پێدان بە گەشەکردنی باشترین ڕێگەی لێک تێگەیشتن لەگەڵ حکومەتی جەلالەت.[1]

لە کاتی گفتوگۆکان کە بووە مایەی دەرکەوتنی ئەم گرنگی پێدانە، کاتەکە گونجاو بوو بۆ ئەوەی بەپێی بنەمایەکە جەخت بکەینەوە کە هەموو ماف و بەرژەوەندییەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکان لە هەردوو کیشوەری ئەمریکی، بەپێی بارودۆخی ئازاد و سەربەخۆ کە تیایدان لێرەوە ئیتر نابێت ملکەچی کرداره داگیرکارییەکانی هەر دەوڵەتێکی ئەوروپی بن لە داهاتوودا.

لە سەرەتای دانیشتنەکە باسمان کرد کە چەند هەوڵێک هەبوو لە ئیسپانیا و پورتوگال بۆ چاککردنی بارودۆخی هەردوو دەوڵەت، بەڵام ئەم کارانە زۆر بەسستی بەڕێوە دەچن و پێویست بەوە ناکات کە بڵێین ئەنجامەکانی تائێستاش بەدی هاتوون بەبێ پێشبینی کردنی ڕووداوەکانی ئەو بەشەی جیهان کە بەشێوەیەکی چڕ وپڕ لەگەڵ یەک کارلێک دەکەین کە لەویشەوە دوایی ڕەسەنمان دەکەوت و هەمیشە وامان لێ دەکات کە چاودێر و دڵەڕاوکێ بین، گەلی ئەمریکا ئەگەر لە ڕاستگۆترین هیوای بکات لە یارمەتی و هەوڵە دۆستانەکانی لە بەدیهێنانی ئازادی و خۆشی بە سەرکەوتوویی لەلای بەشێک لە زەریای ئەتڵەسی.[2]

لەهەمان کاتدا ئەوەمان بەیاد دەهێنێ کە هیچ ڕۆڵێکمان نەبوو لەو شەڕانەی کە پێشتر لە نێوان دەوڵەتانی ئەوروپی ڕوویانداوە، ئەوە کارێکە تایبەتە بە خۆیان،

---

١- لاری الوتیز: نظام الحكم في الولايات المتحدة الأمريكية، ص٣٧١.

٢- هەمان سەرچاوە، ل٣٧٢.

ئەمە بەردەوام سیاسەتی ئێمە بووە و دەبێت، ئێمە ناجوڵێین تا مافمان پێشێل نەکرێت یان نەکەوینە بەر هەڕەشەی ترسناک، تەنها لێرە خۆمان ئامادە دەکەین بۆ بەرپەرچی داگیرکاری یان بۆ بەرگری لە خۆمان، ئەوەی ڕوودەدات لەم شوێنەی گۆی زەوی بە حوکمی پەیوەندی ئەوەی بابەتەکانیان نین لە سیستمی سیاسی هێزە هاوپەیمانەکان لەو بارەوە جیاوازییەکی جەوهەری هەیە لە سیستمی سیاسی ئەمریکی، ئەم جیاوازییەش دەگەڕێتەوە بۆ سروشتی حکومەتەکە کە لەسەر ئەم ڕێکخستنانە دروست بوون لە مافی بەرگری کردنمان لە سیستمەکەمان کە بە گیان و موڵک بەخشین هاتووە کە لەسایەی ئەوەدا لە خۆشیەکی گەورە و مەزن نەبڕاوەدا دەژین.

هەروەها پەیوەندییە ڕاستەکان و دۆستانەکانمان کە لە نێوان ئەمریکا و هێزە هاوپەیمانەکان دروست بووە، ڕایدەگەیەنین کە هەر هەوڵێک لە لای ئەو هێزانەوە بۆ زیادکردنی هەژمونیان بەسەر هەر بەشێکی نیوەگۆی ڕۆژئاوا وەک کارێکی دژی ئاشتی و ئاسایشمان دادەنێین کە دەیخاتە مەترسیەوە.[1]

لە کاتێکدا جەخت دەکەینەوە دەست وەرنادەین و دەستمان وەرنەداوە لە کاروباری داگیرگەکانی سەر بەهەر هێزێکی ئەوروپی، ئەم کارە جیاوازە لە حکومەتەکانی ئەمریکای لاتین کە سەربەخۆییان ڕاگەیاندووە و پارێزگارییان لێکردووە، ئەمەش سەربەخۆییەکە ڕێزی لێ دەگرین بەوپێیەی لەسەر بنەمای ڕاست ئەنجامدرا وە ئێمە ڕێگە نادەین بە هەر دەست تێوەردانێک کە ئامانجی نەهێشتنی ئەم حکومەتانە و یاریکردن بێت بەچارەنووسیان بە هەر شێوەیەک لە شێوەکان لەلایەن هەر دەوڵەتێکی ئەوروپی، ئەمانە لە تێڕوانینی ئێمەوە کارێکی دوژمنکاریە بەرامبەر ویلایەتە یەکگرتووەکان، بێ لایەنی خۆمان ڕاگەیاندووە لەکاتی جەنگەکانی نێوان ئەم حکومەتە تازانە و ئیسپانیا کە دانمان پێیان ناوەو تا ئێستاش سوورین لە سەری، هەڵوێستی خۆمان لەسەر ئەمە دەبینین ئەگەر گۆڕانکاری نەبێت (بەپێی تێڕوانینی دەسەڵاتی پسپۆر) لە حکومەتەکەمان، ئەگەر هەرشتێک لەم بارەیەوە ڕووبدات یان زیان بەم حکومەتانە بگات لە ئەنجامی

---

١- اسماعيل احمد ياغي: س- پ، ل ١٢٠.

گۆڕانکاریەکانەوە ئەوا لەسەر ویلایەتە یەکگرتووەکان پێویستە کە دەست وەربدات بۆ پارێزگاری ئاسایشی.[1]

ڕووداوەکانی ئەم دوایییەی هەریەک لە ئیسپانیا و پورتوگال جەخت لەوە دەکاتەوە کە کیشوەری ئەورووپا تا ئێستاش ناجێگرە، لەم ڕاستیە گرنگەوە هیچ بەڵگەیەکی لەوە بەهێزتر نیە کە ئەم هێزە هاوپەیمانیانە وایان بینی کە کات گونجاوە بۆ دەست تێوەردان لە کاروباری ناوخۆی ئیسپانیا، بەڵام ئەو دەست تێوەردانە مەسەلەیەکە تایبەتە بە هێزە سەربەخۆکان، لەو باوەڕەدانیم هێزێکی سەربەخۆ هەبێت زیاتر لە ویلایەتە یەکگرتووەکان گرنگی بەم مەسەلەیە بدات، سیاسەتەکانمان بەرامبەر ئەورووپا لە کاتی جەنگەکان تا ئێستاش لەم بەشەی جیهان نەگۆڕاوە، ئێمە تا ئێستاش سوورین لەسەر ئەم سیاسەتە کە بەندە لەسەر دەستتێوەرنەدانە لە کاروباری ناوخۆیی هەر دەوڵەتێکی ئەورووپی.[2]

لە هەوڵی چڕ وپڕ داین بۆ بەرەوپێش بردنی پەیوەندی باش لەگەڵیان و پاراستنی ئەم پەیوەندیانە بەڕاستی و پاکی کە بگونجێت لەوێ زۆر جیاوازە، لە بارودۆخی ئێمە لێرە مەحاڵە کە هێزی هاوپەیمان هەژموونی سیاسی خۆی دابمەزرێنێت لەهەر پارچەیەکی هەردوو ئەمریکا و ببێتەمایەی هەڕەشە بۆ ئاشتی و خۆشگوزەرانیمان، کەس باوەڕ بەوە نەکات کە براکانمان لە باشوور بە ئاسانی ئەمە قبوڵ بکەن، دواتریش مەحاڵە ئێمەش هەروا دەستەوسان لە بەرامبەر هەر شێوازێک لە شێوازەکانی دەست تێوەردان.

ئەگەر سەیری هێزی ئیسپانیا و قەبارەی بەرهەمی بکەین و بەراوردی بکەین بە هێز و بەرهەمی حکومەتی وڵاتانی لاتین جگە لە دووری جوگرافیای نێوانیان، بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە مەحاڵە ئیسپانیا بتوانێت ئەو حکومەتانە ملکەچ بکات، لێرەدا ئەوە دووپات دەکەینەوە سیاسەتی ڕاستەقینەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا تا ئێستاش بەندە لەسەر بنەمای وازهێنان لە دەوروبەر و کاروباریان، ئێمەش هیواداریین کە هێزەکانی تر ئەم ڕێبازە بگرنەبەر.[3]

---

١- فرحات زيادة و ابراهيم فريجي: تاريخ الشعب الأمريكي،ص ١١٢.

٢- لارى الوتيز: نظام الحكم في الولايات المتحدة الأمريكية، ص١١٥.

٣- محمد محمود النيرب: س- ج/ پ، ل ١٦٨.

### هۆكاری دانانی بنەمای مۆنرۆ

كاتێک لە ساڵی (١٨٢٣) جیمس مۆنرۆ بنەماكانی ڕاگەیاند لە نامە ساڵانەكەیدا، ئەم بنەمایە هۆكاری خۆی هەبوو ئەویش بەهۆی هەڕەشەی دەست تێوەردانی لایەنی هاوپەیمانی (پیرۆز) بۆ گێڕانەوەی داگیرگەكانی ئیسپانیا لە ئەمریكا كە لەوێ شۆڕشیان دەكرد، ئەمە جگە لەو ئاڕاستە دوژمنكارییەی ڕوسیا لە كەناری ڕۆژئاوای ئەمریكا گرتبویەبەر، دەرچوونی ئەم بنەمایە بریتی بوو لە هەستی نەتەوایەتی ئەمریكا.[1]

جێگەی باسە بەهۆی كێشە ناوخۆییەكان و لاوازی هەژموونە گشتیەكانەوە، لە توانای ئیسپانیادا نەبوو بەسەر داگیرگەكانیدا زاڵ بێت لە خاكی ئەمریكادا، بەڵام هەڕەشەكانی (مترنیخ) بۆ زاڵبوون بەسەر داگیرگەكانی وای لە مۆنرۆی سەرۆكی ویلایەتە یەككگرتووەكانی ئەمریكا كرد سەرەنجی كۆنگرێس ڕابكێشێت سەبارەت بە دەست تێوەردانی ئەوروپا بۆ كاروباری ئەمریكا و بنەماكەی ڕاگەیاند، لە ڕاستیدا بنەمای مۆنرۆ میكانزمێكی سیاسی گونجا و بوو بۆ پتەوكردنی پەیوەستی ئابووری و سیاسی نێوان ویلایەتە یەككگرتووەكانی ئەمریكا و كۆمارە تازە سەربەخۆكانی جیهانی لاتینی.[2]

### سەردەمی ئەندرۆ جاكسۆن

ئەگەر داڕووخانی باڵەكانی حزبی فیدراڵی نەبوایە هەڵبژاردنەوەی مۆنرۆ بۆ جاری دووەم بەو دەنگە زۆرە نەدەبوو، چونكە لەو كاتەدا ململانێی هەڵبژاردن لە نێوان دوو حزبدا بوو ئەویش فیدراڵیەكان و كۆماریەكان بوون، سەرباری ئەو ئارامیەی كە باڵی كێشابوو بەسەر ئاسۆی سیاسیدا مێژوونووسە وردەكارەكان وایاندەبینی كە سەرەتاكانی پارچە پارچە بوون لە حزبی كۆماریەكاندا لە ماوەی سەرۆكایەتی دووەمی مۆنرۆدا بوو بەهۆی بوونی بەرژەوەندیە ناوچەییەكان لە بەشە جیا جیاكانی وڵاتدا، ئەو پڕۆژە زۆرانەی كە گیانی نەتەوایەتییان تیا بەرجەستە دەبوو وەک گەڕانەوەی بانكی نیشتمانی، دانانی باجی گومرگی زۆر، پڕۆژەكانی بنیاتنانەوەی ناوخۆ، بەهێزكردنی دەسەڵاتی دادگای باڵا... هتد،[3] بۆیە

---

١- اسماعيل احمد ياغي: معالم التاريخ الأمريكي الحديث،ص ٧٥.

٢- لوقمان خەیاڵی:س-پ،ل٤١.

٣- د. طليعة الصياح و راغب العلي: تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية، ص ١٠٠.

هـۆی دابەشـبوونی بیـر وبۆچـوون و زیانەکـانی بە ئاشـکرا لە هەڵبژاردنـی سـاڵی (١٨٢٤)دا دەرکەوت کـاتێ چـوار کەس بـۆ سـەرۆکایەتی وڵات خۆیـان پـاڵاوت هەر چواریـان لە حزبـی کۆماریەکـان بـوون، یەکێک لەم چـوارە هەڵبـژاردنەکەی بـردەوە ئەویش (جـان کوینسـی ئـادەمز) کـوڕی جـۆن ئـادەمزی دووەم سـەرۆکی ویـلایەتە یەکگرتووەکـان بـوو، ئەمـیش دوای ئەوەی یەکێـک لە پاڵێوراوەکـان کشـایەوە لە هەڵبـژاردن و شـوێنکەوتووەکانی دەنگیانـدا بە ئـادەمز و ئەمـیش لە هەڵبـژاردنەکەدا سەرکەوتنی بەدەست هێنا.[١]

یەکێک لەو چـوار کاندیـدەی کۆماریەکـان کە خۆیـان پـاڵاوتبوو بـۆ سـەرۆکایەتی ناوی (أندرو جاکسۆن) بوو،ئەو وای دادەنـا هەڵبژاردنـی (ئـادامس) بـۆ سـەرۆکایەتی لە ئەنجامی پلانگێڕیەکی سیاسی چەپەڵەوە بووە کە مەبەست لێی دوورخستنەوەی ئەم بـووە لە گەیشـتن بە سـەرۆکایەتی، ئەمە تێڕوانینی شوێنکەوتەکانیشـی بـوو کە جاکسۆنیان بە نوێنەری گشتی گەل دادەنـا نەک ئەوەی چـاوی بڕیبێتە بەرژەوەنـدی تـایبەتی، لە ئەنجامـدا پـارچە پـارچە بـوون لە حزبـی کۆمارییـدا ڕوویـدا، ئـادمز و شـوێنکەوتەکانی لە حکومەتـدا کە ناسـران بە کۆمـارییە نەتەوەییەکـان پرۆگرامێکـی نەتەوەییان هەبوو، ئەم پرۆگرامە لە دوای جەنگی ساڵی (١٨١٢)، لایـان گرنگتـر بـوو لەلایەکـی تـرەوە شـــوێنکەوتەکانی جاکســۆن دوای ئەوەی هەنــدێک لە کۆمـــاریە پارێزگارەکـان چـوونە پاڵیـان و هەموویـان بە نـاوی دیموکراتیەکـان ناسـران کە مەبەستیان گەڕانەوە بوو بۆ بیروبۆچوونەکانی(جیفرسۆن)کە مەبەستی پارێزگـاری کردنـی مـافی ویلایەتەکـان بـوو بە تەنیـا، هەروەهـا خـاوەن کێڵگەکـان لە باشـوور دەستیانکرد بە سەرزەنشت کردنی ئەو ڕێبازەی کە کۆماریە نەتەوەییەکان پیادەیـان دەکرد کە ئەویش تێکەڵکردنی بەهێزبوو لە نێوان بەرژەوەندی دارایی و بەرژوەنـدی سیاسیدا.[٢]

لەبەر ئەو هۆیانەی سـەرەوە باسمان کرد سەردەمی سەرۆکایەتی ئادەمز پڕبوو لە پێکدادانی نێوان ئەم دوو پـارتە، ئـادەمز ئاگای لە پرۆگرامە نەتەوەیەکەی نەمـا و بـۆی جێبەجێنەکـرا، هەروەهـا لەسـەر دانـانی بـاجە گومرگیەکـان بـۆ پاراسـتنی پیشەسازی لە ویلایەتەکانی باکوور ململانێکە زیادی کرد. خەڵکی باشـوور بەهـۆی

---

١- محمد محمود النيرب: المدخل في تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية،ص١٦٩.

٢- ديب علي حسن: الولايات المتحدة الأمريكية، ص٢٢٠.

دانانی ئەم باجە گومرکیانەوە تووشی زەرەروو زیان بوون، چونکە دوای دانانی ئەم باجە گومرکیانە ئەو کەل وپەل و ئامێرە کشتوکاڵیانەی دەیانهێنا نرخەکەی گرانتر بوو، لەبەرئەوە شتێکی ئاسایی بوو خەڵکی باشوور لەگەڵ حزبەکەیاندا (دیموکراتیەکان) بەرهەڵستی ئەم پلانە بکەن.[1]

لە کۆتاییدا دوای ململانێیەکی توند کە کۆنگرێس ڕووبەڕووی بووەوە ڕەزامەند بوو لەسەر دەرکردنی بڕیاری ساڵی (١٨٢٨) ئەم بڕیارەش بوویە هۆی دەربڕینی نارەزایی توند لەلایەن خەڵکی باشوورەوە، ئەمەش سەرکێشی کرد بۆ ئەوەی هەندێک لە ویلایەتەکان داوای جیابوونەوە لە یەکێتی ئەمریکا بکەن، بەڵام هەڵبژاردنی (ئەندرۆ جاکسۆن) بۆ سەرۆکایەتی لەو ساڵەدا بارودۆخەکەی هێورکردەوە و خەڵکی باشوور گەشبین بوون، چونکە جاکسۆن ناسرابوو بەوەی نکوڵی لە باجە گومرگیەکان دەکرد.[2]

هەڵمەتەکانی هەڵبژاردن ململانێیەکی توندی بەدوای خۆیدا هێنا لە نێوان ئەم دوو پارتەدا (کۆماری- دیموکراتی)، هەر پارتە و کۆمەڵێک خەڵک پشتگیری دەکرد، ئادمز لەلایەن خاوەن ڕۆژنامە و پیاوانی ئاینی وفەرمانبەرانی حکومەت و خاوەن پیشەکان و پیاوانی سەرمایەدارەوە پشتگیری لێدەکرا، بەڵام جاکسۆن لایەنگرەکانی زیاتر جوتیار و کرێکار و پیشەوەران بوو لە کاتی هەڵبژاردندا، هەردوو لایان درێغیان نەدەکرد لە تانە و توانج لەیەکدان، کۆمارییە نەتەوەییەکان بە شێوەیەک باسی جاکسۆنیان دەکرد کە کەسێکی (بەدڕەوشتە، مەشروب خۆرە، گیانبازەو بکوژە)، هەورەها بە خراپە باسی ڕەوشتی ژنەکەیان دەکرد، سەرەڕای ئەوەی ژنەکەی ڕەوشتی جوان و باش بوو، بەڵام شوێنکەوتەکانی جاکسۆن ئادەمزیان بە کەکسێکی پیوریتانی چروک و ئەرستۆکراتیەکی توندڕەو و پیاوێکی بێ مەبدە و و خراپ دادەنا و دەیانگوت لە هەڵبژارنەکاندا دەنگی دەنگدەران بە پارە دەکرێت.[3]

شەڕی هەڵبژاردن سەرکەوتنی جاکسۆنی بە زۆرینەی دەنگ لەگەڵ خۆیدا هێنا، هۆکاری ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ پشتگیری کردنی ویلایەتەکانی باشوور و ڕۆژئاوا. گرتنەدەستی پۆستی سەرۆکایەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان دادەنرێت بە کرانەوە بە ڕووی سەردەمێکی نوێدا، ئاهەنگی دەسەڵات گرتنەدەستی بێ وێنە بوو، هەندێک

---

١- د.صلاح احمد هريدي: دراسات في التاريخ الأمريكي، ص١٠٩.

٢- بدون مؤلف:موجز التاريخ الأمريكي،ص ٦٥.

٣- د.محمد محمود النيرب: س-پ، ج١/ل١٦٩.

کاتی چوونە ناو واشنتنۆن جاکسۆنیان دەچوواند بەوکاتەی کە بەربەرەکان لە کاتی رووخانی ئیمپراتۆریەتی رۆمانیدا چوونە ناو رۆماوە، واشنتن پڕبوو لە خەڵک، هەندێکیان داوای هەلی کارکردنیان دەکرد هەندێکی تریان زۆرینەی میللەت بوون کە لە باشوور و رۆژئاواوە هاتبوون بۆ بینیی پاڵەوانە خۆشەویستەکەیان کە چۆن کورسی دەسەڵات وەردەگرێت و نیشانەی خۆشی لەسەر دەم و چاویان بوو، باوەڕیان وابوو وڵات لە نەهامەتیە گەورەکان ڕزگار دەکات و بە دەنگی بەرز هاواریان دەکرد بژی جاکسۆن.[1]

(جاکسۆن)لەو سەرکردانەی ویلایەتە یەکگرتووەکان بوو کە لە ناو دڵی خەڵکیدا جێگەی خۆی کردبووەوە، خۆی تەرخان کردبوو بۆ خزمەتکردنی میللەتەکەیان و شەونخونیان لەو پێناوە دەکرد، جێگەی بڕوای میللەت بوو، هەروەها خۆی بە یەکێک لە میللەت دادەنا، جاکسۆن لە خێزانێکی هەژار لەدایک بووە، لەناوچە سنووریەکانی رۆژئاوادا نیشەجێ بوون لە باکووری کارۆلینا،

باوکی مردووە پێش ئەوەی جاکسۆن لەدایک بێت، لەبەر ئەوانە سەرەتای ژیانی پڕبوو لە نەهامەتی، کەسایەتیەکی توند و تیژ و هەستێکی بەهێزی هەبوو، ئەمەش وایلێکردبوو رقی دەبویەوە لە رژێمی ویلایەتەکانی رۆژهەڵاتی سەرمایەداری، هەروەها قێزی دەهاتەوە لە خاوەن پارە و قۆرخ چیەکانی ئەو ویلایەتانە، زیاتر دڵتەنگ بوو کاتێ دەیبینی خەڵکی رۆژهەڵات لە خۆشگوزەرانیدان و خەڵکی رۆژئاوا لە ژیانێکی ناخۆشدا دەژیان.[2]

بیروبۆچوونەکانی و توانای جەستەیی هۆکارێکی گرنگ بوون کە هاوڕێکانی و خەڵکی بە گشتی بە پیاوێکی بەهێز و پێشەوایان دادەنا، جاکسۆن لە کاتی جەنگەکانی لەگەڵ هیندیە سورەکاندا هەمیشە لە پێش شەڕکەرانەوە بوو، دەگێڕنەوە جارێک جاکسۆن دوای ئەوەی کەسێکی بەرامبەری لە بەرنگاربوونەوە بەشمشێر (المبارزة) کوشتووە ئارەزووی ئەوەی دەکرد بۆ خەڵکی بگێرێتەوە و ئەو دەمانچەیەیان نیشان بدات کە بەکاری هێناوە، لە شەڕەکانیدا لەگەڵ دوژمنەکانی فیشەکێکی بەرکەوتبوو و بۆ ماوەیەکی زۆر لە جەستەیدا مابووەوە.[3]

---

١- ديب علي حسن: الولايات المتحدة الأمريكية، ص٢٢٢.

٢- د.صلاح احمد هريدي: دراسات في التاريخ الأمريكي،ص ١١٠.

٣- فرحات زيادة و ابراهيم فريجي: تاريخ الشعب الأمريكي،ص ١١٥.

لە ساڵی (١٨١٤) جاكسۆن سەركردایەتی سوپایەكی دەكرد توانی لە شەڕی (نیوأورلینز) سەركەوێت بەسەر ئینگلیزەكاندا، بەمەش پێگەی بەرزبووەوە و خەڵكی لە ئازایەتی و شێوازی جەنگیدا لە سەرووی ناپلیۆن و قەیسەرەوە دایان دەنا، جاكسۆن لەوەدابوو بگات بە دەسەڵات كەتووشی گرفتی بەڕێوەبردن هات، یەكەم گرفتیش پەیوەندی بە پیشە حكومیەكانەوە هەبوو، هەر ئەمەش وایكرد لە یەكەم نامەیدا كە ناردی بۆ كۆنگرێس داوای ئەوەی كرد ئەو فەرمانبەرانە بخەنە سەركار كە لە هەڵبژاردندا ئەندامی پارتی براوەن، ئەمەش لە ڕووداوە نوێیەكانی سیاسەتی وڵات بوو، لەبەرئەوەی باوەڕی وابوو گۆڕنكاری لە بەڕێوەبردندا سوودی بۆ گەل هەیە، چونكە ئەگەر یەكێك یاخود كەسێك بۆ ماوەیەكی زۆر لە كارەكەیدا بمێنێتەوە ئەوا لە كارەكەیدا سستی دەنوێنێت، ئەمەش ئەو پەندە دەسەلمێنێت كە دەڵێت دەسكەوت بۆ براوەیە.[1]

(جاكسۆن) ئەوەی لە بیركردبوو ئەم كارەی كە دەیكرد دەبووە هۆی كەموكوڕی لە بەڕێوەبردندا، بەڵام ئەم بنەمایە بە تەواوەتی پەیڕەونەكراو ڕێژەی گۆڕان لە فەرمانبەراندا لە ماوەی سەرۆكایەتیدا پێنج یەكی گرتەوە، ئەم بنەما پەیڕەوكراوەش بۆ خەڵكی باش بوو، هەروەها سەرۆكەكانیش تا سەردەمی سەرۆكایەتی (گرانت). پاشان جاكسۆن گیروگرفتی تری زۆری هاتەڕێ لەوانە كێشەی پڕۆژە بیناسازیەكانی ناوخۆی وڵات وەكو دروست كردنی ڕێگەوبان و هەڵكەندنی جۆگەلە كە كۆنگرێس یاسای ڕێگەپێدانی بۆ دەركردبوو، بەڵام بە ئابوورییەوە و ڕازیكردنی خەڵكی باشوور چونكە كەمتر سوودیان لەم پڕۆژانە وەردەگرت، قورسترین گیروگرفت كێشەی گومرگ بوو كە پێش ئەوەی دەسەڵات وەرگرێت دانرابوو، چونكە یەكێك لە ویلایەتەكان كە ئەویش ویلایەتی (ساوپ كارۆلینا) بوو، هەڕەشەی نەهێشتنی گومرگی دەكرد لە سنوورەكانیدا، چونكە دەیان وت دەستوور ڕێگەیان پێ ئەدات ئەم كارە بكەن و لە كۆنگرێسدا دەمەقاڵێكی زۆر و توند وتیژ لەسەر ئەم كێشەیە ڕوویدا، چونكە ئەگەر بێت و یەكێك لە ویلایەتەكان ئەم مافەی پێبدرێت ئەوا ویلایەتەكانی تریش داوای هەمان ماف دەكەن، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی ئەم یەكگرتنە بەهۆی ئەم ناكۆكیەوە ترسی هەڵوەشانی لێ بكرێت، دوای (٣٠) ساڵ

---

١- هەمان سەرچاوە.

کاتێک داواکاری ویلایەتەکان یەک نەئەهاتەوە لەگەڵ دەسەڵاتی حکومەتی فیدراڵیدا بوویە هۆی هەڵگیرسانی شەڕی ناوخۆ.[1]

بۆ چاککردنی یەکێتی و نەهێشتنی ئەو هۆکارانەی دەبێتە هۆی لاوازبوونی ویلایەتە یەکگرتووەکان، تیپێکی سەربازیان نارد بۆ شاری تشارلستۆن لە (ساوث کارۆلینا) و بەیاننامەکیان دەرکرد کە تێیدا هاتووە هەر هەوڵێک بۆ جیابوونەوە بدرێت بەهێزی چەک لەلایەن ویلایەتەکانەوە بە ناپاکی نیشتمانی دادەنرێت، کاتێک ئەم ویلایەتە (ساوث کارۆلینا) نەیتوانی هەموو ویلایەتەکانی باشوور لەگەڵ خۆیدا یەکبخات ئیتر لە هەڵوێستی خۆی کشایەوە، بەڵام گومرگی کەمکردەوە بە شێوەیەک کە هەموویان (حکومەت، ویلایەتەکەو دانیشتوان) پێی ڕازی بن.[2]

جاکسۆن سەرەتا دەستیکرد بە گرنگیدان بە بانکی نیشتمانی کە کۆڵەکەی هێزی دارایی ویلایەتەکانی باکوور بوو، بەڵام دوای ئەوەی کۆنگریس یاسایەکی تازەی دەرکرد بە درێژکردنەوەی دەسکەوتەکانی جاکسۆن ئەم یاسایەی ڕاگرت، ئەمیش بەهۆی ئەوەی خەڵکی ڕۆژئاوا دژی بانک و دامەزراوە داراییەکانی تر بوون کە ویلایەتەکانی باکوور دەستیان بەسەراگرتبوون، لە پاشاندا سەرمایەی دەوڵەتی فیدراڵی لەو بانکە سەندەوە و ناردی بۆ بانکە گەورەکانی دی کە لە ویلایەتە جیاوازەکاندا هەبوون تا هەمان دەسەڵاتی بانکی نیشتمانی هەبێت.[3]

ئەم بانکە خزمەتێکی باشی گەلی ئەمریکی تازە پێگەشتووی کرد، بەڵام بێ کەموکوڕی نەبوو لە قۆرخ کردن کە لەلایەن هەندێک کەسەوە دەکرا بە تایبەت ئەوانەی قازانجەکانی کاری لێیان دەکرد، ئەمەش وای لە ڕای گشتی کرد کە پاڵبنێت بە جاکسۆنەوە تاکۆتایی بەکاری ئەم بانکە بهێنێت، بە تەواوبوونی ماوەی یاسایی دەسەڵاتی لەساڵی (١٨٣٦) کۆتایی بە ماوەی سەرۆکایەتی جاکسۆن هات و (مارتن ڤان بوردین) جێگەی گرتەوە کە لە ساڵی (١٨٣٦) هەڵبژێردرا، هەرڵبژاردنی نیشانەی گرنگیدانی پارتی دیموکراتیەکانی لە وڵاتدا دەردەخست کە زیاتر پشتیان دەبەست بە کرێکار و جوتیار و پیشەوەران، لە ڕۆژگاری فەرمانڕەوای مارتن ڤاندا تووشی قەیرانی ئابووری هات کە وای پێویست دەکرد سیستمی سەرمایەداری بگەڕێتەوە، لەم کاتەدا کۆماریە نەتەوەییەکان ناوی پارتەکەیان بە ناوی پارتێکی ئینگلتەراوە

---

١- بدون مؤلف:موجز التاريخ الأمريكي،ص ٦٧.

٢- فرنسيس فريدمان:موجز تاريخ الأمريكي،ص٨٩.

٣- فرحات زيادة و ابراهيم فريجي: تاريخ الشعب الأمريكي،ص ١١٦.

ـونا ئەویش (پارتی وەگ) بوو، ئەو پارتە بەربەرەکانێی ئەو تایبەتمەندیانەی دەکرد ـە پادشاکانی ئینگلتەرا هەیانبوو، بەهەمان شێوە ئەمانیش (کۆماریە نەتەوەیەکان) ـەربەرەکانێی ئەو تایبەتمەندیانەیان دەکرد کە جاکسۆن بەخۆی بەخشی بوو، لە هەڵبژاردنی ساڵی (١٨٤٠) کۆماریە نەتەوەییەکان بۆ ئەوەی دەنگی کرێکار و جوتیار ـو پیشەوەران بۆ خۆیان مسۆگەر بکەن و بیانهێننە ڕیزی پارتەکەیان، بانگەشەی ئەوەیان کرد کە لە پرۆگرامی پارتەکەیان (مەسەلەی گومرگ و بانکی نیشتمانی و بنیاتناوەوە و... هتد) شیاوی گۆڕانکاریە،[1] هەروەها پەنایان بردە بەر ڕێگەیەکیتر لە هەڵبژاردنەکەدا کە زیرەکی سیاسی و توانای کۆماریەکانی دەرخست ئەویش لەوەدا دەرکەوت کە کۆماریەکان جووتیارێکی ڕۆژئاوایان کاندید کرد بۆ سەرۆکایەتی وڵات کە یەکێک بوو لە پاڵەوانەکانی جەنگ، ئەو لە جەنگی هیندیەکاندا دڵسۆزی دەرخست بوو، ئەویش (ویلیم هنری هاریسون) بوو، لای خەڵکی وایاندەرخست پیاوێکی هەژارە و لە خانوویەکی خراپدا گەورە بووە و لە کێڵگەکەیدا بەدەستی خۆی کاری کردووە، ناخۆشیەکانی ژیانی چەشتووە، کەچی لەڕاستیدا کەسێکی خانەدان و شکۆمەند بووە و لە کێڵگەیەکی گەورە و دەوڵەمەندا ئەژیا لە (ئوهایو)، لەگەڵ ئەمانەشدا وێنەی ڕکەبەرەکەیان (ڤان بورین) وا نیشاندا کە پیاوێکی ئەرستۆکراتیە و ژیانێکی خۆشی هەیە و لە قاپی زێڕدا نان دەخوات، کەسێکی ژنانیە (وەک ژنانی شار ناو تەنکی خۆی بەلاستیک دەبەستێت)، هەروەها زۆر ناو و ناتۆرەی تریان بۆ هەڵدەبەست.[2]

لەبەر ئەم هۆکارانە هاریسۆن (کاندیی کۆماریە نەتەوەییەکان- وەگەکان) بە زۆرینەیەکی زۆر هەڵبژاردنەکەی بردەوە. ئەم هەڵگەڕانەوەی میللەت لە پارتی دیموکراتیەکان و پشتگیری کردنی پارتی کۆماریە نەتەوەییەکان (وەگەکان) لە پاشدا بە خراپە بەسەریاندا شکایەوە، لە ئەنجامی ئەو دیموکراتیە ڕوکەشەی کە پەیڕەویان دەکرد میللەت تووشی بارودۆخێکی خراپ بوو، هەروەها دیاردەی هەڵخەڵەتاندن و سووکایەتی پێکردنی خەڵکی بەهۆی فەرمانبەرەکان و حکومەتەوە لە وڵاتدا زیادی کرد.[3]

---

١- د.محمد محمود النيرب: س-پ، ل١٨١.

٢- فرحات زيادة و ابراهيم فريجي: س- پ، ل ١١٧.

٣- ديب على حسن:الولايات المتحدة الأمريكية،ص٢٢٧.

کاتێ حزبێ وەک (کۆماریە نەتەوەییەکان) سەرۆکایەتی وڵاتیان گرتەدەست هەوڵیاندا پڕۆژە نەتەوەیەکان بخەنە بەرنامەی کاری خۆیانەوە، لە بەرامبەریشیان دیموکراتیەکان هەبوون کە بەردەوام سەرمایەداریان ناشرین دەکرد لەبەرچاوی خەڵکی، کاتێک وەگەکان دەیانویست سیاسەتی وڵاتی لەسەر دابڕێژن، دیموکراتیەکان لەبەربەرکانی کردنی وەگەکاندا سەرکەوتن و نەیانهێشت نەخشەکەیان بە تەواوی جێبەجێبکەن، ئەوەی وەگەکان توانییان جێبەجێی بکەن زیادکردنی باجە گومرگیەکان بوو، ئەم کارەشیان کاریگەریەکی خراپی کردە سەر جەماوەرەکەیان، لەبەر ئەم هۆیانە لە هەڵبژاردنی ساڵی (١٨٤٤)دا دیموکراتیەکان دوای ئەوەی (جایمس پۆک)یان کاندید کردبوو توانییان سەرۆکایەتی وڵات بگرنەدەست کە یەکێک بوو لە هاوڕێکانی (جاکسۆن)، حزبی وەگەکان گەیشتە ئەو باوەڕەی کە هێزی سیاسییان لە ڕۆژئاوا لە پاشەکشێدایە، دەبینین یەکگرتن لە نێوان ئەو حزبە و جوتیارەکانی ڕۆژئاوادا ڕوویەندا تا ساڵی (١٨٦٠) کاتێ لەو ساڵەدا هەردوولایان خۆیان ناونا کۆماریەکان.[1]

---

١- فرحات زيادة و ابراهيم فريجي: تاريخ الشعب الأمريكي،ص ١١٨.

**يەكەم/ بارودۆخی سیاسی ئەمریكا**

دوای جەنگـی سـەربەخۆیی ئەمریكـا لە سـاڵی (١٧٧٥- ١٧٨٣)، دابەشـبوونی سیاسی لە ناوخۆی ئەمریكا ڕوویدا و ململانێی پارتە سیاسییەكان دەستی پێكرد بە ئامانجی دەست بەسەرداگرتنی حكومەت، لەم نێوەندەدا چەند كەسایەتیەكی تازە دەركەوتن، كە بەمەبەستی سەرنج ڕاكێشانی خەڵك و زاڵبوون بەسەریاندا سیاسەت و ڕێگای جۆراوجۆریان بەكاردەهێنا.[١]

بەرەنگـاریكردنی باجەكـان لە كۆنگرێسـدا، بـووە هـۆی دوورخسـتنەوەی پەیوەنـدییەكانی خـاوەن بەرژەوەنـدییە بازرگـانی و پیشەسـازەكان لەلایەك، و كشـتیاران و پیشەسـازیە بچووكەكـان لەلایەكـی تـرەوە، (ئەلكسـەندەر هـاملتۆن)، سەركردایەتی لایەنی یەكەمی دەكرد كە (فیدراڵیەكان) بوون، (تۆماس جیفرسۆن)یش سـەركردایەتی لایەنـی دووەمـی دەكـرد كە(دژە فیـدراڵیەكان)بوون، كە لە دواییـدا بە (كۆمارییەكان) ناسران.[٢]

فیدراڵیەكان پێیان باش بوو دەسەڵاتەكانی حكومەت فراوان و بەهێز بێت، چونكە بە بڕوای ئەوان دەسـتوور ڕاڤەیەكی فراوانی بۆ دەكرا، و پێویست بوو پێكهاتەی ئەو دەستوورە بە شێوەیەك بێت، ئەو دەسەڵاتە لە چوارچێوەیدا جێی ببێتەوە، ئەمە ئەو شـتە بوو ئەگەر نەبووایە، حكومەتی فیدراڵی نەیدەتوانی بە شـێوەیەكی تێر و تەسەل كارەكانی ئەنجام بدات، لە بەرامبەردا كۆمارییەكان دەیانویست دەسـەڵاتی حكومەتی فیـدراڵی سـنووردار بكرێـت، چـونكە لە نیگـایەكی تەسـكەوە دەیـانڕوانیە دەسـتوور، گەشـەكردنی ئەم دوو پـارتە لەسـەر چەنـد هۆكـارێكی ئـابووری بنیـاتنرا بوون.[٣]

لە مـاوەی سـەرۆكایەتی مـۆنرۆدا بـۆ جـاری دووەم سیسـتمی تـاك حزبـی، بە توندی پیادەكرا، لە كاتێكدا باڵەكانی پارتی فیدراڵی بەرەو داڕووخان دەچوون، دواتر پارتێكی تـازە دەركەوت بەنـاوی (پـارتی گەل)ەوە، نـاوی خۆیـان نـا (دیموكراتەكـان)، یاخود (كۆمارییە دیموكراتەكان)، دەركەوتنی ئەم پارتە تازەیە خۆی لە سەرۆكایەتی (ئاندر و جاكسون)دا بینیەوە، دوا بە دوای ئەویش، پارتێكی تری سیاسی دەركەوت بەنـاوی (پارێزگـاران)ەوە، و بـۆ چەنـد مـاوەیەكی كـورت دەسـەڵاتیان هەبـووە،

---

١ - تشارلز و ماری بیرد: تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية،ج٢/ص ٣.

٢ - فرحات زيادة و ابراهيم فريجي: تاريخ الشعب الأمريكي،ص ٩٥.

٣ - اسماعيل احمد ياغي: معالم التاريخ الأمريكي، ص ١٢٧.

هەرچەندە لە سەرەتادا ئەم پارتە ناوی خۆیان نەنا بە (پارێزگاری)، بەڵکو خۆیان بە (کۆمـاریيە نەتەوەییەکـان) لە قەڵەم دەدا، تـا هەنـدێک لە دەنگەکـانی کۆمارییەکـان بەدەست بهێنن. (۱)

لە نێوان هەمـوو ئەو ڕووداوە سیاسـی و هەڵبژاردن و کەسـایەتییە جیـاوازانەدا، پێنج ئاڕاستەی سەرەکی بووە هۆی ناکۆکی لە نێوان باڵە سیاسیەکاندا، ئەم ئاڕاستە جیـاوازانە هەر لە سـەردەمی دەرکەوتنـی کۆمارییەکـانەوە دەرکەوتـن، گـۆڕانی بارودۆخەکـان بـووە هـۆی دەرکەوتنـی جیاوازیەکـان و زیادبوونیـان، گرنگترینیـان ئەمانەی لای خوارەوە بوون:

**۱. نزمـی بـاجی گـومرگی لە بەرژەوەنـدی کشـتیاران و جوتیـاران، دژی بەرزی باجی گومرگ، بۆ پاراستنی پیشەسازی ئەمریکا.**

لە دوای سـەربەخۆیی ئەمریکـا (۱۷۷٥- ۱۷۸۳) مەسـەلەی گـومرگ خـرایەڕوو، مەبەسـتی سـەرەکی ئەمە بـۆ شـانازی کـردن بـوو بە سـەربەخۆیی سیاسـیەوە، لە ڕێگەی ئەوەی دەوڵەت خۆی پێداویستیەکانی خۆی دابین بکات، لەبەرئەوە بـاجێکی گـومرگی گەورە خرایەسـەر کەل وپەلـی هێنـراو لە ئەوروپـاوە، بەڵام لەلایەن ویلایەتەکـانی باشـووری ئەمریکـاوە بەرەنگـاری ئەم بـاجە گومرگیـانە کـرا، چـونکە ئـابووری سـەرەکی ئەم ویلایەتـانە کشـتوکاڵ بـوو، دانیشـتوانەکەی بەرهەمـی سـەرەتاییان بەرهەم دەهێنـا و دەیاننـاردە دەرەوە، و بە پارەکەشـی کەل وپەلـی پیشەسازی ئەوروپایان پێ دەکڕی، بە دانـانی ئەم گومرگە نرخـی ئەو کەل و پەلانە زیادیان دەکرد.

ئەم کێشەیە لە سەردەمی سەرۆک (ئاندرو جاکسۆن)دا زیاتر توند وتیژ بوو، بە شـێوەیەک بـووە جێـی مەترسـی لەسـەر ویـلایەتە یەکگرتووەکـانی ئەمریکـا، کاتێـک کـۆنگرێس لە سـاڵی (۱۸۳۲) یاسـایەکی دەرکـرد، تیایـدا بڕیـاری دا، بە دانـانی بـاجی گومرگی تازە، ویلایەتی کارۆلینای باشوور دژی ئەم بڕیارە وەستایەوە، چونکە پێی وابوو ئەم گومرگە لە بەرژەوەندی خاوەن پیشەسازەکانی ویلایەتەکانی باکوورە، لە کاتێکدا زیـانێکی زۆر لە کشـتیارەکانی ویلایەتەکانی باشـووری ئەمریکا دەدات، ئەم ویـلایەتە (کارۆلینـای باشـوور)، بەرامـبەر بەم یاسـایە، بڕیـاری جیابوونەوەیـدا لە

۱ - د.عبدالعزیز سلیمان و د.عبدالمجید نعنعي:تاریخ الولایات المتحدة الأمریکیة الحدیث،ص۱۱۷.

یەکگرتوویی ویلایەتەکان، بەڵام کۆنگرێس لە دژی ئەو بڕیارە وەستایەوە، و ئەنجومەنی ئەو ویلایەتەش ناچاربوو پاشەکشێ لە بڕیارەکەی بکات، لەبەرئەوەی لەلایەک ویلایەتەکانی باشوور پشتگیرییان نەکرد لە بڕیارەکەیدا، لەلایەکی تریشەوە سووربوونی سەرۆک (ئاندرو جاکسۆن) لە بەکارهێنانی هەموو ڕێگایەک بۆ پارێزگاری کردن لە کۆنفیدراسۆنی ئەمریکا. [1]

دواتر کارۆلینای باشوور لە ساڵی (١٨٣٣)دا بە سەرکردایەتی (هینری کلای)، گەشتنە ڕێککەوتنێک، کۆنگرێس بڕیاری کەمکردنەوەی باجە گومرگیەکانیدا، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی هەریەک لەو دوو لایەنە هەست بە سەرکەوتنی خۆیان بکەن، (کارۆلینای باشوور) بڕیاری تایبەت بە جیابوونەوەی خۆی هەڵوەشانەوە و بۆ ماوەیەکی کاتی ئاشتی سەراپای وڵاتی گرتەوە، بەڵام پاش سەرکەوتنی (پارێزگاران) لە ساڵی (١٨٤٠) ڕێککەوتنەکەی ساڵی (١٨٣٣)یان هەڵوەشاندەوە و باجە گومرگیەکانیان لەسەر کەلوپەلی پیشەسازی هاوردە بەرزکردەوە، ئەم کارەش بووە هۆی ڕێگە خۆشکردن بۆ هەڵگیرساندنی جەنگێکی ئاشکرا، دیموکراتەکان ئەم بارودۆخەیان پێ باش بوو، بۆیە لە هەڵمەتی هەڵبژاردنەکانی ساڵی (١٨٥٦)دا، بانگەشەی بیرۆکەی (ئازادی بازرگانی)یان دەکرد لە سەرتاپای جیهاندا، کاتێکیش لە هەڵبژاردنەکاندا سەرکەوتنیان بە دەستهێنا، لە ساڵی (١٨٥٧)دا یاسایەکیان دەرکرد، ئەم یاسایە ئەگەر نەبووبێتە هۆی بەدیهێنانی ئازادی بازرگانی تەواو، ئەوا بووە هۆی دابەزاندنی بەشێکی زۆر لە باجە گومرگیە بەرزەکان. [2]

## ٢. بانک و پارەی نەقدی حکومی دژی بانک و پارەی نەقدی ئەهلی:

ڕۆڵی بانکەکان مەسەلەیەکی نیشتمانی زۆر بەرچاو بوو لە ژیانی سیاسی ئەمریکادا، ئەم مەسەلەیەش سیمایەکی هەرێمی وەرگرت و بووە جێی ناکۆکی نێوان ویلایەتەکانی باکوور و باشووری ئەمریکا، لە کاتێکدا ویلایەتەکانی باکوور دەیانویست خەرجە نیشتمانیەکان ڕێکبخەنەوە و بانکێکی ناوەندی بە هێزیان هەبێت، ویلایەتەکانی باشوور بە بیانووی ئەوەی ئەمە هۆیەکە بۆ ئەوەی دەوڵەت

---

١ - د. طليعة الصياح و راغب العلي: تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية، ص ١٠٠.

٢ - بدون مؤلف:موجز التاريخ الأمريكي،ص ٦٧.

یارمەتی پیاوانی خاوەن دەسەڵات و پلە وپایەکان بدات، بۆ زیادکردنی سەروەت و سامانەکانیان دژی ئەم دامەزراوەبوون.[1]

لە ڕووی پراکتیکیەوە، ئەم کارە نەبووە جێی سەرەنجی زۆرینەی زۆری دانیشتوان، هەروەک زۆربەی ئەمریکیەکان بۆ ماوەی چەند ساڵێک هەستیان بە پێویستی گرنگیدان بە بانکەکان نەکرد، ئابووری کشتوکاڵی داگیرگەکان پێویستیان بە پارەیەکی زۆر و بەردەوام نەبوو، بەڵام ئابووری پێشکەوتووی ئەم نەتەوەیە سەرکەوت بەسەر بیرۆکە دواکەوتووە باوەکانی ئابووری، لە سییەکانی سەدەی حەڤدەهەمدا، مشتومڕێکی زۆر هەبوو لەسەر ئەم مەسەلەیە، هەروەها پارەی نەقدیش بووە جێی گفتوگۆ و باس و لێدوان، ئەم پارە نەقدییە بووە هەل و پێویستی بۆ خاوەن کارەکانی شار، بەڵام سەبارەت بە کشتیارەکان، ئەمە وەک هەلێک بۆ دزینی سەروەت و سامان و بەرهەمەکان لە گوندنشینەکان بەکاریان دەهێنا، هەرچەندە پارەی نەقدی زۆر پێویستە بۆ هەر سیستەمێکی بازرگانی یاخود ئابووری، لەگەڵ ئەوەشدا زۆر بە ئاسانی دەبێتە سمبولێک بۆ بەکارهێنانی ئابووری لە بەرژوەندی چەند کەسێکدا.[2]

### ٣. بابەتی چاکسازییە ناوخۆییەکان:

ئەم بابەتە بووە جیاوازی لە نێوان پارتە سیاسیەکاندا،بە جۆرێک دیموکراتەکان پێیان وابوو، نابێت کۆنگرێس ڕێگا نیشتمانیەکان بونیاد بنێت، و دەست بخاتە ناو کارە بازرگانیەکانەوە بەهەر شێوەیەک بێت، کاتێک بڕیارەکەشیاندا، خێرا هەڵگەڕانەوە لە هەموو ئەو پێشینانەی (جیفرسۆن) دایناببوون، بەڵام جێگیر بوون و بەردەوام بوون هەمیشەیی نەبووەتە یاسایەک بۆ سیاسیەکان، بەو شێوەیە لە ماوەیەکی زۆر کورتدا، ئەو سووربوونە لەسەر چاکسازییە ناوخۆییەکان بەرەو کزبوون ڕۆشت، جارێکی تر ئەم بابەتە بە شێوەیەکی تایبەت دەرنەکەوتەوە هەتا دوای دەرکەوتنی هێڵی ئاسنین، دوای ئەوەی دیموکراتە باشووریەکان و پارێزگارە باکووربیەکان ڕێکەوتن لەسەر دروست کردنی هێڵی ئاسنین، بۆ بەستنەوەی

---

١ - د.عبدالعزيز سليمان و د.عبدالمجيد نعنعي: س- پ، ل ١١٨.

٢ - روبرت ام كروندن:موجز الثقافة الأمريكية،تر-مازن حمادة،الاهلية للنشر والتوزيع،عمان،١٩٩٥،ص١٠٥.

کەنارەکانی زەریای (ئەتڵەسی) بە کەنارەکانی زەریای (هادی)یەوە، ناکۆکی کەوتە نێوان هەردوولا لەسەر ئەو ڕێگایەی هێڵە ئاسنینەکەی پێدا بڕوات. [1]

### ٤. فرۆشتنی زەوییە سەربەخۆکان بۆ زیادکردنی داهات:

به ماوەیەکی درێژ دوای جێگیربوونی دەستوور، کۆنگرێس ڕێگایەکی گرتەبەر بۆ فرۆشتنی ئەو زەوییانە لەشێوەی پارچە زەوی بچووک لە داگیرگەکان یاخود لە شێوەی هەرێمی فراوان بەو کەسانەی باج دەدەن، لە کاتێکدا ڕێبازی پارەدان بەو زەوییانە بە سەرپێچی کردن لە ڕۆحی دیموکراتیەت و پەکخستنی پرۆسەی لە ناوبردنی هەژاری لە ناوچە پیشەسازییەکاندا دادەنرێ، لەبەر ئەوە وایان پێ باشتربوو ئەو زەوییانە بەبێ بەرامبەر بدرێ بە داگیرگەکان لە شێوەی پارچە زەوی بەڕووبەری (١٦٠) دۆنم. [2]

کشتیارە بچووکەکان دەیانوویست بەبێ بەرامبەر ئەو زەوییانەیان دەست بکەوێت، لەبەرئەوە شتێکی ئاسایی بوو خاوەن پیشەکان بەمە ڕازی نەبن، چونکە دەترسان ئەوە ببێتەهۆی لە دەستدانی کرێکاری کارگەکانیان، هەربۆیە بە هەموو هێزێکیانەوە بەرەنگاری ئەم داواکارییە بوونەوە، بەرەنگاربوونەوەی کشتیارە گەورەکانیش لە باشووردا لەمە کەمتر نەبوو، ئەوانە نەیاندەویست سیستمێکی ئابووری سەربەخۆ لە زەوییەکانی ڕۆژئاوادا دروست ببێت، پێچەوانەی سیستمە ئابوورییەکەی خۆیان کە لەسەر کۆیلایەتی بنیادنرا بوو، هەروەها کشتیارەکانی باشوور هەوڵی بە دەست هێنانی ئەو زەوییانەیان دەدا، لەبەرئەوەی زەوییانەی بۆ کشتوکاڵ کردن بەکاریان دەهێنان هیلاک و بێ پیت بوو بوون، ئەمە جگە لەوەی ویلایەتەکانی باشوور لە ڕووی سیاسیەوە پێویستی بەزەوییە تازەکان بوو، تابتوانێ لەو ڕێگەیەوە ویلایەتی نوێ دروست بکات کە لەسەر کۆیلایەتی بنیادنرابێ و ژمارەی ئەو ویلایەتانەی پشت بەستوو بوون بەو سیستمە زیاد بکات. [3]

لە کۆتاییدا ڕێکەوتنێک لە نێوان دیموکراتەکان و پارێزگاراندا بەسترا و یاسایەکیان دەرکرد لە کۆنگرێسدا، بەپێی ئەو یاسایە بەبێ بەرامبەر زەوی دەدا بە

---

١ - تشارلز و ماری بيرد: تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية،ج٢/ص ١٣.
٢ - محمد محمود النيرب: المدخل في تاريخ الولايات المتحدة،ج١/ص٢٢٢.
٣ - فرحات زيادة و ابراهيم فريجي: تاريخ الشعب الأمريكي،ص ١٢١.

هەر کەسێک ئارەزووی نیشتەجێ بوونی هەبووایە، دواتر ئەم یاسایە لە ساڵی (١٨٦٠) نێردرا بۆ (جیمس بوکانان) بۆ بڕیاردان لەسەر جێ بەجێکردنی، ئەم یاسایە زیاتر سیمایەکی میللی پێوە دیاربوو، بەڵام دیموکراتەکان لە دژی وەستانەوە، پاش هەڵسەنگاندنی کارەکە لە هەموو لایەنێکی سیاسیەوە، چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە دواکەوت بۆ کاتێکی نادیار لە داهاتوودا.[١]

### ٥. ئازادی دژی کۆیلایەتی لە ناو هەرێمەکاندا:

کێشەی کۆیلەکان، کێشەیەک بوو زیاتر لە نێوان ویلایەتەکانی باکوور و باشووری ئەمریکا قووڵ بوویەوە، ئەم کێشەیە لە ئاستێکی ئابوورییەوە گواسترایەوە بۆ ئاستێکی کۆمەڵایەتی و هەتا بووە کێشەیەکی سیاسی، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کێشەی بوونی ژمارەیەکی زۆری کۆیلەی هەبوو لە زەوییەکانیاندا، کە هەر لە کۆنەوە لە داگیرکەرە ئینگلیزەکانەوە وەریانگرتبوو، لە کاتی دانانی دەستووری ئەمریکیدا ئەم بابەتە خرایە بەرباس و لێکۆڵینەوە لە ڕووی یاساییەوە دانەرانی دەستوور پێیان باش نەبوو ئەم سیستمە بهێڵنەوە، بەوەی بە حوکمێکی تاکە کەسی دادەنرا، هاوکات دەستوور دژی ئەمە بوو.[٢]

لە ساڵی (١٧٧٥)دا پێش دەست پێکردنی شۆڕشی ئەمریکی (بنیامین فرانکلین) کۆمەڵەیەکی لە (بنسلفانیا) بنیادنا، مەبەستی سەرەکیشی هەوڵدان بوو بۆ ڕەتکردنەوەی کۆیلایەتی، لە ساڵی (١٨٠٧)دا، کۆنگرێس بڕیاری دەرکردنی یاسایەکیدا بە قەدەغەکردنی بازرگانی کردن بە کۆیلەوە، ئەم یاسایە لە مایسی ساڵی (١٨٠٨)دا جێ بەجێ کرا، لە (١)ی کانوونی دووەمی (١٨٠٩)دا ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەشداریکردنی ئەمریکیەکانی لە بازرگانی کۆیلەدا قەدەغەکرد، ئەو نوێنەرانەی بەشداری کۆنگرەی (ڤیەننا)یان کرد لە شوباتی ساڵی (١٨١٥) بە فەرمی دژی بازرگانی کۆیلە وەستانەوە.[٣]

ئەو جوڵانەوەیەی ئامانجی نەهێشتنی بازرگانی کۆیلەبوو، لە پشتیەوە پاڵنەرێک هەبوو ئەویش بنچینەکەی ئازادی بیر و ئازادی خۆیی بوو، دانیشتوانی ویلایەتەکانی باکوور لەسەر یەک بیروبۆچوون یەکگرتوو نەبوون سەبارەت بە

---

١ - تشارلز و ماری بیرد: س- پ،ج٢/ص١٤-١٥.

٢ - لويس ي. لوماكس:ثورة الزنوج، تر.ابراهيم عبود،مطبعة الانشاء، ١٩٦٥،ص٢٧.

٣ - الان بالمر:موسوعة تاريخ الحديث،ج٢/ص٢٧٩.

کۆیلەکـان، تیایانـدا بـوو داوای ڕەتکـردنەوەی خێـرای کـۆیلایەتی دەکـرد، هەنـدێکی کەشـیان وەک پارێزگـاران، لەگەڵ کۆیلایەتیـدا نەبـوون، بەڵام پێیـان ئەسـتەم بـوو بتـــوانن ڕەتـــی بـــکەنەوە، بەڵام زۆربەی دانیشـــتوانی بـــاکوور لەم مەســـەلەیەدا بیروبۆچوونێکیان هەبوو خۆی لە دوو ئاڕاستەدا دەبینیەوە، لەلایەکەوە بەرەنگاری بڵاوبـوونەوەی کۆیلایەتیـان دەکـرد لە زەویـیە تازەکانـدا لە ڕۆژئـاوا، لەلایەکـی تریشەوە داوای نەهێشتنی کۆیلەیان دەکرد لە ویلایەتەکانی باشووردا، چونکە پێیان وابـوو لەگەڵ بەرەوپـێش چـوونی ژیانـدا یەک نـاگرێتەوە، کشـتیارە گەورەکـان لە باشـــووردا دژ بە باکورییەکـــان وەســـتانەوە و وەڵامـــی هێرشـــەکانیان دەدانەوە و نارەزاییان بەرامبەر دەردەبڕین، ئەوانەشـی بەشـداربوون لەم نـاکۆکی و ململانێیەدا زۆربەیان لە ئەندامانی کۆنگرێس بوون و ئەوانـی تریشـیان خـاوەن ڕۆژنامەکـان و مامۆستای زانکۆکان و پیاوانی ئایینی و کەسانی سیاسی بوون.[1]

لە ڕاســـتیدا ئەو جیاوازیـــانەی بـــوونە هـــۆی نـــاکۆکی نێـــوان پارێزگـــاران و دیموکراتەکـان لە ململانێکانیانـدا بـۆ وەرگرتنـی دەسـەڵات، لە شـێوەی ڕاڤەکردنـی دەستوریدا گفتوگۆ دەکران، ئەوەی پارێزگاران داوایان دەکرد و بە باشیان دەزانی دیموکراتەکـان بە ناشـەرعی لە قەڵەمیـان دەدا، سـەبارەت بە حکومەتی یەکگرتـوو و دەســـەڵاتەکانی دوو تیـــۆر دەرکەوتـــن، بەپێـــی دەســـتوور، لە ســـاڵی (١٨٥٠)دا دیموکراتەکان بە شێوەیەکی گشتی لایەنگیری ئەو ڕایەیان دەکرد کە دەسـەڵاتەکانی سـنووردار دەکـرد و پێیـان وابـوو دەسـەڵاتەکان بەرفـراوانن و هەمـوو مەسـەلەکانی تـایبەت بە بەرژەوەنـدی گشـتی دەگرێتەوە، کـۆنگرێس هەروەک دەسـتوور بڕیـاری لەسەرداوە، مافی دەرکردنی هەموو یاسـایەکی هەیە کە لە دەسـتووردا ئامـاژەی پێ نەکراوە.[2]

## دووەم/ بارودۆخی ئابووریی ئەمریکا

سروشـــت ئەمریکـــای لە ڕووی کەش و ئـــاوو هەوا و خـــاکەوە بـــۆ دوو بەشـــی سـەرەکی جیاواز لە یەکتـر دابەشـکرد، لەبەر ئەوەش ویلایەتی بـاکوور و باشـووری ئەمریکـا لە ڕووی ئـابوورییەوە جیـاوازبوون، ئەمەش بەهـۆی جیـاوازی ئامـانجی

---

١ - فرحات زيادة و ابراهيم فريجي: تاريخ الشعب الأمريكي،ص ١٢٤-١٢٥.
٢ - تشارلز و ماري بيرد: تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية،ج٢/ص ١٧-١٨.

دانیشتوانی سەرجەم پارچەکانی ویلایەتەکانی باکوور و باشووری یەکگرتووەکانی ئەمریکا بوو، لەوانەش کۆمەڵە کەسێکی سەرمایەدار لە باکوور و ڕۆژهەڵات و بەشێکی گەورە لە وورده جوتیارەکان لە ڕۆژئاوا، چینی سێیەم پێک هاتبوو لە جوتیارە گەورەکان، خاوەنی سنورێکی زۆری موڵک بوون لە باکووردا. [1]

کەوا بێ جیاوازییەکی بەدی کراو هەبوو لە نێوان خاوەن سەرمایە و پیشەوەراندا لە باکووردا، سەرمایەدارو خاوەن کارگەکان داوای ئەوەیان دەکرد ڕێوشوێنی وەها بگیرێتەبەر، بەرژەوەندییە بازرگانی و پیشەسازیەکانیان بپارێزرێت، وەکلابردنی باجی گومرگ لەسەر کاڵا دروست کراوەنیان و ڕێگەدان بە کۆچکردن بۆ ئەمریکا، تا بتوانن ڕێژەیەکی زۆر کرێکار دابین بکەن بۆ کارگەکانیان بەرامبەر کرێیەکی زۆر کەم و بێ بەها، پێدانی هاوکاری دارایی بۆ برەودان بە دروستکردنی ڕێگا وبان و هەڵکەندنی نۆکەندەکان و لێدانی دراوێک کە لەسەر پایەیەکی توند و تۆڵ دامەزرابێت، بەپێی ئەو دراوە ڕێژەی ئەو قەرزانە دیاری بکرێت کە دەیاندا بە کەسانی تر، هەروەها ئەو سودانەی لەو قەرزانەوە وەریان دەگرت، بەوپێیە دیاری بکرێت، بەڵام جوتیارانی باشوور دژی ئەم بۆچوونە بوون واتێدەگەیشتن دژی بەرژەوەندییەکانیان بێت. [2]

پیشەسازی لە ویلایەتەکانی باکووردا جێگەی خۆی گرتبوو، ڕێژەی پیشەسازی و بازرگانی و سەرمایەداری جێگیربووبوو، ئەمەش پەیوەست بوو بە کۆچکردنەوە، بە تایبەت لە کیشوەری ئەوروپاوە، ڕێژەی ئەو کەسانەی کۆچیان کردبوو لە ساڵی (١٨٢٠- ١٨٦٠) زیاتر لە پێنج ملیۆن کۆچبەر بوون، لەگەڵ زیادبوونی کرێکاران لە ناوەندە پیشەسازییە گەورەکاندا، پشت بەستن بە بەکارهێنانی ئامێرەکان زیادیکرد، تاوای لێهات ڕژێمی وەبەرهێنان پەیوەست بێت بە کاتژمێرەکانی کارکردن، لە بری پشت بەستن بە کرێی ڕۆژانە، هەروەها پشتی بە سەرمایەگوزارەکانی ناو بازاڕەکان و مامەڵەکانی نێوانیان دەبەست، ئەم حاڵەتەش بە تەواوی جیاواز بوو لەگەڵ سیستمی وەبەرهێنان لە ویلایەتەکانی باشووردا کە پشت بەستوو بوون بە هێزی کاری ڕەش پێستەکان لە کشتوکاڵدا بە تایبەت لە چاندنی لۆکەدا، وببوو بە

---

١ - د.حسن حجي:معالم التاريخ الأمريكي والاوروبي الحديث،دار النهظة العربية للنشر والتوزيع، بيروت، ١٩٦٨،ص١١١.

٢ - د. طليعة الصياح و راغب العلي: تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية، ص ١٢٤.

ـەردی بناغەی ئابووری ویلایەتەکانی باشوور، ئەمەش وایکرد ویلایەتەکانی باکوور بەرەوپێش چوونی زۆر گەورە و مەدەنی بەخۆوە ببینێ و شاری گەورەی تیادا بنیاد بنرێت، بە پێچەوانەی ویلایەتەکانی باشوور کە هەموویان گوندنشین بوون و تەنها یەک شاری گەورەی تیادا دروست بوو، ئەویش شاری (نیواورلیانز) بوو، ئەمە جگە لەوەی ویلایەتەکانی باکوور بووە شوێنی تەشەنەکردنی پیشەسازییە گەورەکان و وای لێهات ئاسن و ئامێرە کشتوکاڵیەکان و بابەتە چێنراوەکان بە هەموو جۆرەکانیەوەو دروست کردنی کەشتی تێیدا بەرهەم بهێنرێت.[١]

ئابووریی ویلایەتەکانی باشوور تەواو جیاوازی تیادا بەدی دەکرا لەگەڵ ئابووری ویلایەتەکانی باکووری ئەمریکا، بەجۆرێک وەبەرهێنانی لۆکەی ئامادەکراو بۆ ناردنە دەرەوە گرنگیەکی زۆر گەورەی هەبوو، بووە سەرچاوەی سەرەکی بۆ سامان و بڵاوبوونەوەی چاندن و وەبەرهێنان کە پلەی یەکەمی گرت، جگە لە بڵاوبوونەوەی وەبەرهێنانی (برنج) بە درێژایی کەنارەکان و بەرهەمەکانی قامیشی (شەکر و توتن) و چەندین بابەتی جۆراوجۆری کشتوکاڵی لە ویلایەتە سنوورییەکان بەرهەم دەهێنرا، هەروەها پیشەسازی جیاواز لە مەلا و لەولا بڵاوبوویەوە.

کاتێک چاندنی لۆکە جێگەیەکی بەرچاوی بە دەست هێنا، بارودۆخ تەواو گۆڕا، چونکە زیادبوونی لۆکە بووە مایەی زیادبوونی کۆیلە، هەردوو پێکەوە بوونە سەرچاوەی دەوڵەمەند بوونێکی بێ هاوتا، لەبەرئەوەی بە کۆیلەکردنی ڕەش پێستەکان لەو ڕۆژگارەدا ڕووداوێکی کۆن و بەربڵاوبوو لە ویلایەتەکانی باشووری ئەمریکادا، هەرچەندە لە ویلایەتەکانی باکوریش بەم کارە (بە کۆیلەکردنی ڕەش پێستەکان) ئاشنابوو بوون، بەڵام ئەمە زۆر درێژەی نەکێشا لە باکووردا، بەپێچەوانەی باشوور کە دۆخێکی لە بارو گونجا وی هەبوو بۆ بەکارهێنانی کۆیلە.[٢]

لەبەرئەوەی ئەم جۆرە وەبەرهێنانە کشتوکاڵیە پێویستی بە دەستی کار هەبوو، کەبە نرخێکی زۆر هەرزان و لە پلە بەرزەکانی گەرما و شێی زۆردا توانای

١ – د.جلال يحيى:التاريخ الاوروبي الحديث والمعاصر، المكتب الجامعي الحديث، الاسكندرية،ج٢/ص٤٦٠.
٢ – ستيفن فنسنت بنية:أمريكا،ص ١٠٧-١٠٨.

کارکردنی هەبێت، کەوا بوو گەورە جوتیارەکانی ویلایەتەکانی باشوور، ڕێگایەکی گونجاوو ئاسانتریان لە بەکارهێنانی کۆیلە ڕەش پێستەکان دەست نەدەکەوت، تا لە خراپترین بارودۆخدا دوور لە مامەڵەی مرۆڤایەتی بەکاریان بهێنن.

ئەو کۆیلە ڕەش پێستانەی تازە لە ئەفریقاوە هێنرابوون، توانای بەرگەگرتنی گەرما و خراپترین شێوازی ژیانیان هەبوو، زۆرینەی خەڵکی باشوور کۆیلەیان نەبوو، بەڵکو کۆمەڵە کەسانێکی کەم ژمارەیەکی زۆری کۆیلەیان هەبوو، کۆمەڵە کەسانێکی تریش کەمایەتی بوون، کۆیلەیەک یان چەند کۆیلەیەکیان هەبوو، بازرگانی کردن بە کۆیلەوە بە شێوەیەکی گشتی پارە و پولێکی زۆری دەخستە دەست خاوەن کێڵگە گەورەکان و دەسکەوتێکی مام ناوەندیشی بۆ خاوەن کێڵگە مام ناوەندییەکان دەستەبەر دەکرد.[1]

بەهۆی بەکارهێنانی زەوی بەو شێوە بەردەوامە، وایکرد زەویەکان توانای چاندن و وەبەرهێنانی کەم بێتەوە، سیستمی کۆمەڵایەتی هۆکاری داڕووخانی ئابووری بوو، چونکە کشتوکاڵکردن لە ویلایەتەکانی باشووردا پشتی بە کۆیلە دەبەست و هەر ئەمەش بووە هۆی بەکارنەهێنانی ئامڕازەکانی بەرەوپێش چوونی کشتوکاڵی، ئەمەش بووە هەڕەشەیەک لەسەر هێز و توانای زەوییەکان بۆ چاندن و وەبەرهێنان، وردە وردە وای لێهات بڕی تێچوونی کارکردن گرانتربێت و زیاتر بێت لە قازانج، لە ڕاستیدا هەموو شتێک ڕێگە خۆشکەربوو بۆ تێکچوونی پەیوەندییەکانی نێوان ویلایەتەکانی باکوور و باشووری ئەمریکا، خەڵکی باشوور بە ڕق و کینەوە دەیانڕوانیە باکوورییەکان، وایان دەبینی زۆر لاواز و بێ هێزن لە ئاست بەرەنگاربوونەوەی سەرمایەدارانی باکوور، سەرەڕای ئەمەش نەیاندەتوانی لەگەڵ بەرەوپێش چوونە بەدیهاتووەکانی بەشەکانی تری کۆمەڵگەی ئەمریکی بگونجێن، لە سالانی (١٨٥٠)دا جیاوازییەکانی نێوان باکوور و باشووری ئەمریکا بە شێوەیەک دەردەکەوتن، لە شێوەی دوو شاری جیاواز بەدی دەکران، یەکەمیان (باکوور) لە شێوەی شارێکی دیموکراسی، سەرمایەگوزاری، فراوانبوو لەڕووی دانیشتوان و بەرەوپێش چوونی لەسەر ڕێچکەی پیشەسازی بوو، شاری دووەم (باشوور)،

---

١ - لويس ي. لوماكس:ثورة الزنوج، ص٣٠.

ـواکەوتـوو لە ڕووی گەشـەوە، کشـتوکاڵی، پـارێزەر لەسـەر داب و نەریـت و خـۆ
ـەزلزانی و بۆچوونی تایفەگەری.[1]

### سێیەم/ ڕۆڵی لنکۆڵن بۆ پاراستنی کۆنفیدراسیۆنی ئەمریکا

لە (٤)ی ئـازاری (١٨٦١) لنکـۆڵن لە کەش و هەوایەکـی پـڕ لە سەرسـامی و
وریاییدا چووە سەر تەختی حوکم، خەڵک نەیاندەزانی جیابوونەوەی ویلایەتەکانی
باشوور لە کۆنفیدراسیۆنی ئەمریکی چی لێ ئەکەوێتەوە، ئایا هەردوولا ڕێکئەکەون
و ویلایەتەکانی باشـوور دێتەوە نـاو کۆنفیدراسـیۆن، یـان ویلایەتەکانی بـاکوور بە
ناچاری ڕازی ئەبن و مل بۆ جیابوونەوە ئەدەن، یاخود پێی قایل نـابن و ئەکەونە
شـەڕی باشـوور تـا بە زۆر بیهێنـنەوە نـاو کۆنفیدراسـیۆن، بەڵام لنکـۆڵن لە یەکەم
وتاریدا وەک سەرۆک، بە ڕوونی و بێ پێچ و پەنـا سیاسـەتی خۆی ڕوونکردەوە و
ڕایگەیاند پێویستە کۆنفیدراسیۆن بەردەوام بێ و کشانەوەی هەر ویلایەتێک بەتاڵ
و بـێ بنـاغەیە و ڕێ و شـوێنی چالاکـانەش بـۆ پاراسـتنی دەسـتوور و یاسـاکانی
فیدراڵی لە دەستدرێژی هەندێ ویلایەت دائەنرێ، شێوە زمـانی وتـارەکەی بە گشـتی
پڕبوو لە لێبوردن و تونـد وتیژی پێوە دیـار نەبوو، هەوڵیدا هەردوولا یەکبخـات و
بانگیـان بکـات بـۆ یەکبـوون و برایەتـی و ئاشـتی، بەڵام ئەم وتـارە کەفـو کـوڵی
دەروونەکانی دانەمرکاندەوە و تەنها بـانگەوازی بـۆ خـاوکردنەوەی قەیرانەکە کرد،
خەڵک چاوەڕوانی ڕووداوێک بوون یەکێ دەربڕێ، بەڵام هەردوولا کارێکیان نەکرد
ئاگری جەنگ هەڵگیرسـێ، ئەوە لنکۆڵنی زیـاتر سەرسـام کرد و شڵەژاندی، چونکە
دڵنیـا نەبـوو شـوێنکەوتوانی مەبەسـتیان چـیە و داوای چـی لـێ ئەکەن، هاوکـات
نەیدەویسـت شـەڕێکی وا دژی بە کـۆیلەکردن ڕابگەیەنـێ کە بشـکێتەوە بـۆ
جیـابوونەوەی ویلایەتەکـانی پێڕەوکەری کـۆیلەچێتی و بەوە هەڵوێسـتەکە شـڵۆقتر
بکـات، هەروەهـا لەبەر ئەو پێوەنـدییە بازرگانیـانەی کە لەگەڵ خەڵکـی باشـووردا
هەیـانبوو بە شـێکی زۆری خەڵکـی بـاکوور و بەتـایبەت بازرگانـان شـەڕیان
نەئەویست.[2]

---

١ - فرانك ڤيسلويت: الثورة العظمى،تر. لجنة من الاساتذة الجامعين،دار الشرق الجديد،بيروت،ص٩٢-٩٥.
٢ - فرحات زيادة و ابراهيم فريجي: تاريخ الشعب الأمريكي،ص ١٢٧.

## هۆكارەكانى جەنگى ناوخۆيى ئەمريكا

### آ/ هۆكارە ناڕاستەوخۆكان

### يەكەم: هۆكارى ئابوورى

بەرەوپێش چوونى ئابوورى لە ويلايەتە يەكگرتووەكانى ئەمريكا، هۆكارى سەرەكى ململانێى نێوان ويلايەتەكانى باكور و باشوورى ئەمريكا بوو، دواتر بووە هۆى هەڵگيرساندنى جەنگى ناوخۆ.

ويلايەتەكانى باشوور تا سەدەى نۆزدەهەميش ئابوورييەكەيان كشتوكاڵى بوو، ڕژێمى ئابوورى و كۆمەڵايەتى لەسەر بنەماى كشتوكاڵ و جوتيار و كۆيلە دامەزرابوو، بەڵام ويلايەتەكانى باكوور جگە لە بوونى چەند سەرچاوەيەكى دەوڵەمەندى كشتوكاڵى، بوارەكانى بازرگانى و پيشەسازى تيايدا بەردەوام بەرەوپێش چوو.[1]

لە نيوەى يەكەمى سەدەى نۆزدەهەمدا، لە كاتێكدا خۆشگوزەرانى سەراپاى ويلايەتە يەكگرتووەكانى ئەمريكاى گرتبووەوە، جياوازى نێوان ئەو ويلايەتانە بە شێوەيەكى بەرچاو دەركەوت، لێك جيايى ئابوورى هەريەك لە ويلايەتەكانى باكوور و باشوور، بەسترابووەوە بە بەرەوپێش چوونى ئابوورى جياواز بۆ هەريەكەيان، ئەم جياوازيەش لە چەند بابەتێكى ئابوورى گرنگ دەركەوت، وەك پاراستنى گومرگى و مەسەلەكانى دابەشكردنى زەوييەكانى ڕۆژئاوا.[2]

ويلايەتە كشتوكاڵيەكانى باشوور پشتى دەبەست بە هەناردەكردنى بەروبوومەكان بۆ دەرەوەى وڵات، هەربۆيە پابەندبوون بە دانانى باجى گومرگى كەم، واتە دژى ئەو باج و سەرانەيە بوون كە دەسەپێنرا بۆ پاراستنى بەرهەمەكانى ناوخۆ، ئەمە جگە لەوەى باشوور دژى ئەوەبوو حكومەتى فيدراڵى لەسەر ئەوە پێك بێت چاكسازى لە ناوخۆدا بكات، لەوانەش يارمەتى پڕۆژەكان و دابينكردنى قەرز بۆ كۆمپانياكان و پياوانى خاوەن كار بۆ ئەنجامدانى ئەو پڕۆژە چاكسازييانە، وەك دروستكردنى ڕێگاوبان و قيرتاوكردنى، هەروەها دژى ڕژێمى بانك و پارەى حكومى گەشەسەندن و فراوان بوونى كۆمپانياكان و پيشەسازى گەورە

---

١ – د. عبدالوهاب الكيالي: الموسوعة السياسية،دار الفارس للنشر و التوزيع، الطبعة الاولى،عمان،١٩٩١، ج٢ ص ١٨٢.

٢ – د. طليعة الصياح و راغب العلي: س– پ، ل ١٢٤.

ڕەستانەوە، بەڵام ویلایەتەکانی باکوور بووە چەقی جموجۆڵی سەرمایەداری لە مەیدانەکانی پارەو پیشەسازی، پیاوانی خاوەن کار بۆ پاراستنی پیشەسازی وڵات پابەندبوون بە باجە گومرگیە بەرزەکانەوەو، داوایان لە حکومەتی فیدراڵی دەکرد کاربکات بۆ چاککردنی هۆیەکانی گواستنەوە و گەیاندن، هیوایان دەخواست حکومەت کۆمپانیا و پرۆژە داراییە گەورەکانی ژێر دەسەڵاتیان و ڕێکخستنی ئابووری نەتەوەیی لە سەرجەم وڵاتدا بگرێتە ئەستۆ. [١]

مەسەلەی دابەشکردنی زەوییەکانی ڕۆژئاوا، یەکێک بوو لە دیارترین هۆکارەکانی ململانێی ئابووری لەنێوان هەردوو بەشەکەی وڵات، کاتێک داواکارییەکانی خەڵکی ویلایەتەکانی باکوور بۆ حکومەت ئەوەبوو، زەوییەکانی ڕۆژئاوا دابەش بکات بەسەر کۆچبەر و جوتیارە بچووکەکان بە نرخێکی کەم یان بەبێ بەرامبەر، ئەمەش دژی ئارەزووی خاوەن کێڵگە گەورەکان بوو لە باشووردا، کە داوای بە گران فرۆشتنی ئەو زەوییانەیان دەکرد، ئەمەش بۆ ڕێگرتن لە دابەزینی نرخی بەروبوومە کشتوکاڵیەکانیان و بەرگرتن لە بوونی ڕژێمی ئازاد لەو زەوییانەدا نەوەک ببێتە هۆی دروست بوونی ویلایەتی ئازاد، هەربۆیە هەوڵی دروستکردنی ویلایەتی کۆیلەدارییان دا، تا لەو ڕێگەیەوە هاوسەنگی نێوان ویلایەتە ئازاد و کۆیلەدارەکان بپارێزن. [٢]

## دووەم: کێشەی کۆیلایەتی

کێشەی نێوان ویلایەتەکانی باکوور و باشووری ئەمریکا لە ململانێی ئابوورییەوە گۆڕا بۆ ململانێی کۆمەڵایەتی،تا ئاستێک بووە کێشەی کۆیلایەتی و باڵی کێشا بەسەر کێشەکانی تردا، ئەم کێشەیە بووە هۆی فراوان بوونی ئەو کەلێنەی لە نێوان هەردوولادا هەبوو، ململانێکان لەسەر ئەم کێشەیە شێوازی بەرچاوی بەخۆوە دی، کۆمەڵە و بزافە داکۆکی کەرەکان لە نەمانی کۆیلە، هەر لە ساڵەکانی (١٨١٥ز)ەوە سەریان هەڵدا، ئەم کۆمەڵانە بە شێوازێکی کتوپڕ داوای نەهێشتنی کۆیلایەتیان نەدەکرد، بەڵکو وردە وردە بۆ مەسەلەکە دەچوون، بە نیازی

---

١ - اسماعيل احمد ياغي: معالم التاريخ الأمريكي، ١٢٦-١٢٧.

٢ - د. طليعة الصياح و راغب العلي: تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية، ص ١٢٥.

ئەوەی خاوەن کۆیلەکان بە ئاشتیەوە ئەم باوەڕە پەسەند بکەن و داکۆکی لێ بکەن.[1]

لەم نێوەندەدا لەسەر ئاستی جەماوەریش، لەلایەن (ئارسەر و لویس تابان)ەوە بۆ یەکەم جار کۆمەڵەی دژ بە کۆیلەگەری لە ساڵی (١٨٣١) لە (نیویۆرک) دروست بوو، هێندەی نەخایاند ئەو کۆمەڵەیە بووە ڕێکخراوێکی نیشتمانی و کار گەیشتە ئەو ڕادەیەی لە ساڵی (١٨٤٠)، (٢٥٠) هەزار ئەندامی لە دەور کۆبوویەوە، ئەم کۆبوونەوە فراوانە جەماوەرییەش لە ڕێکخراوێکدا، کە بەرگری لە ئازادی کۆیلە دەکرد، بووە مایەی ترس و دڵەڕاوکێی خاوەن کێڵگەکانی باشوور و هەر ئەم ترسەش بوو دووچاری چەند کاردانەوەیەکی کردن، بۆ نموونە لە ویلایەتی (کانساس) لە ساڵی (١٨٥٥)دا، ئەنجومەنی یاسادانان یاسایەکی دەرکرد و بە گوێرەی ئەو یاسایە

هەر کەسێک یارمەتی کۆیلەیەکی بدایە بۆ ڕاکردن مەرگ چاوەڕێی دەکرد.[2]

باکوورییەکان کۆیلایەتیان دەبەستەوە بە شەڕانگێزی و کاری شەیتانیەوە و داوای سڕینەوەی ئەو پەڵە ڕەشەیان دەکرد بە ناوچەوانی دیموکراتیخوازەکانەوە، بەڵام باشوورییەکان وەڵامی ئەم بۆچوونەیان دەدایەوە بەوەی (کۆیلایەتی هەردەم بەشێک بووە لە جیهان یاخود ژیان، هەروەها داکۆکیان لەسەر ئەوە دەکرد، کۆیلایەتی کاڵایەکی بەسوود و باشە و شایەنی ئەوەیە چەک هەڵگرتنە لە پێناو پاراستنیدا).

بەرهەمی لۆکە وەک پادشای ویلایەتەکانی باشووری ئەمریکا بوو، دەستکەوتی گەورە و قازانجی تێدا بە دەست نەدەهات بەبێ بوونی کۆیلە، هەربۆیە ئەم ویلایەتانە داکۆکیان لە بوونی کۆیلە دەکرد، کۆیلە وەک ئامرازێکی سەرەکی بوو بۆ دارایی ویلایەتەکانی باشوور، بەکارهێنانیان لە کشتوکاڵی لۆکەدا زۆر شیاو و گونجا و بوو، ئامانجی سەرەکی دانیشتوانی ئەم ویلایەتانە لە چوارچێوەی سیاسەتی نیشتمانی بە شێوازی داکۆکی کردن لە بەرژەوەندیەکانیان دەرکەوت کە خۆی لە چاندنی لۆکە و خاوەنداریتی کۆیلەو پاڵپشتی و پشتیوانی بەرژەوەندیەکانیان دەبینیەوە.[3]

---

١ - لویس ي. لوماكس:ثورة الزنوج، ص٣١.

٢ - فرزند شیرکۆ: ئەمریکا لە مێژووە وە بۆ داهاتوو،چاپخانەی خاک،سلێمانی ٢٠٠٥،ل٣٨.

٣ - كارلهاينتس دشنر: تاريخ الولايات المتحدة، ص ١٨٢.

ـە ساڵی (١٨٥٤)دا کێشەی کۆیلە لە مەسەلەیەکی کۆمەڵایەتیەوە بووە کێشەیەکی ـیسی و ئاگرێکی بڵێسەسەندوو، ئەمەش بە هۆی هاتنە ناوەوەی ویلایەتی ـتەکساس) بوو بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، ئەم ویلایەتە کاری بە ڕژێمی ـَویلایەتی دەکرد، بەڵام ویلایەتەکانی (کالیفۆرنیا ، نیومەکسیکو و یوتا) بە ـپچەوانەی یەکەم دژی ڕژێمی کۆیلایەتی بوون، کاتێک ویلایەتە یەکگرتووەکانی ـمریکا، خۆی ئامادەکرد بۆ لە خۆگرتنی ئەو ویلایەتانە، یەکێک لە نوێنەران ـاژەی بە پرۆژەی (یاسای لەخۆگرتن) کرد، تیایدا هاتبوو دەبێت کۆیلایەتی ـقەدەغە بکرێت لە هەر ناوچەیەک یاخود هەرێمێک دەوڵەت دەستی بەسەرداگرتبێت ـە (مەکسیک)دا، ویلایەتەکانی باشوور هەڕەشەی کشانەوەیان کرد لە یەکگرتنەکە، ـە کاتێکدا ویلایەتەکانی باکوور ئامانجی نەمانی بڵاوبوونەوەی کۆیلەیان بە دەست ـهێنا لە هەرێمە نوێکاندا، بەڵام هەردوولا لە ساڵی (١٨٥٠) بە شێوەیەکی کاتی گەشتنە ڕێکەوتنێک، کەبە (ڕێکەوتنی مەیسوری) ناودەبرا، تیایدا ویلایەتی ـ(کالیفورنیا) وەک ویلایەتێکی ئازاد هاتە ناو یەکگرتنەکە، هەردوو ویلایەتی ـانیومەکسیکو و یوتا) بە دوو هەرێم دانران کە هیچ یاسایەکی تیادانیە باسی بە ـتاوان دانانی ڕژێمی کۆیلە یاخود دان پیادانانی کۆیلایەتی بکات،[1] بێگومان ململانێی نێوان ویلایەتەکانی باکوور و باشووری ئەمریکا، لەسەر کۆیلایەتی و کۆیلەداری بووە هۆکاری جیابوونەوە و دواتر سەرهەڵدانی جەنگ، کاتێک باکوورییەکان داوای ئازادبوونی کۆیلەیان دەکرد، ویلایەتەکانی باشوور دژی ئەم ئازادکردنە بوون، بە هۆی پێویستیان بە کۆیلە، ئەمەش خۆی لە خۆیدا خزمەتی ئابووری و دارایی ویلایەتەکانی باشووری دەکرد، بەم جۆرە ململانێ و دژایەتی کردن لەسەر ئەو بۆچوونە جیاوازە فراوانتر و قووڵتر دەبوو، و تەشەنەی دەکرد بۆ ناوچەکانی ڕۆژئاوا، ئەم ئامڕازانە بەپەلە کۆبوونەوە و بەرەنگاربوونەوەی کێشەی کۆیلایەتی بووە ململانێیەک، دەرباز بوون لێی مەحاڵ بوو، کاتێکیش پەیوەندییەکان لە نێوان هەردوو ویلایەتەکەدا ئاڵۆز بوو لە ساڵی (١٨٥٦) لەسەر یاسادانان لە کۆنگرێسدا کۆسپ و تەگەرە هاتە بەردەمیان و پێکدادان ڕوویدا لە نێوانیاندا.[2]

١ - کارلتون هيز:التاريخ الاوروبي الحديث(١٧٨٩-١٩١٤)،ص٢٢٦.

٢ - د.اسماعيل احمد ياغي: معالم التاريخ الأمريكي، ص١٣٠.

### سێیەم: هەڵبژاردنی لنکۆڵن بۆ سەرۆکایەتی

هەندێک لەسەرکردە باشوورییە توندڕەوەکان و لە پێش هەموویانەوە (جیفرسۆن دایفیس) کە دواتر بوو بە سەرۆکی ویلایەتە باشوورییە جیابووەکان، لەسەر هەندێک ڕاو وبۆچوون پێکهاتن و پشت ئەستوور بوون لەسەر جێ بەجێکردن و وەرگرتنی وەکو ئامانج و بنچینەیەک بۆ پلانی حزبە دیموکراتیەکان، لەو بۆچوونانەشی لەسەری پێکهاتبوون، دەبێت هەریەک لەو ویلایەتە جیاوازانە سەروەرییەکی سەربەخۆ و مافێکی هەبێت دابڕێژرێت، هەروەها کۆنگرێس هەستێت بە پارێزگاری کردنی کۆیلایەتی لە هەرێمە ڕۆژئاواییەکاندا، پارتی دیموکراتی کاتێک لە نیسانی ساڵی (١٨٦٠) بۆ پاڵێوراوی سەرۆکایەتی کۆبوونەوەیەکی گشتی بەست لە شاری (تشارستون و کارۆلینای باشوور) نوێنەرانی باکوور لەسەر پلانی پێشکەش کراوی ناو کۆنگرە قایل نەبوون، بۆیە نوێنەری (ئەلباما) لە کۆنگرەکە پاشەکشەی کرد و بەدواییدا نوێنەرانی ویلایەتەکانی (مسیسپی، لویزیانا، کارۆلینای باشوور، فلۆریدا، تەکساس، ئەرکەنساس و جۆرجیا) هۆڵی کۆنگرەیان بەجێ هێشت.[1]

لەگەڵ نزیک بوونەوەی وادەی هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی، تا دەهات ئەمریکا ڕووبەڕووی دۆخی نائارامتر دەبوویەوە، کاتێکیش باکورییەکان لە (٦)ی تشرینی دووەمی (١٨٦٠) (لنکۆڵن)ی پاڵێوراوی پارتی کۆمارییان بۆ سەرۆکایەتی هەڵبژارد، ویلایەتەکانی باشوور کۆنگرەیەکیان بەست و بە کۆی دەنگ دژی هەڵبژاردنی لنکۆڵن بوون، لە (٢٠)ی کانوونی یەکەمی (١٨٦٠) دا (کارۆلینای باشوور) پاشەکشەی کرد لە یەکگرتنەکە.[2]

ساڵی دواتریش چەند ویلایەتێکی دیکە لە ویلایەتەکانی باشووری ئەمریکا پاشەکشەیان کرد لە یەکگرتنەکە، ئەوانیش ویلایەتەکانی مسیسپی وئەلباما لە (١١)ی کانوونی دووەمی (١٨٦١)، و جورجیا لە(١٩)ی کانوونی دووەمی (١٨٦١)، و لویزیانا لە(٢٦)ی کانوونی دووەمی (١٨٦١)، و تەکساس لە(١) شوباتی(١٨٦١)، لە ویلایەتەکانی باکووری ئەمریکا جیابوونەوە.[3]

لە (٤) شوباتی(١٨٦١)ی ویلایەتە جیابووەکانی باشوور سەربەخۆیی خۆیان ڕاگەیاند لە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا، نوێنەری ئەم ویلایەتانە لە (مونتگری)

---

١ - فرحات زيادة و ابراهيم فريجي: تاريخ الشعب الأمريكي،ص ١٣٣.

٢ - تشارلز و ماري بيرد: تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية،ج٢/ص ٢٥٠.

٣ - كارلهاينتس دشنر: تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية، ص ١٨٤.

ـه (ئەلباما) کۆبوونەوە و یەکێتیەکی کۆنفیدراڵیان پێکهێنا بە ناوی (هاوپەیمانی ویلایەتە یەکگرتووەکان)، و دەستورێکی کاتیان دانا، (ریتشموند)یان کردە پایتەختی خۆیان و بە شێوەیەکی کاتی (جیفرسۆن دایفیس)یان هەڵبژارد بۆ سەرۆکایەتی.

چەند هەفتەیەکی دواتریش، دەستووری هەمیشەییان ڕاگەیاند، و لەلایەن ئەو ویلایەتانەشەوە ڕەزامەندی لەسەر دەربڕا، دواتر ئەندامانی ئەنجومەنی پیران و نوێنەرانی کۆنفیدراڵ، (جیفرسۆن دایفیس)یان وەک سەرۆکێکی شەرعی هەڵبژارد. ئەو هۆکارانەی باشووری پاڵدا بەلای جیابوونەوەدا، ترسی سەرکردەکانی بوو لە بێبەش بوون و پەراوێز خستن لە سوود و بەرژەوەندییەکی زۆر کە ئومێدی بەدەست هێنانیان دەکرد، بیریاران بینیان ئەو هۆکارانەی شارستانیەتی ئەمریکای زیندوو کردووەتەوە، لە باشووردا ڕەوتێکی لەسەرخۆی هەبووە و هیوای بەرەوپێش چوونی لە دەستداوە. [1]

ویلایەتە جیابووەکان بڕیاریان وابوو ئەگەر ویلایەتەکانی باکوور ڕازی ببن بەو جیابوونەوەیە، ئەوا دەتوانن بە ڕێگەی ئاشتی لەو یەکگرتنە پاشەکشێ بکەن، بەڵام ئەگەر هاتوو باکوورییەکان ڕێگە بەم کارە نەدەن و جەنگ هەڵبگیرسێنن، ئەوا باشوور ئامادەیە سەربەخۆیی خۆی بە هێزی چەک بسەلمێنێت. لە (٤)ی ئازاری (١٨٦١)دا، (لنکۆڵن) لە وتارێکدا کە بە بۆنەی وەرگرتنی پۆستی سەرۆکایەتیەوە پێشکەشی کرد، بە هەموو شێوەیەک دانپیادانانی بەو جیابوونەوەیە ڕەتکردەوە بەوەی لە ڕووی یاساییەوە ئەو کارە دروست نیە، هەروەها ئاماژەی بەوەکرد بە تەنها لە زەوییە تازەکاندا دژی سیستمی کۆیلەگەری دەوەستێتەوە، هاوکات داوای لە باشوورییەکان کرد پاشگەزببنەوە لەو بڕیارەیان و بگەڕێنەوە ناو یەکگرتنەکە، هەروەها کۆنگرێس بە چەندین ڕێگای جیاواز هەوڵیدا باشوورییەکان بگەڕێنێتەوە بۆ ناو یەکگرتنەکە، بەڵام ویلایەتەکانی باشوور ئەوەیان ڕاگەیاند مەحاڵە بتوانن هاوکاری لەگەڵ سەرۆکایەتی تازە و پارتە کۆمارییەکەیدا بکەن، ئەوەشیان خستەڕوو ئەگەر سیستمی کۆیلەگەری نەما یاخود لە ناوچوو، ئەوا ویلایەتەکانی باکوور لە ڕووی سیاسی و ئابوورییەوە باڵادەست دەبێت بەسەر ویلایەتەکانی باشووردا. [2]

---

١ – ولید نویهض:عصر الغلبة اكتشاف أمريكا و المركزية الاوروبية،مركز الدراسات الاستراتيجية والبحوث، الطبعة الاولى،بيروت،١٩٩٢،ص١١١.

٢ – د.عبدالعزيز سليمان و د.عبدالمجيد نعنعي:تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية الحديث،ص١٢٣.

## چوارەم: هەڵوێستی وڵاتانی ئەورووپا

لەگەڵ ئەوەی ویلایەتەکانی باکووری ئەمریکا لە ڕووی ژمارەی دانیشتوان و سەروەت و سامان و پیشەسازی پێویست پێشکەوتووتر بوو لە ویلایەتەکانی باشوور، بەڵام ویلایەتەکانی باشوور چەند هۆکارێکیان هەبوو بڕوایان وابوو بە بەدیهێنانی ئامانجەکەی خۆیان سەرکەوتوو دەبن لە جەنگدا، ئەویش پێیان وابوو بەریتانیا چ ئیمپراتۆریەتی فەرەنسا پێویستیان بە بەرهەمی لۆکەی ویلایەتەکانی باشووری ئەمریکا هەیە، بۆیە لێیان ڕادەبینین لەو جەنگەدا هاوکارییان بکەن و دان بنێن بە یەکێتی کۆنفیدراڵی ویلایەتەکانی باشووردا.[1]

پاش ڕاگەیاندنی جیابوونەوەی ویلایەتەکانی باشووری ئەمریکا لە ویلایەتەکانی باکوور، هەردوولا لە هەوڵ و کۆششی ئەوەدابوون، لایەنگری ئەرورووپا بە دەست بهێنن، باشوور زۆر سووربوو لەسەرئەوەی لایەنگری و پشتگیری ئەورووپا بە تایبەت بەریتانیا بەدەست بهێنێ، لەبەرئەوەی ویلایەتە کشتوکاڵیەکانی باشووری ئەمریکا لە دابینکردنی پێداویستیەکانیدا پشتی بە پیشەسازی بەریتانیا بەستبوو ئەویش لە بەرهەمە پیشەسازیەکان و چەکە سەربازییەکاندا خۆی دەبینیەوە.[2]

بۆ ئەم مەبەستەش، هەریەک لە ویلایەتەکانی باکوور و باشووری ئەمریکا نوێنەری خۆیان ناردە دەرەوە، ویلایەتەکانی باکوور (شارل فرانسیس ئادامس ناودارترین سیاسەتمەداری ئەو سەردەمەیان ناردە دەرەوە و هەوڵی دەدا بەریتانیا وا لێ بکات دان بە ویلایەتە جیابووەکانی باشووردا نەنێت، بەڵام کاتێک (ئادامس گەیشتە ئەوێ، زانی حکومەتی بەریتانیا وەک لایەنێکی جەنگاوەر دانی ناوە بە یەکێتی کۆنفیدراڵی باشووردا، ئەمەش ڕۆژێک پێش گەشتنی بوو بۆ ئەوەی ویلایەتەکانی باکوور ئەم هەنگاوەی بەریتانیایان بە کارێکی ناشایستە لە قەڵەمدا. چونکە ویلایەتەکانی باکوور دەیانویست ویلایەتەکانی باشوور لە ڕووی سیاسەتی دەرەوە لە جیهان دابڕن و هاوکاری دەرەکی بەدەست نەهێنن تا لەو ڕێگەیەوە ئامانجەکەیان (پاراستنی یەکیەتی خاکی ئەمەریکا) بپێکن.[3]

بیروڕاکان لە بەریتانیا دژ یەک بوون سەبارەت بە هەڵوێستیان لەم مەسەلەیەدا و بەسەر دوو گروپدا دابەش بوون، گروپێکیان پێک هاتبوون لە پیاوانی دەوڵەت و

---

١ - کارلتون هیز:س-پ،ت٢٣١.

٢ - د.عبدالعزیز سلیمان و اخرون:س-پ،ل١٢٦.

٣ - د.محمود السید:تاریخ اوروپا والامریکتین،مؤسسة شباب الجامعة،ص١٤٢.

پیشەسازەکان و چینی ڕۆشنبیران، هەرچەندە دژی سیستمی کۆیلەگەری بوون، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا ئارەزوویان دەکرد ویلایەتەکانی باشوور مەسەلەکە بە قازانجی خۆیان بەرنەوە و سەرکەوتن بەدەست بهێنن، ئەمەش بۆ لابردنی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و دابەشبوونی بەسەر دوو دەوڵەتدا تابەیەک پارچەیی نەمێنێتەوە، بەڵام گروپەکەی تریان خۆی لە خەڵکی گشتی و کرێکاراندا دەبینیەوە و بە هەموو شێوەیەک دژی جەنگ بوون و پشتگیری یەکێتی ئەمریکایان دەکرد، چونکە دژی سیستمی کۆیلەگەری بوون، ئەمە جگە لەوەی جەنگی ناوخۆ دەبووە هۆی بڵاوبوونەوەی بێکاری لە نێوان کرێکارەکانی کارگەی چنین لە بەریتانیادا.[1]

مەسەلەی دان پیادانانی کۆنفیدراڵی باشوور هەتا دوای سەرکەوتنی باکورییەکان لە تەموزی ساڵی (١٨٦٣)دا بەهەڵبەسراوی مایەوە، لێرەوە بەریتانیا وازی لە هەموو ئەو بۆچوونانە هێنا کە دان بە سەربەخۆیی باشووردا بنێت.

سەبارەت بە فەرەنساش پێویستی بە بەرهەمی لۆکەی ویلایەتەکانی باشوور هەبوو، سەرەڕای دژایەتی کردنی سیستمی کۆیلایەتی سۆزی بەلایاندا دەچوو، ناپلیۆنی سێهەم (ئیمپراتۆری فەرەنسا) داوای لە دەوڵەتە ئەوروپییەکانی تر کرد، پێکەوە هاوکاری بکەن بۆ پشتگیری کردنی ویلایەتەکانی کۆنفیدراڵی، بەڵام ئەم پێشنیازەی فەرەنسا لەلایەن بەریتانیا و ڕوسیاوە بە توندی ڕەتکرایەوە، دواتر لە دەوڵەتەکانی ئەوروپادا کۆمەڵێک کێشە سەریان هەڵدا، کە سیاسەتی ئەوروپای سەرقاڵ کرد و لە گرنگترین ئەو کێشانەش کێشەی پۆلۆنیابوو لە ساڵی (١٨٦٣-١٨٦٤)، بەڵام ناپلیۆنی سێهەم لەساڵی (١٨٦٣)ەوە هەموو گرنگیەکی بە ئیمپراتۆر (مەکسیمیلیان)دابوو بۆ جێگیرکردنی دەسەڵاتی خۆی لە مەکسیکدا.[2]

### ب/ هۆکاری ڕاستەوخۆ

هۆکاری ڕاستەوخۆی جەنگی ناوخۆیی ئەمریکا، خۆی لە ڕووداوی (فۆرت سومتەر)دا بینیەوە، ئەمەش کاتێک (ئەبراهام لنکۆڵن) پۆستی سەرۆکایەتی وەرگرت، تارادەیەک هەموو ویلایەتەکانی باشوور لە ژێر دەسەڵاتی هاوپەیمانێتی تازەدابوون، تەنها دوو قەڵا لە ژێر دەسەڵاتی هێزە یەکگرتووەکاندا مابوو، یەکێکیان

---

١ - د.حسن صبحي:س-پ،ل ١٢٠.

٢ - تشارلز و ماری بيرد: تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية،ج٢/ص ٣٥.

له بەندەری (تشارلستون) و ئەوی تریشیان له (فلۆریدا) بوو، بەڵام ئەو کێشەیەی ڕووبەڕووی (ئەبراهام لنکۆڵن) بوویەوە قەڵای یەکەمیان (فۆرت سومتەر) بوو. [1]

ئەم قەڵایە پارچەیەک زەوی بوو، سەر بە یاسای ویلایەتە یەکگرتووەکان بوو، پارێزەرانی فیدراڵی کە ژمارەیان (٨٠) کەسێک دەبوو، بە سەرۆکایەتی (روبیر ئەندەرسۆن)، تیایدا نیشتەجێ بوو بوون، له پێش ئەو ڕووداوە (ئەبراهام لنکۆڵن) بڕیاری نۆژەنکردنەوەی ئەو قەڵایەی دابوو، بەڵام حکومەتی فیدراڵی لەدوا ڕۆژی ئەو کارە ترسا و سووربوو لەسەر دەرکردنی پارێزەرەکانی ئەو قەڵایە، ئەم مەسەلەیە مەسەلەیەکی زۆر هەستیار بوو لای (ئەبراهام لنکۆڵن)، دوای دوو دڵیەکی زۆر بڕیاریدا هاوکاری بگەیەنێتە ئەو قەڵایە لەڕێی دەریاوە، چونکە پێداویستیەکانیان زۆر کەم بوو بوویەوە. [2]

له ژێر کاریگەری ئەمەدا، پاش ئەوەی (ئەندرسۆن) دژی ئەوەبوو قەڵاکە بدات بە دەستەوە، هێزەکانی کۆنفیدراڵی بە سەرۆکایەتی (بیربۆریجاد) له بەرەبەیانی (١٢)ی نیسانی ساڵی (١٨٦١) دا، توانی بە ئاگری تۆپەکانی هێزەکەی ناوی ناچاری خۆبەدەستەوەدان بکات، دوای دوو ڕۆژ و له (١٤)ی نیسانی ساڵی (١٨٦١)دا (ئەندرسۆن) خۆی بە دەستەوەدا، هەر له سۆنگەی ئەم ڕووداوەوە ژمارەی ویلایەتە جیابووەکان له حەوت ویلایەتەوە زیادی کرد بۆ یانزە ویلایەت، ئەوانیش ئەمانە بوون: ڤێرجینیا له (١٧) نیسانی ساڵی(١٨٦١)، ئەرکەنساس (٦)ی مایس، تنیسی (٨)ی حوزەیران، کارۆلینای باکوور (٢٠)ی مایسی هەمان ساڵدا له ویلایەتە یەکگرتووەکان جیابوونەوە.

دواتر پایتەختی ویلایەتەکانی هاوپەیمانی له (مونتگری) گۆڕدرا بۆ (ریتچمۆندی ڤێرجینیا)، باکوورییەکان له بەرامبەر ئەو ڕووداوە دوو دڵیان بۆ دروست بوو، له کۆتاییدا ڕێگای جەنگیان گرتەبەر، له (١٥)ی نیسانی ساڵی (١٨٦١) دا (ئەبراهام لنکۆڵن) بەیانێکی دەرکرد و تیایدا داوای له دەسەڵاتدارانی ویلایەتە لایەنگرەکانی کرد (٧٥,٠٠٠) هەزار جەنگاوەری خۆبەخشکار کۆبکەنەوە بۆ خزمەتی سەربازی بۆ ماوەی سێ مانگ بۆ بەرەنگاربوونەوەی دوژمن، بەم جۆرە جەنگی ناوخۆیی دەستی پێکرد. [3]

---

١ - د.حسن صبحي:س-پ،ل١١٦.

٢ - فرحات زيادة و ابراهيم فريجي: س-پ،ل١٣٦.

٣ - كارلهاينتس دشنر: س-پ،ل١٨٦.

### ڕووداوەکانی جەنگ

پێویستە توانای ئابووری و سەربازی هەریەک لە ویلایەتەکانی باکوور و باشووری ئەمریکا دەست نیشان بکەین، کە هەر یەکەیان تایبەتمەندی خۆیانیان هەبوو، ویلایەتەکانی باکوور بەوە جیادەکرانەوە، لە ڕووی ژمارەی دانیشتوانەوە ژمارەیان زۆربوو بە شێوەیەک بەپێی ئاماری ساڵی (١٨٦٠)، ژمارەی دانیشتوانی ئەو بیست و سێ ویلایەتەی لە ژێر سەرکردایەتی یەکێتی فیدراڵیدابوون، بیست و دوو ملیۆن کەس دەبوون، بەرامبەر یانزە ویلایەتی سەر بە کۆنفیدراڵی (یەکێتی هاوپەیمانی)، کە دانیشتوانەکەی دەگەیشتە نۆ ملیۆن کەس، و زیاتر لە سێ ملیۆن و نیویان لە ڕەش پێستەکان بوون، ئەمە جگە لەوەی ویلایەتەکانی باکوور لە ڕووی ئابووری و پیشەسازییەوە لە سەرەتای چلەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا زۆر پێشکەوتوو بوون،، بەهۆی بەکارهێنانی ڕێگای تازەی بەرهەمهێنانی و بەکارهێنانی (خەڵوزی ئەنتراسیت) و ووزەی هەڵم پیشەسازی ئاسن پێشکەوتنێکی بەرچاوی بەخۆیەوە بینی، دەستیان کرد بە بونیادنانی هێڵە ئاسنینەکان، بە جۆرێک کردارەکانی گواستنەوەی پێداویستیەکانی بۆ بەرەکانی جەنگ خێراترکرد، درێژی هێڵەکانی ئاسن لە ویلایەتەکانی باکووردا دەگەیشتە (بیست و دوو هەزار میل) لە کاتێکدا لە ویلایەتەکانی باشووردا درێژی ئەم هێڵانە دەگەیشتە نۆ هەزار میل.[1]

ویلایەتەکانی باشووری ئەمریکا ویلایەتی کشتوکاڵی بوون، و لۆکە و توتن و برنج و قامیشی شەکریان بەرهەم دەهێنا، بەڵام لە ڕووی پیشەسازییەوە دواکەوتوو بوون، بۆیە لە کاتی جەنگدا پشتیان بە هاوکاری دەرەکی بەستبوو، زۆربەی پێداویستیەکانی جەنگیان لە ئەوروپاوە پێ دەگەیشت، لەبەرامبەردا ویلایەتەکانی باکووری ئەمریکا زۆربەی پێداویستیەکانی جەنگی بۆ خۆی دابین دەکرد، سەرەڕای ئەوەش باشوورییەکان توانیان بۆ ماوەی چوار ساڵ بەرەنگاری بکەن و بجەنگێن، بەهۆی ئەوەی ئەوان لە زەوییەکانی خۆیاندا دەجەنگان و ڕێگاکانی گواستنەوەیان کورت بوو، هەروەها بەهۆی ئەوەی خۆیان جووتیار بوون، توانای بەرگەگرتنی ژیانی سەخت و ڕۆژانی جەنگیان زۆرتر بوو، سەبارەت بە هێرشە سەربازییەکان، حکومەتی یەکێتی ئەمریکا بۆ پلان و نەخشە جەنگیەکەی لە سێ ئامانجی سەرەکی دەکۆڵیەوە:

---

١ – الن نفنز وهنری شیل کومجر:س-پ،ل٢٦٤.

**یەکەم:** گەمارۆدانی دەریایی بەندەرەکانی باشوور.

**دووەم:**کۆنترۆڵکردنی ڕووباری مسیسپی.

**سێیەم:** دەست گرتن بەسەر ڤێرجینیا و ویلایەتەکانی کەناری ڕۆژهەلات بۆ دەست گرتن بەسەر (ریتجمۆند)ی پایتەختی هاوپەیمانان.

لە سەرەتای ئەو جەنگەدا، تاڕادەیەک هەموو هێزە دەرياییەکان لە ژێر دەستی باکووردا بوو، کە بە هەموویەوە (چل) کەشتی دەبوون، بەڵام لاواز و بێ کەڵک بوون، هەربۆیە وەزیری جەنگ (جیدیون ویلز)، هێزە دەریاییەکانی ڕێکخستەوە و بەهێزی کردن.[1]

ئەبراهام لنکۆڵن سەرۆکی هێزە سەربازییەکان بوو، فەرمانیدا بە کەشتی گەلە سەربازییەکانی ئەمریکا بۆ گەمارۆدانی کەنارەکانی باشوور و ڕێگرتن لە هاتو چۆکردنی هەر کەشتیەکی کۆنفیدراڵی یاخود بیانی، لە سەرەتاوە ئەم گەمارۆ دەرياییە تاڕادەیەک بازرگانی ویلایەتەکانی باشووری تێک شکاند، بە تایبەت بازرگانی لۆکە، بەڵام بە هاتنی ساڵی(١٨٦٣) ئەم گەمارۆیە کاریگەری زۆری کردەسەر ویلایەتەکانی باشوور، تا ئەو ئاستەی نەیاندەتوانی بەرهەمی لۆکە بنێرنە دەرەوە و پێویستیەکانیان لە دەرەوە بهێنێن، وەک پێداویستی جەنگ و پزیشکی و جل و بەرگ، لە کاتێکدا باشوور زۆر پێویستی پێ بوو.[2]

لەم کاتەدا سەرکردەیەکی دەریایی بە هێز و بەناوبانگ دەرکەوت، بەناوی (دیڤید فاراگوت)، سەرکردایەتی دوو شەڕی گەورەی کرد، لە یەکەمیاندا بە سەرکردایەتی کردنی کەشتی گەلێکی ئەمریکا، بەرەو کەنداوی مسیسپی بەڕێکەوت و توانی باشوورییەکان ناچار بکات شاری (نیو ئورلیانز) کە گەورەترین شاری هاوپەیمانەکان و دەوڵەمەندترینیان بوو بدەن بە دەستەوە، لە شەڕی دووەمیاندا لە دەروازەی کەنداوی (موبیل) ڕێگای بۆخۆی خۆشکرد و توانی دەست بگرێت بەسەر کەشتی هاوپەیمانەکاندا و بەندەرەکەی داخست، بەڵام لە ئازاری ساڵی(١٨٦٢) دا کەشتییەکی تازەی جەنگی ڕووپۆشکراو بەپۆڵا (میرماک)، هێرشی کردەسەر کەشتی گەلەکانی حکومەتی یەکێتی و ئەوەندەشی نەمابوو هێرش بکاتە سەر (واشنتۆن) یان (نیویۆرک)، بەڵام کەشتیەکی تۆکمەی حکومەتی یەکێتی بە

---

١ - بدون مؤلف:موجز التاريخ الأمريكي،ص ٨٢.

٢ - د. طليعة الصياح و راغب العلي: س-پ، ل١٣٢.

ـوى (مونيتوز) بەپەلە گەيشتە باشوور و هێرشى كردەسەر (ميرماك) و لە ناوى برد، بەم جۆرە كەشتى گەلەكان لە گەمارۆدانى باشوور و دەست گرتن بەسەر كەنارە گرنگەكان و لە ناوبردنى كەشتيە بازرگانيەكانى هاوپەيمانان خزمەتێكى گەورەى يەكێتى ئەمريكايان كرد.[1]

سەبارەت بە ئامانجى دووەم، هێزە يەكێتيەكان بە سەركردايەتى جەنەراڵ (يوليس گرانت) زنجيرەيەك سەركەوتنيان بە دەست هێنا، كاتێك هێڵى باشوورى ويلايەتى (تنيسى) بڕى و توانى دەست بگرێت بەسەر هەردوو قەڵاى (هينرى و دونلسون) كە دەكەوتنەسەر ڕووبارى (تنيسى و كمبرلند)، بەم شێوەيە زۆربەى بەشەكانى ڕۆژئاواى ئەو ويلايەتە (تنيسى) دەستى بەسەردا گيرا و هێزەكانى هاوپەيمانان ناچاربوون شارى (ناشڤيل) چۆڵ بكەن.[2]

هێزە يەككگرتووەكانى باكوور دواى دەست بە سەرداگرتنى بەندەرى (مفيس)، لە تواناياندا هەبوو (٣٢٠كم) ببڕن و بگەنە ناوچەرگەى باشوور،بەڵام هێزە يەككگرتووەكان هێرشێكى لەناكاويان كرايەسەر لە(شليوە) كە دەكەوتە سەر ئەو لێوارەى دەيڕوانى بەسەر ڕووبارى (تنيسى)دا، ئەو هێزانە لە شوێنەكانى خۆيان مانەوە هەتا هاوكارييان پێ گەيشت و توانيان بەرپەرچى دوژمنەكانيان (هێزە هاوپەيمانەكان) بدەنەوە، لە دواتردا هێزەكانى (گرانت) بە هێواشى بەرەو باشوور كەوتنەرێ، ئامانجى سەرەكيشيان ئەوەبوو بە تەواوى دەست بگرن بەسەر ڕووبارى (مسيسپى)دا، لە كاتێكدا هێزە هاوپەيمانەكانى باشوور بەشێكى گەورەيان لێ چۆڵكردبوو، لە ڕێگەى دەست بە سەرداگرتنى (نيوئورليانز)ەوە، بۆ ماوەيەك گرانت و هێزەكەى لە (فيكسبورگ، مسيسپى)كە جێگايەكى پڕ قەلا و تۆكمەى سەر ڕووباربوو گەمارۆدران لەلايەن هێزە هاوپەيمانەكانى باشورەوە كە چوو بوونە سەر لوتكەى كەنارە بەرزەكان، هێزى دەريايى يەكێتى ئەمريكا نەيدەتوانى هێرشيان بكاتەسەر، تا لە دوايدا (گرانت) هێزەكەى بەرەو باشوورى (فيكسبورگ) كشاندەوە و بۆ ماوەى شەش هەفتە گەمارۆى دان، تا لە(١٨٦٣/٧/٤)دا يەكێتى ئەمريكا توانى دەست بەسەر ڕووبارەكەدا بگرێت و بەوەش توانى (ئەركەنساس، لويزيانا و تەكساس) لە ويلايەتە هاوپەيمانەكان دابڕێت.[3]

---

١ - الن نفنز وهنرى شيل كومجر: تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية،ص٢٦٨.

٢ - د.عبد العزيز سليمان واخرون: تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية، ص ١٢٨.

٣ - روجر باركنسن:موسوعة الحرب الحديثة،تر.سمير عبدالرحيم الضلبي،دار المأمون،بغداد،١٩٩٠،ج٢/ص٦٢١.

سەبارەت بە ئامانجی سێیەم و بەرەی ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵات، سەرەتا هێزەکانی باکوور چەند جارێک هەوڵیاندا دەست بەسەر (ریتجموند)ی پایتەختی ویلایەتەکانی باشووردا بگرن، لە چەند شەڕێکی یەک لەدوای یەکدا لە (ڤیرجینیا شکستیان هێنا، دووری نێوان (واشنتۆن) پایتەختی ویلایەتەکانی باکوور و(ریتجموند) تەنها (١٠٠میل) دەبوو، بەڵام بوونی چەند ڕێگایەکی ئاوی لە نێوانیاندا بوو بوونە خاڵی گرنگی بەرەنگاری، ئەمە جگە لە بەتوانایی سەرکردەکانی سوپای باشور، وەک (روبرت لی) و (توماس ستویول جاکسون)، زۆر بە لێهاتوویی کاریان دەکرد و تاڕادەیەک ئەو کارەی لە بەردەم هێزەکانی باکووردا گران کرد. [1]

یەکەمین هەوڵ لە ١٨٦١/٧/١٦ز دەستی پێکرد، کاتێک سوپای باکوور لەسەر ڕووباری (بول رن)ی باکووری (ڤیرجینیا) بە سوپای باشوور گەیشت، ژمارەی سەربازانی هەریەک لەو سوپایانە سێ هەزار کەس دەبوون، لە جەنگی (بول رنی یەکەم) سوپای باکوور تێکشکا و هەندێکیان بە مەبەستی گەیشتن بە (واشنتۆن)ی پایتەخت ڕایان کرد و سەرباز و کەرەستە جەنگییە بە جێماوەکان کەوتنە دەست سەربازانی باشوور. [2]

شکستی هێزەکانی باکوور لەم جەنگەدا، ئەو هەلەی لە دەستدان کە بتوانن بەیەک لێدان جەنگی ناوخۆیی بە قازانج و سەرکەوتنی خۆیان کۆتایی پێ بهێنن. کاتێک خەڵکی باکوور دووپاتی ماوە درێژی ناڕەحەتیەکەیان دەکردەوە، لە سەرەتای ساڵی(١٨٦٢) سەرکردەیەکی باکوور بە ناوی (جورج ماکلیلان) هەستا بە ئەنجامدانی هەوڵێکی دیکە، پاش ئەوەی سوپاکەی کە لە هەزار جەنگاوەر پێک هاتبوون و بە شێوەیەکی باش مەشەقیان پێکرابوو، بەرەو نیمچە دورگەیەکی نێوان هەردوو ڕووباری (یۆرک) و (جیمس) و دواتر بەرەو (ریتجموند) پێشکەوتن، تا گەیشتن بە سوپای باشوورییەکان بە سەرکردایەتی (روبرت لی)، لە جەنگی (حەوت ڕۆژدا) لە ٢٥ ی حوزەیران تا (٢)تەموزی(١٨٦٢)، هەردوولا زەرەر و زیانێکی زۆریان لێ کەوت و ناچار هێزەکانی باکوور بەرەو (واشنتۆن) پاشەکشەیان کرد. [3]

دوای ئەوەی هێزەکانی باشوور بەرەو باکوور هەڵکشان و توانیان لە شەڕی (بول رنی دووەم) لە(٣٠) ئابی(١٨٦٢) بەسەر هێزەکانی باکووردا

---

١ - د. طليعة الصياح و راغب العلي: س-پ، ل١٣٢.

٢ - فرحات زيادة و ابراهيم فريجي: تاريخ الشعب الأمريكي،ص ١٣٩.

٣ - الن نفنز وهنرى شيل كومجر:س-پ،ل٢٧٠.

سەربکەون، بە هەمان شێوەش لە شەڕی (تشانسیلور زفیل)دا، هێزەکانی باکوور
ـوای شەڕێکی قورس شکستیان هێنا و لە بەرامبەردا هێزەکانی هاوپەیمانانیش
ژیانی(ستونول جاکسون)ی سەرکردەیان لەدەستدا، سەرەڕای ئەوەش هێزەکانی
باشوور نەیانتوانی سەرکەوتنی تەواو بەدەست بهێنن، کاتێک ئەو هێزانە لە ئابی
(١٨٦٢)بە سەر کردایەتی (روبرت لی) بەرەو باکوور کەوتنەڕێ، (ماکلیلان) و
سوپاکەی لە (ئنتیتام) لە ڕۆژئاوای (میریلاند) ڕێیان پێ گرتن و نەیانهێشت
بەرەوپێشەوە بڕۆن، ئەمە بووە هۆی ئەوەی (لی) و سوپاکەی پاشەکشێ بکەن، ئەم
سەرکەوتنە کاری لە (ئەبراهام لنکولن) کرد تا لە ئەیلولی(١٨٦٢)دا ئاگادارییە
بەناوبانگەکەی سەبارەت بە ئازادکردنی کۆیلەکان بڵاوکاتەوە.[١]

لە هاوینی ساڵی (١٨٦٣) دا جەنەراڵ(لی) هەوڵەکەی بۆ داگیرکردنی باکوور
دووبارە کردەوە و لەگەڵ فەرماندەی سوپای باکوور (جورج مید) لە جەنگی
(گیتسبورگ- بنسلڤانیا) پێکداهاتن، ئەم جەنگە بە جەنگی یەکلاکەرەوەی جەنگی
ناوخۆیی دادەنرێت، و بۆماوەی سێ ڕۆژ لە (١-٣)ی تەموزی ئەو ساڵە بەردەوام
بوو، پاش ئەوەی سوپای (لی) زیانێکی زۆری لێ کەوت بەرەو (پوتوماک)
کشانەوە.[٢]

لەوکاتەدا هێزەکانی (گرانت) چوونە ناو (فیکسبورگ- مسیسپی)، توانیان
گەمارۆی کەنارەکانی باشوور بدەن بە پشتێنێکی ئاسنین، بەمەش پێداویستیەکانی
هێزەکانی باشوور لە هەموو ڕوویەکەوە بەرەو کەمبوونەوە دەڕۆشت، بە
پێچەوانەی باکوورەوە کە پێشکەوتنێکی بەرچاوی بەخۆوە بینی، کارگەکان بە
هەموو توانایەکیانەوە کەوتبوونە بەرهەمهێنان و هێزی مرۆیش بەهۆی کۆچە
بەردەوامەکانەوە بەرە بەرە زیادی دەکرد.[٣]

لە تەموزی ساڵی (١٨٦٣)دا هێزەکانی باکوور دەستیان گرت بەسەر قەڵای
(فیکسبورگ)دا، هیچ قەڵایەک نەمایەوە بە دەست باشوورییەکانەوە لە (مسیسپی)دا،
بەمەش لە تشرینی دووەمی هەمان ساڵدا سەرکەوتنیان بەدەست هێنا بەسەر هێزە
باشوورییەکاندا.

---

١ - د. طليعة الصياح و راغب العلي: س-پ، ل١٣٣.

٢ - فرحات زيادة واخرون: س-پ، ل١٤٠.

٣ - د. طليعة الصياح و راغب العلي: تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية، ص ١٣٤.

له ساڵی (١٨٦٤)دا (لنكۆڵن) جەنەراڵ (گرانت)ی كردە سەرۆكی گشتی هێزەكانی باكوور، گرنت بە هاوكاری (ولیم شیرمان) بەرەو ناوچەكانی ڕۆژئاوا بەڕێكەوت، سەركردەی باكوور (شیرمان) توانی سەربكەوێت بەسەر بەرگری هێزەكانی باشوور لە (جورجیا)وە تا زەریای ئەتڵەسی.[1]

لە ساڵی (١٨٦٤) (گرانت) زۆر بە هێواشی بەرەو (ریتجموند) بەڕێكەوت، وهێزەكانی لە هەموو بەرەكانەوە هێرشیان دەكرد، لە ١ی شوباتی (١٨٦٥) سوپاكەی جەنەراڵ (شیرمان) بەرەو باكووری جۆرجیا كەوتەڕێ، لە (١٧)ی شوباتی هەمان ساڵدا باشوورییەكان لە پایتەختی كارۆلینای باشوور (كولۆمبیا) پاشەكشەیان كرد، دواتر (تشارلستون) بەبێ شەڕ كەوتە دەست كەشتیگەلەكانی هێزە یەكێتیەكان، هەڵوێستی هێزەكانی باشوور لە (بیتربورگ) و (ریتجموند)دا زۆر شەرمەزاركەر بوو، ئەوەبوو لە (٢)نیسانی ساڵی(١٨٦٥)دا جەنەراڵ (لی) پاشەكشەی كرد و چووە (ئەبوماتوكس- ڤیرجینیا) و لەلایەن هێزە هاوپەیمانەكانەوە گەمارۆدرا، دواتر لە (٩)ی نیسانی (١٨٦٥)دا خۆی بەدەستەوە داو بەوەش كۆتایی بە جەنگی ناوخۆیی هات.[2]

لەم جەنگەدا بابەتی سەربەخۆیی ویلایەتەكانی باشوور، بوو بە مەسەلەیەكی دۆڕاو، پاڵەوانی ئەم مەسەلە دۆڕاوەش (روبرت لی) بوو، هەرچەندە بەتوانایی و لێهاتوویی سەركردەییدا بووە جێی سەرنج، جگە لەوەش ئەم جەنگە (ئەبراهام لنكۆڵن) گەورەترین پاڵەوانی ویلایەتەكانی باكووری دەرخست، كە ئامانجی سەرەكی ئەوەبوو جارێكی تر یەكێتی ویلایەتەكان بگەڕێنێتەوە، نەك هەر بە هێز و زۆرداری، بەڵكو بە بەكارهێنانی ڕێگای ئاشتی و نەرم ونیانی، هەرچەندە دەسەڵاتێكی وای هەبوو، هیچ یەكێك لە سەرۆكەكانی پێش خۆی ئەو دەسەڵاتەی نەبووە، لەگەڵ ئەوەشدا بە پێی پێوانە و بنەماكانی دیموكراتیەت و حوكمی زاتی دەجوڵایەوە، بەمەش لە ساڵی (١٨٦٤)دا دووبارە بۆ سەرۆك كۆماری هەڵبژێردرایەوە.[3]

سەبارەت بە ژمارەی سەربازانی هەریەك لە هێزەكانی حكومەتی یەكێتی و حكومەتی هاوپەیمانی، بەم شێوەیە بوو: ژمارەی سوپای یەكێتی (٢,٨٩٨,٣٠٤)

---

١ - د.اسماعيل احمد ياغي: معالم التاريخ الأمريكي، ص١٤٠.

٢ - ه.ج.ويلز:مؤجز تاريخ العالم،تر.عبدالعزيز توفيق،مكتبة النهضة المصرية،مطبعة الحارة،مصر،١٩٦٧، ص٣٢٨.

٣ - بدون مؤلف:موجز التاريخ الأمريكي،ص٨٥.

ســەربازو، ژمــارەی ســوپای هاوپەیمــانی (١,٣٠٠,٠٠٠) ســەربازبوون، زیــانی گیــانی هێزەکــانی یەکێتــی (٣٥٩,٥٢٨) ســەرباز و زیــانی گیــانی هێزەکــانی هاوپەیمــانی ٢٥٨,٠٠٠) هەزار سەربازبوو، جگە لە سەدان هەزار بریندار کە بە درێژایی ژیان لە توانای کارکردن کەوتن، تێچوونی ئەو جەنگە بە (دە بلیۆن) دۆلار مەزەندە دەکرا، جگە لەوەی گەلیش لەو جەنگەدا لە ناڕەحەترین ئازار و مەینەتی و دەردەسەریدا ژیانی دەبردەسەر. [١]

لە کاتێکدا بڕیــاری جەنــگ درا، هەریەک لە حکــومەتی یەکێتــی لە (واشــنتۆن) و حکــومەتی هاوپەیمــانی لە (ریتجمونـد)، بازرگانیەک لە بەردەمیانـدا بــوو خۆیــان بۆ ئامــادەنەکردبوو، لە ســــەر هەریەک لەو دوو حکــــومەتە پێویســــت بــــوو هێــــزە سـەربازییەکانیان ڕێـک بخـەنەوە و پڕچەکیـان بـکەن و پێداویسـتیەکانیان بۆ دابـین بکەن، ئەمە جگە لەوەی دەبوو کەسانی شیاو و لێهاتوویان دابنایە بۆ سـەرکردایەتی کردنی هێرشە وشکانی و دەریاییەکان. [٢]

گرفتی دارایی سـەرەکیترین گرفت بوو، حکومەت بۆ ئەوەی سـەرمایەی دەست بکەوێت و پێویستییەکانی جێ بەجێبکات ڕووی کردە سـێ سـەرچاوە (دانـانی باج و دەرکردنی دراو و هاندانی قەرز)، باج بە شێوەیەکی گشـتی یاسـا گومرگیەکـان بـوو، ڕێژەکەی گەیشتە چل و حەوت لە سەدەی نرخی پێویستەکان، لە دوای ئەم باجە لە ســاڵی (١٨٦١)دا بــاجێکی دیــکە بە شــوێنیدا هــات، ئەوەش بــاجی دەســکەوت و بەروبــووم بــوو، ســەرچاوەی دووەم دەکردنــی دراو بــوو بەڵام ســوودێکی زۆری نەبوو، چونکە لەسەر بنەمای بەهاداری تایبەتمەند نەبوو، بۆیە بەهـاکەی سـووک و نرخەکـان بەرزبـوونەوە و لە ئەنجامـدا تێکچـوون و کێشـە کەوتە سیسـتمی دارایـی، بەڵام قەرزەکان سەرچاوەیەکی گرنگ بوون لە بەدیهاتن و چارەسەری سـەروەت و سامانی حکومەتدا، بۆ برەودان و هاندانی ئەم قەرزانە و نەهێشـتنی پشـێوی دارایـی لە وڵاتـدا، حکـومەت پەنـای بردە بەر ڕێکخسـتنی بانـک و ڕاسـتەوخۆ سـەرپەرشـتی کردنی و لە ساڵی (١٨٦٣) یاسایەکی لەو بوارەدا دارشت. [٣]

ئەو نــاڕەحەتی و تەنــگەژانەی ڕووبەڕووی حکــومەتی هاوپەیمــانی باشــوور بــوویەوە، گرانتــر و ئــاڵۆزتر بــوو، ســەرەتا فەرمــانگەیەکی دارایــی نەبــوو وەکــو

---

١ – فرحات زيادة و ابراهيم فريجي: تاريخ الشعب الأمريكي،ص ١٤٠.

٢ – تشارلز و ماري بيرد: تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية،ج٢/ص ٢٩.

٣ – فرحات زيادة و ابراهيم فريجي: س- پ، ل ١٤١.

حکومەتی فیدراڵی متمانەی بخاتەسەر، لەبەر ئەوە پێویست بوو لە نەبوونەوە بیهێنێتەدی، بەڵام لە دوای گەمارۆدانی دەریایی لەسەر باشوور و قەدەغەکردنی هاوردنی شتومەک کە باجی لەسەر دادەنرا پشت بەستن بە یاسا گومرگیەکان هیچ سوودێکی نەبوو، بۆیە پەنای بردەبەر باجی ڕاستەوخۆ و دەکردنی دراوی نوێ ئەم دراوە لەسەر سەرەتادا بەشێکی زۆری ئاڵوگۆڕ پێکرا، بەڵام دواتر داشکانێکی شەرمەزاریانەی دارایی خستەوە.[1]

لە سەرەتای جەنگدا، هەریەک لە دوو حکومەتەکە پشتیان بە سەربازە خۆبەخشکەرەکان بەستبوو، چونکە گوڕوتینێکی و زۆر لە دڵیاندا بوو، بەڵامهەر زوو ئەم گەرمە و گوڕییە لە ناخیاندا نەما، کۆنگرێسی کۆنفیدراڵی لە ئەیلولی ساڵی (١٨٦٢)دا یاسایەکی دەکرد، بەپێی ئەو یاسایە ڕێگەیدا بە حکومەت ئەو گەنجانەی توانای چەک هەڵگرتنیان هەیە و تەمەنیان لە نێوان (١٨- ٤٥) ساڵ دایە بیانکات بە سەرباز، بەڵام ئەم یاسایە خاوەن کێڵگە گەورەکانی نەگرتەوە، لە قۆناغەکانی کۆتایی جەنگدا حکومەتی کۆنفیدراڵی ناچاربوو بکەوێتە بە سەربازگرتنی ڕەش پێستەکان، بەهەمان شێوە کۆنگرێسی فیدراڵیش لە ئازاری ساڵی (١٨٦٢)دا، یاسایەکی دەکرد بۆ بە سەربازگرتنی هەموو ئەو نێرینانەی توانای چەک هەڵگرتنیان هەیە، ئەم سەربازگرتنە هەتا کۆتایی جەنگ بەردەوام بوو.[2]

لە هەردوو حکومەتەکەدا، یاسای سەربازگرتن زۆر بە توندی دژایەتی کرا، و ژمارەی ڕاکردووەکان لە خزمەتی سەربازی زۆر زیادی کرد، لە تەموزی ساڵی (١٨٦٢)دا، حکومەتی فیدراڵی ڕێگەی بەڕەش پێستەکاندا، تا لە خزمەتی سەربازی لە سوپادا بەشداری بکەن، هەر لەو ساڵەوە بەشداریکردنی ڕەش پێستەکان بە شێوەیەکی بەرفراوان دەستی پێکرد، هەرچەندە ئەو ڕەش پێستانە لە مێژووی جەنگی ناوخۆیی ئەمریکادا ژمارەیەکی بێ وێنەیان لە لاپەڕەکانی ئازایی و پاڵەوانێتیدا تۆمارکردووە، لەگەڵ ئەوەشدا بە شێوەیەکی زۆر ناهاوتایانە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرا، بەجۆرێک مووچەی سەربازە ڕەش پێستەکان کەمتر بوو لە مووچەی سەربازە سپی پێستەکان، لە ساڵی (١٨٦٤)دا زیاتر لە (١٨٦) هەزار ڕەش

---

١ - فرحات زيادة و ابراهيم فريجي: س- پ، ل ١٤٢.

٢ - تشارلز و ماری بيرد: س- پ، ل چ٢/ص ٣١.

ـیمت لەو ڕێژەیە(١٣٤) هەزار یان لە ویلایەتەکانی باشوور بوون بەشداربوون لە هێزە دەریایی و وشکانیەکاندا.[١]

ڕۆڵـی ژنـانیش لەم جەنـگەدا کەم نەبـوو، هەرچەنـدە ئەگەر نەشـیان تـوانیبێ بەشـداری ڕاسـتەقینەی کوشـتارەکان بـکەن، لەگەڵ ئەوەشـدا لە سـوپای هەردوو حکومەتەکەدا هەندێک لە ژنان بەجل و بەرگی پیاوانەوە پەیوەندیان کرد بە خزمەتی سەربازییەوە، بەڵام لنان لەو جەنگەدا زیاتر وەک پەرستار کاریان کردووە.[٢]

## ئەنجامەکانی جەنگی ناوخۆیی ئەمریکا

بێگومـان جەنگـی نـاوخۆیی ئەمریکـا لایەنـی ئەرێنـی و نەرێنـی بـوو، ئەمەش بـۆ خـۆی سروشـتی جەنـگە، لایەنە نەگەتیڤەکـان لەوەدایە، ژمـارەیەکی زۆری خەڵـک لەناوچوون و ئەرکێکی گران و قەرزێکی زۆری لە دوای خۆی بەجێ هێشت، ئەمە جگە لە نەهـامەتی و مـاڵ وێرانـی و ئـاوارە بـوون و ڕووخـانی ژێرخـانی ئـابووری وڵات... وهتد.[٣]

هەروەک وێرانکـاریەکی گەورەی لە ویلایەتەکـانی باشـووری ئەمریکـادا بەجـێ هێشت، بەهۆی ئەوەی بوو بوونە گۆڕەپانی جەنگ و کردارە سـەربازییەکان، کاتێک جەنـگ کۆتـایی هـات و سـەربازەکانی سـوپای باشـوور گەڕانەوە بـۆ کـێڵگە و شـارەکانیان، زۆر سەرسـام بـوون بەبینینـی ئەو کاولکـارییەی لە ئاکـامی جەنـگ کەوتبووەوە، بە جۆرێک لە مێژووی ئەمریکادا وێنەی نەبوو، ڕێگاکـانی گواسـتنەوە و پردەکـان وێـران کرابوون و هێڵەکانی ئاسـنین لە نـاوبرابوون، بۆ نمـوونە لە سـاڵی (١٨٦٥) پـاش ئەوەی شــاری (کۆلۆمبیــا)ی پـایتەختی (کارۆلینــای باشــوور)، لە سەردەستی سەربازانی سوپای فیدراڵی بە سـەرکردایەتی (جنرال شـیریان) دەسـتی بەسەردا گیرابوو شارەکە وێران کرابوو، بەشێکی زۆری سوتێنرابوو.[٤]

بـارودۆخی ئـابووری ویلایەتەکـانی باشـوور زۆر خـراپ بـوو، سـەرچاوەیەکی گرنگی سەروەتەکانیان لە دەست چوو، ئەویش ڕەش پێسـتەکان بـوون و ژمارەیان

---

١ - کوزنتسوف:عرض اقتصادي تاريخي،مكتبة التحرير، بغداد،ج٢/ص٧٧.

٢ - كارل إن.ديغلر:الانطلاق من الماضي(القوى التي شكلت أمريكا الحديثة)،تر.صادق ابراهيم عودة،دار الاهلية للنشر والتوزيع،عمان،١٩٩٧،ص٢٦٠.

٣ - جواهر لال نهرو:لمحات من تاريخ العالم،مطبعة دار الكشاف،بيروت،ص١٧٥.

٤ - سيرجون.أ.هامرتن:تاريخ العالم،القاهرة،ج٧/ص٦٨٠.

دەگەیشتە چوار ملیۆن و نرخەکانیان بە دوو ملیار دۆلار مەزەندە دەکرا، ئەم ڕەش پێستانە هۆکاری سەرەکی بەرهەم هێنانی کشتوکاڵ بوون لە کێڵگەکاندا، جگە لەوەش بەهۆی ئەو گەمارۆ دەریاییەی خرابووە سەر کەنارەکانی باشووری ئەمریکا لەلایەن هێزە دەریاییەکانی باکوورەوە ناردنی بەرهەمی لۆکە بۆ دەرەوە وەستێنرا بوو، ئەمەش وایکرد نرخی ئەو بەرهەمە دابەزێت، بەمەش ئابووری ویلایەتەکانی باشوور بەرەو لاوازی دەڕۆیشت، بەهۆی ئەوەی بەرهەمی لۆکە سەرچاوەیەکی سەرەکی ئەو ئابوورییە بوو، کێڵگە بچووکەکانی کشتوکاڵ تاڕادەیەک لە چاو کێڵگە گەورەکاندا زیانیان بەرنەکەوتبوو، بەڵام چەند گرفتێکیان هاتە بەردەم، ئەویش ئەوەبوو کشتیارە بچووکەکان پێویستیان بە پارە هەبوو بۆ چاندنی زەوییەکانیان و کڕینی ئامێرە کشتوکاڵیەکان، بۆیە بڕێک پارەیان بە قەرز وەردەگرت لە بازرگانەکان و دواتریش ناچاردەبوون بە نرخێکی کەم بەرهەمەکانیان هەر بەو بازرگانە بفرۆشنەوە، بەمەش کشتیارەکان هیچ سەرچاوەیەکی بە نرخیان نەما لە ئابووریدا پشتی پێ ببەستن. [1]

کاریگەریەکی تری جەنگ لەسەر لاوازی و داڕووخانی ئابووری ویلایەتەکانی باشوور، کەم بوونەوەی دەستی کاری پێویست بوو لە کێڵگەکانی (قامیشی شەکر ، توتن و لۆکە) ئەم جەنگە ڕق و کینەی لە دڵی هەریەک لە باکوورییەکان و باشوورییەکان دروست کرد و بۆ ماوەی چەند نەوەیەک هەرمایەوە، گەلێک لەو خەڵکانە تووشی دەمارگیری بوون، بەتایبەت لە مەسەلە سیاسیەکاندا، بە جۆرێک تا دوای تێپەڕبوونی بیست ساڵ بەسەر جەنگدا هیچ یەکێک لە دیموکراتەکان نەیانتوانی بچنە (کۆشکی سپی)ەوە. [2]

یەکێک لە ئنجامەکانی تری ئەم جەنگە، ئازادکردنی زیاتر لە (٣) ملیۆن ڕەش پێست بوو لە کۆیلایەتی، بەڵام بارودۆخی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسیان بڕیاری لەسەر نەداربوو، بێ بەش بوون لە چێژوەرگرتن لە یەکسانی کۆمەڵایەتی لەگەڵ سپی پێستەکانی ویلایەتەکانی باشووردا، لە ڕووی ئابوورییەوە بارودۆخیان زۆر خراپ بوو، بۆیە بە ناچاری چوونەوە ژێردەستی خاوەنەکانیان و پارچەیەک زەوییان وەردەگرت لە خاوەن زەوییەکان، بەرامبەر بە بڕێک پارە، ئەمەش جۆرێکی

---

١ - سيرجون.أ.هامرتن:تاريخ العالم،القاهرة،ج٧/ص٦٨٨.

٢ - روز براون: البرازيل (شعبها وأرضها)،تر.محمد عبدالفتاح ابراهيم، مكتبة النهضة المصرية، القاهرة، ١٩٦٩،ص٦٧.

ـیوو له چەوساندنەوەی مرۆڤایەتی، لەم بارودۆخەدا ڕەش پێستەکان لەبری ناوی کۆیله)، ناوی (خزمەتکار)یان لێ نرا و هەروەک پێشتر، له بەرەبەریانەوە هەتا ڕۆژئاوا بوون کاریان دەکرد، تەنانەت ڕووبەڕووی سیستمی سزادانی توند ـبوونەوە، ئەمە جگە لەوەی چەندین ڕێکخراوی نهێنی له باشووردا دامەزرا بوون، وەک ڕێکخراوی (کوکلوکس کلان)، که بەشێکی زۆر له سەرباز و ئەفسەرەکانی سوپای پێشووی باشووری له خۆگرتبوو، چەندین کاری توند و تیژی و کاری تیرۆییان دەکرد له دژی ڕەش پێسته ئازادبووەکان.[1]

ئەو سیاسەتەی کۆمارییه باکوورییەکان ئاماژەیان پێ دەکرد، به دیهات و بەرژەوەندیەکانیان مسۆگەر بوو، له ماوەی ئەو چوار ساڵەی جەنگدا، باجه گومرگیەکان سەرلەنوێ دانرانەوە به ڕێژەیەکی زۆر بەرز، بەجۆرێک له پێشتردا نەگەیشتبووە ئەو ڕێژەیه، بەمە بازرگانی ئازاد که دیموکراتەکانی باشوور داوایان دەکرد، بووە مەسەلەیەکی مردوو، مەسەلەیەکی تر هەر له ڕۆژانی (هاملتون و جیفرسۆن)ەوە قسەی لەسەردەکرا لەلایەن پیاوانی سیاسیەوە، مەسەلەی دانانی سیستمی بانکی نیشتمانی بوو.[2]

یاسای بانکه نیشتمانیەکانی ساڵی (١٨٦٣) و (١٨٦٤)، بەشێوەیەک داڕێژران تارادەیەک ئەو بارودۆخەیان جێگیردەکرد، یاسای یەکەمیان تایبەت بوو به دامەزراندنی ئەو بانکه نیشتمانیانەی توانای دەرکردنی پارەی کاغەزیان هەبوو، یاسای دووەمیشیان له پێناو ڕزگاربوون بوو لەو پاره کاغەزییه باوەڕپێنەکراوانەی بانکه تایبەتیەکان دەریاندەکرد، لەگەڵ بەدەست هێنانی پارەی نیشتمانی ڕاستەقینه، باجێکی زۆر خرایەسەر سەنەدی ئەو بانکانەی پابەندبوون به یاسای تازەوە، ئەم کاره وایکرد هەموو ئەو بانکانەی پارەی کاغەز دەردەکەن، ببنه بانکی نیشتمانی.[3]

سەبارەت به زەوییەکانی ڕۆژئاوا، کۆنگرێس له ئایاری ساڵی (١٨٦٣)دا یاسایەکی دەرکرد، بەپێی ئەو یاسایه، هەموو هاوڵاتیەکی ویلایەته یەکگرتووەکانی ئەمریکا جگه لەوانەی چەکیان هەڵگرتبوو دژی ویلایەته یەکگرتووەکان یان ئاسانکارییان بۆ دوژمن (ویلایەتەکانی کۆنفیدراڵی) کردبوو مافی بەدەست هێنانی پارچەیەک زەوییان هەبوو به ڕووبەری (١٦٠)دۆنم له ڕۆژئاوادا، بەم شێوەیه ئەم

---

١ - د.طليعة الصياح ود. راغب العلي:س-پ،ل١٤٠.

٢ - تشارلز وماری بيرد:س-پ،ج٢/ص٤٣.

٣ - کارل إن.ديغلر: س- پ، ل ٢٦٤.

بــابەتە لەســـەر بنەڕەتێکــی دیموکراســیانە چارەســـەرکرا لە قــازانجی جوتیــارە بچووکەکان.

جەنگی نـاوخۆ هۆکـارێکی سـەرەکی بـوو بـۆ بونیادنـانی هێڵەکـانی ئاسـنین لە سـەرتاپای کیشـوەری ئەمریکـادا، لە کـاتی جەنگـدا چەنـد بڕیارێـک دەرکـران بـۆ دامەزرانـدنی کۆمپانیاکـان بـۆ ڕاکێشـانی هێڵەکـانی ئاسـنین تـا کەنارەکـانی زەریـای هادی.

جەنگی نـاوخۆ شۆڕشـێکی ئـابووری هێنایەکـایەوە لە کـۆمەڵگەی ئەمریکیـدا، لە هەردوو ویلایەتەکانی بـاکوور و باشـوور، دەرکەوتنـی ڕاسـتەقینەی ئەمریکـای نـوێ دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سـاڵانەی جەنـگ، لە گرنگترین ئەنجامە ئەرێنیەکانی ئەو جەنگە پاراســـتنی یەکیەتـــی و یەکپـــارچەیی ئەمریکـــا بـــوو، لەگەڵ بەرەوپـــێش چـــوونی پیشەسـازی، خێـرا بەکارهێنـانی مـادە سروشـتیەکان، بنیادنـانی پیشەسـازی گەورە. دانـانی سیسـتمی بەرهەمهێنـان، فراوانکردنـی کـرداری بازرگـانی دەرەکـی، هانـدانی نەوەی تازە بۆ بەرەوپێش چـوون و سـەرکردایەتی کردنـی پیشەسـازی و سـەرمایە. هەروەک چۆن ئەم جەنگە هاندەرێک بوو بۆ بەرەوپێش چوونی هۆکاری گواستنەوە بە تایبەت بنیادنانی هێڵی ئاسنین، هەروەها هاندانی داهێنانەکان و کرنەوەی بـازاڕی تــازە بــۆ ســاغ کــردنەوەی بەرهەمە کشــتوکاڵیەکان و دەســت پێکردنــی شۆڕشــی کشتوکاڵی، بەهۆی ڕووخانی باشوور لەو جەنگەدا، چینـی خـاوەن کێڵگە گەورەکـان بەرژەوەندی و دەسەڵاتەکانیان ڕووخا لە وڵاتدا، لەگەڵ ئازادبوونی ڕەش پێستەکان و دانانی بنەڕەتێکی تازە بۆ ویلایەتەکانی باشوور لەلایەن نەوەی داهاتووەوە.

هەروەک ئەم جەنـگە خـاوەنی کۆلەکـانی ناچـارکرد واز لە دەسـت گـرتن بەسـەر توانای وڵاتدا بهێنن، دەسەڵاتی ئەرسـتوکراتی لە باشـووردا نەمـا و دەسـەڵات کەوتە دەسـت چینـی بۆرجـوازییە پیشەسـازەکان، ئەمەش هۆکـاری سـەرەکی گەشـەکردنی سەرمایە بـوو لە ویـلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکـادا، بە شـێوەیەکی گشـتی جەنگـی نـاوخۆ، هۆکـاری سـەرەکی بەرەوپـێش چـوونی ئـابووری ویـلایەتە یەکگرتووەکـانی ئەمریکـا بـوو، لە سـێ چـارەکی سـەدەی نۆزدەهەمـدا سـەرمایەداری بە شـێوەیەکی بەرچـاو گەشـــەی کـرد، بەجۆرێـک لە سـاڵی (١٨٤٠)دا ویـلایەتە یەکگرتووەکـانی ئەمریکا بەپلەی پێنجەم دەهات لە جیهاندا لە ڕووی بەرهەمهێنانی پیشەسازییەوە، لە سـاڵی(١٨٦٠)دا بەپـلەی چـوارەم و لە سـاڵی (١٨٧٠)دا بەپـلەی دووەم و لە سـاڵی (١٨٩٤)دا بە پـلەی یەکەم دەهـات و نیـوەی هەمـوو بەرهەمـی پیشەسـازی جیهـانی

بـابەتە لەسـەر بنەڕەتێکـی دیموکراسـیانە چارەسـەرکرا لە قـازانجی جوتیـار
بچووکەکان.

جەنگی نـاوخۆ هۆکـارێکی سـەرەکی بـوو بـۆ بونیادنـانی هێڵەکـانی ئاسـنین لە سـەرتاپای کیشـوەری ئەمریکـادا، لە کـاتی جەنگـدا چەنـد بڕیارێـک دەرکـران بـۆ دامەزرانـدنی کۆمپانیاکـان بـۆ ڕاکێشـانی هێڵەکـانی ئاسـنین تـا کەنارەکـانی زەریـای هادی.

جەنگی نـاوخۆ شۆڕشـێکی ئـابووری هێنایەکـایەوە لە کـۆمەڵگەی ئەمریکیـدا، لە هەردوو ویلایەتەکانی بـاکوور و باشـوور، دەرکەوتنی ڕاستەقینەی ئەمریکای نوێ دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سـاڵانەی جەنـگ، لە گرنگترین ئەنجامە ئەرێنیەکانی ئەو جەنگە پاراسـتنی یەکیەتـی و یەکپـارچەیی ئەمریکـا بـوو، لەگەڵ بەرەوپـێش چـوونی پیشەسـازی، خێرا بەکارهێنـانی مـادە سروشـتیەکان، بنیادنـانی پیشەسـازی گەورە دانـانی سیسـتمی بەرهەمهێنـان، فراوانکردنـی کـرداری بازرگـانی دەرەکـی، هانـدانی نەوەی تازە بۆ بەرەوپێش چوون و سـەرکردایەتی کردنی پیشەسازی و سـەرمایە هەروەک چۆن ئەم جەنگە هاندەرێک بوو بۆ بەرەوپێش چوونی هۆکاری گواستنەوە بە تایبەت بنیادنانی هێڵی ئاسنین، هەروەها هاندانی داهێنانەکان و کرنەوەی بازاڕی تـازە بـۆ سـاغ کـردنەوەی بەرهەمە کشـتوکاڵیەکان و دەسـت پێکردنـی شۆڕشـی کشتوکاڵی، بەهۆی ڕووخانی باشوور لەو جەنگەدا، چینی خـاوەن کێڵگە گەورەکان بەرژەوەندی و دەسەڵاتەکانیان ڕووخا لە وڵاتدا، لەگەڵ ئازادبوونی ڕەش پێستەکان و دانانی بنەڕەتێکی تازە بۆ ویلایەتەکانی باشوور لەلایەن نەوەی داهاتووەوە.

هەروەک ئەم جەنـگە خـاوەنی کۆلەکـانی ناچـارکرد واز لە دەسـت گـرتن بەسـەر توانای وڵاتدا بهێنن، دەسەڵاتی ئەرستوکراتی لە باشـووردا نەمـا و دەسـەڵات کەوتە دەسـت چینـی بۆرجـوازییە پیشەسـازەکان، ئەمەش هۆکـاری سـەرەکی گەشـەکردنی سەرمایە بـوو لە ویـلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکـادا، بە شێوەیەکی گشـتی جەنگی نـاوخۆ، هۆکـاری سـەرەکی بەرەوپـێش چـوونی ئـابووری ویـلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکـا بـوو، لە سـێ چـارەکی سـەدەی نۆزدەهەمـدا سـەرمایەداری بە شـێوەیەکی بەرچـاو گەشـەی کـرد، بەجۆرێـک لە سـاڵی (١٨٤٠)دا ویـلایەتە یەکگرتووەکـانی ئەمریکا بەپلەی پێنجەم دەهات لە جیهاندا لە ڕووی بەرهەمهێنانی پیشەسازییەوە، لە سـاڵی(١٨٦٠)دا بەپـلەی چـوارەم و لە سـاڵی (١٨٧٠)دا بەپـلەی دووەم و لە سـاڵی (١٨٩٤)دا بە پـلەی یەکەم دەهـات و نیـوەی هەمـوو بەرهەمـی پیشەسـازی جیهـانی

بەرهەم دەهێنا، بە بەراوردکردنی ساڵی (١٨٦٠) تا ساڵی (١٨٩٥)، بەرهەمی پیشەسازی حەوت جار زیادیکرد. [1]

لەبەر ئەوەی هەردوو ویلایەتەکانی باکوور و باشووری ئەمریکا، ژمارەیەکی زۆر لە پیاوانیان کردبوو بە سەرباز لە شەڕەکاندا، ژنان هەستان بە ئەنجامدانی چەند ئیش و کارێک کە پێشتر نەیانکردبوو، ژمارەی مامۆستا ژنەکان زیاد بوو بە جۆرێک لە ساڵی (١٨٦٠)دا ژنان نزیکەی چواریەکی مامۆستایانیان پێک دەهێنا، بەڵام لە ساڵی (١٨٧٠)دا سێیەکیان پێک دەهێنا، هەروەها لە ساڵەکانی دوای جەنگدا ژنان بەرەو منبەرەکان بەڕێکەوتن بۆ گفتوگۆکردنی ئەو بابەتانەی تایبەتن بە ژنانەوە، وەک مافی هەڵبژاردن و کارکردنی ژن.

هەندێک لە ژنان، بەتایبەت ئەوانەی بڕوایان بە یەکسانی نێوان هەردوو ڕەگەزی نێر ومێ هەبوو، ئەم جەنگەیان کردە هۆکارێک بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانی خۆیان، (کلارا بارتون) دامەزرێنەری (خاچی سووری ئەمریکی) بوو لە کاتی جەنگدا، لە ساڵی (١٨٨٨) سەبارەت بە ژن دەڵێت: (لە کۆتایی جەنگدا، ژن بۆ ماوەی پەنجا ساڵ لەو بارە سروشتیەی بارودۆخی ئاشتی بۆی دابین دەکرد، پێشکەوت) ئەمە لەوانەیە زیادە ڕەوی تیادابێت، بەڵام ئەم جەنگە ڕێگای لە بەردەم ژندا کورت کردەوە بۆ گەیشتن بە مافەکانیان. [2]

ئەم جەنگە، گرنگترین ڕووداو بوو، بۆ چەند نەوەیەک شوێن پەنجەی خۆی لەسەر گەلی ئەمریکی بە جێ هێشت، و کاریگەریشی لەسەر هەست و سۆزی ئەو گەلە هەبوو، بۆ نموونە بە درێژایی ساڵانی (١٨٦٢- ١٩٠٠) زیاتر لە (٤٨٠) ڕۆمان و چیرۆکی کورت لەسەر جەنگ و کاریگەرییەکانی نووسران، لە ساڵانی (١٨٦٢-١٩٤٨)دا (٥١٢) چیرۆک لەسەر جەنگی ناوخۆ بڵاوکرانەوە، ئەمە جگە لەوەی بە درێژایی ساڵان لە مێژووی هونەری چیرۆک نووسی ئەمریکیدا ئەو چیرۆکانەی لای خەڵک زیاتر دەخوێندرانەوە بریتی بوون لە (کوخ العم توم uncle toms cabin) و (ذهب مع الریح gone with the wind)، یەکەمیان باسی لەو مەسەلە گەورە و سەرەکیانەی دەکرد کە بوونە هۆی ڕوودانی ئەو جەنگە، دووەمیشیان باسی لە ئەنجامەکانی جەنگەکە دەکرد. [3]

---

١ - کوزنتسوف: س- پ، ل ٧٧.

٢ - الن نفنز وهنری شیل کومجر:س-پ،ل٢٨٤.

٣ - کارل إن.دیغلر: س- پ، ل ٢٥٧.

## ڕێکخستنەوەی ویلایەتەکانی باکوور

پاش ئەوەی ویلایەتەکانی باکوور بە سەرکردایەتی (جەنەراڵ لی)سەرکەوتن بەسەر سوپای ویلایەتەکانی باشووردا، و هێزی سەربازی ئەم ویلایەتانە تێک شکا، ئەو یانزە ویلایەتەی جیابوونەوەی خۆیان ڕاگەیاند لە یەکێتی ئەمریکا، حکومەتەکانیان بە جێگری نەمانەوە، بۆیە پێویست بوو لە ڕووی سیاسی وئابوورییەوە هەموو ئەو ڕێ و شوێنانە بگیرێتەبەر بۆ کارئاسانی گەڕانەوەی ئەو ویلایەتانە بۆ باوەشی یەکێتی کۆنفدراسۆنی ئەمریکی، هەروەک پێشتر (ئەبراهام لنکۆڵن) هێڵە سەرەکییەکانی سیاسەتەکەی خۆی لەو بڵاوکراوەیەی (٨)ی کانونی یەکەمی ساڵی (١٨٦٣) دەرخست، کاتێک لێبووردنێکی گشتی بۆ هەموو ئەو باشووریانە دەرکرد سوێندی ملکەچ بوونیان بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکان خواردبوو، هەر لەو ساڵەدا بڕیاریدا دان بە حکومەتی هەر ویلایەتێک دابنێت، بەمەرجێک لە (١٠%)ی دەنگدانی ئەو ویلایەتە سوێندیان بە دڵسۆزی بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکان خواردبێت و پابەندی دەستوور و بڕیارەکانی سەرۆک و کۆنگرێس بن، سەبارەت بە کۆیلە ڕەش پێستەکانیش ئامانجی ئەوەبوو گەرەنتی ئازادبوون و فێربوونیان بداتێ، بەڵام داوای ئەوەی نەکرد مافی موڵکایەتی و دەنگدانیان بدرێتێ.[1]

بەڵام پاش تیرۆرکردنی (ئەبراهام لنکۆڵن) بە پێنج ڕۆژ لە دوای کۆتایی هاتنی جەنگی ناوخۆ لە ساڵی (١٨٦٥)، کەسایەتیەکی تر پۆستی سەرۆکایەتی گرتە دەست ئەویش (ئەندرۆ جونسون) بوو، لە هاوینی ساڵی (١٨٦٥)دا دەستی کرد بەجێ بەجێکردنی پرۆژەکەی (ئەبراهام لنکۆڵن) لەگەڵ هەندێک دەستکاریدا، حاکمێکی بۆ هەر ویلایەتێک لە ویلایەتەکانی باشوور دەست نیشان کرد، مافە سیاسیەکانی بۆ زۆر لە دانیشتوانی ئەو ویلایەتانە گەڕاندەوە، لە هەمان کاتدا لە هەریەک لەو ویلایەتانەدا کۆنگرە بەسترا بۆ ڕەتکردنەوەی بڕیاری جیابوونەوە و قەرزەکانی جەنگ و دانانی دەستووری تازە، لە کۆتاییدا هەریەک لە ویلایەتەکان حاکم و (ئەنجومەنی یاسادانان)ی خۆیان هەڵبژارد، ئەمە جگە لەوەی (جونسون) بڕیاریدا ئەنجومەنی یاسادانانی هەر ویلایەتێک دان بنێت بە ڕاستکردنەوەی دەستووری سیانزەهەمدا (کە ڕەتکردنەوەی کۆیلایەتی تیادا هاتبوو)، ئەوا ڕێگە دەدرێت بە

---

١ – د.عبد العزيز سليمان نوار واخرون: تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية، ص ١٢٥.

دامەزراندنی حکومەتێکی مەدەنی لەو ویلایەتەدا و دووبارە گەڕانەوەی بۆ ناو یەکگرتنەکە. [1]

بەڵام کۆنگرێس بە تەواوی دژی ئەوەبوو نوێنەرانی ویلایەتەکانی باشوور کورسیان لە کۆنگرێسدا هەبێت، هەروەها دژی پرۆژە تایبەتیەکەی (جونسون) بوون سەبارەت بە ڕێکخستنەوەی وڵات، ئەوەش لەبەر چەند هۆیەک بوو، گرنگترینیان ئەوەبوو لە کاتی جەنگدا کۆنگرێس هەموو دەسەڵاتەکانی خۆی لە دەست دا بوو، بەهۆی بارودۆخی جەنگەوە سەرجەم دەسەڵاتەکان لە ژێر دەستی سەرۆک کۆماردابوو، بەڵام لەوە بەدواوە چیتر کۆنگرێس بەوە ڕازی نەبوو چونکە جەنگ کۆتایی پێ هاتبوو، هەروەها زۆر لە دانیشتوانی باکوور پێیان وابوو (جونسون) زۆر بەخشندەیە لەگەڵ ویلایەتەکانی باشووردا بەهۆی ئەوەی خۆی سەر بەو ویلایەتانە بوو، بۆیە پێیان وابوو پێویستە ئەو ویلایەتانە سزای خۆیان وەربگرن ئینجا بگەڕێنەوە ناو کۆنفدراسۆنەکە، هۆیەکی تر بریتی بوو لە ترسی ئەو کۆمارییانەی زۆرینەی ئەندامانی کۆنگرێسیان پێک هێنابوو، چونکە پێیان وابوو گەڕانەوەی دیموکراتە باشوورییەکان بۆ ناو یەکگرتنەکە، دەبێتە هۆی بەهێزبوونی پارتی دیموکراتی لە هەڵبژاردنی داهاتوودا. [2]

لە ساڵی (١٨٦٦)دا کۆنگرێس بڕیاریدا لەسەر پرۆژەی یاسای مافی شارستانیەت و نووسینگەی کۆیلە ئازادکراوەکان، هەریەکێکیان دەسەڵاتی یەکگرتووی بەکاردەهێنا بۆ بەدیهێنانی یەکسانی ڕەش پێستەکان لە بەردەم یاسا و لە کارو چالاکی و شوێنە گشتییەکاندا، سەرەڕای ڕازی نەبوونی (جونسون) بەرامبەر بەو یاسایانە، دواتر کۆنگرێس بڕیاری ڕاستکردنەوەی دەستووری چواردەهەمیدا، ئامانج تیایدا بەخشینی هەموو مافە مەدەنیەکانی ڕەش پێستەکان بوو بە گشتی، مافەکان بەم دەقە دەستەبەر بوو (هیچ ویلایەتێک بۆی نیە دەست بخاتە ژیان و ئازادی و موڵکی هەر مرۆڤێکەوە، تەنها بەپێی یاسا نەبێت، هەروەها پێویستە لەسەر ویلایەتەکان دەستەبەری پارێزگاری یاسایی بکەن بۆ هەمووان بەبێ جیاوازی)، ئەو ڕاستکردنەوەی دەستوورە بە ناڕاستەوخۆیی بڕیاری مافی دەنگدانی بە ڕەش پێستەکاندا لە هەڵبژاردنە گرنگەکاندا، دواتر ئەم ڕاستکردنەوەیە پێشکەشی

---

١ – ديب على حسن: الولايات المتحدة الأمريكية،ص٢٤٥.

٢ – د. طليعة الصياح و راغب العلي: تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية، ص ١٤٢.

ویلایەتەکانی باکوور و باشووری ئەمریکا کرا، بەڵام ئەنجومەنی یاساداناني هەموو ویلایەتەکانی باشوور دژی دان پیادانانی ئەو ڕاستکردنەوەیە بوون، تەنها ویلایەتی (تنیسی) نەبێت، کە ڕەزامەندی خۆی لەسەر دەربڕی، بەم شێوەیە ئەم ویلایەتە گەڕایەوە ناو یەکێتی کۆنفدراسۆنی ئەمریکی و بڕیاریاندا کرداری دووبارە ڕێکخستنەوەی تیادا ئەنجام نەدەن.[1]

زۆرێک لە باکوورییەکان پێیان وابوو، پێویستە پارێزگاری لە مافی ڕەش پێستەکان بکرێت لە باشووردا، لەبەرئەوە کۆنگرێس لە ئازاری ساڵی (١٨٦٧)دا، بێ گوێدانە ئەو حکومەتە مەدەنیانەی لە ویلایەتەکانی باشووردا پێک هاتبوون، یاسای بونیادنانەوەی دەرکرد، بەپێی ئەو یاسایە ویلایەتەکانی باشوور دابەشکران بۆ پێنج ناوچەی سەربازی و هەریەک لەو ناوچانە لە ژێر دەسەڵاتی یەکەیەکی سەربازی دابوون، بۆ پاراستنی ئاسایشی گشتی و سەرپەرشتی کردنی بنیادنانەوە.[2]

هەر لەو یاسایەدا هاتبوو، ئەگەر دانیشتوانی ئەو ویلایەتانەی باشوور دڵسۆزی خۆیان بۆ یەکگرتن و ڕەزامەندییان لەسەر ڕاستکردنەوەی دەستووری چواردەهەم دەربڕن و مافی دەنگدان بدەن بە کۆیلەکان، دەتوانن ڕزگاریان بێت لەو حکومەتە سەربازییە،بگەڕێنەوە ناو یەکگرتنەکە و حکومەتێکی مەدەنی دروست بکەن،

لە ساڵی (١٨٦٩)دا، کۆنگرێس ڕاستکردنەوەی دەستووری پانزەهەمی پێشکەشکرد، بەپێی ئەو ڕاستکردنەوەیە نابێت هاوڵاتیانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە هۆی ڕەگەز یان ڕەنگی پێستەوە بێ بەش بکرێن لە مافەکانیان، دواتر پاش ساڵێک ڕەزامەندی لەسەر ئەم یاسایە دەربڕا.

بەپێی بڕیارەکانی بنیادنانەوە لەلایەن کۆنگرێسەوە، لە هاوینی ساڵی (١٨٦٨)دا، ویلایەتەکانی (ئەرکەنساس، کارۆلینای باکوور، کارۆلینای باشوور، لویزیانا، جۆرجیا، ئەلباماو فلۆریدا) گەڕانەوە ناو کۆنفیدراسۆنی ئەمریکا.[3]

بە تێپەڕبوونی کات، باکوورییەکان بۆیان دەرکەوت ناتوانن کێشەی باشوورییەکان بە یاسا قورسەکان و ململانێکانیان لەگەڵ ئەو ویلایەتانەدا چارەسەر بکەن، بۆیە کۆنگرێس لە ساڵی (١٨٧٢)دا، لێبوردنێکی گشتی دەکرد بۆ هەموو ویلایەتەکانی باشوور، بەمەش هەموو مافە سیاسیەکان بۆ دانیشتوانی ئەو

---

١ - لویس ي. لوماكس:ثورة الزنوج، ص٢٧.

٢ - د. طليعة الصياح و راغب العلي: س-پ،ل١٤٤.

٣ - لويس ي. لوماكس:ثورة الزنوج، ص٢9.

ویلایەتـانە گەڕانەوە، جـگە لە نـزیکەی پێـنج سـەد کەس کە بێبەش کـران لە مـافی دەنگدان و بەدەسـت هێـنانی پۆسـت، ویلایەتەکانی باشـوور وردە وردە دەسـتیانکرد بە هەڵبژاردنی ئەندامانی پارتی دیموکراتی بۆ بەدەستهێنانی پۆستەکان، هەتـا سـاڵی (١٨٧٦) کۆمارییەکان دەسەڵات و پایەی خۆیان لەو ویلایەتانەدا لەدەستدا، تەنهـا لە سێ ویلایەتدا نەبێت.[١]

هەڵبژاردنەکانی ئەو ساڵە ئەوەیان سەلماند کە توند و تیژترین هەڵبژاردن بوو لە مێـژووی ئەمریکـادا، بە شـێوەیەک باشـوور هێمنـی و ئـارامی بەخـۆیەوە نەبینـی تـا ئەوەی سوپای باکوور نەکشێتەوە، لەبەرئەوە سـەرۆک (ردۆفورد هـایس) لە سـاڵی دواتـر هێزەکـانی خـۆی لە ویلایەتەکـانی باشـوور کشـاندەوە و دانـی نـا بە هەرەسـهێنانی سیاسـەتی بنیادنانەوەیـدا، بەمجـۆرە دەسـەڵاتی باکورییەکـان لە ویلایەتەکانی باشـووردا کۆتـایی پێهـات و دوای مـاوەی بنیادنـانەوە کە (١٢) سـاڵی خایاند (١٨٦٥- ١٨٧٧)، هەوڵە ڕاستەقینەکان بۆ بنیادنانەوەی ویلایەتەکانی باشـوور سەرلەنوێ دەستیان پێکرد.[٢]

## گرفت و ئاکامەکانی جەنگی ناوخۆ

### أ. گیروگرفتی دارایی

جەنگـی نـاوخۆ زیـانێکی ئـابووری گەورەی تووشـی حکـومەتی ئەمریکـاکرد، تەنانەت بڕی خەرجیەکانی ئەمریکا لە دۆزینەوەیەوە تا ساڵی هەڵایسانی ئەو جەنگە هێندەی زیانەکانی ئەو شـەڕە نەدەبوو، کاتێک لنکۆڵن دوای کۆتـایی هـاتنی جەنـگ پۆستی سەرۆکایەتی گرتەدەست گەنجینەی وڵات خاڵی ببوو.

ب. ویلایەتەکـانی باشـوور بە حـوکمی دواکەوتوییـان لە ڕووی بـوونی دام و دەزگـای دارایـی کامـڵ و ڕێـک وپـێکەوە تووشـی قەیرانێکـی گەورە هـاتن و نەیاندەتوانی خۆیان ڕێکبخەنەوە.

ج. کێشـەی سـەرباز گرتنـی زۆرەملـێ، یەکێک بـوو لە گرفتە زەقەکـانی هەردوو هەرێـمەکەی ئەمریکـا و نـاڕەزایی خەڵـک لەم حـاڵەتەدا گەشـتە ئاسـتێکی دژوار و

---

١ - محمد محمود النيرب: س-پ،ل٢٨٤.

٢ - فرنسيس فريدمان:موجز التاريخ الأمريكي،ص١١٩.

خۆپیشاندان دەستیپێکرد و ژمارەی ئەوانەی لە هەردوو بەشەکەی ئەمریکادا خۆیان لە جەنگ دزیبووەوە گەشتە (١٠٠) هەزار کەس.[١]

لەئاکامی جەنگی ناوخۆیی ئەمریکا

١ -(٣٥٠) هەزار کوشتاری باکوور.

٢- (٢٥٠) هەزار کوشتاری باشوور.

٣- (٢) ملیار دۆلار زەرەر باشوور بەهۆی ئازادبوونی کۆیلەکان.

٤- کێڵگەکانی شەکر سازی لە لویزیانا وێران بوون.

٥-نرخی لۆکە دابەزی و دەرفەتی ناردەنی لە بری ئەمریکا، میسر و هیند بوون.

٦- پاراستنی یەکێتی (ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا) بە هێزی سەربازی لە ئەنجامە گرنگەکانی ئەم جەنگە بوو.

٧- دروستبوونی ڕق و کینە و دۆخی دەروونی نێوان باکور و باشوور.

٨- تا (٢٠) ساڵ هیچ دیموکراتێک نەیتوانی بچێتە ناو کۆشکی سپیەوە.

٩- هیچ پیاوێکی لە دایکبووی باشوور بو ماوەی (٥٠) ساڵ نەیتوانی ببێتە سەرۆکی (ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا).

١٠- سیستمی کۆیلایەتی باشوور ڕووخا.

١١- کۆمەڵەی نهێنی دژی ئازادبونی کۆیلە و کۆیلە ئازاد بووەکان دروست بوو، لەوانە (کۆمەڵەی کوکلوکس کلان) کە چەندین کاری توند و تیژییان ئەنجامدا.[٢]

لە کۆتاییدا تێبینی ئەو پێشکەوتنە ترسناکەمانکرد لە گەشەکردنی ویلایەتە یەکگرتووەکاندا لە ڕووی ئەو بارودۆخە ناوخۆییەی تێیدا بوو، لە دوای جەنگی ناوخۆ لە چەند لایەنێکەوە، لە بارەی سیاسەتەوە لەسەر چۆنێتی ڕێکخستنی ویلایەتەکانی باشوور وەستاین، هەورەها چاکسازی ئەو کاول بوونەی کە بەهۆی شەڕەکەوە بوو و هەستکردن بە چاکسازی سیاسی جیاواز لە حوکمی ویلایەتەکان و لە حوکمی فیدراڵیدا، هەروەها لە ڕووی ئابووریەوە بینیمان کە وڵاتەکان چی کاری باشیان پێشکەشکرد وەک هێڵی ئاسن و بەستنەوەی بەشێکی کیشوەرەکە بە بەشەکەی ترەوە، لەسەر چاکسازی لە کۆمەڵگەدا وەستاین، هەروەها پێشکەوتنی ژیانی سەلار و ڕۆشنبیری و جۆراوجۆری کارپێکردن، جگە لەوەی چاومان کەوت

---

١ - فرحات زيادة واخرون:س-پ،ل١٥٨.

٢ - د. طليعة الصياح و راغب العلي: س-پ،ل١٣٩.

بەو پێشکەوتنە ناوخۆییە و ئەو ڕووداوە گەورانەی دەرەوە و پەیوەندی وڵات بە دەوڵەتە بیانیەکانی ترەوە و بۆمان دەرکەوت کە گرنگی کەمترە، لە ساڵی (١٨٨٩) (هنری کابوت) کە لە دوای چوار ساڵ بوو بە ئەندام لە ئەنجومەنی پیراندا وتی: (ئەمڕۆ پەیوەندی کردنیان بە وڵاتانی بیانیەوە بۆشاییەکی کەمی پڕکردۆتەوە لە سیاسەتی ئەمریکادا لەگەڵ ئەوەشدا لەوە ناچێ گەل گرنگی وای پێبدەن).

سەیر لەمەدا نیە چونکە لەسەر ئەو وڵاتانە پێویست بوو چاکسازی بکەن، لە دوای جەنگی ناوخۆ ئەم شەڕە یەکەم هۆ بوو بۆ خراپەکاری کە پێویست بوو سەربکەون بەسەر چەرمەسەرییەکاندا کە لەناو خۆوە رووبەڕووی ببوەوە بە تایبەت لەکاتی کردنەوەی بەشی ڕۆژئاوا، لە پاشاندا کارکردن لەسەر گەشەکردنی کاروباری ئابووری و ئاوەدان کردنەوە، جگە لەوەی گرنگیدانی بە سیاسەتی دەرەوە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لە زیادبووندا بوو، ئەگەر ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا وەگرین وردە وردە نزیک دەبێتەوە لە بیری ئەوەی وەک دەوڵەتێکی جیهانی بێت کە بەرژەوەندی بەهێزی هەیە لەپارێزگاری لە سەلامەتی جیهان وای لێ بکات کە هەست بکات بە هاوکاری کردن لەگەڵ ئیمپراتۆریەتی بەرتیانیادا لەبەرسێ هۆکار:

**یەکەم:** جێ بەجێکردنی (بنەمای مۆنرۆ) و فراوانکردنی بازرگانی داواکاریان بۆ دەست بەسەراگرتنی دەوڵەت کە ئارەزووی چاککردنی ئاشتی و دانپێنان بە دۆخی بەرفراوان لە جیهاندا.[1]

**دووەم:** ئەو کاتە ئیمپراتۆریەت گەورەترین بەکرێ گیراوی ویلایەتە یەکگرتووەکان بووە لە بازرگانی درەوەدا.

**سێیەم:** هەردوو دەوڵەتی ئەمریکا و بەریتانیا ڕێک بوون لەسەر هاندانی بنەمای دیموکراتیەت و خۆشەویست کردنی لە جیهاندا.

ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا گرنگی زیاتریاندا بە سیاسەتی دەرەوە بۆ پاراستنی دەوڵەتانی ئەمریکای لاتینی و پارێزگاری لێکردنی لەکاتی پێویستدا خستە سەر خۆی، لەگەڵ ئەمەشدا ڕاگەیاندنی وڵات لە گەورەی خۆی لە بارەی کشتوکاڵ و پیشەسازی و بەردەوام بوو لەسەر دەستکەوتنی بازاڕێکی جیهانی بۆ ساغ

---

١ - د.صلاح احمد هريدي: دراسات في التاريخ الأمريكي،ص ١٦٨.

کـــردنەوەی بەرهەمەکـــان، ئەگەر ئـــێمە هەمـــوو ئەمـــانە لەبەرچـــاوبگرین لە بەرژەوەندییەکانی وڵاتە یەکگرتووەکان لە بازرگانی و زیـادەی خۆشی و پیاهەڵدان بە بەهێزی خۆیان ئەوەمان بۆ دەردەخات کە ئەم وڵاتە وای لێهات لەخۆبایی بێت و بـــڕواتە دەرەوەی ســـنوری خـــۆی، پیاهەڵـــدانی ئەمریکیەکـــان بەهێـــزی خۆیـــان و هەســتکردنیان بەوەی کە بـونەتە وڵاتێکـی گەورە لە ڕووداوێکەوە نەبـووە، بەڵکـوو ئەگەرێتەوە بـۆ کۆتاییەکـانی ڕێگـای نـوێ و توانیـان پەیوەنـدی بازرگـانی لەگەڵ دەرەوەدا ببەستن بەتایبەت لەگەڵ ڕۆژهەڵاتی دووردا کە نێردراوەکانیان زیادیکرد.

## ئەمریکا و جەنگی یەکەمی جیهانی (١٩١٤ – ١٩١٨ز)

جەنگی یەکەمی جیهانی لە هاوینی ساڵی (١٩١٤)دا، لە نێوان هەردوو بەرەی ناوەند (ئەڵمانیاو ئیمپراتۆریەتی نەمسا و مەجەر و دەوڵەتی عوسمانی) و بەرەی هاوپەیمانان (بەریتانیا، فەرەنسا، بەلجیکا، ئیتاڵیا، ژاپۆن) و ڕووسیای قەیسەری دەستی پێکرد دواتر لە ساڵی (١٩١٧) بە هۆی هەڵگیرسانی شۆرشی ئۆکتۆبەرەوە ڕووسیای قەیسەری کشایەوە و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا جێگەی گرتەوە.[١]

وەنەبێ ئەم جەنگە لە خۆرا هەڵگیرسابێ بەڵکو کۆمەڵێک هۆکاری هەبووە، یەکێک لەو هۆکارانە سەرهەڵدانی بیری نەتەوەیی بوو لای گەڵنی جیهانی بۆ سەربەخۆیی و فراوانخوازی، یەکێکیتر لە هۆکارەکانی جەنگ (تەرازووی هێزەکان)ە، وڵسن سەرۆکی ئەمریکا لە ڕۆژانی جەنگی جیهانی یەکەمدا هەستی کرد کە تەرازوویی هێزەکان پرەنسیپێکی بەدوو شەڕەنگێزە، چونکە ئەو پرەنسیپانە هانی سەرۆک دەوڵەتەکانی ئەدا چەشنی پارچە پەنیرێک مامەڵە لەگەڵ نەتەوەکاندا بکەن و چۆن لەگەڵ بازاڕەکانی ئەواندا ئەگونجێ بەبێ هیچ حساب کردنێک پارچە پارچەیان بکەن.[٢]

هەندێک لە فەیلەسوف و سەرکردە سەربازیەکان بە تایبەت شلیفین و مولتکە (moltka) لە ئەڵمانیا و جوفر (joffre) و فوش (foch) لە فەرەنسا باوەڕیان وابوو کە هێرش کردن چاکترە لە بەرگری کردن ئەمانە و هۆکارگەلێکیتر... هتد.[٣]

بەڵام هۆکاری ڕاستەوخۆی جەنگ کوشتنی (ئارشیدۆق فرانسیس فردیناند) برازای پادشای نەمسا بوو لە بەرواری (٢٨) حوزەیرانی (١٩١٤) لەلایەن سێ گەنجی سربییەوە. بەم شێوەیە جەنگی یەکەمی جیهانی هەڵگیرسا و ئەوەی شایەنی باسە ئەوەبوو ئەمریکا سەرەتا بە هۆی پابەندبوون بە (بنەماکانی مۆنرۆ)وە بەشداری لە جەنگدا نەکرد، هۆکارێکی تری بەشداری نەکردنی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە سەرەتاکانی جەنگدا هاتنەسەر کاری دیموکراتەکان بوو (تۆماس ودرۆ وڵسن) و کەرت بوونی کۆماریەکان بوو لەو کاتەدا.

---

١ – د.فرغلي علي تسن: تاريخ أوروپا الحديث المعاصر، جامعة العلاقات الدولية،ص١٦٥.

٢ – د.جفری برۆن:پوختەی مێژووی ئەوروپا، و.نهاد جلال حبيب الله،چاپی یەکەم،٢٠٠٩،ل٦١٠.

٣ – د.خليل علي مراد وجاسم محمد حسن و د. عبدالجبار قادر:دراسات في التاريخ الاوروپی الحديث و المعاصر، الموصل،جامعة الموصل،ص٢٣٤.

پێنج هەفتە دوای کوشتنی (فردیناند) جەنگێک لە نێوان هەردوو بەرەدا ڕوویدا کە تا ئەوکاتە جیهان جەنگی وای بە خۆیەوە نەدیبوو، لەوکاتەدا ئەمریکا تووشی سەرسورمان بوو و بڕیاریاندا بە هیچ شێوەیەک بەشداری جەنگ نەکەن. ئەم بێ لایەنیە پشتگیری لێکرا و داوا لە گەلی ئەمریکا کرا پابەندبن بە بەندەکانی ئەو بڵاوکراوەوە، بەڵام بە تێپەڕبوونی ڕۆژانی جەنگ دەرکەوت پابەندبوون بەبێ لایەنییەوە کارێکی سەختە، چونکە هەریەک لەو دوو لایەنە چەندین جار ئەمریکایان بانگێشت کرد بۆ جەنگ.[1]

(وڵسن)باوەڕی خۆی بەم سیاسەتەوە دەربڕی، بۆیە کاتێک هەواڵی هەڵگیرساندنی شەڕی بیست لە ئەوروپا وتی (سەبارەت بە شەڕ پێویستە لەسەر ئەمریکایەکان بێ لایەن بن لە ڕووی تیوری و پراکتیکەوە، چۆن لە کرداردا بێ لایەنن پێویستە لە باوەڕیشدا بەو شێوەیە بن).[2]

لە پێش هەڵبژاردنی ساڵی (١٩١٦) و لە کاتی شەڕیشدا (وڵسن)لە وتارەکانیدا بە توندی ڕقی خۆی بەرامبەر بەو جۆرە شەڕانە دەردەبڕی، لە هەڵمەتی هەڵبژاردنەکاندا بەرامبەر بە (هیوز)ی پاڵێوراوی دیموکراتەکان بە توندی لە دژی بانگەشەکەرانی شەڕ دەوەستایەوە، خۆشی بە بانگەشەکەری یەکەم دادەنا بۆ ئاشتی لە جیهاندا، ئاماژەشی بەوە دەکرد کە لە نێو گەڵنی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئەو شەڕە هیچ نیە جگە لە جەنگێکی دژ بە شارستانیەت، (وڵسن)مەبەستی دوورخستنەوەی ئەمریکا نەبوو لە جەنگ، بەڵکو دەیویست شەرەف و سەروەری ئەمریکا بپارێزێ لە شەڕی ئەو وڵاتانەی شەڕخواز بوون.[3]

(وڵسن) لە وتارێکی تر سەبارەت بە جەنگ وتی (دەزانم دەتانەوێ ئەم میللەتە لە جەنگە بپارێزم ئەو کاتە هاتووە و پەیمانم داوە کە بە هاوکاریێ خودا و بەپێی توانا ئەمریکا لەم شەڕە بەدوور بگرم، بەڵام ئەرکێکی دیکەشتان داوە بەسەر شانما ئەویش پاراستنی سەروەری ئەمریکایە، ئەم کارەش دەسەڵاتی منی بەسەردا نیە، ئەمەش لەسەر کردەوەی کەسانی دیکە وەستاوە).[4]

---

١ – ستیفن فنسنت بنیة:امریکا،ص١٧٢.

٢ – تشالرز چونسون: امریكا العظمى(القناع و الحقیقة)،تر.د.فاطمة نصر، الطبعة الاولى،٢٠٠٦،ص٧٩.

٣ – د. طليعة الصياح و راغب العلي: تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية، ص ١٨٠.

٤ – اسماعيل احمد ياغي: معالم التاريخ الأمريكي، ص ١٨٥.

بەم شێوەیە (ولْسن)بەرگری لەوە دەکرد ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە جەنگ بە دوور بگرێ، بەڵام دوای هەڵبژاردنەوەی بۆ جاری دووەم لە ساڵی (١٩١٦) چەند هۆکارێک هاتنە پێش ڕێگربوون لە بەردەم بەشداری نەکردنی ئەمریکا لەو جەنگەدا، بۆیە ولْسن لە وتارێکیدا وتی (ئەرکی سەر شانمان ئەوەیە جیهان بکەینە شوێنێکی بێ شەڕ، پێویستە ئاشتی جیهانی لەسەر بنەمای ئازادی سیاسی بێ،ئێمە هەوڵ ئەدەین ئامانجەکانمان گیانی خۆشەویستی تیابێ، ئێمە داگیرکاری و موڵکایەتیمان ناوێ).[1]

### هۆکارەکانی بەشداری ئەمریکا لە جەنگی یەکەمی جیهانیدا

یەکەم: گیانی خۆبەزلزانی سیاسەتی ئەڵمانیا لە ئۆقیانۆسی ئارام و چین و دەریای کاریبی کە سیاسی و ڕۆشنبیرانی ئەڵمانیا پەیڕەویان دەکرد، وای کرد هەستی ئەمریکاییەکانیان لە پێش شەڕ و لە کاتی شەڕدا بەرامبەر بە ئەڵمانەکان بگۆڕێ، لەلایەکی ترەوە پەلاماردانی بەلجیکا لەلایەن ئەڵمانەوە بەبێ هیچ بیانویەک مەترسی و چاوچنۆکیەکانی ئەڵمانیای دەرخست و زیاتر ڕقی لای ئەمریکیەکان دروست کرد دژ بە ئەڵمانیا.[2]

ئەوەی زیاتر گەلی ئەمریکای تووڕەکرد ئەوەبوو کە ئەڵمان بەپێی پەیمانی "سایکس"ی مانگی مایسی (١٩١٦) بەڵێنیدا بوو پەلاماری کەشتیە بازرگانی و نەفەر هەڵگرەکانی ئەمریکا نەدات، بەڵام دواتر ئەو بەڵێنەی نەبردەسەر. ئەڵمانیا سەرکەوتنەکانی بەسەر هاوپەیمانادا لە جەنگی ژێر دەریاییەکاندا بینیەوە، پێش ئەم مێژووەش لە مانگی مایسی ساڵی (١٩١٥) کەشتیەکی نەفەر هەڵگری ئینگلیزی بە ناوی "لویسنا- لویزا" ڕووبەڕووی هێرشی موشەکی جەنگی هێزی دەریایی ئەڵمانی بویەوە، ژمارەیەکی زۆری سەرنشینەکانی کە نزیکەی (١٢٨) کەسیان ئەمریکی بوون خنکان، ئەم ڕووداوە دەنگی بیروڕای گشتی ئەمریکای دژ بە ئەڵمانیان بەرزکردەوە و ولْسن ئەم کارەی بە دەست درێژیکردنە سەر مافی مرۆڤ وەسف کرد.[3]

---

١ - د.رأفت غنيمي الشيخ: امريكا والعالم، ص ٥٦.

٢ - فرحات زيادة و ابراهيم فريجي: س- پ، ل ٣٠٢.

٣ - فریشتە نورائی: مێژووی گۆڕانکاریی کۆمەلایەتی و سیاسی ئەمریکا، ل ١٨٤.

دووەم: یەکێکی تر لە هۆکارەکانی بەشداری کردنی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەم جەنگەدا بەرپابوونی شۆڕشی ئۆکتوبەری (١٩١٧) بوو لە ڕووسیای قەیسەریدا کە تیایدا بە لشەفیەکان سەرکەوتن و دەسەلاتیان گرتەدەست، لە هەمان ساڵدا ئاگر بەستیان لەگەڵ ئەڵمانیادا مۆرکرد بەناوی (برست لیتوفسک) بەمەش هیچ بیانوویەک بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا نەمایەوە گوایە بەهۆی بوونی دەوڵەتێکی (دیکتاتۆری ئۆتوکراتی) لەبەرەی هاوپەیمانان بەشداری جەنگ ناکات.[١]

سێهەم: لە ڕاستیدا ئەوەی بووە هۆی تێوەگلانی ئەمریکا لە جەنگ، بڵاوبوونەوەی نوسراوێکی نهێنی بوو، کە لەلایەن دەزگای هەواڵگیری ئینگلیزیەوە خرایە بەردەستی ئەمریکاییەکان. لەم نوسراوەدا دەوڵەتی ئەڵمانیا داوای پشتیوانی و یارمەتی مەکسیکی کردبوو لە کاتی ڕوودانی هەر شەڕێک لەگەڵ ئەمریکادا، لە بەرامبەریشدا بەڵێنی دابوو پاش سەرکەوتن ویلایەتەکانی نیو مەکسیکۆ و ئاریزۆنا و تەکساس بۆ مەکسیک دەگەڕێنێتەوە، بڵاوکردنەوەی ئەم نوسراوە ئەمریکیەکانی هاندا بۆ جەنگ.[٢]

ترسی گەلی ئەمریکا لەوەوە بوو ئەگەر ئەڵمانیا سەربکەوێ دەبێتە سەرچاوەی مەترسی بۆ سەر هەموو بەرژەوەندیەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، چونکە ئەڵمانیا بڕوای بە دەسەلاتی تاک جەمسەری ڕەها هەبوو. لە مانگی نیسانی ساڵی (١٩١٧) ولسن چووە نێو کۆنگریس و وتاری مێژوویی خۆی خوێندەوە و وتی (ئێمە لەگەڵ گەلی ئەڵمانیا شەڕ ناکەین، بەڵکو تەنها ڕووبەڕووی دکتاتۆریەتی سەربازی دەوڵەتی ئەڵمانیا دەبینەوە، دەبێت دنیایەک دروست بکەین دیموکراسی تێدا بپارێزین، ئێمە ئێستا لە پێناو ئەو بنەمایەدا تێدەکۆشین کە بە مافی مرۆڤ ناودەبرێت بۆ پاسەوانی کردنی مافە ڕاستیەکانی نەتەوە بچوکەکان و ئازادیان، بۆ بەرقەرارکردنی لێک تێگەیشتنی نێوان نەتەوەکان شەڕ دەکەین، ئاشتی و ئارامی هەموو ولاتان لە پێناو دابینکردنی ئازادی جیهانیدا دەستەبەر دەکەین).[٣]

بەمشێوەیە ولسن بەشداریکردنی جەنگی ڕاگەیاندوو دایە پاڵ هاوپەیمان لەبەر ئەم هۆیانە:

---

١ – د.عبدالعظیم روخان:اوروبا والعالم في العصر الحدیث،الهیئة المصریة العامة للكتاب، القاهرة،١٩٩٣، ج٣/ ص٢٢٢.

٢ – تشارلز و ماری بیرد: س– پ،ج٢/ص٤٧٧.

٣ – فریشتە نورائی: س– پ، ل ١٨٦.

١. هەست و سۆزی ئەمریکیەکان بەلای ئینگلیزەکانەوە بوو، لە ئەنجامی سیاسەتی خراپی ئەڵمانەکان دژ بە ئەمریکیەکان لە زەریای ئارام و چین بەتایبەت دوای شەڕی ژێر دەریایی ئەڵمانەکان دژ بە ئەمریکیەکان.[١]

٢. لەوکاتەشدا لایەنی ئابووری گریمانەکانی سۆز و سیاسەتی بەهێز دەکرد، ئەمریکا قەرزێکی زۆریدا بە بەریتانیا و فەڕەنسا هەروەها بە شێوەیەکی خێرا پیشەسازی ئەمریکی داواکانی فەڕەنسا و ئینگلیزی پڕدەکردەوە و هاوکاری ئەو دوو وڵاتەی بە تۆپ و تەقەمەنی و کەرەستەکانی دیکەی سەربازی دەکرد، بەمەش بانکەکانی ئەمریکا وەکو بریکارێک لەلایەن هاوپەیمانانەوە هەڵدەسان بە کڕینی ئەو شتانەی هاوپەیمان پێویستیان پێی بوو، قەرزیشی پێدەدان و متمانەی بۆیان ڕێکدەخست، لە پێش شەڕدا کشتوکاڵی ئەمریکی دابەزینێکی زۆری بەخۆوە بینی، بەڵام لەکاتی شەڕدا کشتوکاڵی لۆکە و گەنم و فرۆشتنی گۆشتی بەراز لە فەڕەنسا و ئینگلیزدا بوژانەوەی بەخۆوە بینی.[٢]

٣. هەندێک لە مێژوونوسان پێیان وایە: جولەکەکانی ئەمریکا فشارێکی زۆریان هەبووە لەسەر حکومەت و کۆنگریسی ئەمریکا، هەر ئەمانیش بوون هانی ئەمریکایان داوە بۆ بەشداریکردن لەم شەڕەدا شان بەشانی ئینگلیزەکان ئەمەش لە بەرامبەر ڕاگەیاندنی پەیمانی "بلفور" بوو لەلایەن ئینگلیزەکانەوە بەرامبەر جولەکە.[٣]

٤. لەناو دانیشتوانی ئەمریکادا نفوز و لایەنگری ئینگلیزەکان بەهێز بوو، چونکە ئەگەر تەماشا بکەین ئەبینین ئیرلندی و ئەڵمانەکان زیاتر لە ویلایەتەکانی ڕۆژئاوا بوون کە زۆر هەژار بوون، بە پێچەوانەوەی ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵات کە ویلایەتی بازرگانی و پیشەسازی بوون هەموویان بەڕەچەڵەک ئینگلیزی بوون، ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵات توانایان هەبوو گوزارشت لە بۆچونێک بکەن بە شێوەیەک توانای ڕۆژئاوایەکان (ویلایەتەکانی ڕۆژئاوا) ون بکا، بۆچوونی ویلایەتەکانی ئینگلیزی لە ئەمریکا بە شێوەیەکی خێرا توانی گەلی ئەمریکا قایل بکات بە بۆچوونەکانی، بەڵام بۆچوونەکانی ئەڵمانیا بەناو خەڵکیدا بڵاونەبوویەوە، جگە لە فەرمانگە ڕەسمی و شوێنە باڵاکان نەبێ، ئەمەش بووە هۆکارێک بۆ قایل کردنی گەلی ئەمریکا بۆ

---

١ - اسماعيل احمد ياغي: معالم التاريخ الأمريكي الحديث، ص ١٨٥.

٢ - تشارلز و مارى بيرد: تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية،ج٢/ص٤٧٦.

٣ - د.عبد العزيز سليمان و د. عبد المجيد نعنعي: تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية الحديث، ص ١٦٠.

هاوکاریکردنیان، بەم شێوەیە ئینگلیزەکان توانیان ئەمریکایەکان لە جەنگدا بهێننە ڕیزەکانی خۆیانەوە. [1]

٥. هەر لە سەرەتای شەڕەوە ئەمریکیەکان هیوای سەرکەوتنیان بۆ (بەریتانیا ، فەڕەنسا و بەلجیکا) دەخواست، چونکە پەیوەندی کەلتوری و داب و نەریت و یەکێتی سیستەم و یەکێتی بیر ئەمریکا و ئینگلیزی بەیەکەوە دەبەستەوە، ئەم پەیوەندیانەش هیچی لەو هاوکاریانەی فەڕەنسا کەمتر نەبوو کە لە سەردەمی شۆڕشدا پێشکەشی ئەمریکای دەکرد. [2]

٦. بانگەوازی زۆر لە ئەمریکادا بەزربوویەوە داوای دەکرد ئەمریکا لە شەڕدا بچێتە پاڵ هێزە دیموکراسیەکان (بەریتانیا و فەڕەنسا) لەسەر ئەو بنەماییەی نەمسا و ئەڵمانیا لە وڵاتە دکتاتۆریەکانن و سیستمی وڵاتەکەیان لەگەڵ چەرخ و سەردەمدا ناگونجێ، وەک ئەرکێک پێویستە لەسەر گەلی ئەمریکا گەڵنی نەمسا و ئەڵمانیا لەو دەسەڵاتانە ڕزگار بکەن و بواریان بۆ بڕەخسێنن، بە شێوەیەکی دیموکراتیانە حوکمی خۆیان بکەن. [3]

بەم شێوەیە لە (٦)ی نیسانی (١٩١٧) ئەمریکا دژی ئەڵمانیا شەڕی ڕاگەیاند، بەڵام تا(٧) دیسەمبەری (١٩١٧) شەڕی دژی نەمسا ڕانەگەیاند، ئەمە جگە لەوەی ئەمریکا هەرگیز بە شێوەیەکی ڕەسمی شەڕی دژی عوسمانی ڕانەگەیاند. [4]

کۆنگرێس دوای ڕاگەیاندنی شەڕ دەستی کرد بە دانانی ڕێ و شوێنی پێویست، بۆ بەدەست هێنانی سەرکەوتن، ئەمەش هۆکارێک بوو بۆ گۆڕینی ڕێڕەوی ژیان لە وڵاتدا، بۆ ئەم مەبەستە دەستی کرد بە ڕێگە خۆشکردن بۆ پارەدانی قەرزی نیشتمانی هەروەها باجی نوێی دانا بۆ ڕۆژنامەنوسان و سوور بوو لەسەر پاراستنی نهێنیەکانی وڵات و ڕاگرتنی ورەی خەڵکی، بە کورتی خەڵک ماڵ و سامانیان بوو بە بارمتەیەک سەبارەت بە کردنەوەی شەڕ. [5]

---

١ - د.عبد العزيز سليمان و د. عبد المجيد نعنعي: تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية الحديث، ص ١٦٨.

٢ - تشارلز و ماری بيرد: س- پ،ج٢/ص٤٧٦.

٣ - عبدالعزيز سليمان واخرون: س- پ، ل ١٥٨.

٤ - اسماعيل احمد ياغي: س- پ، ل ١٨٨.

٥ - عبدالعزيز سليمان واخرون: س- پ، ل ٣٠٥.

دوای ئەوەی حکومەتی ئەمریکا بۆی دەرکەوت ژمارەی خۆبەخشەکان کەمن و ژمارەیــان وەک پێویســت نــیە ڕێگەیــدا بە دەرکردنــی یاســایەک ســەبارەت بە سەربازگرتن بە زۆر. ئەوەبوو ژمارەی ئەو سەربازانەی کە بۆ خزمەتی سەربازی بانگێشت کرابوون لە نێوان ساڵانی (١٩١٧-١٩١٨) گەیشتبووە سێ ملیۆن. [1]

ســەبارەت بە خۆڕێکخستن (نیوتن د. بیکر) کە لەوکاتەدا وەزیری شەڕبوو بە گیانێکی ڕاستگۆیانەوە هاوکاری (وڵسن)ی دەکرد هەروەها "ماک ئدۆ"ی وەزیری کۆگاکان و "برنارد بارۆخ"ی سەرۆکی ئەنجومەنی پیشەسازی شەڕ لە هاوکاری کردندا هاوشێوەی وەزیری شەڕبوون، لەسەر حکومەت پێویست بوو توندترین ڕێ و شوێن بگرێتەبەر لە بارەی شەڕەوە کە ئەوەش چالاکی زۆر دەکرد، هەروەها دکتاتۆریەتی خۆی بەسەر پیشەسازی کشتوکاڵدا زاڵکرد. [2]

لە بەهاری ساڵی (١٩١٧) ئەڵمانەکان دوای شەڕی (گابوریتو Gaporito) و تێک شکانی بەری ڕووسیا، هەستان بە هێرشێکی سەربازی بە هێز بۆ سەر فەڕەنسا و ماوەی گەشتنیان بە پاریس (٦٠کم) بوو، ئەمەش بارودۆخێکی زۆر ترسناکی هێنایە گۆڕێ و ڕێگەی بە ئەمریکیەکان نەدا بیربکەنەوە بۆ دانانی پلان. [3]

هەربــۆیە بە خێرایەکــی زۆر بــێ وێــنە یەکەم تیپــی ســەربازی ئەمریکــی بە سەرکردایەتی (جان بیرشنیج) گەشتە فەڕەنسا و توانیان لە دژە هێرشێکدا سوپای ئەڵمانەکــان بشــکێنن، و لە ســەرەتاکانی ئەیلــول ژمــارەی ســەربازەکانی ئەمریکــا زیادیکرد و توانیان هێڵەکانی سەربازی ئەڵمانی تێک بشکێنن و نزیکەی (٦٠٠٠٠٠) ســەربازی ئەڵمانیایــان کوشــت، بەڵام هــاتنی ئەم هێــزە ســەربازییەی ئەمریکــا بەس نەبوو، چونکە شەڕ پەرەی سەندبوو، هاوپمانان زیاتر پێویستیان بە ئەمریکا هەبوو، لە(٢)ی حوزەیرانی (١٩١٧) سوپای ئەمریکا گەشتە فەڕەنسا، بەڵام بە شێوەیەکی ڕۆشتنی سەربازی نەک بۆ بەرەی جەنگ. [4]

لە (٤)ی تەمــوزی (١٩١٧) ســوپایی ئەمریکــا بە شــەقامەکانی (شــانزیلنوی) دا دەڕۆشت و ئاڵای ئەمریکا ئەشەکایەوە (براند هوتیلوک Brand whitlock) بەم

---

١ - د.راغب العلي ود.طليعة الصياح و د.عبدالكافي العطوف:اوروپا المعاصر،جامعة دمشق،١٩٩٥،ص١٨٤.

٢ - د.صلاح احمد هريدي:دراسات في التاريخ الأمريكي، ص ٢٤١.

٣ - فريــــدريكو روميــــرو: الامبراطوريــــة الأمريكيــــة،تر. احمــــد الكريم،الاهــــالى للنشــــر،الطبعة الاولى،دمشق،٢٠٠٠،ص٤٤.

٤ - اسماعيل احمد ياغي: س- پ، ل ١٨٨.

شێوەیە باسی ئەکا و ئەڵێ: (گوێم لە ئاوازی مۆسیقا بوو نەمتوانی خۆم ڕابگرم بەپلەکانەکاندا هاتمە خوارەوە کەوتمەڕێ بۆ شەقامی ریڤولی Rivoli) بە سەری پەتی هەموو خەڵکی ڕێگاکانیان گرتبوو لەم شۆستە بۆ ئەو شۆستە بەبێ هیچ ڕێخستنێک بە ژن و منداڵ و پیاوەوە ڕایان دەکرد و عارەق بەناو چاویانەوە دەهاتە خوارەوە دەیانویست بگەنە ئەو هێزە سەربازیانە کە بە جلی خاکیەوە دەڕۆشتن و سەربازە فەرەنسیەکان بە جلی شینی ئاڵەوە بە تەنیشتیانەوە بوون، ئەیانویست زیاتر لێیان نزیک بکەونەوە سەیریان دەکردن وەک چۆن مناڵ سەیر دەکا، لەسەر ڕوویان نیشانەی سەرسورمان دەردەکەوت، گوڵ میوانەکانی داپۆشیبوو بانگی جەماوەر بەرز دەبوویەوە (بژی ئەمریکا) ئەمە تەنها نموونەی سوپای ئەمریکا بوو، چونکە سوپای ڕاستەقینە لە سەربازگەکانی ئەمریکا خەریکی مەشق بوون.[1]

لە بەهاری (١٩١٨) ئەڵمانەکان لە ناوچەکانی ڕۆژئاوا بە شێوەیەکی بەرچاو زیادیان دەکرد تەواو پەلەیان بوو کە بە لێدانی قورس گورزی سەربازی بدەن لە (فەرەنسا و ئینگلیز) کە ژمارەیان کەم بوو، و هیلاکی باڵی بەسەردا کێشابوون، لەو شەڕەدا ئەڵمانیا (٩٠٠٠٠) سەربازی ئینگلیزی بە دیل گرتبوو دەستیشی گرتبوو بەسەر چەک و تەقەمەنیەکی زۆری ئینگلیزدا.[2]

ئەڵمانەکان نیازی شاڵاویان هەبوو، لەوکاتەدا ولسن ئاگادارکرایەوە ئەگەری زۆر هەیە شەڕەکە بدۆڕێنن، تەنها لەوکاتەدا نەبێ بە زووترین کات چارەسەری کێشەی کەمی سەرباز لای هاوپەیمانان بکات، ئەویش بە گەشتنی سوپای ئەمریکایە، کێ بڕکێ کردن لەگەڵ کاتدا دەستی پێکرد و ئەمریکا دروست کردنی کەشتی لە هەموو شت پێ گرنگتربوو، کاروانی کەشتی لە ئەمریکاوە کەوتە ڕێ و (٨٠٠٠٠) گەنجی خاکی لە بەریان هەڵگرتبوو، ئەم ژمارەیە لە مانگی سێ و چواردا گەشتە (١١٨٠٠٠) سەرباز و لە مانگی حوزەیران (٢٥٠٠٠٠) سەرباز، بەمەش سوپای ئەمریکی لە مانگی دەی ئەو ساڵەدا لە فەرەنسا گەشتە (٧٥٠٠٠٠) سەرباز و لە کاتکی گونجاودا گشتنە جێ.[3]

لە ماوەی هاتنی هێزی سەربازی ئەمریکا بۆ ئەوروپا تا کۆتایی جەنگەکە مانگی (٣٠٠٠٠٠) سەرباز ئەگەشتنە جێ. (ڤالیدر ینهارت) سەرۆکی ئەرکانی سوپای ئەڵمان

---

١ - تشارلز و ماری بیرد: تاریخ الولايات المتحدة الأمريكية،ج٢/ص ٤٨١.

٢ - عمر الديراوي:الحرب العالمية الاولى:دار العلم للملايين، الطبعة الخامسة، بيروت،١٩٧٧،ص٣٨٢.

٣ - تشارلز و ماری بیرد: س- پ،ج٢/ص٤٨٢.

ـە یەکەم ڕووبەڕووبوونەوەیان لەگەڵ سوپای ئەمریکادا ئەڵێ: (زۆرمان نەمابوو سەرکەوتن بەدەست بهێنن و ئامانجەکانمان بەدی بهێنن، بەڵام لە ناکاو یەکێک لە یەکەکانمان توشی هەورە بڵاچەیەک بوو کە ئەویش سوپایی ئەمریکی بوو توشی شکستی هێناین).[1]

لە مانگی ئەیلولدا هێزەکانی ئەمریکا هێرشی کردەسەر ( سەینت میرل saint milrl) هێزی هاوپەیمان بە ئاراستەی هێڵی (هندبورگ hind burg) شالاوی کۆتایان دەست پێکرد. ژەنەڕاڵ (پرشنیخ) دەڵێت (ئەو خێراییەی سوپاکەمان پەیڕەوی دەکرد دوژمنەکانمانی تێک و پێک شکاند).[2]

زیانە گیانیەکان بەردەوام بەرزدەبویەوە، بەڵام سوپای ئەمریکی (ئالنتو) یان ڕیشەکێش کردو (١٦,٠٠٠) سەربازیان بە دیل گرت، قورسایی شەڕەکان کەوتە سەر سوپای ئەمریکا کە لە یەک ملیۆن سەرباز زیاتر پێک هاتبوو، دواتر هێرش کرایەسەر (میزوارجۆرن meuseygamme) و هێڵی هندبورگ تێکشکێنرا ئەمەش ئەو هێڵە بوو ئەڵمانەکان شانازیان پێوەدەکرد، بەمەش سوپای ئەڵمان بەیەک جاری ورەی بەرداو لە (٦)ی تشرینی یەکەمی (١٩١٨) لەگەڵ وڵسندا ئاگر بەستیان مۆرکرد.[3]

## ڕۆڵی وڵسن لە کۆتایی پێ هێنانی جەنگی جیهانی یەکەم

کاتێک ئەمریکا نەیتوانی (فەرەنسا و بەریتانیا) قایل بکات بۆ ڕاگەیاندنی پەیمانێکی هاوبەش، وڵسن لە (٨)ی کانونی دووەمی (١٩١٨) لە بەردەم کۆنگرێسی ئەمریکادا (١٤) بەندەکەی ڕاگەیاند:[4]

١. سیاسەتێکی ئاشکرا بۆ بەستنی کۆنگرەی ئاشتی.

٢. ڕێزگرتنی ئازادی دەریاوانی لە کاتی شەڕ و ئاشتیدا.

٣. لابردنی بەربەستی ئابووری لە نێوان گەلندا بەپێی توانا.

٤. کەمکردنەوەی چەک و چەکداری بە ئەندازەی پێویست بۆ پاراستنی ئاسایشی ناوخۆ.

---

١ - د.رأفت غنيمي الشيخ: أمريكا والعالم، ص ١٠٨.

٢ - عمر الديراوي: س- پ، ل ٣٨٦.

٣ - د.خليل علي مراد واخرون: س- پ، ل ٢٥٥.

٤ - د.رأفت غنيمي الشيخ: أمريكا والعالم، ص ١٠٨-١٠٩.

٥. تەخت کردنی ململانێ و داگیرکاری لەگەڵ پاراستنی خواستی دانیشتوان و بەرژەوەندییەکانیان.

٦. چۆڵ کردنی زەوی و زاری ڕووسیا و گەڕانەوەی بۆ رووسیا.

٧. پاراستنی سەروەری بەلجیکا.

٨. پێویستە سەرجەم خاکی فەڕەنسا ئازادبکرێت و بەشە داگیرکراوەکەی بگەڕێنرێتەوە، جەخت کردنەوە لەسەر مەسەلەی "ئەلزانس و لۆرین" تا ئەو ئاشتیە جارێکی تر بکرێتەوە بۆ بەرژەوەندی هەمووان.

٩. ڕاستکردنەوەی سنووری ئیتاڵیا، پێویستە هێڵی سنووری بەفەرمی ناسراوی نەتەوەی ئەو وڵاتە بێت (واتە سنوری وڵات سنوری نەتەوە بێت).

١٠. خەڵکی نەمسا و هەنگاریا کە ئارەزوو ئەکەن پێگەیان لە نێو نەتەوەکاندا پارێزراو و زامن بێ پێویستە ئازادترین دەرفەتیان بۆ بڕەخسێنرێت بۆ گەشەسەندن.

١١. هەمەوارکردنی سنووری نیمچە دورگەی (بەلقان) بۆ گەنجان لەگەڵ بارودۆخی مێژووی و دابەش کردنی نەتەوەکان.

١٢. بەشە تورکیەکەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی زامن بکرێت و سەرپەرشتی بپارێزرێت، بەڵام ئەو نەتەوانەی تر کە ئێستا لە ژێر فەرمانڕەوایی تورکەکاندان، پێویستە ژیانی ئەوانیش بە تەواوی زامن بکرێت و دەرفەتێکی بێ خەوشیان بۆ بڕەخسێنرێت تا پەرە بە ئۆتۆنۆمی خۆیان بدەن، پێویستە دەردەنیل بە شێوەیەکی هەمیشەیی لە ڕووی بازرگانیدا کراوە بێ.

١٣. بڕیاردان لەسەر سەربەخۆیی پۆلندا و توانای گەشتنی بە دەریا.

١٤. پێویستە ڕێکخراوی نەتەوەکان بە گوێرەی چەند پەیمانێکی تایبەت پێک بهێنرێت، بە مەبەستی زامنکردنی سەربەخۆیی سیاسی و سەروەریی و یەک پارچەیی خاکی وڵاتانی گەورە و بچووک بێ جیاوازی.

لەوکاتەی سوپای ئەمریکا گەشتبووە کەنارەکانی قەڵای (سیرا)ی بەناوبانگ نوێنەری ئەڵمانەکان سنووریان تێ پەڕاند بۆ چاوپێکەوتنی (فوش) سەبارەت بە ئاگربەست، لە (١٩١٨/١١/١١) ئەو ئاگر بەستە گرێ دراو بەمەش لێپرسراوێتی

ولسن بەرامبەر بە ئاشتی و شێوەی جیهانی کە پێویست بوو دووبارە بنیات بنرێتەوە لە دوای شەڕە خوێناویەکان دەستی پێکرد. [1]

حکومەتی ئەڵمانیا ڕوویکردە ولسن و داوای ئاشتیان لێکرد لەسەر بنەمایی (١٤) بەندەکە بەمەش قەیسەری ئەڵمانیا دەستی لە عەرشەکەی هەڵگرت و ڕایکرد، دوای کۆتایی هاتنی شەڕ هەریەک لە ئەمریکا و وڵاتانی هاوپەیمانان نوێنەری خۆیان نارد بۆ پاریس سەبارەت بە دانانی کۆنگرەی ئاشتی، ولسنی نوێنەری ئەمریکا خۆی هەڵبژێرابوو خۆشی سەرکردایەتی شاندەکەی ئەکرد، لە کانوونی دووەمی ساڵی (١٩١٩) کۆبوونەوە و تاوتوێی ئەو مەرجانەیان دەکرد کە دەیانویست بەسەر وڵاتە دۆڕاوەکاندا بیسەپێنن. [2]

بەم شێوەیە کۆنگرەی پاریس لە ساڵی(١٩١٩) دەستی پێکرد، ماوەی کۆنگرەی پاریس دابەش بوو بەسەر دوو خولدا:

خولی یەکەم/ لە (١٢)ی کانوونی دووەم تا (٢)ی مارسی خایاند، کارەکانی خولی یەکەم تایبەت بووبە بابەتی لێکۆڵینەوە لەسەر پەیمانی ئاشتی، هەر دە ئەندامەکەی ئەنجومەنەکە کە لە سەرۆکی حکومەت و وەزیرانی دەرەوەی هەر چوار وڵاتە گەورەکە (ئەمریکا ، بەریتانیا ، فەرەنسا و ئیتاڵیا) و دوو نوێنەری ژاپۆن لەسەر ئاستی باڵوێز پێک هاتبوون بەخۆوە سەرقاڵ و هیلاک کرد. [3]

خولی دووەم / لە (٢٤)ی مارس تا (٢٨) حوزەیرانی (١٩١٩) خایاند، ئەم خولە تایبەت بوو بە کۆکردنەوەی کارەکانی کۆنگرە و لێکۆڵینەوە لەو کێشانەی کە لە ئەنجامی شەڕدا کەوتبوونەوە، لەگەڵ دانانی چارەسەری گونجا و بۆیان، لە ماوەی خولی یەکەمدا توانیان کاری زۆر چاک ئەنجام بدەن، بەڵام بارودۆخ لە بار نەبوو بۆ دانانی کۆنگرەی ئاشتی، لە خولی دووەمدا سەرۆکی وڵاتە گەورەکان زانیان کات بە دەستەوە نەماوە و کۆنگرەکە ڕووبەڕووی مەترسی بۆتەوە، بە هۆی تێکچوونی بارودۆخی نێودەوڵەتیەوە، لەوانەش شۆڕشی ئیشتراکی لە (مەجەڕ و باڤاریا) بەرپابوو، شکست هێنانی شۆڕشی دژی بەلشەفی، تێکچوونی بارودۆخ لە ئینگلترا و ئیرلەندا، لەکۆتایدا سەرۆکەکان ناچاربوون پەیمانی ئاشتی مۆر بکەن. [4]

---

١ – عبدالعزيز سليمان نوار واخرون: تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية الحديث،ص١٨٦.

٢ – فرحات زيادة و ابراهيم فريجي: تاريخ الشعب الأمريكي،ص٣٠٩.

٣ – اسماعيل احمد ياغي: معالم التاريخ الأمريكي الحديث، ص ١٩٢.

٤ – هەمان سەرچاوە،ل١٩٣.

له ڕاستیدا ئەو پەیماننامە ئاشتیانە بە قورسی لەسەر وڵاتە دۆڕاوەکانی جەنگی یەکەمی جیهانی (١٩١٤- ١٩١٨) کەوت، یەکێک لە دیارترین ئەو پەیماننامانە. پەیماننامەی ڤێرسای لە (٢٨) حوزیرانی (١٩١٩) بوو کە لەلایەن دەوڵەتە سەرکەوتووەکانەوە سەپێنراوە بەسەر ئەڵمانیادا. [١]

له گرنگترین ئەو مەرجانەی لە پەیمانی ڤێرسایدا سەپێنرا بەسەر ئەڵمانیا، دابەشکردنی بوو بەپێی سیستمی ئینتیداب، لەگەڵ گەڕانەوەی هەردوو نیمچە دوورگەی (ئەلزانس و لۆرین) بۆ فەرەنسا، و وازهێنان لە هەردوو ناوچەی (یوپن- مالمیری) بۆ بەلجیکا و وازهێنان لە ڕۆژهەڵاتی پروسیا و سلیسا بۆ پۆلنداو وازهێنان لە دانزیگ تا لە ژێر دەستی کۆمەڵەی گەلان داگیر بکرێت بۆ هاوپەیمانان بۆ ماوەی (٢٥) ساڵ. [٢]

ئەڵمانیا دەبوو وەک قەرەبوو پارەیەکی زۆر بدات، دیاریکردنی سوپای ئەڵمانیا بە (١٠٠٠٠٠) کەس بەبێ دەستەی ئەرکان، و بەبێ تانک و دەبوو کەشتیەکانیان لە (١٠٠٠٠) تەن زیاتر بار هەڵنەگرێ و نابێ هێزی ئاسمان و ژێر دەریایی هەبێ. [٣]

ئەم پەیماننامەیە یەکێتی ئەڵمانیا و نەمسای ڕەتکردەوە، بەپێی ئەم پەیماننامەیە ئەڵمانیا بەرپرسیارە لە هەڵگیرسانی جەنگ و دەبێ قەیسەری پێشووی ئەڵمانیا و سەرکردە سەربازیەکانیان بدرێنە دادگا. سەرەڕای ئەوەی ئەڵمانیا ڕەزامەندی لەسەر ڤێرسای ڕاگەیاند، بەڵام ڕای گشتی هەریەک لە بەریتانیا و فەرەنسا ڕازی نەبوون، چونکە پێیان وابوو مەرجەکان زۆر توند نین، هەروەها کۆنگرێسی ئەمریکیش ناڕازی خۆی لەمەڕ ئەم پەیماننامەیەوە دەربڕی و دواتر قەیسەر نەدرایە دادگا و جارێکتر سەرکردە سەربازیە ئەڵمانیەکان بە تایبەت (سیکت seecti) داوای هەڵوەشانەوەی مەرجی چەکدانانی ئەکرد و دواتر هیتلەر کاتێ هاتە سەر دەسەڵات لە ساڵی (١٩٣٣) بە هەموو شێوەیەک پەیماننامەی ڤێرسای هەڵوەشاندەوە. بەو جۆرە لە ساڵی (١٩١٩) لە کۆنگرەی ئاشتی لە پاریس کۆمەڵەی گەلان دامەزرا، و (جنێف)ی پایتەختی سویسرا کرایە بارەگای و ئینگلیز و فەرەنسا بوونە زمانی گفتوگۆی کۆمەڵەکە، ئەندامانی کۆمەڵەکە دوو جۆر بوون: [٤]

---

١ - روجز ثارکنسن: موسوعة التاريخ الحديث، ١٧٨٩-١٩٤٥،ج٢/ص ٣٦٨.

٢ - هەمان سەرچاوە،ل١٩٣.

٣ - فرانكلن اشر: س- پ، ل ١٥٤.

٤ - على حيدر سليمان:تاريخ الحضارة الاوربية الحديثة،دار الاوسط،بغداد،١٩٩٠،ص٣٧٨.

**أ. دامەزرینەران.**

**ب. هەڵبژێردراوان.**

کۆمەڵە لە ئەمریکا و وڵاتانی هاوپەیمانان و ئەو وڵاتانەی کە لە کاتی شەڕدا بێ لایەن بوون پێک هات، دوای ئارامبوونەوەی دۆخەکە وڵاتە دۆڕاوەکانی شەڕیش بەشداربوون تێیدا و دەستەی بڕیاردان دروست بوو تیایدا. (وڵسن) لەوەش سەرکەوتووبوو کە ڕۆڵی سەرەکی لە دانانی (دەستەی وڵاتان) دا ببینێت و وڵاتانی دیکەش قایل بکات بەو پرۆژەیە، ئامانجی کۆمەڵەی گەلن جێ بەجێ کردنی هاوکاری و دەستەبەرکردنی ئاسایش و ئاشتی نێودەوڵەتی بوو، ئەندام بوونیش تیایدا کراوەبوو، کاری چاودێر کردنی ئەنجومەنیش بەدەستی وڵاتە گەورەکانەوە بوو. [1]

(وڵسن) ئەڵێ: (ئەو ویستەی لە مێشکی من دایە دەربارەی کۆمەڵەی گەلن ئەوەیە کە ئەبێتە هێزێکی ئاکار ئامێزی ڕێکخستنی خەڵک لە هەموو لایەکی جیهاندا، تیشکی ڕۆشنگەری ویژدان دەخرێتە سەر هەموو کارێکی شەڕانگێزی، دەست درێژی کردن، ئەوەی نەخشەی بۆکێشابێ، یاخود بیری لێکردبێتەوە جا کەی و لەهەر شوێنێک بێت). [2]

ئامانجی یەکەمی کۆمەڵەی گەلن بەپێی دەستور و پەیڕەوی کۆمەڵەکە بریتی بوو لە پاراستنی ئاشتی، بۆ ئەوەی جارێکی تر کارەساتی جەنگی یەکەمی جیهان ڕوونەدات، هەروەها جەختی لەسەر کەمکردنەوەی هێزی دەوڵەتان دەکردەوە، دەبوو کێشەی نێوان دەوڵەتان لە ڕێگەی دانیشتنەوە چارەسەر بکرێ. [3]

پرسیارێک کە زۆر گرنگە ئەوەیە بۆچی ویلایەتە یەکگرتووەکان دەستبەرداری مەسەلەی دامەزراندنی کۆمەڵەی گەلن بوو، سەرباری ئەوەی کۆمەڵەکە سەرەتا پرۆژەیەکی ئەمریکی بوو بۆ سەرلەنوێ ڕێکخستنەوەی سیاسەتی جیهان، هۆکاری ئەم پاشەکشەی ئەمریکا لە کۆمەڵەکە ئەوەبوو کە زۆرینەی ئەمریکاییەکان لە دوای جەنگ ویستیان بگەڕێنەوە سەرباری سروشتی خۆیان، زۆربەی خەڵک واتای سروشتیان والێکدەدایەوە خۆیان لە دەست خستنەناو کاروباری دەولی لابدەن، لایەنگرانی ئەو بۆچوونە ڕایانگەیاند بەپێی پرەنسیپی (مۆنرۆ)ی ساڵی (١٨٢٣) بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا تەنیا نیوەگۆی ڕۆژئاوا دەگرێتەوە. لێرەدا وڵسن

---

١ - اسماعيل احمد ياغي: س- پ، ل ١٩٤.

٢ - انيس لكود:قوة العلاقات الدولية،دارونووم،نيويورك،١٩٦٢،ص١٠٤.

٣ - د.رأفت غنيمي الشيخ: أمريكا والعالم، ص ١١٠.

سـەلماندی کە سـەرکردەیەکی زیـرەکە چـونکە دوای ئەوەی شـەڕ کۆتـایی هـات کۆمەڵێ هەڵەی سیاسی ڕوویدا. بۆیە داوای لە گەل کرد کە دیموکراتەکان هەڵبژێرن بـۆ کـۆنگریس، بەڵام جەمـاوەر ڕقـی لەم حیزبـایەتیە بـوو، لەبەرئەوە زۆریـنەی کۆماریەکان بۆ کۆنگریس هەڵبژێرانەوە.[1]

(وڵسـن)بڕیاریـدا خـۆی لە کـۆنگرەی ئاشـتی بەشـداری بکـات، زۆریـنەی ئەمریکیەکـان لە دژی ئەو بڕیـارەی وەسـتان، لەبەرئەوەی کە پێیـان وابـوو نابێـت سـەرۆک وڵات بەجـێ بهێڵـێ. کاتێک (وڵسـن) بەرەو پـاریس بە ڕێکەوت ڕۆزفێڵت سەرۆکی پێشووی ئەمریکا ڕایگەیاند(وڵسـن) هیچ دەسـەڵاتێکی نیە بە نـاوی گەلەوە قسە بکات.[2]

کاتێک (وڵسن) گەڕایەوە بۆ ئەمریکا پەیمـانی ڤێرسـای و کۆمەڵەی گەڵنی خستە بەردەم کـــۆنگرێس، لە هەمـــوو لایەکەوە دژایەتـــی کـــراو زۆربەی ســــەرکردە کۆمارییەکـان بە تـایبەت "لـودج- lodge" کە کەسـایەتێکی زۆر توندبوو هەسـتی بە نـاهەمواری بـارودۆخەکە ئەکـرد و وای بە بـاش زانـی دیموکراتەکـان بە دۆڕان بدات.[3]

یەکێک لەو خاڵانەی زۆر خەڵکی هەژاند بەندی (١٠)ی کۆمەڵەی گەڵن لەلایەن کۆنگریسەوە ڕەتکرایەوە. کۆنگرێس داوای لە وڵسـن کرد دەبێ دەست هەڵگرێ لە بەندی (١٠)ی کۆمەڵەی گەڵن، بەڵام (وڵسن) ڕایگەیاند کۆمەڵەی گەڵن بەبێ بەندی (١٠) شـوێنێکە بـۆ گفتوگـۆ، ناچـار (وڵسـن)پەنای بـردە بەر جەمـاوەر، بەڵام قەدەر ڕێـگەی پـێ نەدا تـاپلانەکەی جێبەجـێ بکـا و بـۆیە لە گەڕانیـدا بە ویلایەتەکـانی ڕۆژئاوادا، وڵسن لە ویلایەتی کۆلورادۆ توشی داروخانی جەستەیی بوو لە (٩/٢٥) تووشـی سـەلەلی بـوو دۆسـیە گـرنگەکەی بنیـاتی نـابوو لە دەسـت چـوو، لە مـانگی (١٩٢٠/٣) کۆنگریس بە شێوەیەکی کۆتـایی دەنگیداو پەیمـانی ڤێرسـایی و کۆمەڵەی گەڵنی ڕەتکردەوە.[4]

ئەم ڕووداوانە هاوکـات بـوو لەگەڵ هەڵبژاردنـی سـاڵی (١٩٢٠) ئەوەبـوو کۆماریەکان لە پروپاگەندەی هەڵبژاردنەکاندا جەختیان ئەکردەوە لەسـەر گەڕانەوەی

---

١ - عبدالعزيز سليمان نوار واخرون: تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية،ص١٧٠.

٢ - تشارلز و ماری بيرد: س- پ،ج٢/ل٤٨٥.

٣ - د.عبدالعزيز سليمان نوار واخرون: س- پ، ل ١٨٣.

٤ - تشارلز و ماری بيرد: تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية،ج٢/ص ٤٨٧.

ئەمریکا بۆ سیاسەتی (مۆنرۆ)، بەم شێوەیە کۆمارییەکان گەورەترین سەرکەوتنیان بەدەست هێنا، (ولّسن) دوای ئەوەی کاتی سەرۆکایەتی تەواوبوو، لە ڕووی جەستییەوە تەواو داڕووخابوو، بەلاّم لە ڕووی ڕووحیەوە هەر کەسێکی بە هێزبوو، بە غەم و پەژارەوە چاودێری بارودۆخەی دەکرد، بەم شێوەیە بە نەخۆشی مایەوە لە واشنتن تا ساڵی (١٩٢٤) کۆچی دوایی کرد.[١]

## ئەمریکا و کۆنگرەی ئاشتی لە پاریس

لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانی ولاّتە سەرکەوتووەکانی جەنگ لە پاریس کۆبوونەوە و ئەڵمانیایان پەلکێش کرد بۆ کۆبونەوەکە، ئامانجیان ئەوەبوو ئەو کێشە و گیروگرفتانە چارەسەر بکات کە بوونە هۆکاری هەڵگیرسانی شەڕ، ئەگەر نەتوانێت چارەسەریان بکەن ئەوا خوێنی هەموو ئەوانەی لە ماوەی نێوان (١٩١٤-١٩١٨)دا کوژرابوون بە فیڕۆ دەچێت، بۆیە لە کۆتاییەکانی ساڵی (١٩١٨)دا ولاّتە سەرکەوتووەکان خۆیانیان بەرامبەر ئەرکێکی گرنگ بینیوە، چونکە ئەم جەنگە تەنها ئەوروپای نەهەژاند بەڵکو دەرەوەی ئەوروپاشی هەژاندبوو، زۆربەی ولاّتانی بە شەڕ هاتووی دەرەوەی ئەوروپا بەشداریان لە کۆنگرەی ئاشتیدا کرد.[٢]

لە ڕۆژی هەینی (١٣)ی کانوونی یەکەمی (١٩١٨) سەرۆکی ئەمریکا (ولّسن) بە سواری کەشتیەک گەشتە فەڕەنسا، بەمەش تەحەدای هەموو ئەو ئەمریکیانەی کرد کە باوەڕیان وابوو نابێت سەرۆک خاکی ولاّت بەجێ بهێڵێت، لە کۆنگرەی ئاشتی پاریسدا ناوی سەرۆکی ئەمریکی (ولّسن) وەکو ئەستێرەیەکی پرشنگدار لە ئاسمانی کۆنگرەدا دەرکەوت وەک مەسیح چۆن دابەزێتە سەرزەوی ڕێگەی خێر و ئاشتی پیشانی خەڵک بدات.[٣]

(ولّسن) لە هەموو ئەمریکیەکی پێش خۆی و دوای خۆی بە پەرۆشتر بوو تیشکی خستەسەر هۆشداریەکی فراوان و ئاواتێکی مەزن و وروژاندی، ڕاستە لە کاتی شەڕەکەدا (ولّسن) کەسێکی بیزاربوو لەلای لایەنە شەڕکەرەکانی، بەلاّم لە کاتی کۆنگرەدا وەک کەسێکی ویژداندار و خاوەن مێشکی بێ لایەن دەرکەوت بە

---

١ - علی حیدر سلیمان: س- پ، ل ١٦٧.

٢ - د.بشری قبیس وموسی مغول:الحروب والازمات الاقلیمیة في القرن العشرین(أوروثا-أسیا)،بیسان للنشر و التوزیع، بیروت،١٩٩٧،ص٢٠.

٣ - ه.ا.ل.فشر: تاریخ اوربا في العصر الحدیث(١٧٨٩-١٩٥٠)،تر.احمد نجیب هاشم و ودیع الضبع، دار المعارف، مصر،ص٥٥٢.

شێوەیەک جیهان هیچ جۆرە ناکۆکیەکی ئەدەبی و مەعنەوی تێدا دیار نەبوو، هانی ئامادە بووانیدا بۆ ئاشتیەک سەرکەوتنی لە جەنگدا پێوە دیار نەبێ.[١]

ئەوەبوو لە (١٨) کانوونی دووەمی (١٩١٩) نوێنەری وڵاتان کە ژمارەیان (٣٢) دەوڵەت دەبوو، بە مەبەستی دانانی پلانی چاکسازی جیهانی کە جەنگی یەکەمی جیهانی دایڕوخاندبوو گەشتنە پاریسی پایتەختی فەرەنسا و لە کۆشکی (ڤێرسای) کۆبوونەوە بۆ دانانی ئەتڵەسێکی نوێ بۆ جیهان و دەستگرتن بەسەر نائارامیە هەرێمایەتیەکاندا، بەم شێوەیە لە کاتێکدا (بوانکاریە) سەرۆک کۆماری فەرەنسا ڕێ و ڕەسمی کردنەوەی کۆنگرەکەی بەڕێوەبرد، بە ئەندامێتی هەریەک لە (وڵسن و لوید جۆرج)ی سەرۆک وەزیرانی بەریتانیا و هاوکارانیان لە کەش و هەوایەکی پڕ لە ڕق و کینەدا کۆبوونەوە، کاتی کۆبوونەوەکانیان دابەش کرد بەسەر دوو خولدا:[٢]

خولی یەکەم: لە (١٢) کانوونی دووەم بۆ (٢)ی مارس (١٩١٩) خایاند، لەم خولەدا ئەنجومەنێکی (١٠) کەسی پێکهات، ئەوانیش هەریەک لە سەرۆک و وەزیری دەرەوەی وڵاتانی (بەریتانیا ، فەرەنسا ، ئەمریکا و ئیتالیا) و (٢) نوێنەری ژاپۆن لە ئاستی (بالۆیزدا)، کە بەمەبەستی تاوتوێ کردنی پەیمانی ئاشتی بەڕێوەچوو.[٣]

خولی دووەم: لە (٢٤) مارس بۆ (٢٨)ی حوزەیرانی (١٩١٩)، خایاند، تیایدا سەرۆکەکانی هەرچوار دەوڵەتە گەورەکە دانیشتن بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان و تاوتێ کردنیان، لە کاتی بەڕێوەچوونی خولی یەکەمی کۆنگرەکەدا کاری باشیان کرد، بەڵام ڕۆژگار ڕێگای بە کۆنگرەی ئاشتی نەدا، ئەوەبوو لە خولی دووەمدا بە هۆی هەڵگیرسانی شەڕی ناوخۆ لە (مەرجەرو بلغاریا) و ناکۆکی نێوان (ئینگلتەرا و ئێرلەن)دا و سەرهەڵدانی شۆڕشی بەلشەفی و چەندین هۆکاری دیکە، بارودۆخێکی وایان خولقاند سەرۆکەکانی ناچارکرد بە پەلە واژووی لەسەر بکەن.[٤]

یەکەمین شتی سەرنجڕاکێش لە کۆنگرەی ئاشتی لە پاریس ئەوەبوو، پێکدادانێکی توند لە نێوان دوو سیاسەتدا دەرکەوت کە لەماوەی جەنگدا سەری هەڵدابوو:

---

١ - لويس ل.شنايدر:العالم في القرن العشرين،تر.سعيد عبود السامرائي،منشورات دار مكتبة الحياة،بيروت،ص ٥٧.

٢ - بشرى قبيس واخرون: س- پ، ل ٢٠.

٣ - هەمان سەرچاوە،ل٢١.

٤ - اسماعيل احمد ياغي: معالم التاريخ الأمريكي، ص ١٩٢.

أ/ سیاسەتێکی باش، کە (١٤) بەندەکەی (وڵسن)ی لە خۆدەگرت و ئازادیخوازەکان لە ماوەی جەنگدا بانگهێشتیان بۆ دەکرد، لە (٣)ی کانوونی یەکەمی ١٩١٩، (وڵسن) لە یەکێک لە وتارەکانیدا وتی (کاری ئێمە لە پاریسدا پیشاندانی دۆستایەتیە بۆ هەموو دونیا، دوونیایەک تیایدا تەواوی هێزە ئەخلاقیەکان لە ڕووی ماف و عەدالەت و ئازادیەوە یەک بگرن، شێوازی ژیانیان ڕێکبخەن، تەواوی خەڵکی بەپێی حەز و ئارەزووی خۆیان وەڵامی پرسیارەکان بدەنەوە). [١]

ب/ سیاسەتی داگیرکاری: ئەم سیاسەتە خۆی لە خۆیدا هۆکارێکی سەرەکی هەڵگیرساندنی ئاگری جەنگ بوو، وڵاتە زلهێزەکان هەر لە کاتی جەنگەوە ویستە داگیرکاریەکانیان سەری هەڵدابوو، لە نێوان خۆیاندا چەند پەیماننامەیەکی نهێنیان بەستبوو بۆ دابەشکردنی زەوی و سوودە بەدەست هاتووە ئابووریەکان ئەگەر هاتوو سەرکەوتن، هەریەک لە وڵاتە زلهێزەکان کەم تازۆر بەشداریان کردبوو لەم پەیماننامانەدا، تەنها ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا نەبێت بەشداری نەکردبوو. [٢]

هەرچەندە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ڕۆڵی سەرەکی هەبوو لە کۆتایی پێهێنانی جەنگی یەکەمی جیهانیدا، ئەمە بارودۆخەکەی ئەوەندەیتر ئاڵۆز کرد، چونکە هەریەک لە وڵاتانی (فەرەنسا- ئیتاڵیا- بەریتانیا) ئەو ڕێکەوتننامانەی لە کات و شوێنی جیاواز جیاوازدا بەستبوویان زۆر بوون، هەندێکی لەنێوان دوو وڵات و هەندێک لەنێوان سێ وڵاتدا یان زیاتر بەسترابوو،، بە گوێرەی ئەم پەیماننامانە دەوڵەتی عوسمانی لە نێوان بەریتانیا و فەرەنسا و ئیتالیا و ڕوسیادا دابەشکرابوو، بەڵام ناوچەکانی ئەڵمانیا لە ڕۆژهەڵات دانرابوو بۆ ژاپۆن و بەریتانیا، بڕیار درابوو هەردوو ناوچەی (ئەلزانس و لۆرین) بگەڕێتەوە بۆ فەرەنسا لەگەڵ ڕۆژئاوای (ڕاین)، ئیتاڵیا بەڵێنی پێدرابوو هەردوو ناوچەی (تۆرینتۆ و تریستە) و بەشێک لە (پترۆڵ)ی سەر بە (نەمسا و مەجەڕو) و هەندێ ناوچەی سەر بە (ئەدریاتیک) وەک (ئەستیریا) و (دالماشیا)ی باکووری پێ بدرێت. [٣]

هاوپەیمانان سووربوون لەسەر جێبەجێکردنی ڕێکەوتن نامەکان، لەلایەکی تریشەوە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە دژی بوون، هەرچەندە ئەم ناکۆکی و دژە ڕایانە پێچەوانەی ئەو بنچینەیە بوو کە کۆنگرەی ئاشتی لەسەر بونیادنرابوو، ئەویش ئەوەبوو، لەسەر ئەم کۆنگرەیە پێویست بوو نەخشەی جوگرافی جیهان

---

١ - علی حیدر سلیمان: س- پ، ص ٣٨٩.

٢ - هەمان سەرچاوە.

٣ - علی حیدر سلیمان: س- پ، ص ٣٩٠.

بگۆڕێت بە تایبەت ئەوروپا، ئەوەش لەسەر بنەمای دەرئەنجامەکانی جەنگ، و ڕێگە خۆشبکات بۆ چەسپاندنی مافەکانی مرۆڤ ئەمەش بە نەهێشتنی دەست درێژی کردنی گەلی بەهێز بۆ سەر گەلی لاواز و... هتد، چەندین مافی تر بۆ گەلنی جیهان.[1]

لێرەدا (وڵسن) سەرۆک کۆماری ئەمریکا هەوڵیدا تەرازووی هێزەکان ڕابگرێت و زامەکانی جەنگی یەکەمی جیهان سارێژ بکاتەوە، ڕێگای نەدا جارێکی تر جیهان ڕووبەڕووی نەهامەتیەکی هاوچەشنی ئەوەی لە (١٩١٤) ڕوویدا ببێتەوە.

بۆیە هەستا بە پێشنیازکردنی (١٤) بەندە بەناوبانگەکەی کە بناغەی ئاشتی جیهانی لەسەر دانرا، لە بەندی (١٤) هەمیدا، پێشنیازی دامەزراندنی ڕێکخراوێکی جیهانی کردبوو کە بتوانێ ئاشتی بۆ جیهان بەدی بهێنێ ئەویش (کۆمەڵەی گەلن) بوو.[2]

(وڵسن) لەوباوەڕەدابوو ڕێکخستنی ئاسایشی نێودەوڵەتی دەکرێت ببێتە دەروازەیەکی کرداری بۆ سیاسەتی جیهانی، ئەو دەیزانی ئەو ڕێککەوتننامانەی لەسەر کاغەز نوسراونەتەوە بە تەنها بەس نین، بەڵکو هەردەبێ ڕێکخراو و ڕێسایەک هەبێ ئەو ڕێککەوتننامانە جێ بەجێبکات، بۆیە (وڵسن) باوەڕێکی گەورەی بە بیرۆکەی (کۆمەڵەی گەلن) هەبوو، ڕاستە هێزی ئاکاری گرنگە، بەلام هەردەبێ هێزی سەربازی پشتگیری ڕەوشت بکات. بۆیە لە نیسانی (١٩١٩) دەستووری کۆمەڵەی گەلن دانرا و بلاوکرایەوە بۆ جیهان، بەپێی دەستووری کۆمەڵەی گەلن کۆمەڵەکە دابەش کرابوو بەسەر ئەم بەشانەدا.[3]

أ/ کۆمەڵەی گشتی: نوێنەرایەتی هەموو ولاتە ئەندامەکان دەکات، ڕێکخراوەکە ولاتانی سەرپشک کردووە، هەریەکە و سێ کەس نوێنەرایەتی بکات بەمەرجێک هەرشاندێک یەک دەنگی هەبێت، و مافی وتوێژکردن و پێشنیارکردنیان هەبێت، بەلام مافی یاسادانیان نیە.

ب/ ئەنجومەنی کۆمەڵەی گشتی: لە پێشدا لە (٩) ئەندام پێکهاتبوو، پێنجیان هەمیشەیی بوون لە ولاتە هاوپەیمانەکان پێکهاتبون، ئەوانیش (ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ، بەریتانیا ، فەرەنسا ، ژاپۆن و ئیتالیا). بوون، لەگەڵ چوار ئەندامی کاتی کە ئەندامانی ئەنجومەن هەڵیان دەبژێرن.

---

١ - بشرى قبيس واخرون: س- پ، ص ٢١.

٢ - یاسین صابر صالح:ئینسکلۆ پیدیای گشتی،دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم،سلێمانی،٢٠٠٥،ل٨٧٩.

٣ - علي حيدر سليمان:س-پ،ل٣٩١.

ج/ سـكرتاريەتی بەردەوام: لە کۆمەڵێـك فەرمـانبەر پێکهـاتبووە، ئەرکیـان کۆکردنەوەی زانیارییە ڕاستەکان و تۆمارکردنی ژمارەی پەیماننامەکان و هەستان بوو بەو ئەرکانەی سکرتاریەتی کۆمەڵە لەسەریان دانابوو.[1]

(ولسن) باوەڕی وابوو گرنگترین شت لە دەستی بێت بۆ ئاشتی جیهانی بریتیە لە (کۆمەڵەی گەلن)، بەڵام ئەگەر داواکاریەکانی هاوپەیمانان جێ بەجێ بکرێت ئەم هیوایە جێبەجێ ناکرێت، بۆیە (ولسن) پاڵپشتی کرد لەیەک بەیەکی بنەماکانی لە دانوسـانەکانی کـۆنگرەی ئاشـتیدا، لەنێـو ئەو خـاڵانەی جێبەجێکـرد بریتـی بـوو لە ڕەتکـردنەوەی داواکاریەکـانی ئیتاڵیـا لە هەرێمـی (فیـوم) و داواکـانی (کلمنصـو) لە دابڕانی هەرێمی (ڕاین)ی ئەڵمانیا و ڕێگرتن لە فەرەنسا بۆ وەرگرتنی دۆڵی (سار) و هەڵوەشانەوەی ئەو پرۆژەی هەموو جەنگی دەخستنە ئەستۆی ئەڵمانیا.[2]

سەرەڕای ئەو هەموو ڕووبەڕووبوونەوەی لەلایەن ئۆپۆزسیۆنەکانیەوە (ولسن) سەرکەوت لەوەی (کۆمەڵەی گەلن) بکاتە بەشێ لە سیستەمی پەیماننامەکە و بیخاتە نێو ڕێکەوتنەکانەوە، کۆمەڵەکە هیوایەکی ئایندەی دەربارەی ئاشتی بە مرۆڤایەتی ئەدا. بەڵام دوای ئەوەی دەوڵەتە سەرکەوتووە ئەوروپیەکان توانیـان (ولسن) ناچـار بکەن دان بەدوو خاڵی گرنگدا بنێت ئەوانیش:

١. بژاردنـی هەمـوو ئەو زیانـانەی لە ئەنجـامی دەسـت درێژییەکـانی ئەڵمانیـا هاتبووە ئارایەوە لە لایەن ئەڵمانیاوە.

٢. وڵاتە سـەرکەوتووەکان ئـازادی کەشـتوانیان هەبێت لە مـاوەی جەنگدا واتە بنەمای ئازادی دەریاوانی.[3]

(ولسـن) نیـازی وابـوو بیروبـاوەڕی دابەشـکردنی وڵاتـان کە هەریەکە لە (لوید جۆرج و کلیمنصۆ و ئۆرلاند) دەیانویست جێبەجێی بکەن، بگۆڕێت بۆ سیستەمی (ئینتـداب) کە مەرجە لە مـاوەیەکی دیـاری کـراودا کۆتـایی بە داگیرکـردن بهێنێت، چونکە ولسن بەردەوام ترسی لەوەبوو هاوپەیمانان ئەو هەموو کارەساتەی جەنگ جێی هێشتووە وایان لێبکات داواکاری قورس پێشکەشی ئەڵمانیا بکەن.[4]

---

١ - الن نفنز:تاريخ المتحدة الأمريكية،ص٤٨٤.

٢ - تشارلز و مارى بيرد: تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية،ج٢/ص ٤٨٦.

٣ - بشرى قبيس واخرون: الحروب والازمات الاقليمية،ص٢٤.

٤ - محمد محمد صالح و ياسين عبدالكريم ونورى السامرائي:الدول الكبرى بين الحربين العالميتين(١٩١٤-١٩٤٥)، جامعة بغداد،ص٣٣١.

بۆیە لە کاتی تاوتوێ کردنی مەرجەکانی کۆتایی ئاشتیدا (کلیمنصو) پێشنیاری کرد هەرێمی (ڕاین) لە ئەڵمانیا دابڕێت و بە شێوەیەکی سەربەخۆ بخرێتە ژێر سایەی ئەورووپاوە، هەروەها پەیماننامەی ئاشتی لەگەڵ هەریەک لە میرنشینەکانی ئەڵمانیا بەشێوەی سەربەخۆ و جیاجیا ببەسترێت بەمەبەستی پووچەڵکردنەوەی یەکێتی ئەڵمانیا، هەریەک لە سەرۆک (وڵسن) و (میستەر جۆرج) پێشنیارەکەیان ڕەتکردەوە، پێشنیارێکی تریان خستەڕوو بۆ بەرگری کردن لە ئیتالیا لە بەرامبەر مەترسیەکانی ئەڵمانیادا، ئەویش سنووردارکردنی ژمارەی سەربازانی ئەڵمانی و بەستنی پەیماننامەیەک لە نێوان (ئەمریکا و فەڕەنسا و بەریتانیا)دا، بەپێی ناوەڕۆکی ئەم پەیماننامەیە ئەمریکیەکان و بەریتانیەکان ناچاربن لایەنگری فەڕەنسا بن لە کاتی هەر دەست درێژیکردنێکی ئەڵمانیا بۆسەر فەڕەنسا، ئەم ئاشتبونەوەیە جەنگی بەسەر دۆڕاوەکاندا شکاندەوە، لە (٢٨)ی حوزەیرانیساڵی (١٩١٩)دا، پەیماننامەی (ڤێرسای) تاوانی جەنگی خستە ئەستۆی ئەڵمانیا و بە ناچاری پێی واژووکرد، بەبێ ئەوەی هیچ مافێکی ڕادەبڕینی هەبێ لەسەر بەندەکانی پەیماننامەکە، بەپێی ئەم پەیماننامەیە ئەڵمانیا هەشت یەکی زەوی و نزیکەی (٦,٥) ملیۆن لە دانیشتوانی و داگیرگەکانی لە دەستدا، گێڕانەوەی (ئەلزاس و لوزین) بۆ فەڕەنسا، (ئوپین و ماڵدی و مۆریزنێت) بۆ بەلجیکا و گەڕانەوەی سەرجەم ئەو ناوچانەی لە ژێردەستی دەوڵەتە دۆڕاوەکانی جەنگدا بوون، ڕووخانی هەرسێ ئیمپراتۆریەتی (ئەڵمانی و عوسمانی و نەمسا- مەجەڕ).[1]

کاتێک (وڵسن) لە شوباتی (١٩١٩)دا گەڕایەوە بۆ (واشنتون) بۆ ئەوەی پرۆژەی (ڤێرسای و کۆمەڵەی گەڵن)پێشانی کۆنگرێسی ئەمریکی بدات، ڕووبەڕووی بەرگریەکی زۆر بوویەوە لەلایەن نەیارەکانیەوە، ئەمەش زیاتر لەسەر بەندی (١٠)ی دەستووری کۆمەڵەکە بوو، بەپێی ئەم بەندە دەبوایە لە کاتی ڕوودانی هەر کێشەیەک لە ئەورووپادا هێزی سەربازی ئەمریکا بەکاربهاتایە، بۆیە ئەم کۆمەڵەیە لەلایەن ئەنجومەنی پیرانی ئەمریکاوە ڕەتکرایەوە، سەرئەنجام ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ئەندامێتی کۆمەڵەکە کشایەوە.[2]

---

١ - فاروق الحريري: الحرب العظمى(الحرب العالمية الاولى)،منشورات وتوزيع المكتبة العالمية،مطبعة حسام، بغداد،١٩٩٠،ص٢٥٨.

٢ - د. طليعة الصياح و راغب العلي: تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية،ص١٨٦.

## ئەمریکا و قەیرانی ئابووری (١٩٢٩ - ١٩٣٣)

یەکەم جار نیە ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ڕووبەڕووی قەیرانی ئابووری ببێتەوە، وەک زانراوە لە مێژووی ئەم وڵاتە زلهێزە لە پاش داگیرکردنی بەریتانیا بۆ واشنتۆنی پایتەخت لە جەنگی ساڵی (١٨١٢)، و پاشان لە جەنگی ناوخۆیی ئەمریکا لە نێو ساڵانی(١٨٦١-١٨٦٥) و دابەشبوونی ئەمریکا بۆ باکوور و باشوور و هەروەها لە سەرەتاکانی سەدەی ڕابردوو قەیرانی ئابووری هەبووە، بەڵام گەورەترین قەیران، کە ڕووبەڕووی ئەمریکا بوویەوە لەنێوان هەردوو جەنگی جیهانی لە ساڵانی (١٩٢٩-١٩٣٢)دا بوو کە هەموو بازاڕەکانی ئەمریکای داڕووخاند، کاریگەری گەورەی کردە سەر بازاڕەکانی جیهان و ببووە قەیرانێکی جیهانی، جێی ئاماژە پێدانە لە پاش کۆتایی هاتنی جەنگی یەکەمی جیهانی لە(١٩١٨/١١/١١) تا کۆتایی سەدەی ڕابردوو نزیکەی (٥٠) جار قەیرانی ئابووری جیهانی گرتووەتەوە، ئەمەش بۆ خۆی بەشێکە لە سروشتی سیستمی سەرمایەداری، کە هەمیشە تووشی هەڵگەڕانەوە دەبێت.[١]

لە ئۆکتۆبەری (١٩٢٩)دا بەهۆی بەرهەمهێنانی هەڕەمەکی و بێ سەروبەر و ئەو دەسکەوتە زۆرەی ژمارەیەکی کەم لە پیاوە سەرمایەدارەکان دەستیان کەوت، بووبە هۆی دروست بوونی کێشەی بازاڕی دراو (وڵ ستریت) لە نیویۆرک ئەمە سەرەتایەک بوو بۆ قەیرانی ئابووری جیهانی و بەهای دراو بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر دابەزی، ئەمەش بووبە هۆی ئیفلاس بوونی (٦٥٩) بانک، لە ساڵی (١٩٢٩) تا ساڵی (١٩٣١) ژمارەی ئەو بانکانەی مایەپووچ کرد گەشتە (٢,٢٩٤) بانک، ئەم داڕمانە ئابوورییە بووە هۆی بێ بازاری و مەنگ بوونی ئابووری جیهانی، لە نێوان ساڵانی (١٩٢٩- ١٩٣١) ڕژێمی سەرمایەداری گەورەترین قەیرانی ئابووری بەخۆوە دی کە بە داڕمانی گەورە ناو دەبرێت، لە ڕۆژی هەینی (٢٤) تشرینی یەکەمی (١٩٢٩) ڕوویدا بە ڕۆژی ڕەش ناو دەبرێت، سەرەتا قەیرانەکە لە بۆرسە ڕوویدا و دواتر نرخی (سهم) پشکەکان دابەزی و، بووبە هۆی مایەپووچبوونی بانکەکان، نرخی ملیۆنان پشک لە دەرئەنجامی ئەو وەستانەی بۆ فرۆشتن خرا بووە

---

١ - د.ئاراس فەریق زەینەل:ئۆباما و پرسە هەستیارەکان،ل ٥٩-٦٠.

ڕوو دابەزی، ئەم داڕمانە گەشتە ئاستێک لە کۆتای ساڵدا بوویە (١٥) ملیۆن دۆلار.[١]

نرخی کەل و پەل و شمەکەکان لە نێوان ساڵانی(١٩٢٩- تاکۆتایی ١٩٣٢)بە ڕێژەی سێ یەک دابەزی. بەڵام دابەزینی کەرەستەی کشتوکاڵی زۆر لەوە زیاتر بوو لە کۆتای (١٩٣٠) نرخی گەنم بەڕادەیەک دابەزی پێش چوار سەدە تۆمارکرابوو.

ژمارەی کارمەندانی کشتوکاڵ لە نێوان ساڵانی (١٩٢٣- ١٩٣٩)دا، بۆ (١٠%) دابەزی هەروەها لە ئیتالیا ئەم دابەزینە بووە هۆی زیادکردنی نرخی گەنم بەشێوەیەکی بێ وێنە، زیاتر لە (١٣٠٠) بانک ناچاربوون دەرگای بانکەکانیان دابخەن، لە کۆتایی ئۆکتوبەری (١٩٢٩) تا یۆلۆی (١٩٣٢) بەرهەمهێنای پیشەسازی بە شێوەیەکی زۆر دابەزی، بێگومان لەوکاتەدا بازرگانی بە شێوەیەکی جیهانی بەرەو داڕمان ڕۆشت، ڕێژەی بێکاریش بەردەوام بەرز دەبویەوە تا لە ساڵی (١٩٣٣) گەشتە نزیکەی (٢٥) ملیۆن.[٢]

لە ساڵی (١٩٢٩- ١٩٣٢) لە ویلایەتە یەکگرتووەکان و فەڕەنسا و ئنگلتەرا و ئەڵمانیا ئاماژەیان بە داڕمانی خێرای ئابوری وڵاتەکەیان دەرکرد ئەمەش بوو بەهۆی قووڵبوونەوەی ئەم کێشەیە، بەشێوەیەک لە ساڵی (١٩٢٩) بڕێکی گەورە کرێکار لە کێلگەکاندا بێکاربوون، ئەمەش بووە هۆی بڵانەوەی برسێتی و کۆچکردن، جموجۆڵی کۆچکردن تەنها ئەوروپای نەگرتەوە بەڵکو لە بەڕازیل لە شارەکانی (دیو) و (ساوپاولو)، کۆچکردن لە لادێوە بۆ شار بە ڕێژەی (٦٠%) بەردەوام بوو، تەنانەت لە ئەڵمانیا و ئیتاڵیا دانیشتوانی لادێ ڕێژەی (٣٥%) ی هەموو دانیشتوان پێکدەهێنا بەڵام لە ساڵی (١٩٣٣)دا ئەم ڕێژەیە دابەزی بۆ (٣٢,٨)، لە ساڵی (١٩٣٩) گەشتە (٣٠,١%).

قەیرانی ئابووری جیهانی نێوان (١٩٢٩- ١٩٣٢)، یەکێکە لە قەیرانە گەورەکان کە بووە هۆی دابەزینی وزەی بەرهەمهێنان، درێژترین و توند و تیژترین قەیرانی ئابووری بوو لە جیهاندا، کە بووە هۆی دابەزینی بەرهەم لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی کە بەڕێژەی (٤٢%) دابەزیوە، لەو ماوەیەدا وڵاتان پەنایان بردبووە بەر دابەزینی

---

١ - پیرو نوڤن: تاريخ القرن العشرين،تر- نورالدين حاطوم،دار الفكر الحديث،بيروت،١٩٦٩،ص٣٠٦.

٢ - الان بالمر:موسوعة التاريخ الحديث،ص٢٢٣.

نرخی دراو یان ناردنیان ڕاگرتبوو، باری دارایی خراپ بوو، بازرگانی نێودەوڵەتی کەم بووەوە. [١]

ئەم قەیرانە لە ویلایەتە یەکگرتووەکان دەستی پێکرد و بە خێرایی لە ئەورووپای ناوەڕاست و ئینگلترا و فەڕەنسا بڵاوبویەوە، تەنانەت ئەمریکای لاتینیشی گرتەوە و گەشتە ژاپۆنیش.

ئەو قەیرانەی لە (٢٢) تشرینی یەکەمی (١٩٢٩) لە بازاڕەکانی دارایی لە نیویۆرک ڕوویدا، بووە هۆی دابەزینی گەورە لە نرخی (سهم) سەندەکان، لە ساڵی (١٩٣١)ئەم دابەزینە هەموو بازاڕەکانی جیهانی گرتەوە، و نرخ دابەزی، سەرئەنجام موچەی کرێکارانیش دابەزی، بە هەمان خێرایی دابەزینی نرخی شمەکەکانی تر، بێکاری بە خێرای بڵاوبوویەوە، دواتر ناوچەکانی تری ئەورووپای گرتەوە، کاریگەری یەکەمی بۆ نەمسا و ئەڵمانیا هەبوو. [٢]

سەرهەڵدانی قەیرانی ئابووری جیهانی ژەنگی سیاسی زۆری پێوە بوو چ لە ڕووی سیستەمی ناوخۆی هەندێ دەوڵەت یا لە بواری نێودەوڵەتیەوە، ئەم کێشەیە بەلێدانی دارای دەستی پێکرد لە بازاڕەکانی نیویۆرکدا لە (٢٤) تشرینی یەکەمی (١٩٢٩) تا (١٩٣٢) بەردەوام بوو لە فەڕەنسایش تا ساڵی (١٩٣٥) بەردەوام بوو، لە ماوەی قەیرانەکەدا بەرهەمی جیهانی نەگەشتە ئاستی ساڵی (١٩٢٩)، ئەم قەیرانە ئابووری و داراییە دەرئەنجامێکی گەورەی هەبوو لە بواری کۆمەڵایەتیدا، تەنها لە ناوەندی بازرگانی و پیشەسازیدا نەبووە زەرەر بۆ تاک بەڵکو بووە هۆی کێشەی بێکاری. [٣]

ئەم قەیرانە بووە هۆی تێکچوون و ئاڵۆزبوونی پەیوەندیەکانی نێوان دەوڵەتان بە شێوازی جۆراوجۆر، و لە هەموو دەوڵەتانی جیهاندا بووە هۆی لە رزینی بواری ئابووری، هەرچەندە لە زۆر لاوە بەرهەڵستکرا، بەڵام نەتوانرا لە ناو ببرێ بۆیە بەرهەڵستی وڵاتانیش لە بەرامبەر ئەم قەیرانە جیاوازبوو، لە ساڵی (١٩٣١)دا، کاتێک کێشەی دارایی لە ئەورووپا سەریهەڵدا بەریتانیای گەورە ناچاربوو واز بهێنێ لە بنکەی زێڕ لەکاروباری داراییدا، لە ساڵی (١٩٢٩)دا بووە هۆی زیادبوونی سودی

١ - ولیم ز.لوستر:موجز تاریخ الحرکة النقابیة العالمیة،تر.عبدالحمید الصافي،مطابع دار الثورة، بغداد، ١٩٧٤، ص١١٥.

٢ - محمد محمد صالح واخرون:الدول الکبری بین الحربین العالمتین(١٩١٤-١٩٤٥)،ص١١٤.

٣ - پیرو نوڤن: تاریخ القرن العشرین، ص١٧٠.

قەرزەکان لە (٥٥%) بۆ (٦%)، تەنانەت دابەزینی نرخ لە ئینگلتەرا لە ساڵی (١٩٢٩)دا بوو بەهۆی کشانەوەی ئاڵتون لە بانکەکانی ئینگلتەرا، لەگەڵ ئەوەشدا دەزگای ئابووری و دارایی (ولستریت)سەرەڕای ئەم دابەزینە بەردەوام بوو لەسەر فرۆشتنی پشک و قەباڵە، لە کاژێری کۆتایی ڕۆژی (٢٣) تشرینی یەکەمی (١٩٢٩) بازاڕی پشک و قەباڵە بە شێوەیەکی کتوپڕ هەرەسیهێنا، لە ڕۆژی دواییدا دەستەی یەکەم بڕی (١٢,٨٠٠,٠٠٠) پشکی فرۆشت، بەڵام لە دەستەی دووەمدا بڕەکەی بۆ (٦,٣٠٠,٠٠٠) پشک دابەزی بە نرخی (٥٠% بۆ ٧٠%) کەمتر لە بەهای راستەقینەی خۆی، لەگەڵ کێشەی ساڵی (١٩٢٩)دا حکومەتەکانی ئەوروپا لە دانەوەی ئەو قەرزانەیان وەستان کە لەئەنجامی جەنگی یەکەمی جیهان کەوتبووە سەریان، ئەمریکیەکان ئەو قەرزەی دابوویانە وڵاتانی دەرەوە لە جیهاندا دەگەشتە نزیکەی (٥ملیار)دۆلار هەموویان لەناوچوون.[1]

ئەم دارمانە لەگەڵ خۆیدا کێشەی بێکاری هێنا و لە ئەوروپا ساڵێکی تەواو و، لە هەندێ وڵاتدا بۆ ماوەی دوو ساڵ درێژەی هەبوو، ڕێژەی بێکاری بە جۆرێک بەرزبوویەوە ژمارەی بێکاران گەشتە (٣٠- ٥٠) ملیۆن بێکار، ئەوەش کاری دەست دەکەوت کاتێکی زۆر کاری دەکرد لە بەرامبەر کرێیەکی کەم، بە جۆرێک بێکاری تەگەرەی خستە بەردەم پیشەسازی، ئەمەش کاریگەی گەورەی هەبوو لەسەر مەسەلە سیاسیەکان.[2]

لە دوای جەنگ پیاوانی پیشەسازی وای بۆ دەچوون دەتوانن پارێزگاری بکەن لە بەرەوپێش چوونی پیشەسازی بەسێ ڕێگا:

١. دروستکردنی پێداویستی تازە و بەردەوام بوونی جەماوەری بەکاربەر.

٢. بوژانەوەی (داواکاری) بە بەردەوام، لە ڕێگای زیادکردنی کرێ بۆ زیادکردنی هێزی کڕین لە ناو جەماوەردا.

٣. دۆزینەوەی میکانیزمێک، کە لە قەرزەکاندا خۆی دەنوێنێت لە ناو ویلایەتە یەکگرتووەکاندا درا بە (بەرهەمهێنەرەکان و بەکارهێنەرەکان) وەک یەک، یان لە دەرەوە بۆ وڵاتانی ئەوروپا بە شێوەیەکی گشتی ئەڵمانیا و نەمسا بە ڕێژەیەکی

---

١ - میشال جوبیر:الأمریکیون،تر.وجیة البعیسی،المطبعة العربیة،الطبعة الاولی،بیروت،١٩٨٩،ص٤٧.

٢ - ولیم ز.لوستر: س-پ، ل١١٥.

کەمتر، بە مەرجێک کەرەستەی خاوی پیشەسازی و شمەکە خۆراکیەکان لە ویلایەتە یەکگرتووەکان بکڕن.[1]

قەیرانەکە بووە هۆی دابەشبوونی ڕژێمە سیاسیەکان لە بناغەوە بەتایبەت ڕژێمی پەرلەمانی، دواتر ئەو قەیرانە یارمەتی دەربوو بۆ ئەو بارودۆخەی لەلایەن ڕژێمی پەرلەمانەوە دڕۆشت، بەڵام بڵاوبوونەوەی بێکاری لە جیهاندا بووە هۆی زیادبوونی داواکاری چاکسازی، داواکاری کرێکاران بۆ چاک خوازی بویە مایەی مەترسی لەسەر بەشە سیاسیەکان، ئەو داواکاریانە زۆربوون لەسەر مافە نوێکان، ئەمەش زەنگێکی ترسناک بوو لە ڕژێمی پەرلەمانیدا، وەک چۆن (لوفیفر) دەڵێ لە ساڵی (١٩٣٣) هیچ ڕژێمێکی لیبراڵی نەما لەسەر ڕووی زەویدا تەنها لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ئینگلتەرا و دەوڵەتانی دۆمنیۆن و فەرەنسا نەبێ، لەگەڵ ئەو دەوڵەتە بچووکانەی دەکەونە باکووری ڕۆژئاوا یان ناوەڕاستی کیشوەری ئەوروپا لەوانە بەلجیکا و دەوڵەتە نزمەکان و سویسرا و چیکلۆسۆفاکیا و وڵاتانی ئەسکەندەنافیا.[2]

کێشەی کشتوکاڵیش کە هەموو جیهانی گرتەوە بە تەنها گەنمی نەگرتەوە، بەڵکو هەموو لایەنەکانی کشتوکاڵی و پیشەسازی گرتەوە بە توتن و ئاوریشم......و

و داهاتی جوتیاران لە (٣,٣) دۆلار ساڵی (١٩٢٣) دابەزی بۆ (٩٠) سەنت و ساڵی (١٩٣٢) قەرزی بە کرێگیراوەکان گەشتە (١٢,٥) ملیار دۆلار و نزیکەی (٨٠,٠٠٠) دەرقتی (دراق) لە، زیادی بەرهەمەکان ساڵی (١٩٣٢) ڕەگەوە هەڵکەنرا.[3]

دواتر ئەم قەیرانە بووە هۆی ئەوەی بازرگانی جیهانی لە ساڵی (١٩٣٢)دا بە ڕێژەی یەک لە سێ دابەزێ و لە ئینگلتەرا لە نێوان ساڵانی (١٩٢٩- ١٩٣٢) بۆ ڕێژەی (٣٧%) دابەزی، لەندەن چیتر بازاڕی زێر نەبوو لە جیهاندا.

ناهەمواری باری بازرگانی و پیشەسازی لە هەموو لایەکی جیهاندا پەرەی سەند و ناوی تەنگ و چەڵەمەی ئابووری جیهانی لێنرا، بەربەرەکانی و پێکدادان لە بازاڕی پارە لە نیویۆرکدا بووە هۆی پەیدابوونی ئەم تەنگ و چەڵەمەیە، بازرگانی

---

١ - د.عبدالعظيم رمضان: تاريخ اوروپا والعالم الحديث من ظهور البرجوازية الاوروبية الى الحرب الباردة،الهيئة المصرية العامة للكتاب،١٩٩٣،ص٥٥.

٢ - موريس كروزية:تاريخ الحضارات العالم،تر.يوسف اسعد داغر، عويدات للنشر والطباعة، بيروت، ١٩٩٤، ج ٧/ ص ٣٠٠.

٣ - د. طليعة الصياح و راغب العلي: تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية، ص ١٩٨.

له هەموو لایەکی جیهاندا ڕووی لەکزی کرد، نرخ تێکڕا دابەزی بە تایبەت نرخی بەرووبوومی کشتوکاڵی، هەروەها بەرهەمی کارگەکان مایەوە و کۆمەڵ دەبوو بێ ئەوەی کەس بیکڕێت، ئەمەش خاوەن کارگەکانی ناچار کرد کارگەکانیان دابخەن، چونکە نەیان دەتوانی لە بەرهەمهێنانی شتومەکدا بەردەوام بن، لە بەرامبەردا کەس نەبێت بیکڕێت، ئەمەش بووە هۆی بڵاوبوونەوەی بێکاری لە ئەوروپا.[1]

تایبەتمەندیەکانی ئەو داشکانە بەردەوامەی نێوان ساڵی (١٩٢٩- ١٩٣٢) لە جیهاندا ڕویدا ئەمانەن:

أ- لە بواری کشتوکاڵدا زۆربوونی بەرهەمی کشتوکاڵ و نەبوونی بازاڕێک بۆ ساغ کردنەوەی بووە هۆی تێکچوونی بارودۆخی ئابووری لەبەر ئەم هۆیانە:

١. لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا زیادبوونی باجی بازاڕ بووە هۆی ڕاکێشانی پشکەکانیان لە ئەوروپا، ئەمەش بارودۆخی (وۆڵ ستریت)ی تێکدا و ئاڵۆزی کرد، کە بە کەوتنی (وۆڵ ستریت) ناسرابوو.

٢. تێکچوونی باری بانکەکانی ئەوروپا بووە هۆی بەکارهێنانی سیستەمی (ئەنسالست)ی نەمساوی ئەمەش لەسەر بنەمای بەرژەوەندی بڵاوبووەوە لە زەویەکانی دانوب، لە بەرامبەردا فەرەنسا هەموو پشکەکانی خۆی کشانەوە.[2]

ب- بارودۆخی ئابووری بەهۆی داشکان لە شمەکە نێردراوەکان و بەکاربردنی ناوخۆ بووە هۆی کەمکردنەوەی سەرمایە و کەمکردنەوەی بەرهەمی پیشەسازی و دواجار بێکاری زیادیکرد، ئەو هۆیانەی کاریگەری لەسەر داشکانی ئابووری هەبوو:

١. زیادەڕەوی لە پلانی ئابووری.

٢. زیادەڕەوی لە باجی بازرگانی و ئابووری نیشتمانی.

٣. دەرکەوتنی ئەو کێشانەی جەنگ هێنایەکایەوە، لەوانە تێکچونی بازرگانی نێودەوڵەتی چونکە بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ بەرهەمهێنان تایبەت کرابوو بە جەنگەوە ئەمەش کاریگەری خراپی هەبوو بۆ سەر شمەکی بەکاربەرەکی، ئەوەبوو ئەوروپا قەرزارێکی زۆری ئەمریکا بوو هەوڵیدا ئەو قەرزانەی خۆی بە ئاڵتون پڕبکاتەوە، ئەمەش بووە هۆی بەرزبوونەوەی نرخی دراوی ئەوروپی، سەرئەنجام گۆڕانی بارودۆخ و نەمانی باری خۆشگوزەرانی ئەوروپای لێکەوتەوە.[3]

---

١ - جواهر لال نەهرو: س-پ، ل٣١٢.

٢ - الان بالمر:موسوعة التاريخ الحديث،ص٢٤٤.

٣ - د.محمود السيد: س-پ، ل١٥٢.

ئەم قەیـرانە بـووە هـۆی ڕووخـانی بازاڕەکـانی دراوی جیهـانی کە دواتـر بە سەردەمی بێکاری و هەژاری ناسرا، لەسـەر هۆکارەکانی سـەرهەڵدانی ئەم قەیرانە چەندین بیروڕای جیاواز هەبوو، بەڵام بە پلەی یەکەم ویلایەتە یەکگرتووەکانیان بە لێپرسـراوی سـەرهەڵدانی قەیـرانەکە دادەنـا، کێشـەکەش بەهـۆی ئەوەبـوو وەڵامدانەوەیەکی تەواو نەبوو بۆ یەکلاکردنەوەی قەرزەکانی جەنگ کە بووە هۆی هەڵاوسـانی ئـابووری ئەرورووپـا، ئەم تەنگژەیە هەمـوو جیهـانی گـرتەوە تەنهـا ئەو وڵاتانە نەبێت کە لە جیهاندا دوورە پەرێز بوون دەنا هیچ وڵاتێک لێی ڕزگـار نەبوو. [1]

ئەو قەیرانەی لە ساڵی (١٩٢٩)دا تا ساڵی (١٩٣٢) بەردەوام لە ئاڵۆسکاندا بوو و دواتـر چـاک بوونی، بـارودۆخی گشـتی بـووە هـۆی ئەوەی هاوسـەنگی ڕابگرێت لە نێـوان کەرتە جیاوازەکـانی وەبەرهێنـان و لە لایەکـی دیـکەوە هاوسـەنگی نێـوان نرخەکانیشـی بە جۆرێـک ڕاگـرت نرخەکـان زیـادی کـرد ئەویـش بە زیـادبوونی بەرهەمە خەزنکراوەکـان، جـگە لەوەش ڕادەی بێکـاری کەمکـرایەوە و بـارودۆخی کرێکـاران باشـتر بـوو، لەگەڵ ئەم چاکسازیانەشـدا کارگەکـان سێ یەکـی توانـای خۆیان کاریان دەکرد بۆ پڕکردنەوەی پێداویستی بازاڕەکانی نـاوخۆ، ئەم ڕێژەیە لە سـاڵی (١٩٣٢) بەرەو بەرزبـوونەوە ڕۆشـت بە تـایبەت ئەو کەرەسـتە خـاوانەی داواکـاری زۆریـان لەسـەر بـوو، ئەمەش بـووە هـۆی بەرزبـوونەوەی قەبـارەی بازرگانی نێودەوڵەتی. [2]

دوای قەیرانە ئابوورییە جیهانیەکەی سـاڵی (١٩٢٩- ١٩٣٢)، زانایانی بۆرجوازی کەوتنە گەڕان بە دوای ڕێگە چارەیەک بۆ زاڵبوون بەسـەر ئەو قەیرانە ئـابووریەدا، بۆ دڵنیابوون لە جێگیربوونی سیستەمی سەرمایەداری، حکومەتی هەندێ لە دەوڵەتە سـەرمایەدارەکان هەسـتان بە پێشکەشـکردنی کـار بـۆ کرێکـاران ئەویـش لە ڕێگـای کارپێکردنی گشتی یان لە ڕێگای فراوانکردنی ئـابووری جەنـگ، لە ڕاسـتیدا گـۆڕینی

١ - چون ستيل جوردون: امبراطورية الثروة(التاريخ الملحمي للقوة الاقتصادية الأمريكية)،تر.هشام ممدوح طه، الشرق الدولية،الطبعة الثانية،القاهرة، ٢٠٠٩،ص٣٤٣.

٢ - موريس كروزية: س-پ، ل١٧٦.

پاره لە نێوان وڵاتانی سەرمایەداریدا لە دوای کێشەی ئابووریی جیهان لە ساڵی (١٩٢٩- ١٩٣٢) لە ناوچوو.[١]

ئەنجامەکانی ئەم قەیرانە لەسەر وڵاتانی جیهان بە تایبەت ئەڵمانیا لە ترسناکی و گشتگیریدا هەرگیز وێنەی نەبوو، قەیرانەکە لە بنەڕەتدا بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە ئەمریکا لە ناوەڕاستی ساڵی (١٩١٩)دا، دەستی کرد بە فراوان کردنی پیشەسازی بە ڕێژەیەکی زۆر، بەڵام بەرهەمی ئەمریکی لە ساڵی (١٩٢٥)دا، دەروازەیەکی بە ڕووی خۆیدا بکاتەوە لە ئەوروپا، چونکە جارێکی دیکە ئەوروپا بوویە خاوەنی بەرهەمی خۆی، لێرەدا ئەڵمانیا زەرەرمەندترین وڵات بوو لەبەر ئەوەی ئەڵمانیا لە سەرەتای بیستەکاندا بە تەواوی پەیوەست بوو بە قەرزە بیانیەکان بە تایبەت قەرزەکانی ئەمریکا، ئەوەبوو (١٩٢٠) کۆمپانیای ئەمریکی لە ئەڵمانیا دامەزرا، دامەزراوە پیشەسازیەکان (٩٨٣) ملیار مارک زیانیان کرد، لە ساڵی (١٩٣١) ئەمریکیەکان دەستیان کرد بە کشانەوەی ئەو پارانەی لە ئەڵمانیادا دایاننابوو لە ئایاری هەمان ساڵدا ترس لە ئەڵمانیا بڵاوبوویەوە.[٢]

فەرەنساش نەیتوانی قەرزەکانی لە ئەڵمانیا وەربگرێتەوە، لە ئایاری ساڵی (١٩٣٠)دا بەرنامەیەکی نوێیان دانا بۆ دانەوەی قەرزەکان ئەویش بەرنامەی (یانگ) بوو، بەم پێیە پێویست بوو ئەڵمانیا لە ماوەی (٥٨) ساڵدا قەرزەکان بداتەوە، ئەڵمانیا پێویستی بە (٣٠) ملیار مارک هەبوو، لە هەمان کاتدا پێویست بوو قەرزەکانی ئەمریکا و بەریتانیا بداتەوە بۆ ئەم مەبەستەش دەبوایە بڕی (٧) ملیار مارکی دابینبکردایە.[٣]

لە ئەنجامی ئەو بێ بازاڕییە ئابووریەی ڕوویدا بووە هۆی زیادبوونی ژمارەی دانیشتوان و سەرلێشێواوی کۆمەڵایەتی، هەموو وڵاتە زلهێزەکان دەستیان کرد بە هەڵوەشانەوەی ئەو پەیمانانەی بەستبوویان.

ڕۆژنامەی (دیرانیت) کە ڕۆژنامەیەکی ئیشتراکی دیموکراتی ئەڵمانی بوو باسی لەوە دەکرد: (١٧) ملیۆن ئەڵمانی ژیانیان خراپ بوو، مانگانە (٣-٤) دۆلاریان دەست

١ - الكسندر كيرسانون:الولايات المتحدة الأمريكية،واوروپا الغربية،تر.جبرئيل فياض،دار الفارابي، بيروت،١٩٧٤، ص١٣٠.

٢ - د.راغب العلي واخرون: س-پ، ل٢٥٧.

٣ - ئيرو نوظن: تاريخ القرن العشرين، ص٣٨.

نەدەکەوت و کرێی هەفتانەیان دابەزیبوو لە (٤٢) مارک لە ساڵی (١٩٢٩)، بۆ (٢١) مارک لە ساڵی (١٩٣٢) بەمەش ئاستی پێداویستی ژیانیان کەم بویەوە.[١]

ئەڵمانیا لە توانایدا نەبوو کەرەستەی دارایی خۆی بفرۆشێت و ناچار بوون باجەکان زۆر بکەن و خەرجیەکانی دەوڵەت کەم بکەنەوە ئەوە بوو ئابووری ئەڵمانیا لە بواری بازرگانیدا وەستا.[٢]

هیتلەر زۆر هەوڵیدا بۆ ئەوەی پەیمانی (ڤێرسای) هەڵوەشێنێتەوەو، زەوییە دابڕاوەکانی ئەڵمانیا بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە لەسەر حسابی نەتەوەسلۆڤیەکان، ئەو کێشە ئابوورییەی جیهانی گرتەوە یارمەتیدا بۆ گەیشتن بە ئامانجەکەی، ئەمەش دوای سەرهەڵدان و بەهێزبوونی دەسەڵات و پێگەی نازییەکان لە ئەڵمانیادا.[٣]

هەروەها لە بەریتانیاش لە دوای کۆتایی جەنگی یەکەمی جیهانەوە بێ بازاڕی پەیدابوو بەرهەمی پیشەسازی بە ڕێژەی (٢٥%) دابەزی، تا کاتی قەیرانەکە ژمارەی بێکاری بۆ یەک ملیۆن لە ساڵی (١٩٢٩) بۆ (٢,٩٧٠,٠٠٠) ملیۆن لە ساڵی (١٩٣٢) بەرزبوویەوە، کرێش کەم بویەوە و نەیاندەتوانی ژیان دابین، بکەن هەروەها ژاپۆنیش بە هۆی ئەم قەیرانەوە زیانێکی گەورەی بەرکەوت، لە ساڵی (١٩٣٢) (٢,٨٤٠,٠٠٠) ملیۆن کرێکاری بێکار لە ژاپۆندا هەبوو، حکومەتی ژاپۆن بە گوێرەی سیستەمی ژاپۆنی یارمەتی بێکاری نەدەدا، لە فەرەنساش لە حوزەیرانی ساڵی (١٩٣٣) ژمارەی بێکاری گەشتبووە (٢,٣٠٠,٠٠٠) ملیۆن بێکار، لە وڵاتانی دیکەش وەک(ئیتاڵیا و نەمسا و پۆلۆنیا و چیکۆسلۆفاکیا و بەلجیکا و ئیسپانیا و وڵاتانی تری ئەسکەندەنافیا و ئوستڕالیا) و وڵاتانی تری سەرمایەداری بەهان شێوە بوو.[٤]

ئەم قەیرانە کاریگەریەکی زۆری لەسەر وڵاتە داگیرکراوەکان و نیمچە داگیرکراوەکان هەبوو، لە (چین و هند و وڵاتانی تری ئاسیا) بێکاری ژمارەیەکی زۆر پێوانەیی بڕیبوو، لە ناوچە لادێ نشینەکان برسێتی و قات و قڕی و گرانی

---

١ - الن نفنز: س-پ، ل٢٠٧.

٢ - ولیم ز.لوستر: س-پ، ل١١٧.

٣ - د.ئاراس فریق زەینەل: س-پ، ل ٦٣-٦٥.

٤ - د.فوزي درويش:الشرق الاقصى(الصين واليابان)،الطبعة الثالثة،١٩٩٧،ص١٥٠.

بڵاوبـویەوە، هەروەهـا لە وڵاتـانی ئەمریکـای لاتـین بەهەمـان شـێوە بەرووبـوومە پیشەسازی و بازرگانیەکان بە ڕێژەی لە (٥٠% بۆ ٨٠%) دابەزی بوو.[١]

لەم ڕووەوە حکـومەتی فەرەنسـا ناچـار بـوو قەرەبـووی هەنـدێ دامەزراوەی دارایی بکات کە تووشـی بـارگرانی هـاتبوون، لە ئینگلتـراش ئەم قەیرانە کـاریگەری لەسـەر ئینگلـتەرا حکـومەتی نیشـتمانی دروسـتکرد، لە هەڵبژاردنـی سـاڵی (١٩٣٢)دا مکدۆناڵ بوو بە وەزیری دارایی بۆ مـاوەی (٦) مانـگ، و تـوانی ڕەسـمی گومرگ بە ڕێژەی (١٠٠%) لەسـەر کەلوپەلی هـاوردەی ڕواڵەتکاری دابنێت، ئەم سیاسـەتە بۆ سـاڵانی دواتـر زۆر تونـد و فـراوان تـر بـوو، زۆر وڵاتـانی گـرتەوە و سیاسـەتی پاراستن ڕێژەکەی بەرزبویەوە ئەم سیاسەتە لە وڵاتانی تردا بەم شێوەیە بوو.

لە فەرەنسا لە ساڵی (١٩٣٢) (١٧,٨) بوو لە ساڵی (١٩٣٥) زیادی کرد بۆ (٢٩,٤).

و لە ئەڵمانیا لە ساڵی (١٩٢٩) (٨,١%) بوو لە ساڵی (١٩٣٧) بۆ (٢٩,٢) زیادیکرد.

و لە ئیتاڵیا لە سـاڵی ١٩٢٩ (١١,٩%) ەوە زیـادی کـرد بۆ (١٩,٤%)، لە ئینگلـتەرا لە سـاڵی (١٩٢٩) ڕێـژەی (١٩,٣% بـۆ ٢٣,٢) زیـادی کـرد، لە ئەڵمانیـا بەرهەمـی کشـتوکاڵی (١٥%) و بەرهەمـی پیشەسـازی (١٠%) و (٧٤%) بەرهەمـی ئاسـتی خاوی لە دەست داوە.[٢]

### فاکتەرەکانی قەیرانەکە

بە هـۆی ئەم قەیـرانە ئـابوورەییەی جیهـانی گـرتەوە لە گەڵێـک لە وڵاتانـدا ئامێرەکـانی کارگەکـان لە جـووڵە کەوتـن، ئەو کێڵگـانەی کە خـواردەمەنی و بەرووبوومی تریان بەرهەم دەهێنا بە بێکاری مـانەوە، ئەمەش پێی دەوترا قەیرانـی سـەرمایەداری، چـونکە دامودەزگـای ڕژێمـی سـەرمایەداری توانـای هەڵگرتنـی ئەم قەیرانەی نەبوو، لە جیهاندا بە هۆی زیادبوونی قەیرانە ئابووریەکە لە زۆر ڕووەوە بێ ئـارامی و نەبـوونی هاوسـەنگی نێـوان هـاتوو نێردراوی لێکەوتەوە، کۆسـپ و نارەحەتیەکـان لە ڕێـی بازرگـانی هـاتوودا لە زۆربوونـدا بـوو، بەمەش دیـاردەی وەستان لە خەرجکردن بڵاوبویەوە.[٣]

---

١ - ولیم ز.لوستر: س-پ، ل١١٧.

٢ - موریس کروزیة: س-پ، ل١٤٦.

٣ - محمد عبدالمنعم الشرقاوي:الولايات المتحدة ارضا وشعبا ودولة،الطبعة الثالثة،١٩٥٦،ص٤٥.

حکومەتی بەریتانیا لە دیسەمبەری (١٩٣٢)، یاداشتێکیدا بە حکومەتی ئەمریکا، لە یاداشتەکەدا هاتبوو (بە بێ بەزەیی باجەکان لە هەموو لایەکدا زیادکران، خەرجی بە جۆرێکی بەرفراوان کەمکرایەوە لەگەڵ ئەوەشدا چاودێریکردن بە ئامانجی چارەسەرکردنی بارودۆخەکان زیاتر ئەمەی ئاڵۆزکرد)، هۆکاری ڕاستەقینەی ئەم قەیرانە خواردنەوەی نرخەکان بوو سەبارەت بە کەمی زێڕ، لە ئەنجامی ئەوەی برێکی زۆریان دەهێنا، هۆیەکی دیکەش ئەوەبوو سیاسەتی ئابووری نیشتمانی کۆسپی گومرگی دادەنا، ئەمەش بووبە کۆسپ لە ڕێی بازرگانی، هەروەها کەم بوونەوەی ژمارەی کرێکاری پێویست لە ئیش و کارەکاندا، بووبە هۆی بڵاو بوونەوەی بێکاری. [1]

هۆکاری ڕاستەقینەی ئەو قەیرانەی کە لە (٢١)ی یۆلیۆمی (١٩٢٩)دا دەستی پێکرد ئەم هۆکارانە بوو:

١. هەندێک لە ئابووری ناسان دەیگێڕنەوە بۆ کەمی چەندێتی بوونی زێڕ لە جیهاندا کە بنچینەی سەرەکی ئاڵوگۆری دەولی و جیهانیە.

٢. بەمەش زیادبوونی ڕێژەی بەرهەمهێنان بە شێوەیەکی فراوان لە نێوان ساڵانی(١٩٢٠-١٩٢٩) و چالاکی بازرگانی گەشەی کرد و ڕادەی قازانجیش تادەهات زیاتر دەبوو، لە لایەکی دیکەوە دەست بە سەراگرتنی داهاتی نەتەوەیی لەلایەن چەند کەسێکەوە لە پیشەسازیدا بەکاردەهێنرا و بەرهەم بەشی هەموو گەلی نەدەکرد. [2]

٣. کەمبوونەوەی بەرووبووم بە هۆی دابەزینی نرخەکان، بوو بە هۆی دابەزینی توانای کڕینی جوتیاران وکەمبوونەوەی بەرووبوومی پیشەسازی جوتیاران، کرێکاران سودیان لە داهات وەرنەگرت لەبەر ئەوەی لە توانایدا نەبوو هەموو پیشەسازییەکان بفرۆشن.

٤. قەرز بە ئاسانی دەست دەکەوت، ئەمەش وای کرد قەرزی گشتی و تایبەتی زۆربێت و قەرزێکی زۆر کەڵەکەی کردبوو مابووەوە، دانەوەی ئەم قەرزانە بە خاوەن قەرزەکان گەشتە (١/٣)ی داهاتی نەتەوەیی و بازرگانی، بەمەش بارودۆخی جوتیار ناخۆشتر بوو، بێکاریش لە ناو کرێکاراندا زیادی کرد. [3]

---

١ - د.ئاراس فریق زەینەل: س-پ، ل ٦٧.

٢ - د. طليعة الصياح و راغب العلي: تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية، ص ١٩٨.

٣ - محمد محمد صالح واخرون: س-ث، ل١١٤.

٥. له ئەنجامی ئەو مەترسیەی له (٢٤)ی تشرینی یەکەمی (١٩٢٩) له نیۆیورک ڕوویدا بانکەکان تووشی زۆر کێشه بوون.

هۆکارێکی دیکەی ئەم قەیرانه زەرەرمەندبوون و تێکشکاندنی بانکی گەورەی نەریتشی بوو به ناوی (کریدیت انشتالت) له مانگی پێنج دا، تێکشکاندنی ئەم بانکه بووە به هۆی ئەوەی کۆمپانیا و سەرمایەدارەکان له بارەی توانای دووباره پێدانی دراو لەلایەن بانکەکانی تری ئەورووپای مەرکەزی نیگەران بن، دواتر لەمانگی (٧)دا یەکێک له گەورەترین بانکەکانی ئەڵمانیا به ناوی (دارم اشتادتر اوند ناسیۆنال بانک) سەرمایەیەکی قورسی له (ئۆردوول) بەگەڕخست ئەم دامەزراوە ئابووریيه نرخی لۆکەی به شێوەیەکی ترسناک بەرزکردەوە و به گەڕی خست، پیشەسازییه گەورەکان بەهۆی ئەم ڕووداوەوە نەیانتوانی متمانەی دارایی به دەست بهێنن، ناچاربوون چالاکیەکانیان کەم بکەنەوە، یاسای کۆمپانیا هاوبەشەکان ئاڵۆز بوو، ئەمەش وایکرد زۆر کاری سەخت به ئەنجام بگەیەنرێ.[١]

٦. نەبوونی سیستەمی باج بەسەر دەوڵەمەند و کەم دەرامەتەکاندا وایکرد داهاتی کەم دەرامەتەکان زۆر کەم بێتەوە، زۆربەی قازانجەکان دەچووە گیرفانی سەرمایەدارە گەورەکان و ڕێژەیەکی کەم بۆ کارکەران خەرج دەکرا، هەرچەند خەرجیەکی زۆریان تێدا سەرف دەکرد بەبێ ئەوەی ئەم قازانجه توانای کڕین لەلای خەڵکیدا به هێز بکات.

٧. هۆکارێکی دیکەش هاتنه خوارەوەی ڕێژەی نرخ بوو، ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ زۆری زیو و دابەزینی نرخەکانی، ئەمەش هۆکارێکی سەرەکی ئەو قەیرانه بوو چونکه زیادبوونی چەندێتی زیو و دەبێتەهۆی کەمی کڕین له دەوڵەتدا، ئەم دابەزینه لەساڵی (١٩٣٠)دا دەرکەوت.[٢]

ئەمەش بووە هۆی دابەزینی نرخی شمەکی کۆ و دابەزینی بەرهەمی پیشەسازی، و له دوایشدا دابەزینی نرخی بۆرسە، بەڵام ئەم دابەزینه به نسبەت ئەمریکاوە مام ناوەند بوو.

٨. داهێنانه زۆرەکانی سەردەمی جەنگ و دواتریش کەمبوونی دەستی کرێکاران و بڵاوبوونەوەی بێکاری‌لێکەوتەوە که له ئەنجامدا نەیان دەتوانی بەرووبوومەکان

---

١ – پیرو نوڤن: س–پ، ل٣٠١.

٢ – د.عبدالعزیز سلیمان نوار واخرون: س–پ، ل١١٤.

بکڕن، کارگەکان بەردەوام بوون لە پرۆسەی بەرهەمهێنان تا وای لێهات خستنەڕوو لە خواست زیاتر بوو، شمەکەکان لە بازاڕەکان مابوونەوە بەبێ ئەوەی بەبازاڕ بکرێت، خاوەن کارگەکان کارگەکانیان داخست بەمەش بێکاری بڵاوبوویەوە، بەمەش هێزی کڕین ڕۆژ لە دوای ڕۆژ دادەبەزی.[1]

٩. ئەو ئاراستە ئابووریانەی کە پێش ساڵی (١٩٢٩) هەبوون وایکرد بەرهەمهێنان لە دامودەزگا ئابووریەکان زیادبکات لە ئەنجامدا، کێشەی ئابووری ساڵی (١٩٢٩)ی زیاتر قوڵکردەوە، هاوکات ئەو سیستمی باج وەرگرتنەی کەئیشی پێدەکرا هیچ چاکسازیەکی تێدا نەکرابوو، ئەوانەی داهاتیان دیاریکراو بوو تاڕادەیەک باجی زیاتریان دەدا لەوانەی داهاتیان زۆر بوو، توانای شت کڕین لای خەڵکی تاڕادەیەکی زۆر سنوردار بوو، کاتێک حکومەتی ئەمریکا بڕیاریدا سیستەمی گومرگ ڕێکبخات کێشەکە زیاتر ئاڵۆزتربوو.

١٠. ئەو دەوڵەتانەی لە دوای جەنگ سەربەخۆییان بەدەست هێنابوو، جەختیان لەسەر دروست کردن و بەرهەمهێنانی شمەکی دەرەکی دەکرد و باجیان دەخستە سەر شمەکی هاوردە، پیشەسازییە بەکاربەرەکیەکان زۆر بوو، بازاڕی ناوخۆش پێویستی بەو زۆرینە نەبوو، حکومەت بەربەستی لە بەردەم بەرهەمە بیانیەکان دانا و ئەمەش کاریگەری هەبوو لەسەر بازرگانی جیهانی بە تایبەت لە ساڵی (١٩٣١)دا بێکاری بڵاوبویەوە و بەروبوومی پیشەسازی کەمبوویەوە، بازرگانی جیهانی کەم بوونەوەیەکی سەیری بە خۆیەوە بینی لەگەڵ دابەزینی نرخەکان.[2]

## کاریگەری قەیرانی ئابووری جیهان لەسەر ئابووری ئەمریکا

قەیرانی ئابووری جیهانی (١٩٢٩) لە بنەڕەتدا گرفتێکی ئابووری ئەمریکا بوو، سەرەتا بە داڕووخانی بازاڕی دراوی نیویۆرک دەستی پێکرد، پاشان وڵاتانی ئەوروپای ناوەڕاست و ئینگلتەرا و ئەمریکای لاتین و ژاپۆنی گرتەوە.

بانکەکانی ئەمریکا متمانەی داراییان خستبووە بەردەست بەرهەمهێنەر و بەکاربەرە ئەمریکیەکان، بەشێکیشیان خستبووە سەر ئەوروپا بە تایبەت ئەوروپای ناوەڕاست و وڵاتانی ئەڵمانیا و نەمسا، بەرامبەر بەوەی کەرەستەی خاوەی

١ - محمد محمد صالح واخرون: س-پ، ل١١٤.

٢ - د. طليعة الصياح و راغب العلي: تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية، ص ١٩٨.

پێویست بۆ پیشەسازی ئەمریکیەکان دابین بکەن و خۆراک لە ویلایەتە یەکگرتووەکان بکڕن، بەڵام دوای سەرهەڵدانی ئەم قەیرانە ئەمریکیەکان بە پەلە دراوی خۆیان لە بانکەکانی (ئەوروپای ناوەڕاست ، ئەڵمانیا و نەمسا) کشاندەوە، ئەمەش بووە هۆی سەرهەڵدانی قەیرانی ئابووری لەو وڵاتانەدا، بە هۆی نا دادپەروەری لە دابەشبوونی ساماندا، شێوازی قۆرخکردن و چڕبوونەوەی دەسەڵاتی دارایی هۆکاری سەرەکی سەرهەڵدانی قەیرانەکە بوو، تەنها (٥%) دانیشتوان، قەرز و متمانەیەکی لە ڕادە بە دەریان بۆ پاڵپشتی پێویست دەخستە بەردەم سەرمایەداران، ناردنە دەرەوەی ئەمریکا بە ڕێژەی (٦٠%) دابەزی، ئەم بێ بازاڕییە گەورە ئابوورییە لە سەردەمێکدا بوو (هۆڤر) سەرکردەی وڵات بوو، بەهای پشکەکان (سەهمەکان) دابەزی و ئەوەندە ئاڵوگۆڕ و دەستا ودەستی پێکرا بلیۆنەها دۆلار لە دەست چوو، تا دەهات ئارەزووی کڕیار بۆ کڕین بەرەو نەمان دەچوو و بەم شێوەیە پاڵی بە خاوەن پشکەکانەوە دەنا پشکەکانیان بفرۆشن، ئەمەش وایکردبوو بەهای پشکەکان دابەزینی زیاتر بە خۆیەوە ببینێ.[1]

ملیۆنان وەبەرهێنەر هەموو ئەو سامانەی بە درێژایی تەمەنیان کۆیان کردبوەوە لە دەستیان چوو، ئەم دابەزینەش بەوە نەوەستا تا وای لێهات دەرگای کارگەکان داخران و بانکەکان چۆڵبوون، لە ماوەی نێوان سالانی (١٩٣٠- ١٩٣٢) ژمارەی ئەو بانکانەی دەرگاکانیان داخرا گەشتنە نزیکەی (٥٠٠) بانک، لەنێوان ئۆکتۆبەری (١٩٢٩) و (١٩٣٢) نزیکەی (٤٨٣٥) بانک مایەپووچ دەبوون، بەهای دراوی دارایی ئاڵوگۆڕ دابەزی لە (١/٨~ ٨٩) بلیۆن دۆلارەوە بۆ (١/٢~ ١٥) بلیۆن دۆلار، ئەو زیانەی لە پشکەکان کەوت نزیکەی (٧٥) ملیۆن دۆلار بوو تا دەهات ڕێژەی بێکاری بەرزدەبوویەوە بەم شێوەیە:[2]

لە مارسی (١٩٣٠) ژمارەی بێکاران (٣,٢٥٠,٠٠٠) کەسی تێپەڕاند.

لە مارسی (١٩٣٢) ژمارەی بێکاران (١٢,٥٠٠,٠٠٠) کەس بوو.

لە مارسی (١٩٣٤) ژمارەی بێکاران (١٤,٥٠٠,٠٠٠) کەس بوو.

لە ئەنجامی ئەو بێکاریەی ئەمریکای گرتەوە، دەسەڵاتداران ناچاربوون بە دامەزراندنی کرێکاران لە بونیادی پێشکەوتنی شارستانێتە گەورەکان، چونکە

---

١ - د.صلاح احمد هريدي:دراسات في التاريخ الأمريكي، ص ٢٥٥.

٢ - تشارلز وماری بیرد: س- پ،ج٢/ص٥٠٣.

مەترسی ئەوەیان هەبوو کرێکاران لەشارەکاندا دەستبدەنە خۆپیشاندان، لە ئەنجامی ئەو بارودۆخە خراپەدا کە لە ماوەی سالآنی بێکاریدا تێی کەوتبوون هەزارەها کەس دەستیان دایە خۆکوشتن، ئەمەش بووە هۆی بێ توانایی ڕژێمەکان و نەمانی بەها مرۆییەکان، لە کۆمەڵگەی ئەمریکی گەندەڵی بە شێوەیەکی فراوان هەموو ئاستەکانی گرتبووەوە، لەوانەش وەزیری ناوخۆی (ئەلبیرت نول) دانی بەوەدانا، کە بڕی (١١٠٠) دۆلار بەرتیلی وەرگرتووە و دامودەزگا ئابوورییەکان بۆ بەرژەوەندی خۆیان یارییان بە ئابووری وڵات دەکرد. [١]

فەرمانبەرانیش موچەکانیان ئەوەندە کەم بوو بەشی پڕکردنەوەی پێداویستیەکانی نەدەکردن، ئەمەش خەڵکی ئەمریکا بە گشتی و گەنجەکانی بە تایبەتی تووشی سەرسامی کردبوو، چونکە ئەو گەنجە خوێندکارانەی لە زانکۆ و پەیمانگاکان بوون پێشتر لە ژیانێکی خۆشگوزەراندا بوون و بەم بارودۆخە ڕانەهاتبوون، لەلایەن خێزانەکانیانەوە خەرجیان بۆ دابین دەکرا، بەڵام دوای سەرهەڵدانی ئەم کێشەیە لەسەر خوێندکاران پێویست بوو پشت بە خۆیان ببەستن بۆ دابینکردنی بژێوی ژیانیان، هەندێکیان توانیان ڕووبەڕووی ئەو نەهامەتیانە ببنەوە، بەڵام ژمارەیەکی زۆریان کە ملیۆنان کەس دەبوون توشی دزی و تالآنی و کاری تیرۆریستی و دەربەدەری بوون. [٢]

ئەو بارودۆخە خراپە ئابوورییەی گەلی ئەمریکای تێکەوتبوو هانی گەنجەکانیدا بچنە ڕیزی سەرکردە توندڕەوەکانەوە و داوای گۆڕانکاریی سیاسی بکەن لە وڵاتدا، بە تایبەت چاککردنی باری ئابووری و گێڕانەوەی خۆشگوزەرانی بۆ گەلی ئەمریکا، زۆرێک لەو کرێکارانەی خاوەنی توانای هونەری باڵا بوون ڕوویان کردە یەکێتی سۆڤیت لە پێناو باشتر کردنی باری ژیانیان. [٣]

جوتیارانیش بەهەمان شێوەی کرێکاران کەوتنە ژێر کاریگەری ئەو بارودۆخە نالەبارەوە، بەهەموو شێوەیەک لەهەوڵی ئەوەدا بوون خۆیان ڕزگار بکەن، بۆیە لەپێناو دابینکردنی پێداویستەکانی ڕۆژانەیان هەڵدەستان بەلەئەستۆگرتنی پارچە زەویەکی بچوکی کشتوکاڵی، کە زەوی موڵکەدارەکان بوو، لە ئەنجامی ئەو

---

١ - عبدالوهاب الكيالي:الموسوعة السياسية،ص١٥٩.

٢ - كارلهاينتس دشنر: تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية، ص ٤٠١.

٣ - د.محمود السيد: س- پ، ل ١٥١.

بێکارییەی لە ناو جوتیاراندا بڵاوبویەوە دەستیان دایە کۆچکردن بۆ شارەکان، لە کاتێکدا شارەکان لە توانایاندا نەبوو ئەو ڕێژە زۆرەی جوتیاران لەخۆ بگرن. [1]

هەروەها ئەو وشکە ساڵیەی لە دەشتەکانی ناوەڕاستی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ڕوویدا، بووە هۆی خراپ بوونی بەروبوومی کشتوکاڵی، ئەمەش وای لە جوتیاران کرد نەتوانن قازانجی قەرزەکان بدەن بە بانکەکان. جوتیاران لەسەر ئەو باجە زۆرەی لەسەریان دانرابوو دەیانناڵاند، لە ساڵی (١٩٣٣)دا کۆمەڵەی بێکاری کشتوکاڵیەکان و یەکێتی جوتیاران داوای سیستەمێکی دراویان دەکرد، کە دوو دراوی تیادا بەکاربهێنن، هەروەها داوایان لە یاساکرد کشتوکاڵ نرخی نزمتربێت بە شێوەیەک لەگەڵ خەرجی بەرهەمهێناندا هاوسەنگ بێت. [2]

ئەم قەیرانە ئابوورییە کاریگەری هەبوو لەسەر سیاسەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، چونکە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ناچاربوو پاشەکشە لەو سیاسەتە توند وتیژە بکات کە دژی وڵاتانی ئەمریکای لاتین پەیڕەوی دەکرد، هەربۆیە (هۆڤەر) ڕایگەیاند سیاسەتی ئەمریکا نابێت لەسەر بنەمای دەست تێوەردان بێت بە هێز، پێویستە پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئەمریکای لاتیندا باشتر بکات، لەسەر بنەمای دڵنیایی هاوکاری ئابووری، ئەمەش لە کۆنگرەی (هاڤان) لە ساڵی (١٩٢٨) جەختی لەسەر کرابوویەوە. [3]

قەیرانی ئابووری ئەمریکا لە کاتێکدا بوو کە ئابووری جیهان لە دژوارییەکی زۆردا بوو، بە جۆرێک لە ساڵی (١٩٢٩)دا نرخی سەرجەم بەرهەمی نەتەوەیی بۆ (٦٩,٥%) داشکا و لە ساڵی (١٩٣٣)دا داشکا بۆ (٥٥,٦) بلیۆن دۆلار لە نرخی تێچوونی گشتی، ئەم قەیرانە کوشندە ئابوورییە بووە هۆی کەوتنی وڵات و بڵاوبوونەوەی بێکاری بە شێوەیەکی فراوان، هەروەها بەرهەمهێنان سنورێکی دیاری کراوی هەبوو نرخی زۆر بەرزبوویەوە و بووە هۆی کەمبوونەوەی دەست کەوت. [4]

بە هۆی ئەو بارودۆخە نالەبارەی کە کاروباری بازرگانی بە خۆیەوە بینی ژیان ڕووی لە ئاڵۆزی کرد، ئەمریکا نەیتوانی بە شێوەیەکی خێرا چارەسەری گونجاو بۆ

---

١ - د.عبد العزيز سليمان و د. عبد المجيد نعنعي: س-پ،ل٢٠١.

٢ - فريشته نورائي: س-پ،ل١٩٦.

٣ - د.ئاراس فەریق زەینەل:ئۆباما و پرسە هەستیارەکان،ل ٧٣-٧٥.

٤ - موريس كروزية: س-پ، ل١٩٥.

ئەم قەیرانە بدۆزێتەوە و بە سەریدا زاڵ بێت، ئەم بارودۆخە ماوەی چوار ساڵی خایاند تا گەشتە ئەوپەڕی بێ بازاڕی، ئەو بەرزبوونەوەیە کە لە ئاستی دامەزراندن و کەمبوونەوەی سەرچاوە نەتەوەییەکاندا ڕوویدا بووە هۆی کورت هێنانی بوجەی دەوڵەت لە ئەنجامیشدا هەڵاوسانی نرخی لێکەوتەوە نرخی شمەکی نیشتمانی بۆ بلیۆنەها دۆلار دابەزی.[1]

فرانکلین روزفیڵت سەر بە دیموکراتەکان بوو، لە ساڵی (١٩١٠) هەڵیان بژارد بۆ پلەی (سیناتۆر) لە ناوچەی (داتش کاونتی) و سەرکەوتنی بەدەستهێنا، لە ساڵی (١٩١٤) خۆی بۆ ئەندامێتی ئەنجومەن پیران هەڵبژارد و لەوێش سەرکەوتنی بەدەستهێنا.[2]

بۆ یەکەمجار لە ساڵی(١٩٢٠) لەلایەن کۆنگرەی نەتەوەیی پارتی دیموکرا تەکانەوە دەستنیشان کرا بۆ جێگری سەرۆک جیمس کۆکس، لەنیوەی دووەمی تشرینی دووەمی ئەو ساڵەدا ئەنجامدرا، بەڵام دیموکراتەکان سەرکەوتنیان بە دەست نەهێنا.[3]

بەهۆی ئەو کێشە ئابوورییەی لە ساڵی (١٩٢٩)دا لە ئەمریکا ڕوویدا بووە هۆی هاتنی دیموکراتەکان بۆ سەر کورسی دەسەڵات، (فرانکلین ڕۆزفیڵت) لە ساڵی (١٩٣٠)دا بوو بە حاکمی نیویۆرک، لە هەڵبژاردنەکەدا بەڕێژەیەک دەنگی بەدەستهێنا لە مێژووی نیویۆرکدا بێ وێنە بوو، لە ماوەی سەرۆکایەتی کردنی چوار ساڵی نیویۆرک توانی لە سەرجەم بوارەکانی ئابووری و سیاسی و کۆمەڵایەتی گەلێک کاری گرنگ و چەندەها خزمەت گوزاری گشتی بگرێتە ئەستۆ، کارەکانی لەو ماوەیەدا بۆ کەمکردنەوەی نەهامەتیەکانی خەڵکی نیویۆرک بوو لە دانانی بەڕێوبەرایەتیەک بۆ هاوکاری کردنی ئەو ڕێژە زۆرەی بێکاری لە نیویۆرک وبەڵێنی پێدان بیانگێڕێتەوە سەرکار و خۆشگوزەرانیان بۆ دەستەبەر بکات و داهات بە شێوەیەکی گشتی و فراوان دابەش بکات, هەوڵێکی زۆریدا بۆ هاوکاری کردنی پڕۆژەیەکی ستراتیژی گەورەی وزە لەسەر ڕووباری (سانت لورانس) بۆ بەرهەمهێنانی وزەی کارەبا، کارەکانی لە ناوەندەکانی سیاسی و کۆمەڵایەتیدا لە نیویۆرک هەلێکی تری بۆ ڕەخساند و وای لێکرد لە ناو خەڵکی ئەمریکا زیاتر

---

١ - بۆ زانیاری زیاتر بروانە(چون ستیل جوردون:امبراطورية الثروة).

٢ - الن نفنز:نظام الحكم في الولايات المتحدة،ص٥٠٦.

٣ - ديب على حسن: الولايات المتحدة الأمريكية،ص٢٨٣.

بناسرێت. لە ئەنجامی دابەزینی نرخ و زیادبوونی ڕێژەی بێکاری، سەدان بانک ڕووخان وخاوەن موڵکەکان کەوتنە داوای یارمەتیکردن. [١]

بۆ وەڵامدانەوەی ئەم کارانە سەرۆک (فرانکلین رۆزفێڵت) هەستا بە دامەزراندنی (بەرنامەی نویێ) بۆ دەوڵەتی ئەمریکا،بۆ ئەم مەبەستە هەستا بە ڕێکخستنی بازاڕەکانی دارایی و بانکەکان و ناردنی بەرهەمی کێڵگەکان بۆ بازاڕەکان و ڕێکخستنی کشتوکاڵ، شێوازە بنەڕەتیەکانی دامەزراند بۆ دابینکردنی کۆمەڵایەتی دژی بێکاری. حکومەت لە ساڵی (١٩٣٠)دا کۆمەڵێک یاسای بۆ سەندیکای کرێکاران پێکهێنا و بە دۆزینەوەی کار بۆ (٦) ملیۆن کرێکاری لە کارکەوتوو بەرەنگاری کێشەی بێکاری بوویەوە. بە شێوەیەکی ڕوون هەوڵیدا بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان، گرنگی گەورەی دا بە هەموو کارەکان و خاوەنی چالاکیەکی زۆر بوو، سیفەتە چاکەکانی لە خراپەکانی زۆرتر بوو، خەباتی (رۆزفێڵت) وەک خەباتی یەکەمی (وڵسن) بوو، کە جەختی دەکردەوە لەسەر ئەوەی میللەت لە کرۆکدا ساغە،[٢] سەرۆک خۆی تەرخان کردبوو بۆ:

یەکەم: یارمەتیدانی هەژاران.

دووەم: گەڕانەوەی هاوسەنگی نێوان کشتوکاڵ و پیشەسازی.

سێیەم: چاودێریکردنی کاروباری بانکەکان.

چوارەم: ئاسانکردنی پەیوەندی ئابووری نێودەوڵەتی و دەستپێکردنی سیاسەتی دراوسێیەتی باش. [٣]

(فرانکلین روزفێڵت) و پارتی دیموکراتی ئەمریکی سەرقاڵی داڕشتنی پلان و ڕێوشوێنێکی وەهابوون کە سیستەمی سیاسی ئەمریکا و نەتەوە کارەساتبارەکەی لە مەترسی تیاچوون بپارێزێت، سەربارەت بە وتە بەناوبانگەکەی (روزفێڵت) لەبارەی دەستووری ئەمریکی وتی (دەستوورەکەمان تەواو سادە و خۆگونجێنە و بەکارە، لەبەر ئەمە سیستەمی دەستورەکەمان سەلماندی بە شێوەیەکی نموونەیی لەگەڵ جیهانی نوێدا گونجاوە و لە توانایدایە لەگەڵ فراوانبوونی زەوی و جەنگی بیانی و قەیرانە نێوخۆییەکان چارەسەری تەواوی کێشەکان بکات). [٤]

---

١ - د.محمد محمد صالح واخرون:الدول الكبرى بين الحربين العالمتين(١٩١٤-١٩٤٥)،ص٢٣٦.

٢ - فرحات زيادة و ابراهيم فريجي: تاريخ الشعب الأمريكي،ص٣٢١.

٣ - ستيڤن فنسنت بنية:امريكا،ص١٦٨.

٤ - الن نڤيز وهنرى ستيل كومجر:س-پ،ص٥١٢.

(روزفێلــت) هەســتا بە ئەنجامــدانی چەنــد چاکســازییەک کە لەچەنــد خاڵێکــدا دەیانهێنین:

١. باج بخرێتەسەر دەستکەوت و ماڵی بەجێماو (میراتی).

٢.خەرجکردنـی هەمـوو دارایـیە کۆکراوەکـان بـۆ چـاککردنی لایەنە جیاوازەکـانی کۆمەڵایەتی.

٣.دەسـتگرتن بەسەرنەخۆشـییە پەتاکانـدا لە رێـگای پرۆژە تەندروسـتیەکانەوە حکومەتیش بەو کارە هەستێت.

٤. کەمکـردنەوەی کـاتی کـارکردن بە تـایبەت بـۆ ژنـان و منـداڵان و ئەوانەی لە کارگە تەسکەکاندا کاردەکەن.

٥. بڕینەوەی مووچەی خانەنشینی بۆ کەسە بە تەمەنەکان بەجۆرێک بژێوییان دابین بکات.

٦. چـاککردنی کاروبـاری شـارەکان، ئەوەش بە دروسـتکردنی بـاخچە و یاریگـای گشتی.

٧. گرنگیدان و گشتگیرکردنی بواری فێرکردن.

٨. گرنگیدان بەکارو بەکرێکاران.[1]

لە هەڵبژاردنەکـانی سـاڵی (١٩٣٢)دا، (فـرانکلین روزفێلـت) کاندیـدکراوی پـارتی دیموکرایتەکـان بـوو بەرامـبەر بە (هربـرت کـلاک هـۆڤەر) کاندیـدکراوی پـارتی کۆمارییەکان، دواجار روزفێلت سەرکەوتنی بەدەستهێنا.[2]

قەیرانی دارایی جیهانی باروودۆخێکی بەسەر جیهـان و ئەمریکـادا هێنـابوو زیـاتر گرنگیـان بەنـاوخۆ دەدا، بـۆیە (روزفێلـت) لە هەڵبژاردنەکـانی سـاڵی (١٩٣٢)دا زیـاتر پەرەی بە کاروبـاری نـاوخۆ دەدا،لێرەدا خـۆی بـۆ چاکسـازی ئـابووری و سیاسـی ناوخۆ ئامادە کردبوو، وەک چۆن لە وەڵامـی داخـوازییەکەی رۆژنـامەنووس (ولیەم رندولف هرست)دا پێی دەڵێت (واز لە سیاسەتی دەرەوە بێنە و زیـاتر پەرە بە بـاری ناوخۆ بدە سەردەکەوێت، ئەویش جەختی لەوە دەکردەوە).[3]

---

١ – فرحات زیادة و ابراهیم فریجي: تاریخ الشعب الأمریکي،ص٣٢٢.

٢ – الن نڤیز وهنری ستیل کومجر:س–پ،ص٥١١.

٣ – د.فاضل حسین ود.کاظم هاشم نعمة:التاریخ الاوربي الحدیث،(١٨١٥–١٩٣٩)،دار الکتب للطباعة والنشر، جامعة الموصل،الطبعة الاولی،١٩٨٢،ص٢٦٨.

ئەنجامی هەڵبژاردنەکانی ساڵی (١٩٣٢) بەم شێوەیە بوو:(٥٩%) بۆ دیموکراتیەکان، (٣٦%) بۆ کۆمارییەکان بوو.

فرانکلین روزفێڵت پاش سێ مانگ لە گەشتنی بە کورسی دەسەلات، بۆ زیاتر سەرکەوتنی لە کارەکانیدا زنجیرەیەک یاسای دەکرد،کە پێشتر ویلایەتە یەککگرتووەکان لەو جۆرە یاسایانەی بە خۆیەوە نەدیبوو، ئەم یاسایانە بە (بەرنامەی نوێ) ناسران، بەپێی ئەو بەرنامەیەش دەستی کرد بە دابەشکردنی وەزارەتەکان بەسەر خەڵکانێکی تەکنۆکرات و پسپۆر لە بوارەکاندا بە تایبەت وەزارەتە گرنگ و گەورەکان،(کوردل هول)ی کرد بە وەزیری دەرەوە، (فرانس پێرس) وەزیری کارو (ولیەم وودن) وەزیری گەنجینە کە لەدوایدا گۆڕا بۆ (هینری مورگنشاو) و (هینری لاست) وەزیری کشتوکاڵ و (هارولد ئایکس) وەزیری ناوخۆ, بوون. [١]

ئەو یاسایانە لە سەرەتادا زۆرینەی پیاوانی کاروبار و یاساناسانی نیگەران کرد، بەڵام بە شێوەیەکی دوابەدوا (قۆناغ بە قۆناغ) سوودی ئەم یاسایانە ئاشکرابوون و ئەنجامەکانیانی دەرکەوتن، حکومەتەکەی (فرانکلین روزفێڵت) بەوە پشت ئەستوور بوو کە دەتوانێت  زۆرێک لەو بەرنامانەی هەیەتی بە ئازادی بخاتە حاڵەتی جێ بەجێکردنەوە، چونکە زۆرینەی ئەندامانی کۆنگرێسی ئەمریکی کە باڵاترین دەسەلاتی یاسادانانیان هەبوو لە دیموکراتەکان بوون, بە پێچەوانەی (هوڤەر)ەوە کە زۆرجار پرۆژەکانی تووشی گرفت دەبوویەوە لە کۆنگرێسدا. [٢]

زۆرێک لە چاودێرانی سیاسی پێیان وابوو سەرکەوتنی دیموکراتیەکان لە هەڵبژاردنی ساڵی (١٩٣٢)دا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو پشتیوانیەی کە جوتیاران و چینی کرێکاران لێیان کرد، سەرەڕای ئەوەی هەندێک لە سەرانی حیزبی کۆماری بەوە تاوانبار دەکران لەگەڵ سەرمایەداری مادە بێهۆشکەرەکاندا پەیوەندییان هەبووە، وەک (وتبش سولز و جیمس هانیل). [٣]

(فرانکلین روزفێلت) لە دوای وەرگرتنی پۆستی سەرۆکایەتی وتارێکی خوێندەوە و وتی "سەرەتا دەبێت داکۆکی لەوە بکەم دەبێت ئێمە لە هیچ شتێک نەترسین، جگە

١ – د.محمد محمد صالح واخرون:الدول الكبرى، ص٢٣٨.

٢ – فرحات زيادة و ابراهيم فريجي: س– پ، ل ٣٢٢.

٣ – جاك لين ولي مورطير:أمريكا دولة تحكمها العصابات،ص٦٥.

له خـودی تـرس نەبێـت"[1] هەر له سـاڵی (١٩٣٢)دا لەژێـر ڕۆشـنایی ئەو وته ئابوورییەی که دەڵێت (نەتەوه له ناخی خۆیدا تەندروسته) هەموو ئەو هەڵانەی که ڕوویدا خسته ئەستۆی ئەو کەسانەی که ئاڵوگۆڕی پاره دەکەن و تەنها مەبەستیان قـازانجی خۆیـانه، ئەو بەرنـامەیەی (روزفێلـت) گـرتیەبەر بـۆ چارەسـەرکردنی ئەم کێشـەیه له ڕووی کـۆمەڵایەتی و ئـابوورییەوه کـاریگەری هەبـوو، له سـەرەتای دەسەڵاتیدا کێشه ئابوورییەکه لەوپەڕی توندیدا بوو.[2]

چەند خاڵێکی بنەڕەتی دانا بۆ چارەسەرکردنی کێشەکه:

١. دووباره چاککردنەوەی بانکەکان و دام و دەزگا داراییەکان.

٢. بەرزکـردنەوەی ئاسـتی بەرهەمهێنـانی پیشەسـازی بـۆ ئاسـتێک که بتـوانێ ژمارەیەک کرێکاری بێکار بخاتەگەڕ.

٣. جێبەجێکردنی پڕۆژه کشتوکاڵی و پیشەسازیەکان.

٤. حکومەت له چارەسـەرکردنی کێشـەکەدا ڕۆڵێکی ئەرێنی هەبێت بەبێ ئەوەی مەترسی بۆ سەر سیستمی دیموکراتی له ئەمریکا دروستبکات.[3]

حکومەتی روزفێلت دەستەیەکی تـایبەتی پێکهێنا که ملیۆنەهـا دۆلاری بۆ خەرج کـرد, بـۆ ئەوەی یـارمەتی ئەو کەسـانه بـدات که بێکـار کەوتـوون، چ لەسـەر ئاسـتی ئەمریکـا یـان لەسـەر ئاسـتی ویلایەتەکـان،ئەم هەنگـاوەی حکـومەت تـوانی ملیۆنـان کەس له بێکاری ڕزگار بکات، هەرچەنده به تەواوی کێشەکه چارەسەر نەکرا، بەڵام له کۆتایی سییەکاندا ڕێژەی بێکاری کەم بوویەوه، بەم شێوەیه توانی ڕووبەڕووی ترسـناکترین و تونـدترین گرفتـی ئـابووریی بـوویەوه که ئەمریکـا به خـۆیەوه بینـی، (روزفێلت) توانی پڕۆژەی سیستمێکی نوێ دابنێ که بەرنامەیەکی گشتگیر بێت بۆ چاکسازییه کۆمەڵایەتیەکان، ئەم پڕۆژەیه لەلایەن کۆمارییەکانەوه تووشی تونـدترین ڕەخنه بوویەوه، ئەم سیستەمه نوێیه به هۆی مـایه پوچ بـوونی بانکەکان و گۆڕانی بازاڕ و بێکاری که به هۆی وەستانی کارو پیشەسازیەکان دروست ببوو، پێویسـتی بەوه هەبوو هەمـوو پڕۆژه تـاکه کەسیەکان بکەونه ژێر چاودێری فیدراڵیەوه، لەم کـاتەدا کـۆنگرێس ڕەزامەنـدی دەربـڕی لەسـەردانانی کۆمەڵێک یاسـا بـۆ بەخشـینی

---

١ - د.محمد محمد صالح واخرون: س- پ، ل ٢٣٧.

٢ - رمضان لاوند:الحرب العالمية الثانية،دار العلم للملايين،الطبعة الثانية،بيروت،١٩٨١،ص٩.

٣ - د.صلاح احمد هريدي:دراسات في التاريخ الأمريكي، ص ٢٦٨.

هاوكاری دارایی بۆ پەككەوتوان و بەخشینی قەرز بە بانكەكان و هاوكاریكردنی جوتیاران لەڕووی داراییەوە.[1]

دیارترین كارەكانی روزفێلت ئەوەبوو پشتی دەبەست بە سیاسەتی دراوسێیەتی چاك لەگەڵ وڵاتانی ئەمریكا، كاری دەكرد بۆ بەرەنگاربوونەوەی خێرا و چالاك و بەڵێنی دەدا بەجێی بەجێكردنی بەرنامەكانی، هەروەها بە كۆنگرێسی ڕاگەیاند هەڵدەستێت بە پێشنیاری ڕێگەچارەیەكی پێویست بە گوێرەی دەستوور، ئەگەر كۆنگرێس بڕیاری لەسەردا هەڵدەستێت بە درێژكردنەوەی دەسەڵاتی پێویست بۆ دەستگرتن بەسەر كێشە ئابوورییەكان، لەم كاتەدا وڵات لەباری ترسناك بوو و هەڕەشەی دەرەوەی لەسەر بوو، كۆنگرێس ڕەزامەندی خۆی دەربڕی بە جێبەجێكردنی كۆمەڵە یاسایەك لە بواری كۆمەڵایەتی و ئابووریدا، ئەمەش وەك شۆڕشێك وابوو و هەموو چاكسازییەكانی گرتەوە.[2]

ئەو ڕێوشوێنانەی (روزفێلت) بۆ چارەسەركردنی ئەو بارودۆخە خراپەی كە لە وڵاتدا هەبوو گرتیەبەر، بریتیبوو لە ڕێكخستنی بانكەكان، بۆ ئەم مەبەستەش بۆ چاودێری هەڵاوسان یاسایەك دەركرا، یاسای هاوكاری دارایی بانكەكان لە (٩ی مایسی ١٩٣٣) دەرچوو، كە دەقی دانابوو لەسەر ملكەچكردنی بانكەكان بۆ چاودێری و ڕێگرتن لە مامەڵەكردن بە ئاڵتوونەوە، دووەمیان دانی قەرزی فیدراڵی بە كۆمپانیاكان و خاوەن موڵكەكان، سێیەمیان یارمەتیدانی جوتیاران لە ڕێگەی ئاسانكاری بۆ دەستكەوتنی پارە بۆ جوتیاران و ڕزگاركردنی چینی جوتیارە كرێیەكان و ئەوانەی لەسەر سنوور نیشتەجێ بوون، هەروەها دۆزینەوەی بازاڕی نوێ لە دەرەوە و ناوەوە بۆ بەرهەمە كشتوكاڵیەكان، چوارەمیان ڕێكخستنی پرۆژەكانی ئاوەدانكردنەوە، پێنجەمیشیان بریتی بوو لە ڕێكخستنەوەی سەندیكای كرێكاران و دابینكردنی مافی كرێكار لەلایەن خاوەن كارەوە.[3]

لە ساڵی (١٩٣٣) یاسایەك بەناوی (یاسای بوژانەوەی نیشتمانی) دەركرا، ئەمەش لە پێناو كەمكردنەوەی كاتژمێری كاركردن و بەرزكردنەوەی كرێ. (روزفێلت) سووربوو لەسەر گرتنەبەری ڕێوشوێنی ڕاستەوخۆ بۆ دەستپێكردنی پرۆژەی ئابووری نیشتمانی, لە ڕێگەی بەرنامەكەیەوە بە پلان دانان بۆ داهاتی گشتی و

---

١ - دیب علی حسن: س- پ، ل ٢٨٤.

٢ - فرحات زیادة و ابراهیم فریجي: س- پ، ل ٣٢٦.

٣ - د.محمد محمد صالح واخرون: س- پ، ل ٢٣٩.

پێگیریکردنــی نرخــی نــاوخۆ دەســتپێکرد بە ئامــانجی هانــدان و چــاککردنی بەرهەمهێنــان، بەڵام لە کـۆنگرەی (لەنـدەن) لە ســاڵی (١٩٣٣)دا هەوڵیـدا دووبـارە سیستمی دراو لەسەر بنەمای نرخی ئاڵتوونی یەکگرتوو بونیاد بنێ، (روزفێلت) وای بە باش دەزانی ویلایەتە یەکگرتووەکان پارێزگاری لەو ئازادییە بکات. [1]

لە هەمان ساڵدا پرۆژە یاسای (وادی التسنی) دانا، ئەم پرۆژەیە یارمەتیدەر بوو بۆ بەرهەمهێنانی وزەی پێویست و دروستکردنی خانووبەرە بۆ زیاتر لە (٢) ملیۆن و نیو خەڵکی ناوچەکە، هەروەها چاکسازی لە بواری زەوی کشتوکاڵی و ناشتنی درەختی تازە و چاککردنی بازرگانی دەریایی لە ڕووباری (التسنی) ئەنجامدا. [2]

لە (١٢)ی ئایاری (١٩٣٣)دا یاسای ڕێکخستنەوەی کاروباری کشتوکاڵی دەرکرد، بەپێی ئەم یاسایە جوتیاران یارمەتیدران لە پێناو کەمکردنەوەی خەرجی لەسـەر بەرهەمە کشتوکاڵییە سەرەکیەکان، هەروەها حکومەت ئاسانکاری بە هێڵی ئاسن پێشکەشــکرد و لە (١٠)ی حــوزەیرانی (١٩٣٣) هێڵــی ئاســنی لە کێشــەی مــایە پووچبــوون ڕزگــار کــرد، یاســای بازرگــانی و پیشەســازی دانــا، بــاجی لەســـەر دەوڵەمەندەکان هەڵگرت. [3]

هەســتا بە دانــانی پلانێکــی گونجــا و بــۆ ڕێکخســتنەوەی کەرتــی کشــتوکاڵ و پیشەسازی و لەناوبردنی بێکاری و ئاوەدانکردنەوەی وڵات و پێشخستنی بـواری وەبەرهێنــان، لە (٦)ی ئــازاری (١٩٣٣) دوای دوو ڕۆژ لە مــاوەی ســـەرۆکایەتی مۆرکێکی یاسایی دا بە بانکەکان، داوای کۆبوونەوەی کۆنگریسی کرد یەک لە دوای یەک بۆ ماوەی (١٠٠) ڕۆژ تا لە (٩)ی ئازار بۆ (١٥)ی حوزەیران کۆببێتەوە، لەو مــاوەیەدا کـۆنگرێس کۆمەڵێـک یاســای دەرکـرد کە بە (شـێوەی نـوێ) ناسـرابوو میتۆدێکی دادپەروەرانە بوو، لەوانە:-

یەکەمیان: یاسای ئابووری و پێدانی پارە.

دووەمیان: یاسای دامەزراندنی گروپی چاککردنەوەی دارستانەکان.

سێیەمیان: یاسای فریاکەوتنی بانکەکان، کۆنگرێس بەبێ گفتوگۆ بڕیاری لەسـەر ئەم یاسایە دەرکرد.

چوارەمیان: هەڵوەشانەوەی بناغەی ئاڵتوون بۆ پارە.

---

١ - لويس ل.شنايدر:العالم في القرن العشرين،تر.سعيد عبود السامرائي،بيروت،ص٨٩.

٢ - فرحات زيادة و ابراهيم فريجي: تاريخ الشعب الأمريكي،ص٣٢٢.

٣ - الن نڤيز وهنری ستيل كومجر:س-پ،ص٥١٢.

پێنجەمیان: دامەزراندنی دەزگای کشتوکاڵ بۆ کڕینەوەی بەرووبوومی کشتوکاڵ لە جوتیاران بە نرخێکی گونجا و.

شەشەمیان: یاسای بیمە و دڵنیایی بۆ ئاشکرا کردنی (سندات) پشکی دارایی تازە. حەوتەمیان: یاسای پارە بۆ دروستکردنی بینا.[1]

هەموو ئەو کارانەی کە کردی لە پێناو زیادکردنی بەرهەمی پیشەسازی و بایەخدان بە بواری کشتوکاڵی بوو، بۆیە هەستا بە سنوردارکردنی کێڵگە کشتوکاڵیەکان، دەوڵەت لە پرۆسەی ناردنە دەرەوەی بەرهەمە کشتوکاڵیەکان ڕۆڵی بینینی و ڕێبازی (ئاڕاستەکردنی ئابووری) لە جێگای (ئازادی دام و دەزگاکان) پەیڕەو دەکرد و بێکارانی لە دروستکردنی ڕێگەوبان و قوتابخانە خستەوە کار.[2]

ئەو سەردەمە تازەی کە روزفێڵت بە وڵاتی بەخشی بەشێکی بوژانەوە و پشتبەستن بوو، بەشەکەی دیکەش ئەو چاکسازیانە بوو کە لە ڕێگەی قەرزی فیدراڵیەوە گەشتە نزیکەی بلیۆنەها دۆلار بە ئەنجامی گەیاند،بۆ ئەم مەبەستە دەستیکرد بە دانانی پرۆگرامێکی فراوان بۆ خەرج کردنی لە کارە گشتیەکان، توانی ئەو بەڵێنانە جێبەجێبکات کە دای بە خەڵک بەڕادەیەک بووە مایەی سەرسامبوونی خەڵک، نرخی کشتوکاڵی دیاریکرد، چەند دۆنمێکی دیاری کرد بۆ جوتیاران دەبوو بیکەنە کشتوکاڵ، ئەو بەرنامە نوێیە دووخاڵی لەخۆ دەگرت:[3] یەکەمیان بوژانەوەی باری ئابووری، دووەمیان چاکسازی لە بواری پیشەسازیدا بوو، یاسایەکی دەرکرد کە کورتکراوەکەی (AAA) بوو لەم یاسایەدا ئاماژە بەوە دەدات دەبێت بە بڕی (١) ملیار دۆلار یارمەتی جوتیاران بدرێت بۆ دانەوەی قەرزەکانیان ,یاسای دووەمیان کورتکراوەکەی (NRA) تایبەت بوو بە بواری پیشەسازی کە روزفێڵت لە (١١)ی حوزەیرانی (١٩٣٣)دا دەریکردبوو، لەم یاسایەدا کۆمەڵێک بنچینەی دارشت ئەوانیش:

١. داننان بە مافی سەندیکاکان.

٢. دیاریکردنی کاتی کارکردن.

٣. دیاریکردنی ڕێژەی کرێ.

---

١ – فرحات زيادة و: س- پ، ل ٣٢٥.

٢ – د.محمد محمد صالح واخرون:الدول الكبرى، ص٢٣٨.

٣ – تشارلز و ماری بيرد: تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية،ج٢/ص ٢٦٢.

٤. حکومەت چاودێری جێبەجێکردنی ئەم بەندانەی دەکرد.[1]

هەروەها (روزفێلت) کاری کرد بۆ ئەوەی هێڵی ئاسن و ڕێگەی دەریایی و وشکانیەکان بخاتەکار تا کێشەی بێکاری نەمێنێ، لە ساڵی (١٩٣٤)دا کۆنگرە بڕیاریدا لەسەر یاسایەک کە پەیوەست بوو بە بەڵێن و ڕێکەوتنە بازرگانیەکان کە لەسەر بنەمای ئاڵوگۆڕکردن دانرابوو، ڕێگای بە سەرۆک دەدا ئەندازە و بڕی گومرگ بۆ (٥٠%) کەم بکاتەوە ئەمەش ئاماژەبوو بۆ سیاسەتی کەمکردنەوەی ڕێگری بازرگانی، ئەم یاسایەش (یاسای پارێزگاری کردنی بەرووبوومی ناوخۆ) بوو.[2]

سەبارەت بە سیاسەتی دەرەوەش (روزفێلت) ئەو پلانەی دارشت کە وڵات لە پێشدا لەسەری دەڕۆشت، ئەویش پارێزگاریکردن بوو لە ئازادی دەریاکان و چاککردنی ئاشتی جیهان و پشتگیریکردن لە بنەماکانی دیموکراتیەت، حکومەتی نوێ بازاڕی دەرەوەی لەبیر نەکرد، کۆنگرێس لە ساڵی (١٩٣٤)دا یاسایەکی دەرکرد، سەرۆکی وڵات و وەزیری دەرەوەی سەرپشک کرد لە بەستنی هەر ڕێکەوتننامەیەکی بازرگانی لەگەڵ وڵاتە بیانییەکان، بەپێی ئەم یاسایە سەرۆک و وەزیری دەرەوە دەتوانن باج و گومرگ لەسەر هاوردەکان کەم بکەنەوە.[3]

یاسای گرنتی و دڵنیایی: لە ساڵی (١٩٣٥)دا کۆنگرێس بڕیاری لەسەردا،کە لە زنجیرەیەک یاسا پێکهاتبوو، بەپێی ئەم یاسایە داواکراوە سەنەداتی داراییە نوێکان ئاشکرا بکرێ، لەم یاسایەدا مووچە بۆ پیرەکان دابین کرا و هەلی کار بۆ بێکاران ڕەخسێنرا،لەگەڵ یارمەتیدانی ئەو ئافرەتانەی کە کاریان نەبوو، تەرخانکردنی پارەی پێویست بۆ تەندروستی گشتی.[4]

(روزفێلت) پرۆژەیەکی دیکەی پێشکەش بە کۆنگرێس کرد بۆ یارمەتیدانی ملیۆنێک لەکارکەوتوو، (٥) ملیار دۆلاری ئامادەکرد بۆ ئەو پڕۆژەیە، ئەمەش بۆ بنیاتنان و نوێکردنەوەی جیاواز.

---

١ - د. طليعة الصياح و راغب العلي: تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية، ص ١٩٨.

٢ - الكساندر كيرسانوف:الولايات المتحدة الأمريكية وأوروپا الغربية(العلاقات الاقتصادية بعد الحرب الكونية الثانية)،تر.جبرائيل الفياض، دار الفارابي،بيروت،١٩٧٤،ص٤٨.

٣ - الن نڤيز واخرون:س-پ،ص٥١٢.

٤ - د.محمد محمد صالح واخرون: س- پ، ل ٢٣٨.

ئامانجی (روزفێلت) له دەرکردنی ئەو یاسایەنە ئەوەبوو ڕووبەڕووی ئەو کێشە ئابوورییانە ببێتەوە کە هەموو وڵاتی گرتبووەوە، بەڵام ئەم کارانەی (روزفێلت) لەلایەن دادگای دەستووریەوە دژایەتی دەکرا و ژمارەیەک لەو یاسانەی پووچەڵ کرانەوە کە (روزفێلت) له چارەسەرکردنی لایەنێک لەلایەنەکانی ئەو کێشەیە پشتی پێدەبەستن له ئەنجامی ئەم هەموو کارو کۆششانەدا، نرخ دانان و بازرگانیکردن تاڕادەیەک چاکبوویەوە، بەڵام چاک بوونی ڕاستەقینه له دڵ ودەروونی کرێکار و خاوەن ئیش و فرمانەکاندا بوو، ئیتر هەست کردن بە بەزین و شکست نەما، متمانەیان بە سەرۆک زیادی کرد.[1]

بەرهەمهێنان له بواری پیشەسازی و کشتوکاڵی گەشەی بەرچاوی بەخۆیەوە بینی، بەجۆرێک له سەروبەندی هەڵگیرساندنی جەنگی دووەمی جیهاندا ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا بووە دەوڵەمەندترین  وڵاتی جیهان.

له هەڵبژاردنەکانی ساڵی (١٩٣٦)دا فرانکلین روزفێلت بۆ جاری دووەم خۆی بۆ پۆستی سەرۆک کۆمار پاڵاوت، له بەرامبەردا پارتی کۆماری (ئەلف بوندن) یان بۆ ململانێی ئەو پۆستە دەستنیشان کرد، کە ئەوکات حاکمی ویلایەتی تەکساس بوو، (فرانکلین روزفێلت) سەرکەوتنی بە دەستهێنا له هەموو ویلایەتەکاندا جگە له (فیرمونت)، ئەمەش باشترین سەرکەوتن بوو.

ئەنجامی هەڵبژادنەکان بەم شێوەیە بوو:

پارتی دیموکرات (٦٠%) و پارتی کۆماری (٣٦%) بوو، لێرەوە فرانکلین رۆزفێلت سیاسەتی دوورەپەرێزی ڕاگەیاند.[2]

هەڵبژاردنەکانی ساڵی (١٩٤٠) هەڵبژاردنێکی سەخت بوو بۆ فرانکلین روزفێلت، چونکە لەلایەک سێیەم جاربوو خۆی بپاڵێوێت و لەلایەکی تریشەوە ڕووبەڕووی ناڕەزایی هەندێک ئەندامانی حزبەکەی بوویەوە، سەبارەت بە خۆپاڵاوتنی (جیمس فارلی و جۆن نسانسی) له ساڵی (١٩٤٠)دا کە هەردووکیان دەیانویست خۆیان کاندید بکەن بۆ ئەو پۆستە، کۆنگرەی گشتی پارتی کۆماری لەو ساڵەدا له شیکاگۆ بەسترا، بڕیاردرا ئەو کێشەیە بە هەڵبژاردن له ناوحیزبدا یەکلایی بکرێتەوە، ئەوەبوو فرانکلین (روزفێلت) توانی بە زۆرینەی دەنگ ببێتە پاڵێوراوی پارتی

---

١ - فرنسیس فریدمان: موجز التاريخ الأمريكي،ص١٥٢.

٢ - جواهر لال نەهرۆز: س- پ، ل ٢٩٥.

دیموکراتەکـان بـۆ هەڵبژاردنەکـانی سـاڵی (١٩٤٠)، لە بەرامـبەردا پـارتی کۆمـاری (ویندل ویکلی)یان بۆ پۆستی سەرۆک کۆمار لە هەڵبژاردنەکانی ئەو ساڵەدا دیارکرد و (ویکلی) لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی (١٩٣٢)دا دەنگی بۆ روزفێلت دابوو، چونکە ئەو دەمە ئەنـدامی پـارتی دیموکراتەکـان بـوو، لە سـاڵی (١٩٣٨) دژی سیاسـەتەکانی روزفێلت وەستایەوە و چوویە پاڵ پارتی کۆماری، ئەگەر چی حکومەتی ئەمریکی بێلایەنـی خـۆی لە کێشـە دەرەکییەکـان ڕاگەیانـدبوو،بەڵام کێشـە دەرەکییەکـان بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ کاریگەری لەسەر هەڵبژاردنەکان هەبوو. [1]

ئەنجامی هەڵبژاردنەکانی ساڵی (١٩٤٠) بەم شێوەیە بوو:

دیموکراتەکـان بە ڕێـژەی (٥٤%) و کۆمارییەکـان بە ڕێـژەی (٤٤%)دەنگییـان بەدەسـتهێنا، لە گەرمەی شـەڕی جیهـانی دووەمـدا (فـرانکلین روزفێلـت) بـۆ جـاری چـوارەم خـۆی بـۆ هەڵژاردنەکـانی سـاڵی (١٩٤٤) پـاڵاوت، ئەمەش لەلایەن پـارتی دیموکراتەکـانەوە بە گەرمـی پێشـوازی لێکـرا، لە بەرامـبەردا پـارتی کۆمارییەکـان (تۆماس دیو)یان پاڵاوت، کە لەوکاتەدا حاکمی ویلایەتی نیویۆرک بوو، ئەنجامی ئەم هەڵبژاردنەش بەم شێوەیە بوو:

دیموکراتەکان (٥٣%)، (٤٦%) بۆ کۆمارەیەکان. [2]

## گرنگترین یاساکانی روزفێلت

١. یاسای فریاکەوتنی بانکەکان، کۆنگرێس بەبێ هیچ گفتوگۆ و ڕاگۆڕینەوەیەک ڕەزامەندی خۆی دەربڕی لەسـەر ئەم یاسـایە، بەڕێوەبەرایەتی فیدراڵی سەرپشـک کرد بۆ چاودێری چالاکی بانک و کۆنترۆڵکردنی بە شێوەیەکی کارا.

٢. یاسـای پێکهێنـانی فەرمـانگەی فریـاکەوتنی فیـدراڵ بـۆ فریـاکەوتنی کەسـانی هەژار هەروەها پێدانی قەرزی فیدراڵی بۆ کۆمپانیا و خاوەن سەرمایەکان. [3]

٣. یاسای دامەزراندنی تیپی سیانەی دارستانی مەدەنی بۆ سیانەی دارستان و خاک و دەست بەسەرداگرتنی ڕووداوە سروشتیەکان، ژمارەیەکی زۆر لە بێکاران لەو فەرمانگانەدا خرانە سەرکار.

---

١ - کارلهاینتس دشنر: تاريخ الولايات المتحدة، ص ٣٤٩.

٢ - ميشال بوغنون جوردان:أمريكا التوتوليتارية الولايات المتحدة والعالم:الى أين،تر.خليل احمد خليل،الطبعة الاولى،دار الساقي،٢٠٠٢،ص٩٥.

٣ - فرحات زيادة و ابراهيم فريجي: س- پ، ل ٣٢٢.

٤. هەڵوەشاندنەوەی بنەمای ئاڵتوونی دراو.

٥. یاسای ڕێکخستنی کشتوکاڵ، ئامانج لێی ئەوەبوو حکومەت یارمەتی دارایی بدات بە جوتیارەکان، لە دوای دەرچوونی بەسێ ساڵ دادگای باڵا ئەم یاسایەی هەڵوەشاندەوە، هەر لەوکاتەدا کۆنگرێس یاسای دووەمی دەکرد، ئەم یاسایەیان لە یاسای یەکەم باشتر بوو، باسی لەوە دەکرد کە حکومەت یارمەتی دارایی بدات بەو جوتیارانەی کە بەشێکی زەویەکەیان دادەنێن بۆ چاندنی ئەو بەرهەمانەی خاک بەپیت دەکەن، هەتا ساڵی (١٩٤٠) ژمارەی بەشداربووانی ئەم پرۆژەیە نزیکەی شەش ملیۆن جوتیار بوو، هەروەها ئەم یاسا نوێیە سەرپشک کرا بۆ پێدانی قەرز بەرامبەر بەرهەمە زیادەکان، و ئاسانکاری کرا بۆ خزمەت کردنی بڕێکی زۆر لە دانەوێڵە.[١]

٦. یاسای بە ڕەهندانی کێڵگەکان و هاوکاری کردنی ماددەی ڕەهندەرەکان لە کاتی پێویستدا.

٧. یاسای پێدانی پارەی پرۆژە بیناکارییەکان بۆ بوژانەوەی بازاڕی کاری ئەو کەرتە و کۆبوونەوەی کرێکاران لەو جۆرە کارانەدا.

٨. یاسای پێکهێنانی فەرمانگەی ئاوەدانکردنەوەی گشتی کە تیایدا بڕی (٣٣,٠٠٠,٠٠٠) دۆلار بۆ دروستکردن و نوێ کردنەوەی بەست و بەندا و و پرد و ڕێگە وبان و فرۆکە خانە و چاک کردنی زەوی و زار و هەندێ پرۆژەی هاوشێوەی تر تەرخان کرا.[٢]

٩. قەدەغەکردن و نەهێنانی مەی و بە خێرایی دروستکردنی مەی لابرد.

١٠. یاسای ژیانەوەی پیشەسازی نەتەوەیی کە لە ژێر سەرپەرشتی دەوڵەتدا بوو، بۆ ئەوەی بەپێی چەند سیفاتێکی دیاریکراو و گونجا و و بەپێی بەرژەوەندی ئابووری نەتەوەیی کار بکات.

لە ناوەڕۆکی ئەم یاسایەشدا هاتووە کە پێویستە حکومەت ملیۆنەها دۆلار بۆ هاندانی ئاوەدانکردنەوەی وڵات و چاککردنی ژیانی کرێکارەکان خەرج بکات بە شێوەیەک بتوانن بەرهەمە نوێکان بکڕن و بەکاری بهێنن.

---

١ - د. طليعة الصياح و راغب العلي: س- پ، ل ٢٠١.

٢ - د.محمد محمد صالح واخرون: س- پ، ل ٢٣٨.

کۆنگرێس لە ساڵی (١٩٣٠) بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی ئەم یاسایەی دا، پاشان یاسایەکی تری دەکرد، کە مافی بە کرێکارەکاندا سەبارەت بە ماوەی کارکردن و ڕێژەی کرێ بە ویستی خۆیان سەندیکاکان هەڵبژێرن و نوێنەر دیاری بکەن بۆ قەسەکردن لەسەر مافەکانیان لای خاوەنکار، لە هەمان کاتدا دەزگایەکی تایبەت دروستکرا بۆ ئەوەی چاودێری ئەم کارانە بکات، بەم شێوەیە دوو سەندیکای گەورە دروست بوو ئەوانیش (یەکێتی کرێکارانی ئەمریکی و لیژنەی ڕێکخستنی پیشەسازی) بوون.[١]

١١. لە ساڵی (١٩٣٤)دا کۆنگرێس بڕیاری لەسەر یاسایەکدا کە پەیوەست بوو بە بەڵێنی ڕێکەوتنی بازرگانی و لەسەر بنەمای ئاڵوگۆڕ دانرابوو، کە ڕێگای بە سەرۆک دەدا ئەندازە و بڕی گومرگ کەمبکاتەوە بۆ (٥٠%)، ئەمەش ئاماژەیە بۆ سیاسەتی کەمکردنەوەی ڕێگری بازرگانی، ئەم یاسایەش (یاسای پارێزگاریکردنی بەرووبوومی ناوخۆ بوو).

١٢. یاسای گرەنتی دڵنیایی کە کۆنگرێس لە ساڵی (١٩٣٥)دا بڕیاری لەسەردا، کە لە زنجیرەیەک یاسا پێکهاتبوو، بەپێی ئەم یاسایە دەخوازرێت سەنەداتی دارایە تازەکان ئاشکرا بکرێ، لەم یاسایەدا مووچە بۆ پیرەکان دابینکرا و هەلی کار بۆ بێکاران ڕەخسێنرا، یارمەتی دانی ئەو ژنانەی کاریان نەبوو، تەرخانکردنی پارەی پێویست بۆ تەندروستی گشتی.[٢]

بەندەکانی ئەو یاسایە زۆرێک لە چینەکانی کۆمەڵگای دەگرتەوە و لە حاڵەتی چاوەڕوان نەکراو دەیپاراستن. لە هەمان ساڵدا (فرانکلین روزفێڵت) پڕۆژەیەکی پێشکەشی کۆنگرێسی کرد بۆ فریاکەوتن و یارمەتیدانی سی و پێنج ملیۆن لە کار کەوتوو، پێنج ملیار دۆلاری ئامادەکرد بۆ ئەو پڕۆژەیە، ئەویش بۆ بنیاتنان و نوێکردنەوەی جیاواز.[٣]

سەرۆک (فرانکلین روزفێڵت) بۆ جێ بەجێکردنی ئەو یاسایانە هەوڵیدا کەسی شیاو و دڵسۆز بۆ ئەو فەرمانگە و دامەزراوانە دابنێ، هەربۆیە چەند کەسانێکی بە وەفای بۆ ئەم ئەرکە گرنگانە هەڵبژارد، بۆ نموونە (هنری مویکنسی) بۆ سەرۆکی فەرمانگەی فریاکەوتنی فیدراڵی و (جۆرج بیک) بۆ سەرپەرشتی دائیرەی

---

١ - فرحات زيادة و ابراهيم فريجي: تاريخ الشعب الأمريكي،ص٣٢٥.

٢ - الن نفيز واخرون:س-پ،ص٥١٢.

٣ - د.محمد محمد صالح واخرون: الدول الكبرى، ص٢٣٩.

(ڕێکخســتنی کشــتوکاڵ) و (هیــر جونســن) بــۆ ســەرکردایەتیکردنی فەرمــانگەی (بوژاندنەوەی پیشەسازی نەتەوەیی) دیاریکرد. [١]

ئەگەر چی لە ماوەی یەکەمی سەرۆکایەتی (فرانکلین روزفێلت)دا بەرنامەکەی نەیتوانی بە تەواوەتی بنەبڕی نەهامەتیەکانی گەلی ئەمریکا بکات، بەڵام گوڕوتینێکی باشی بە توانای ئابووری و ئاستی بژێوی گەلی ئەمریکا بەخشی. [٢]

لە کانونی دووەمی ساڵی (١٩٣٦)دا دادگای باڵای فیدراڵی ئەمریکی بڕیاری نا دەستووری بوونی (یاسای بوژاندنەوەی پیشەسازی) دەرکرد، ئەگەر چی ئەو یاسایە خزمەتێکی زۆری گەلی ئەمریکای کردبوو، پاشانیش بڕیاری نا دەستوری بوونی (ڕێکخستنی کشتوکاڵ)ی دەرکرد، ئەمە مانای ئەوەبوو کە زۆرێک لە بەندەکانی پرۆگرامی تازەی سەرۆک (فرانکلین روزفێلت) لە کار دەکەون. [٣]

فرانکلین رۆزفێلت لە ساڵی (١٩٣٦) پرۆژەیەکی پێشکەش بە کۆنگرێس کرد بۆ پاکردنەوەی دادگای فیدراڵی، دوای ئەوەی ئەو دادگایە زنجیرەیەک بڕیاری دەرکردبوو هاوشێوەی نەبوو، ئامانجەکەشی ئەوەبوو دادوەرە بە ساڵاچووەکان دەربکرێن لە پۆستەکانیان ئەوەبوو فرانکلین روزفێلت شەش ئەندامی خانەنشین کرد لەوانەیان کە تەمەنیان لە حەفتا ساڵ تێپەڕ کردبوو.

لە ساڵی (١٩٣٧)دا لە وتارێکیدا روزفێلت کۆتایی پرۆگرامی یەکەمی ڕادەگەیەنێت و پێداگری لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە شوێنەوارەکانی قەیرانی ئابووری لادەبات و گرنگی دەدات بە پێشخستنی ناوخۆ. [٤]

---

١ - فرحات زیادة و: س- پ، ل ٣٢٨.

٢ - بول م.سام ویلسون واخرون:الاقتصاد،تر.هاشم عبدالله،الاهلیة للنشر،عمان،٢٠٠١،ص٣٥٢.

٣ - د.محمد محمد صالح واخرون:الدول الکبری، ص٢٣٩.

٤ - د.محمد محمد صالح واخرون: س- پ، ل ٢٤٠.

# بەشی سیازدەیەم

# ئەمریکا و جەنگی دووەمی جیهانی
# (١٩٣٩ – ١٩٤٥ز)

**(هۆکارەکانی هەڵگیرسانی جەنگی دووەمی جیهانی)**

هەڵگیرســـانی جەنگـــی دووەمـــی جیهـــان کۆمەڵێـــک هۆکـــاری ڕاســـتەوخۆ و ناڕاستەوخۆی لە پشتەوە بوو، هۆکاری ڕاستەوخۆ بەهۆی هێرشی ئەڵمانیاوە بوو بـۆ ســەر پۆڵەنـدا، کاتێـک (ئـادۆلف هیـتلەر) لە (۱)ی ئەیلـولی (۱۹۳۹) فەرمـانی پەلامـارداني پۆڵەنـدای دا، بەڵام هۆکـارە ناڕاسـتەوخۆکان جێگـای تێرامـان و جیاوازییەکی گەورەی مێژوونووسانە، لێرەدا چەند هۆکارێک دەخەینەڕوو. [۱]

پەیمانی (ڤێرسای) لە ساڵی (۱۹۱۸) لە پاریس، کۆمەڵێک مەرجی توندی سەپاند بەسـەر ئەڵمانیـادا، لە مـادەی (۲۳)ی پەیماننـامەکەدا هـاتووە، ئەڵمانیـا بەرپرسـە لە هەڵگیرسـاندنی جەنگـی یەکەمـی جیهـان وهەمـوو ئەو زیانـانەی لە هاوپەیمانـان کەوتووە، بۆ ئەم مەبەستەش لیژنەیەک پێکهێنرا بۆ چاودێریکردنی تواناکانی ئەڵمانیا لەگەڵ سیستەمی باجدا، تا ئەڵمانیا زیانەکان ببژێرێت. [۲]

بەپێـــی ئەم پەیماننـــامەیە ئەڵمانیـــا (۱۲٫٥) لە ڕووبەرەکەی و (۱۲%)ی دانیشـتوانەکەی و نـزیکەی (۱٥%) بەرهەمـی کشـتوکاڵی و (۱۰%) پیشەسـازی و (۷٤%) بەرهەمی ئاسنی خاوی لە دەستدا، سوپای ئەڵمانیـاش نەدەبـوو لە (۱۰۰) سـەد هەزار سـەرباز تێپەڕێت، بە زۆر سـەرباز گرتنیشـی تیـادا هەڵوەشـایەوە، ئەم پەیماننـامەیە ئەڵمانیـای خسـتە بـارودۆخێکی نالەبـاری وا دەربـازبوون لێـی زۆر ئەسـتەم بوو,هەروەهـا هەسـتکردن بە شکسـت گیـانی ڕق و تـۆڵەکردنەوەی لای ئەڵمانەکان زیاتر کرد. [۳]

ئەم بـارودۆخە نالەبـارەی ئەڵمانیـا و ئەڵمانەکـان زۆری نەخایاند و پاش ئەوەی نازییەکان بە سەرۆکایەتی هیتلەر چوونە سـەر کورسـی دەسـەڵات,ئەڵمانیا بوویەوە بە یەکێک لە گەورەترین و بەهەژمـوونترین زلهێزی ئەوکـاتی جیهـان لە سـەرجەم بوارەکـانی سیاسـی و ئـابووری و بازرگـانیو سەربازی(بەتایبەتتر)،سـەرجەمی ئەو قەرزانەی وەک قەرەبـووی جەنـگ بەسـەر ئەڵمانیـادا سـەپێنرابوو، توانییـان لە ماوەیەکی کەمدا بیدەنەوە,پاش خۆ ڕێکخستنەوەی نـاوخۆی وڵات,(هیـتلەر) کەوتە بیری گەڕاندنەوەی ئەو زەوییانەی کەلە پاش جەنگی یەکەمی جیهانی و پەیماننامەی ڤێرسـای لە ئەڵمانیـا دابڕێنرابـوون و خرابـوونە سـەر چەنـد وڵاتێکـی هاوسـنوری

---

۱ - د.خليل علي مراد واخرون:دراسات في التاريخ الاوروبي الحديث والمعاصر،ص۳۷٥.

۲ - د. طليعة الصياح و راغب العلي: تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية، ص ۱۸.

۳ - علي حيدر سليمان:تاريخ الحضارة الاوروبية الحديث،ص۳۹٦.

ئەڵمانیا،هیتلەر قۆناغ بە قۆناغ دەستی کرد بە جێبەجێ کردنی پلانەکەی،[1] هەرچەندە هەنگاوەکانی (هیتلەر) مەترسییەکی گەورە و ڕاستەقینەی دروستکردبوو بۆ سەر ئاشتی ئەورپا و جیهان,بەریتانیا و فەڕەنسا بەبیانووی پاراستنی ئاشتی جیهانی هیچ هەنگاوێکی ڕاستەقینەیان هەڵنەگرت بۆ ڕێگریکردن لە هەوڵە فراوانخوازییەکانی هیتلەر, (هیتلەر) زۆر هەوڵیدا بۆ ئەوەی پەیماننامەی ڤێرسای هەڵبوەشێنێتەوە و زەویـیە لە دەست چووەکانی ئەڵمانیا جارێکی تر بخاتە ژێردەسەڵاتی خۆیەوە، بۆ ئەو کارە بارودۆخ یارمەتیدەری بوو، چونکە دواین هێزی هاوپەیمانان لە ساڵی (١٩٢٠) ئەڵمانیای بەجێ هێشت، لەگەڵ داڕووخانی ئابووریشدا بژاردنەکانیش داڕووخا.[2]

سەرۆکی ئەڵمانیا دەستی کرد بە تێکدانی چوارچێوەی کاری پەیماننامەی (ڤێرسای)، لە تشرینی یەکەمی (١٩٣٣)دا ئەڵمانیا لە (کۆمەڵەی گەلان) کشایەوە، سەرنەکەوتنی ئەو کۆنگرەیەی کۆمەڵە کە بۆ داماڵینی چەک سازیدابوو خستە ئەستۆی فەڕەنسا، بەوەی فەڕەنسا لە کۆنگرەی داماڵینی چەک نایەوێ هێزەکانی خۆی کەم بکاتەوە، ئەمەش وا لە ئەڵمانیا دەکات بەردەوام نەبێت لە مانەوەی لە کۆمەڵە و کۆنگرەدا.[3]

(هیتلەر) لە (١٦)ی مارسی (١٩٣٥) بڕیارێکی مەترسیداریدا، ئەویش بریتی بوو لە پشتگوێ خستنی بەندەکانی پەیماننامەی ڤیرسای، ئەوەبوو بڕگە سەربازییەکانی هەڵوەشاندەوە و گوتی ئەڵمانیا چیتر بەرگەی ئەوە ناگرێت سوپاکەی تەنها (١٠٠) هەزار سەربازبێت و ڕایگەیاند لەجیاتی ئەمە سوپاکەی سێ بەرامبەر زیاد دەکات و هێزی ئاسمانیش دادەمەزرێنێت,بەمەش ئەڵمانیا بوو بە دەوڵەتێکی بەهێزو هیچ کاریگەریەکی ڕێککەوتننامەی ڤیرسای لەسەر نەما، تەنها ئارەزووی تۆڵەکردنەوەی هەبوو لەو لایەنانەی مەرجی قورسیان لە ڕێکەوتننامەکەدا سەپاندبوو بەسەریدا.[4]

هیتلەر ڕایگەیاند ئەو خەڵکانەی بە زمانی ئەڵمانی دەدوێن و لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانیەوە خراونەتە سەر خاکی چیکوسلۆڤاکیا، پێشێلکردنی مافی چارەی

---

١ - د. طليعة الصياح و راغب العلي: س- پ، ل ١٨٥.

٢ - ج.م.روبرتس: موجز تاريخ العالم،تر.فارس قطان،دمشق،٢٠٠٤،ج٢/ص٨٧٨

٣ - د.محمد ئیحسان: ململانیە نیودەوڵەتیەکان لە سەدەی بیستەمدا،د. ئاسۆ کریم و کامران مەنتک،چاپی یەکەم، وەزارەتی پەروەردە،هەولێر،٢٠٠١،ل١٢٧.

٤ - د.خليل علي مراد واخرون: س- پ، ل ٣٧٥.

خۆنوسینه  و نموونەیەکی تری زۆرداری دەوڵەتە هاوپەیمانەکانە، داوایکرد ئەو زەوییانەی خەڵکەکانیان بە زمانی ئەڵمانی ئەدوێن لە چیکوسلۆڤاکیا داببڕێن و بخرێنەوە سەر ئەڵمانیا.[1]

لە (٢٩)ی ئەیلولی (١٩٣٨) لە کۆبوونەوەی چوار زلهێز (بەریتانیا، فەڕەنسا، ئەڵمانیا و ئیتاڵیا) لە میونخ ڕێکەوتن لەسەر ئەوەی وڵاتی ئەڵمانیا ناوچەی (سودێن)ی لە ژێر دەسەڵاتدا بێت، لەم کۆنگرەیەدا بەریتانیا و فەڕەنسا سیاسەتی ئاشتەواییان لەگەڵ ئەڵمانیا گرتەبەر، سەرۆکی حکومەتی بەریتانیا (ئیڤیل چامبرلن) دەستێکی گەورەی هەبوو لە هەڵگیرساندنی جەنگ، بەوەی هیچ هەڵوێستێکی یەکلاکەرەوەی نەبوو دژ بە (هیتلەر) لە کاتێکدا ئەڵمانیا داوای بەندەری (دانزک)ی دەکرد، چونکە دەیزانی هێزی بەرگری وڵاتەکەی و سیستەمەکانی ڕادار ئامادەی شەڕێکی ئاسمانی نین.[2]

چامبرلن دوا بە دوای کۆتایی هاتنی کۆنگرەی میونخ دەگەڕێتەوە وڵاتەکەی و مزگێنی بە خەڵک دەدات، گوایە ئاشتی دابین کردووە. تەنها شەش مانگ بەسەر کۆبوونەوەی میونخدا تێپەڕیبوو، هێزەکانی ئەڵمانیا لە ئازاری (١٩٣٩) چونەناو پارچەکەی تری چیکوسلۆڤاکیاوە و (پراگ)ی پایتەختیان داگیرکرد.[3]

بێدەنگی زلهێزەکان لە هەنگاوە فراوانخوازیی و تەماعکارییەکانی هیتلەر نەک ئاشتی ئەوروپای نەپاراست بەڵکو ئاشتی ئەوروپا و جیهانیشی بەیەکجاری لەناوبرد,و بوو بە ڕێگەخۆشکەر بۆ سەرهەڵدانی گەورەترین و ترسناکترین و وێرانکەرترین جەنگ لە مێژووی مرۆڤایەتییدا، لەلایەکی ترەوە کەمی دەسکەوتەکانی لە جەنگی یەکەمی جیهانی و سەرقاڵی وڵاتانی ڕۆژئاوا بە کێشەکانی دوای جەنگ و قەیرانی ئابووری ,وای لە ژاپۆنیش کرد بکەوێتە بیری فراوانخوازی لە ڕۆژهەڵاتی دوور,ئەمەشی لەژێر دروشمی(ڕۆژهەڵات بۆ ڕۆژهەڵاتییەکان و ڕۆژئاواش بۆ ڕۆژئاواییەکان)دا دەکرد,بۆ ئەم مەبەستە  لە (١٩٣١/٩/١٨) هێزەکانی ژاپۆن هەستان بە داگیرکردنی (مەنشوریا) لەبەر ئەوەی مەنشوریا لە دوو لایەنی ستراتیجی و

١ - د.محمد ئیحسان: س- پ، ل ١٢٨.

٢ - د.صلاح احمد هریدي: س- پ، ل ٢٧٥.

٣ - د.محمد ئیحسان: س- پ، ل ١٢٩.

ئـابوورییەوە گرنـگ بـوو بـۆ ژاپـۆن، بەڵام کـۆمەڵەی گەڵـن لە شـوباتی (١٩٣٣)دا ڕاگەیاند کە بەهیچ شێوەیەک مەنشوریا نابێت بە بەشێک لە دەوڵەتی ژاپۆن.[١]

هەروەهـا کەمـی دەسـتکەوتی لە جەنگـی جیهـانی یەکەم و هـاتنە سـەرکاری دەسـەڵاتی فاشـی لە ئیتالیـا لە سـاڵی (١٩٢٢) و هەوڵە داگیرکارییەکـانی بەتـایبەت داگیرکردنـی حەبەشـە لەلایەن ئیتالیـاوە لە سـاڵی (١٩٣٥) بـوو بە هـۆی تێکچـونی ئاسایشی جیهانی و کۆمەڵەی گەڵنیش نەیتوانی هیچ هەنگاوێکی پێویست و جدی بۆ کۆتایی هێنان بەم داگیرکارییە و پاراستی سەروەری وڵاتان و ئاسایشی جیهان بنێ ,بەمەش هەڵگیرسـانی ئـاگری ئەو جەنـگە ترسـناک و وێـرانکەرەی هەڕەشـەی لە ئایندەی تەواوی مرۆڤایەتی دەکرد، نزیکتر بوویەوە.[٢]

لە ئەنجـامی ئەوەی وڵاتە زلهێزەکـان دەسـتیان کـرد بە پاشـگەزبوونەوە لە پەیماننامەکـان، بـارودۆخی سیاسـی تێکچـوو، لە مـاوەی هەردوو دەیەی بیسـت و سـییەکانی سـەدەی ڕابـردوو چەنـدین پەیماننـامە لەنێـوان وڵاتە جیاوازەکانـدا بەمەبەستی هاوکاریکردنی یەکتر لەکاتی پێشهاتنی هەر ڕووداوێکی چاوەڕوانکراو و چـاوەڕواننەکراودا,هەرچی وڵاتە دیکتاتۆرەکـان هەبـووکەوتنە ڕێکخسـتنی خۆیـان بەوەی هێزیان باشترین هۆکار دەزانی بۆ گەشتن بە دەسکەوتی جەنگ.[٣]

لاوازی کـۆمەڵەی گەڵـن لە چارەسـەرکردنی کێشـە گرنـگ و گەورەکـان بەهـۆی نەبـوونی هێزێکـی سـەربازی بەهێـزی سـەر بە کۆمەڵەکە تـا بڕیارەکانی کۆمەڵەکە جێبەجێ بکات وای کرد بڕیارەکانی کۆمەڵەکە تەنها مرەکەبی سەر کاغەزبێت و هیچ قورساییەکی لای وڵاتە بەهێزەکان نەبێ.[٤]

کۆمەڵەی گەڵن لە سەرەتای دروستبوونیەوە لە ساڵی (١٩٢٠) هەوڵیدا لە ڕێگەی چالاکیەکـانیەوە ئاشـتی جیهـان مسـۆگەر بکـات، ئەمەش لە ڕێـگەی قەدەغەکردنـی جەنگ و بڵاوکردنەوەی گیانی هاوکاری و تێگەیشتن لە نێوان دەوڵەتاندا، سـەپاندنی سـزای ئـابووری و دەرکردنـی دەوڵەتـی سـەرپێچیکەر لە کـۆمەڵەدا، پشـتیوانانی کۆمەڵەی گەڵن هیوایان وابوو دامەزراندنی کۆمەڵە سەرەتای سەردەمێکی نوێ بێت،

---

١ - د. طليعة الصياح و راغب العلي: س- پ، ل ٢٠٧.

٢ - د.خليل علي مراد واخرون: س- پ، ل ٢٧٤.

٣ - د. طليعة الصياح و راغب العلي: س- پ، ل ٢٠٧-٢٠٨.

٤ - د.محمد ئيحسان: ململانيە نيودەوڵەتيەكان لە سەدەی بيستەمدا، ل١٢١.

بەڵام ئەم گەشبینییەیان بۆ نەچووە سەر، دواتر هەندێ ڕووداوی گرنگ ئەوەی سەلماند.[1]

کۆمەڵەی گەڵن نەیتوانی چەند کێشەیەک چارەسەربکات لەبەرئەوەی لە توانای کۆمەڵەدا نەبوو، لەوانەش پێشبڕکێی خۆ پڕ چەک کردن و دەست تێوەردانی دەوڵەتان لە ململانێی نێوان ئیتاڵیا و یۆنان، کاتێک ئیتاڵیا لە ساڵی (١٩٣٧) دوورگەی (کورفوی) داگیرکرد، لە (١٩٣١/٩/١٨) ژاپۆن مەنشوریای داگیرکرد و لە ساڵی (١٩٣٢) دەستی گرت بەسەر (بیهول)دا و بەستیەوە بە مەنشوریا، تا دەوڵەتی منشوکو پێک بهێنێت، کۆمەڵەی گەڵن لە (١٩٣٣) ڕایگەیاند بەهیچ شێوەیەک دان بە مەنشوریا نانێت وەک دەوڵەتێک، سەرەڕای ئەوەی کۆمەڵەی گەڵن هیچ گەمارۆیەکی نەسەپاند بەسەر ژاپۆندا، بەڵام ژاپۆن لە کۆمەڵەی گەڵن کشایەوە.[2]

لە تشرینی یەکەمی (١٩٣٥)دا، ئیتاڵیا ئەپیوبیای داگیرکرد، ئەم داگیرکردنە کارێکی دەستدرێژیکەرانەبوو ئەنجومەنی کۆمەڵە ڤیتۆی ئیتاڵیای خستە لاوە و داوای بەستنی کۆنگرەیەکی تایبەتی کرد، بۆ ئەوەی بڕیار لەسەر ئەو سزایانە بدات کە پێویستە بەسەر ئیتاڵیادا بسەپێندرێ، دوای سەپاندنی سزا بەسەر ئیتاڵیادا، گەشبینیەکی تەواو هەبوو، کە ئەو سزایانە ئیتاڵیا ناچار بکەن لە ئەپیوبیا بکشێتەوە، بەڵام بە پێچەوانەوە لە مایسی (١٩٣٦) ئیتاڵیەکان وایان لێهات توانای تەواوکردنی سەرکەوتنە سەربازییەکانان هەبێت، لە مانگی تەمووزدا سزاکان هەڵگیران.[3]

لە ساڵی (١٩٣١) شۆڕشگێڕانی ئیسپانیا توانیان کۆمارێکی سەربەخۆ دابمەزرێنن، بەڵام زۆری نەخایاند دوژمنان پلانیان بۆ ڕووخانی ئەم کۆمارە سازکرد و لە تەمووزی (١٩٣٦) ئاگری شەڕی براکوژی لەو وڵاتەدا هەڵگیرسا، هەرچەندە (٢٧) دەوڵەتی ئەوروپی بڕیاریان دابوو دەست لە کاروباری ناوخۆی ئیسپانیا وەرنەدەن، بەڵام نازییەکانی ئەڵمانیا و فاشیەکانی ئیتاڵیا، خۆیان پێ نەگیرا و دەستیان خستە نێو کاروباری ئیسپانیاوە، بەپێی ناوەڕۆک و پێڕەوی کۆمەڵە دەبوو کۆمەڵەی گەڵن یەکەم دەزگا بێت لەسەر ئیسپانیا بێتە دەنگ، تەنانەت بڕیاری

---

١ - د.صلاح احمد هريدي:دراسات في التاريخ الأمريكي، ص ٢٧٦.

٢ - د.ناهد ابراهيم دسوقي:دراسات في التاريخ الأمريكي،ص١٦٠.

٣ - د.محمد ئيحسان: س- پ، ل ١٢١.

ئابلۆقەدانی ئیتالیا و ئەڵمانیاشی نەدا، چونکە کۆمەڵەی گەڵن لەوپەڕی لاوازیدا بوو.[1]

کۆمەڵەی گەڵن هیچ ڕێ و شوێنێکی نەگرتەبەر بۆ ڕێگەگرتن لە جەنگی نێوان پاراگوایی و پولیڤیا لە ساڵی (١٩٣٥) بەوەی لە سەرەتادا گەمارۆ بسەپێنێ بەسەر هەردوو لایەنی بەشەڕ هاتوودا، پاش سنوور دانان بۆ پاراگوای بە تەنها. فاشیستەکانی ئیتالیا هیچ بایەخێکیان نە بەڕای گشتی و نە بە کۆمەڵەی گەڵن نەدەدا، لە شکری ئیتالیا لە ساڵی (١٩٣٩) ئەلبانیای داگیرکرد، فاشیەکان ڕایانگەیاند ئەو وڵاتە هەمیشە بەشێکی مێژوویی ئیتاڵیای دێرین بووە بە تایبەت (مۆسۆلۆنی).[2]

یەکێک لە خاڵە هەرە لاوازەکانی کۆمەڵەی گەڵن بریتی بوو لەوەی کە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا نەچووە نێو کۆمەڵەی گەڵنەوە، سەرەڕای ئەوەی ڕۆڵێکی سەرەکی بینی لە بنیاتنانیدا، لە ساڵی (١٩٣٤) یەکێتی سۆڤیەت پەیوەندیکردبەکۆمەڵەی گەڵنەوە، بەڵام لە ساڵی (١٩٣٩) کشایەوە.[3]

ڕۆڵی یەکێتی سۆڤیەت لە هەڵگیرساندنی جەنگی دووەمی جیهان لەوەدا دەردەکەوێت، واژووی ئەو ڕێکەوتننامەیەی کرد، کە دەست درێژی بۆ سەر ئەڵمانیا قەدەغە دەکرد، پێویست بوو لەسەری هاوپەیمانێتیەک لەگەڵ هەریەکە لە وڵاتانی ڕۆژئاوا و پۆڵەندا ببەستێت دژی (هیتلەر) بۆ ئەوەی وازبهێنێت لە پلانە دوژمنکارییەکان، لەلایەکی ترەوە بەریتانیا ئامادەی هاوپەیمانیەتی نەبوو لەگەڵ سۆڤیەتدا، ڕەنگە ئەوەش لە ئەنجامی جیاوازی ئایدۆلۆژیایی هەریەک لەو دوو زلهێزە بوو بێت.[4]

بەهێزبوونەوەی وڵاتە شکست خواردووەکانی جەنگی یەکەمی جیهانی ودروستبوونی گیانی ڕق و تۆڵەسەندنەوە لایان وئەو داگیرکارییانەی لە دەیەی سییەکاندا ڕوویدا...هیچ هیوایەکی بۆ مانەوەی ئەو ئاشتییە لەرزۆکەی باڵی بەسەر جیهاندا کێشابوو،نەهێشتەوە.

---

١ - د.کەمال مەزهەر:چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی گەلی کورد،دەزگای ڕوشنبیری کوردی،بغداد،١٩٨٥،ص٦٩.

٢ - د.خلیل علی مراد واخرون: س- پ، ل ٢٧٤.

٣ - د.ریاض الصمد:تطورات الاحداث الدولیة فی القرن العشرین،المؤسسة الجامعیة للدراسات والنشر والتوزیع،الطبعة الاولی،بیروت،١٩٩٩،ص١٢٣.

٤ - د.خلیل علی مراد واخرون: س- پ، ل ٣٧٩.

## هەڵوێستی ئەمریکا بەرامبەر گۆڕانکارییەکان

سـەبارەت هەڵوێسـتی ئەمریکـا بەرامـبەر گۆڕانکارییەکـانی ئەوروپـا دوای سەرکەوتنی هاوپەیمانان لە جەنگی یەکەمی جیهانی و گێڕانەوەی هاوسەنگی هێز، بە بڕیـارێکی کـۆنگرێس ویـلایەتە یەکگرتووەکـانی ئەمریکـا گەڕایەوە سـەرهەمان سیاسەتی دوورە پەرێزی و دابڕان، ئامانجیش لەم کارە ئەوەبوو ڕێگە لە ویلایەتە یەکگرتووەکـان بگرێـت، بـۆ ئەوەی نەچێـتە جەنـگەوە لە دەرەوەی کیشـوەری ئەوروپا.[1]

لە ئەنجامی ئەو گۆڕانکارییانەی لە ئەوروپا ڕوویاندەدا، ویلایەتە یەکگرتووەکان بۆچوون و تێڕوانینەکانی خۆی دەخستەڕوو و ئامۆژگاری ئەو وڵاتانەی دەکرد کە ڕاسـتەوخۆ ئەم بـارە دەیگـرتنەوە، بەوەی پەنـا نەبەن بـۆ جەنـگ و هـانی دەدان پشـت بەو ڕێگەچـارانە ببەسـتن، کە لە ئەنجـامی ڕێکەوتـن و کۆنگرەکانـدا بڕیاریـان لەسەردرابوو، هەرچەندە ویلایەتە یەکگرتووەکان سەرکەوتوو نەبوو لە ڕێککردنی بارودۆخی ئەوروپا، بەلایەنی کەمەوە ڕۆڵی هەبوو لە دواخستنی کارەساتی گەورە، تـا ئەوکـاتەی سیاسـەتمەدارەکان چارەیـان بـۆ دەدۆزیـیەوە، بەشـێوەیەک ئاشـتی بپارێزێت.[2]

سـەرەڕای بەرزبوونەوەی دەنگی نـاڕەزایی لە بەرامـبەر سیاسـەتی گۆشـەگیری، هێشـتا کاربەدەسـتانی ئەمریکـا و سـەنتەری بڕیـار لەم وڵاتە بە وردی و وریـاییەوە مامەڵەیـان لەگەڵ ئەو ڕووداوەنەدا نەدەکـرد، نەک هەر ئەوەش لە سـاڵی (١٩٣٥)دا کۆنگرێسی ئەمریکی یاسای بێلایەنبوونی ئەمریکای لە کێشـەی ئەوروپـادا ڕاگەیاند، ئەوەش زیاتر بۆ دانانی سنورێک بوو بۆ دەسەڵاتی سەرۆک لە گۆڕەپانی سیاسەتی دەرەوەیـدا، ئەم یاسـایە ڕێگربـوو لە نـاردنی چەک و تەقەمەنـی بـۆ لایەنە بە شـەڕ هاتووەکان، بەڵام لە ساڵانی دواتردا گۆڕانکاری لەم یاسایەدا کرا.[3]

جـارێکی تـریش بە هـۆی داگیرکردنـی ئەپیوبیـا لەلایەن ئیتاڵیـاوە کـۆنگریس لە سەرەتای ساڵی (١٩٣٦) بڕیاری بێ لایەنی دووبارە کردەوە، جگە لەوەش بە بۆنەی

---

١ - بدون مؤلف:موجز التاريخ الأمريكي،ص١٣٧.

٢ - د.محمد عبدالمنعم الشرقاوي:الولايات المتحدة،ص٢٤٧.

٣ - د.فاضل حسين ود.كاظم هاشم نعمة: س- پ، ل ٢٧٢.

هەڵگیرسانی شەڕی ناوخۆی ئیسپانیا، کۆنگرێس یاسای سێیەمی بێلایەنی ڕاگەیاند، ئابلۆقەی خستەسەر ناردنی چەکڕ بۆ کۆماری ئیسپانیا.[1]

سەرەڕای ئەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکان شوێن بنەمای دوورەپەرێزی کەوتبوو، بەڵام ئەم سیاسەتە لەبارنەبوو بۆ چاودێریکردنی ئەو ڕووداوانەی لە ئەوروپا ڕوویاندەدا، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە گومان بوو بەرامبەر بە وڵاتانی میحوەر، بە هۆی سیاسەتە فراوانخوازییەکانیان و ڕێز نەگرتنیان لە پەیماننامە نێودەوڵەتیەکان، لە تشرینی یەکەمی (١٩٣٧) (روزفێڵت) سەرۆکی ئەمریکا لە وتارێکدا هێرشی کردەسەر (ئەڵمانیا و ئیتاڵیا و ژاپۆن) بەبێ ناوهێنانیان بە ئاشکرا، هەر یەکەیانی تاوانبار کرد بە دروستکردنی نائارامی و ڕێز نەگرتن لە یاسا نێودەوڵەتیەکان.[2]

لە (٥)ی ئایاری (١٩٣٨)، وەزیری جەنگی ئەمریکا هەریەکە لە ئەڵمانیا و ئیتالیا و ژاپۆنی ئاگادارکردەوە لەهەر کارێک ببێتە هۆی هەڵگیرساندنی جەنگی دووەمی جیهان، لە کاتی هەڵگیرساندنی جەنگی دووەمی جیهاندا لە ساڵی (١٩٣٩) ویلایەتە یەکگرتووەکان هەڵوێستی بێ لایەنی گرتەبەر، چەکی دەنارد بۆ هەموو دەوڵەتە بە شەڕ هاتووەکان بەبێ جیاوازی، بەم کارەش زیان بە بەرژەوەندییەکانی فەرەنسا و بەریتانیا گەیشت، چونکە لەلایەنی سەربازییەوە ئامادەی جەنگ نەبوون، لە کاتێکدا ئەڵمانیا ئامادەکاری بۆ ئەم جەنگە کردبوو.[3]

سەرەتای هەڵگیرساندنی جەنگی دووەمی جیهانی لە (١٩٣٩/٩/١) دابوو، کاتێک هێزەکانی سوپای هیتلەری نازی لە هێرشێکی بەرفراوانی گەورەدا وڵاتی پۆڵەندای داگیرکرد، دواتر لە (١٩٣٩/٩/٢)دا هێزەکانی هاوپەیمانان(بەریتانیا و فەرەنسا) جەنگیان لە دژی ئەڵمانیای نازی ڕاگەیاند ،ئەمریکا لەم کاتەدا دژی ئەڵمانیا بوو بەڵام زۆرینەی ڕای گشتی ئەمریکی لەگەڵ بەشدار نەبوونی ئەمریکا بوون لەم جەنگەدا، بۆیە ویلایەتە یەکگرتووەکان هەڵوێستی بێلایەنی گرتەبەر، بەبێ جیاوازی چەکی دەنارد بۆهەموو دەوڵەتە بەشداربووەکان بەم کارەش زیان بە

---

١ - د. طليعة الصياح و راغب العلي: س- پ، ل٢١٠.

٢ - د.خليل على مراد واخرون:دراسات في التاريخ الاوروبى الحديث والمعاصر،ص٤٠٣.

٣ - د. طليعة الصياح و راغب العلي: س- پ، ل٢١٠.

بەرژەوەندیەکانی فەرەنسا و بەریتانیا گەشت، چونکە لە لایەنی سەربازیەوە ئامادەی جەنگ نەبوون، لە کاتێکدا ئەڵمانیا ئامادەی کردبوو بۆ جەنگ.[1]

پاش ماوەیەک لە جەنگ ویلایەتە یەکگرتووەکان بۆی دەرکەوت ئەم بێلایەنیەی زیان بەو دەوڵەتانە دەگەیێنێت کە زۆر نزیکن لە ویلایەتە یەکگرتووەکانەوە، وەک بەریتانیا و فەرەنسا، بۆیە لە پاش ماوەیەکی کەم ئەمریکا لە بەرژەوەندی دەوڵەتانی هاوپەیمان هەڵویستی گۆڕی، لە (٣)ی تشرینی دووەمی (١٩٣٩)دا روزفێڵتی سەرۆکی ئەمریکا داوای لە کۆنگریسی ئەمریکا کرد یاسای بێلایەنی بگۆڕێت، کۆنگریسیش وەڵامی داواکەی دایەوە، ویلایەتە یەکگرتووەکان چاوی پۆشی لە فرۆشتنی کەل وپەلی جەنگی بە بەریتانیا و فەرەنسا بە مەرجێک دەم و دەس نرخەکەی پێ بدرێ و لەسەر پشتی کەشتیەکانی ئەمریکا بارنەکرێن و نەگوێزرێنەوە, ئەمەش بەپێی یاسای (الاعاره والتأجير) بوو.[2]

لە ئەیلولی (١٩٣٩) ویلایەتە یەکگرتووەکان بۆی دەرکەوت، ئەم بێ لایەنیە زیان بەو دەوڵەتانە دەگەیەنێ، کە زۆر نزیکن لەو ویلایەتە یەکگرتووەکانەوە وەکو بەریتانیا و فەرەنسا, لە ساڵی (١٩٤٠) (روزفێلت)ی سەرۆکی ئەمریکا لە نامەیەکیدا بۆ (مۆسۆلۆنی) داوای لێکرد بەشداری جەنگ نەکات، بۆ جارێکی تر سەرۆکی ئەمریکا ئەم داوایەی دووبارەکردەوە، لە هەمان ساڵدا (وینستون چەرچڵ) سەرۆک وەزیرانی بەریتانیا نامەیەکی بۆ (مۆسۆلۆنی) نارد و داوای لێکرد دژی بەریتانیا نەچێتە جەنگەوە، بەڵام سەرکەوتنە بروسک ئاساکانی ئەڵمانیا وایان لە (مۆسۆلۆنی) کرد، وەڵامێکی نەرێنی ئەو نامانە بداتەوە، کە پێشتر لەلایەن (چەرچڵ و رۆزفێلت)ەوە ئاراستەی کرابوو، لە وەڵامی سەرۆکی ئیتاڵیا بۆ (روزفێلت) رایگەیاند ناتوانێت داواکارییەکەی جێ بەجێبکات سەبارەت بە نەچوونە جەنگەوە.[3]

سەرۆکی فەرەنسا داوای لە ویلایەتە یەکگرتووەکان کرد، قورسایی خۆی بخاتە تەرازووەوە بۆ رزگارکردنی فەرەنسای پاسەوانی دیموکراتی لە ئەوروپا، سەرۆکی ئەمریکا بەڵێنی ناردنی برێکی گەورەتری چەکیدا بە فەرەنسا و بەریتانیا بێ ئەوەی خۆی لە جەنگەوە بگلێنێ.[4]

---

١ - كارلهاينتس دشنر: تاريخ الولايات المتحدة، ص ٢٨٧.

٢ - د.خليل علي مراد واخرون: س- پ، ل ٤٠٣.

٣ - د.محمود السيد:تاريخ اوربا والامريكتين،ص٩٦.

٤ - كارلهاينتس دشنر: س- پ، ل ٢٨٨.

تێکشکانی فەرەنسا لە لایەن ئەڵمانیاوە لە هاوینی (١٩٤٠) بوو بە هۆی ئەوەی گرنگیدانی ویلایەتە یەکگرتووەکان بە ڕووداوەکانی ئەوروپا زیاتر بێت، بە تایبەت پاش داگیرکردنی پاریس لە هەمان ساڵدا، (روزفێلت) ئاشکرایکرد وڵاتەکەی دەبێتە جبەخانە و یارمەتی پڕچەک کردنی وڵاتە دیموکراتیەکان دەدات. [1]

کاتێک هێرشی ئاسمانی ئەڵمانیا بۆ سەر بەریتانیا دەستی پێکرد، لە ئەمریکا کەس بە عەقڵیەتێکی دوورە پەرێزی بیری نەدەکردەوە جگە لە ژمارەیەکی کەم نەبێت. لە (٣)ی ئەیلولی (١٩٤٠)دا ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و بەریتانیا ڕێکەوتنێکیان واژووکرد و بەپێی ئەو ڕێککەوتنە ئەمریکا (٥٠) پەنجا کەشتی دژە تۆربیدی دا بە بەریتانیا، لە بەرامبەر بە کرێگرتنی بنکە سەربازییە بەریتانیەکان لە (ئەلباهاماس، جامایکا، سانتالوسیا، ترینیتی و ئەنتیگوادا) بۆ ماوەی (٩٩) ساڵ.

ئەم ڕێکەوتنە قازانجێکی زۆری بۆ بەریتانیا هەبوو، چونکە پاڵپشتی لە بنکەی دەریایی و هێڵی بەرگری بەریتانیا دەکرد لە پشتەوەی ڕووبارەکان. ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا یارمەتیەکی زۆری پێشکەش بە بەریتانیا و هاوپەیمانان کرد بەبێ ئەوەی جاڕی بەشداریکردنی خۆی لەو جەنگەدا بدات. [2]

لە ١٩٤١/٣/١١ دا کۆنگرێس ڕازی بوو لەسەر یاسایی خواستن و بە کرێدان بە (٦٠) شەست دەنگ بەرامبەر بە(٣١) سی ویەک دەنگ, یاسای ناوبراو ڕێگەی بە سەرۆکی ئەمریکا دەدا بۆ فرۆشتن یان گۆڕین یان خواستن یان دەستکاریکردنی کەل و پەل و ئامێری جەنگ بۆ بەرژەوەندی ئەو دەوڵەتانەی کە بەرگریکردن لێیان دەبووە هۆی بەرگریکردن لە ئەمریکا، سەرۆکی ئەمریکا دەسەلاتی ڕەهای هەبوو لە ناوهێنانی ئەو دەوڵەتانەی سودیان لە یارمەتیەکانی ئەمریکا وەردەگرت، یارمەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان گەشتە ڕووسیا و چین، دوای سێ مانگ ڕووسیا چووە پاڵ هاوپەیمانان لە دژی ئەڵمانیا، جێی ئاماژەپێکردنە بەریتانیا و یۆنان سودێکی زۆریان لەو یاسایە وەرگرت. [3]

بڕی یارمەتی ئەمریکا بۆ وڵاتانی هاوپەیمانان لە ساڵانی جەنگدا، گەشتە (٥٠) پەنجا ملیار دۆلار، پشکی بەریتانیا لەو یارمەتیانە (٦٥%) و یەکییەتی سۆڤییەت(٢٣%) بوو. لە (١٤)ی ئابی (١٩٤١) سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی

---

١ - بدون مؤلف:موجز التاريخ الأمريكي،ص١٣٨.

٢ - عبدالوهاب القيسي واخرون:تاريخ العالم الحديث ١٩١٤-١٩٤٥،الطبعة الاولى،الموصل،١٩٨٣،ص١٦٦.

٣ - د.محمود السيد:تاريخ اوربا والامريكتين،ص٩٦.

ئەمریکا لەگەڵ سەرۆک وەزیرانی بەریتانیا کۆبوونەوە، بە باشیان زانی هەندێ بنەمای گشتی ئاشکرا بکەن لە سیاسەتی هەردوو وڵاتدا، کە خواستەکانیان لەسەر دانابوو لە پێناو داهاتوویەکی باشتر بۆ هەموو جیهان. (١)

بەڵگەنامەی ئەتڵەسی دانرا، ئەم بنەمایانە دەستنیشانکرا بۆ قەدەغەکردنی فراوانخوازی هەرێمی یان گۆڕانکاری هەرێمی، کە ڕێک نەگونجێت لەگەڵ ئارەزووی ئەو گەلەدا، بڕیاری مافی چارەی خۆنوسین بۆ هەموو گەلن لە هەڵبژاردنی هەر جۆرە دەسەڵاتێک کە خۆیان دەیانەوێت، هەموو دەوڵەتێک مافی بازرگانی و بەدەست هێنانی کەرەستەی سەرەتایی هەبێت، لە هاریکاری ئابووری لە نێوان گەلندا، پاراستنی ئازادی دەریایی، بەکارنەهێنانی هێز لە چارەسەرکردنی کێشە نێو دەوڵەتیەکان. (٢)

هەرچەندە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەندەکانی ئەم پەیمانەی پەسەند کرد، بەڵام لەسەر دووره پەرێزی خۆی بەردەوام بوو، بەهۆی ڕێگەگرتن و شەڕ فرۆشتنی دەریاوانە ئەڵمانیەکانەوە، ویلایەتە یەکگرتووەکان ناچاربوو بڕیاری لێدانی هەموو کەشتی و فڕۆکە و دەریاوانە ئەڵمانی و ئیتاڵیەکان بدات، ئەوانەی لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی ئەمریکا ببینرێت، بەم هەڵوێستەش هەڵوەشاندنەوەی پەیوەندیەکانی نێوان ویلایەتە یەکگرتووەکان و وڵاتانی محوەر ڕاگەیەنرا. (٣)

هۆکاری ڕاستەوخۆی چوونە ناوەوەی ئەمریکا بۆ جەنگی دووەمی جیهانی ئەوەبوو کە لە (١٩٤١/١٢/٧)دا فڕۆکەکانی ژاپۆن هێرشیان کردە سەر بنکەی سەربازی ئەمریکا لە دورگەی (بیرل هار بەر) و بەشێکی گەورەی کەشتیە جەنگی و فڕۆکەکانی ئەمریکایان لەناو برد، هەروەها داگیرکردنی پاریس لەلایەن ئەڵمانیاوە و ڕێگری سوپای ئەڵمانیا لەو ژێر دەریاییە ئەمریکییانەی کە چەک و پێداویستی جەنگیان بۆ سوپای بەریتانیا دەگواستەوە وداگیرکردنی چین لەلایەن ژاپۆنەوە چەند هۆکارێکی تربوون بۆ چوونە ناوەوەی ئەمریکا بۆ جەنگ. (٤)

لە پاش ئەم ڕووداوانە ڕوزفێڵت داوای لە کونگرێس کرد شەڕ لە دژی ژاپۆن ڕابگەیەنێت و لە (١٩٤١/١٢/١١)دا بە کۆی دەنگ ئەندامانی کۆنگرێسی ئەمریکا ڕازی

---

١ - د. طليعة الصياح و راغب العلي: س- پ، ل٢٧٥.

٢ - الن نفيز وهنرى ستيل كومجر:س-پ،ص٥٢٥.

٣ - د.عبدالوهاب القيسي واخرون: س- پ، ل١٦٧.

٤ - د. طليعة الصياح و راغب العلي: تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية، ص ٢١٥.

بـوون به ڕاگەیانـدنی شـەڕ دژی وڵاتـانی بەرەی ناوەنـد، گەلـی ئەمـریکیش پشـتی ڕوزفیڵتیان گرت.[1]

له شەشـی کـانوونی دووەمـی سـاڵی (١٩٤١)دا ڕوزفیڵـت وتـارێکی ئاڕاسـتەی کۆنگرێس کرد و تیایدا جەختی لەسەر چوار ئازادی کردەوە و وتی:

(له ڕۆژانی داهاتوودا هەوڵدەدەین سەلامەتی و ئاسایش دابین بکەیـن، سـەرەڕای ئەمەش داوا له وڵاتانی جیهان دەکەین چوار ئازادیەکە بۆ مرۆڤ دەستەبەر بکەیـن)،[2] ئەو چوار ئازادییەشی بەیان کرد کە ئازادی قسـەکردن و ڕادەربڕین له هەموو شوێنێکی جیهاندا و ئازادی بیروباوەڕی مەزهەب و ئازادی له دابینکردنی پێویسته ئابووریەکان و ئازادیش له ترس بەمانای کەمکردنەوەی خۆ پڕ چەک کردن.[3]

له ئابی ساڵی(١٩٤١)دا (فرانکلین ڕوزفیلت و چەرچل)پێکەوە بەیاننامەیەکیـان بە نـاوی (پەیمـانی ئەتڵەسـی) و ڕایانگەیانـد، کە چەنـد بنەمـایەکی سـودمەندی لەخـۆ دەگرت بۆ ڕێکخستنەوەی جیهانی دوای جەنگ، له ساڵی (١٩٤١)دا یەکێتی سۆڤیه تیش چووە ناو ئەم پەیماننامەیەوە.[4]

کۆنگرێس سـەرۆک ڕۆزفیلیتشـیان سەرپشـک کـرد بە بەکارهێنـانی سـەرجەم تواناکانی میللەت و بەرووبوومیان، ڕازیش بوون لەسـەر دابینکردنی بوودجەیەکی دارایی زۆر بۆ شەڕ، ڕۆزفیلت هەستا بە ڕێکخستنی دەستەی بەرهەمهێنـانی جەنگ له (١٩٤٢/١/١٣)دا و (دۆناڵد نلسۆن) کرایە سەرۆکی ئەم دەستەیە، یاسـای سـەرباز گرتنی تازەی دەرکرد.[5]

ڕوزفیڵـت هەروەهـا بەشـداری کـرد له هەریەک له کۆنگرەکـانی تـاران (١٩٤٣) و یاڵتا (١٩٤٥) کە له مانگی شوباتدا بوو، بۆ تسدام تەموزی (١٩٤٥)، لەم کۆنگرانەدا هەرسێ سـەرۆک (چەرچڵ و ڕوزفیڵت و سـتالین) له پێنـاو سـەرکەوتنی یەکجـاری بەسەر ئەڵمانیا و ژاپۆندا بەرنامەی هاوکاریکردنی یەکتریان داڕشت.[6]

---

١ – بدون، مؤلف:موجز التاريخ الأمريكي،ص١٣٩.

٢ – د.محمود السيد: س–پ، ل٩٩.

٣ – عبدالوهاب القيسي واخرون:تاريخ العالم الحديث ١٩١٤–١٩٤٥، ص١٧٧.

٤ – د.خليل على مراد واخرون: س– پ، ل ٤١٢.

٥ – د.ناهد ابراهيم دسوقي:دراسات في التاريخ الأمريكي،ص١٦٦.

٦ – د.عبدالوهاب القيسي ولخرون: س– پ، ل١٧٨.

لە هـاوینی (١٩٤٢)دا (وینسـتون چەرچـڵ)ی سـەرۆک وەزیرانـی بەریتانیـا لەگەڵ سـەرۆکی ئەمریکـا (روزفیڵت) پێگەیشـتن، ئەمەش لە کاتێکدا بـوو ئەڵمانیـا هێرشـی بردبووەسەر (لیبیا) و ڕێگای بۆ قاهیرە و کەنداوی سوێسی والآکردبوو. [1]

هەردوو سەرکردە ڕێکەوتن هێرشێکی فراوان دژی هێزەکانی ئەڵمانیا و ئیتاڵیا لە باکوری ئەفریقـا ئەنجـام بـدەن و بەرەی ڕۆژئاوایـان دروسـتکرد وەک گۆڕەپانێکی نوێ بۆ فشار خستنەسەر سوپای ئەڵمانی بۆ کەمکردنەوەی هێرشـەکانیان ئەڵمـانی بـۆ سـەر بەرەی ڕۆژهەلات(یەکیەتـی سـۆڤیەت). هێزەکـانی هاوپەیمانـان لە سـاڵی (١٩٤٢) بە سەرکردایەتی جەنەڕاڵی ئەمریکی (ئایزنهاور) توانیان لیبیا لە دەسەلآتی مۆسۆسۆلنی و هێزەکانی ئەڵمانیا پاک بکەنەوە، پاشان ئەڵمانەکانیان بە یەکجاری دەرپەڕێنـران، [2] لە (١٩٤٢/١/٢٣)دا پلانەکـانی هاوپەیمانەکـان چـووە قۆنـاغی جـێ بەجێکردنەوە، هەر لەگەڵ گەشتنی هێزی سەربازی ئەمریکا بۆ گۆڕەپانەکانی جەنگ ڕاسـتەوخۆ گـۆڕان بەسـەر هەلـومەرجی کـردەوە سـەربازیەکاندا هـات، هێزەکـانی ئەڵمانیـاش تووشـی کۆمەڵێـک شکسـت و دۆڕان بـوونەوە لە بـاکووری ئەفریقـا بەتایبەت لە شەڕی (العلمین)دا، لەلایەکی تریشـەوە لە (١٢)ی تشرینی دووەمی ئەو سـاڵەدا چـوونە نـاو (گبـرقەوە)، لە (١٤)ی کـانوونی یەکەمـدا (عقلـیەش) دەسـتی بەسـەرداگیرا، [3] هەروەهـا لە سـاڵی (١٩٤٣)شـدا دەسـت بەسـەر (تـرابلس)دا گیـرا، بەبڕوای فەرەنسییەکان سنوری تـونس بـۆ ڕووبەڕووبـوونەوەی ئیتاڵیـا تونـدوتۆڵ بوو، لە تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٤٢)دا هێزەکانی بەریتانیا و ئەمریکا هێرشیان کردەسـەر ناوچەکـانی جەزائیـر و هـیچ بەرەنگرییەکـی ئەوتـۆ نەکـران، هێزەکـانی ئەڵمانیـا دوای چەنـد ڕۆژێکـی کەم توانیـان بچـنە نـاو تونسـەوە، لەلایەکـی تـرەوە بەریتانیاش دەستی کرد بە هێرشێکردن بۆ سەر ڕێگای هاتوچۆی ژاپۆن بە تایبەت لە گۆڕەپـانی نـاوچەی دارسـتانە ئیسـتیواییەکان، ژاپۆنیەکـانیش لە سـاڵی (١٩٤٣)دا هێرشەکانی خۆیان دەستپێکرد بۆسەر(ئاسام) بە مەبەستی دەسگرتن بەسـەر ڕۆڵـی (براهمـابرنرا)، بەلآم بەهـۆی ئەو بـارانە زۆرەی لەو نـاوچەدا بـاری سـەرەڕای

١ - د.عبدالعزيز سليمان نوار واخرون:تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية،ص٢٠٠.

٢ - د.ناهد ابراهيم دسوقي: س-پ، ل١٦٤.

٣ - د.محمود السيد:تاريخ اوربا والامريكتين،ص٩٩.

بەردەوامی جەنگ بۆ ماوەی شەش مانگ هێرشەکانیان دەرئەنجامێکی ئەوتۆی نەبوو. [١]

یەکێتی سۆڤییەت بەهۆی هێرشی لەناکاو و فراوان و گشتگیری هێزەکانی ئەڵمانیا توشی شکست و زیانێکی بێ ئەندازە هاتن،هەموو ڕێگەکانی گەیاندنی کۆمەک بەم هاوپەیمانە تێکشکاو و ماندووەیان لەبەردەم وڵاتە هاوپەیمانەکاندا داخرابوو،تەنها هیوا و ڕێگە کە لە بەردەمیاندا مابوو ئەوەبوو لەڕێگەی ئێرانەوە کۆمەک و هاوکارییەکانیان بگەیەننە سۆڤییەت،بەو هیوایەی توانای بەرگری ئەم وڵاتە لە بەرامبەر ئەڵمانیا زیادبکەن،[٢] لەئێران ڕەزاشا حوکمڕانی دەکرد،بە بیانووی بێلایەنی لە جەنگ و پاراستنی سەروەری خاکی ئێران ئامادەنەبوو وەک پێویست هاوکاری ئەمریکاو هاوپەیمانەکانی بکات,پاش سەرنەگرتنی هەوڵەکانییان بە ڕێگەی ئاشتییانە بۆ بەدەست هێنانی هاوکاری خێراو پێویستی ئێران،هێزی هاوپەیمانان ئێرانیان داگیرکرد و ڕەزاشایان لەسەر دەسەڵات لابرد و کوڕەکەی(محمد ڕەزاشا)یان لەشوێنی دا دانا، (محمدشا) بە پێچەوانەی باوکییەوە ئامادەی پێشکەش کردنی هەموو جۆرە هاوکارییەک بوو، کۆنگرەی (تاران) گرنگی خۆی هەبوو، چونکە ڕێگایەکی باشی بوو بۆ چاوپێکەوتنی ویلایەتە یەکگرتووەکان و بەریتانیا و یەکێتی سۆڤیەت. سەرەکیترین کێشە کە لەو کۆبوونەوانەدا خرایەڕوو، ڕووبەڕووبوونەوەی ئەڵمانیا بوو لە چەند بەرەیەکدا، لە کۆتاییدا ڕێکەوتن لەسەر کردنەوەی بەرەی ڕۆژئاوا. [٣]

ئەوەبوو لە (٦) کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٤٤) هێزەکانی هاوپەیمانان بە سەرکردایەتی جەنڕاڵێکی ئەمریکی بە ناوی (دوایت ئایزن هاور) کە دواتر بوو بە سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە هێزێکی (٢٠٠) هەزار سەربازیەوە بەرەو باکووری فەڕەنسا کشا و لە کەناری نۆرماندی دابەزی، زۆربەی ئەم هێزە ئەمریکی بوون، ئەوانەی تریش بەریتانی و کەنەدی و فەڕەنسی بوون پلانی ئەم کارەش بە گەورەترین هێرشی سەربازی دائەنرێ لە بەریتانیا، کە بووە هۆی

١ - عبدالوهاب القيسي واخرون:تاريخ العالم الحديث،ص١٧٢.

٢ - د.محمود السيد: س-پ، ل٩٩.

٣ - د.عبدالوهاب القيسي واخرون: س- پ، ل١٧٧.

ئـازادکردنی نـاوچەکە لە دەسـتی ئەڵمانیـا دوای ئەوەی زیـانێکی زۆر لە هەردوولا کەوت.[1]

لە بەرەی ڕۆژهەڵاتی ئەوروپاش هێزەکانی سۆڤییەت توانیان لە ساڵی (١٩٤٢) لە شـەڕی (سـتالینگراد) سـەرکەوتن بەسـەر هێزەکـانی ئەڵمانیـا بەدەسـت بهێـنن و گەورەترین زیانی ماڵ و گیانیان لێبدەن. بەڵام لە بەرەی ڕۆژئاواوە هاوپەیمانـان لە (تشرینی دووەمی ١٩٤٤)دا کەنارەکانی یۆنانیان داگیرکـرد و لە پێش کۆتـایی هاتنی هەمان ساڵدا ئازادیان کرد، هەروەها هێزەکانی ئەمریکا لە سەرەتای ساڵی (١٩٤٤)دا توانیـان چەند دورگەیەکی فیلیپین داگیر بکەن، دوا بەدوای ئەوەش سوپای ژاپۆن دوچاری شکستێکی تر بویەوە لە دروگەی (لیت).[2]

لە (٤)ی شـوباتی سـاڵی (١٩٤٥) ئەمریکـا و بەریتانیـا و یەکیەتـی سـۆڤییەت کۆبوونەوە و ڕێکەوتن لەسەر هێرشی کۆتـایی بۆ سـەر ئەڵمانیا، ئەوەبوو لە پێناو لەناوبردنی هێڵی بەرگری ئەڵمانیا لە (٨)ی شـوباتی (١٩٤٥) هێرشـی هاوپەیمانـان بە درێژایی بەرەی ڕۆژئاوا دەستی پێکرد، دواتر توانرا دەست بەسـەر هەردوو هێڵـی بەرگری ئەڵمانیادا بگرێ.[3]

بەم شـێوەیە ئەڵمانیـا نەیتـوانی بەرگـری لە شارەسـتانیەتەکەی خـۆی بکـات و هاوپەیمانـان لە خـۆرهەڵات و خۆرئـاوا گەشـتنە نـاوجەرگەی ئەڵمانیـا و هەمـوو بەرگریەکـی ئەڵمانەکـان لە نـاو چـوو، شـارەکانی ئەڵمانیـا خۆیانـدا بەدەسـت هاوپەیمانـانەوە، لە(٧) ئایـاری (١٩٤٥)دا دوای چەنـد جەنگێکـی تونـد وتیـژ بەرلـین خۆیـدا بەدەسـتەوە، لە (٨)ی ئایـاری (١٩٤٥)دا (جەنـڕاڵ یـودل) سـەرۆکی (هەیـئەی ئەرکـان)ی جەنـگ لە ئەڵمانیـا بەبێ هـیچ مەرجێک بەلێننـامەی خـۆبە دەستەوەدانی مـۆرکرد لەگەڵ (ئـایزن نهـاور)، لە هەمـان ڕۆژدا (هیـتلەر) خـۆی کوشـت، سـوپای ئیتاڵیـاش کە هاوپەیمـانی ئەڵمانیـا بـوو پـاش بەرگریەکـی زۆر لە ئەیلـولی (١٩٤٣)دا خۆیان بە دەستەوەدا، سوپای هاوپەیمانان هاتنەناو ئیتاڵیاوە،[4] دواجـار مۆسـۆلۆنی لە کۆتایی نیسانی ساڵی (١٩٤٥)دا دادگایی کراو هەر لەو ڕۆژەدا گولله بـاران کـرا. لە نیسـانی سـاڵی (١٩٤٥)دا سـەرۆکی ئەمریکـا کـۆچی دوایـی کـرد، لە (٢٦)ی

---

١ – لوقمان خەیالی: س– پ، ل٥٦.

٢ – خلیل علی مراد واخرون: س– پ، ل ٤٢١.

٣ – د.محمود السید: س–پ، ل١٠٥.

٤ – د.خلیل علی مراد واخرون: س– پ، ل ٤٢٣.

حوزەیرانی (١٩٤٥)دا دەوڵەتانی هاوپەیمانان و چین ئاگاداریان پێشکەش بە ژاپۆن کرد کە خۆی بدات بەدەستەوە پاش ئەوەی ژاپۆن ئەم داواکاریانەی ڕەتکردەوە، ئەمریکا بە سەرۆکایەتی ترومان (پاڵێوراوی پارتی کۆماری) لە (٦) ئابی (١٩٤٥)دا لە هێرشێکی ئاسمانیدا بۆ سەر شاری هێرۆشیمای ژاپۆن یەکەمین بۆمبی ئەتۆمیان بەسەر ئەو شارەدا خستە خوارەوە، پاش چەند ڕۆژێک دووەمین بۆمبیان بەسەر شاری ناکازاکیدا خستە خوارەوە، زیانەکانی ژاپۆن لە هێرۆشیمادا (٨٠) هەزار کوژراو زیاد لە (٢٠٠) هەزار کەس بێ سەروشوێن بوو، پاش ئەم هێرشانە حکومەتی ژاپۆن بە ڕەسمی خۆ بە دەستەوەدانی ڕاگەیاند، بەم شێوەیەش کۆتایی بە جەنگی دووەمی جیهانی هات.

جەنگی دووەمی جیهانی درێژخایەن بوو، چەکەکانی توندتر بوون بۆ لە ناوبردنی خەونە مرۆییەکان لە ڕووی ئاسایش و جێگیربوون و دڵنیایی ئاشتیەوە.[١]

ئەڵمانیا ناچاربوو پاش بەرگرییەکی زۆر خۆی بدات بە دەست هێزەکانی سۆڤییەتەوە، لە پێش ئەم ڕووداوە بەسێ ڕۆژ هەواڵی خۆکوشتنی (هتلەر) و کەوتنی ڕایخی سێیەم ڕاگەیاندراو بەرلین داگیرکرا، بەمەش سوپای ئەڵمانیا و ئیتاڵیا و باکووری ڕۆژئاوای ئەڵمانیا خۆیان بە دەستەوەدا، جەنەڕاڵ (جوول)سەرۆکی ئەرکانی جەنگی لە سوپای ئەڵمانیا بەپێی بەڵێنامەی خۆ بە دەستەوەدانی خۆی بە دەستەوەدا، لە مانگی ئابی (١٩٤٥) دوو بۆمبی ئەتۆمی لە شارەکانی (هێرۆشیما) و (ناکازاکی)دا و بەرگری ئەم وڵاتەی تێک شکاند.

ئەمەش دوای ئەوەی کە لە (٣)ی ئابدا (هاری ترومان) فەرمانیدا بە بەکارهێنانی بۆمبی گەردیلەیی بۆ چوار ئامانجی دیاریکراو (هێرۆشما، کوکورا، نبفاتاو ناکازاکی).[٢]

ئەوەبوو لە (٦)ی ئابدا بۆمبی یەکەمیان ڕەوانەی هێرۆشیماکرد و وێرانیان کرد لە پاش سێ ڕۆژ بۆمبی دووەمیاندا لە ناکازاکی، ئەم دوو بۆمبە زیانێکی گیانی و مادی زۆریان گەیاندە ژاپۆن کە مێژوو لەوەوپێش ڕووداوی وەهای بە خۆوە نەدی بوو. دوا ڕاپۆرتی کوژراوانی ئەو کارەساتە ژمارەی کوژراوەکان بە (٨٧٨٣٣) کەس

---

١ - د.محمود السيد:تاريخ اوربا والامريكتين،ص١٠١.

٢ - د. طليعة الصياح و راغب العلي: تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية، ص ٢٣٠.

دادەنێت، لەگەڵ بریندار‌بوونی (٥٢٢٦٦٤) کەسی تر، کە دواتر (٢٤٦٧٢٦) کەسی تریش لەم بریندارانە مردوون.[١]

جەنگی جیهانی دووەم بە یەکێک جەنگە گشتگیر و پڕ خەرجیەکانی مێژووی مرۆڤایەتی دادەنرێت، لەبەر فراوانی گۆڕەپانی شەڕەکە و زۆری و فراوانی بەرەکانی جەنگ، نزیکەی (٦٠) ملیۆن کەس لە سەرباز و مەدەنی بوونە قوربانی ئەم جەنگە کە ژمارەی قوربانییە مەدەنییەکان زیاتر بوو.

پسپۆڕان دەڵێن بە تەنها بودجە سەربازیەکان گەشتە (١١٠٠) ملیار دۆلار و زیانەکانی ئەم جەنگە گەیشتە (٢١٠٠) ملیار دۆلار، جگە لەوەی چەندین شار وێرانکران و خاک و کێڵگە کشتوکاڵییەکان سوتان و وێرانکران.[٢]

جەنگی دووەمی جیهانی بە هەموو کارەساتەکانیەوە نەیتوانی باوەڕ بە مرۆڤ بهێنێ و گرنگی ئازاد بوونێکی بنەڕەتی لە دێوەزمەی کوشتن و وێران کردن بخاتەپێش چاو، گومان و دوو دڵییەکانی ئەمڕۆ لە سەربازگە جیهانیەکان زیاترن لە دوێنی، ئەو چەکانەی کە مرۆڤ بەکاریان دەهێنێ ماڵ وێرانکەرترن لە چەکەکانی دوێنێ، ئەمڕۆ هیوابوون بە ئاشتی لە دوێنی تاریکترە.

ئەوەتا ئەمڕۆش جیهان لە هەڵگیرساندنی جەنگێکی نوێ دەترسێ کە ڕەنگە زەرەر و زیانەکانی هێندە زۆر بێ زیانی هەردوو جەنگی یەکەم و دووەممان لەبیربەرنەوە. بەڵام لەگەڵ ئەو گومانەشدا هێشتا هیوایەک هەیە بە چەند سەرکردە و مرۆڤ دۆستێک کە هەوڵ دەدەن و کاردەکەن لە دژی جەنگ و بانگەوازی ئاشتی دەکەن و هەوڵ دەدەن دڵەکان پاک بکەنەوە لە تۆوی ڕق و کینە و شۆڤێنستی.

بەو هیوایەی چیتر مرۆڤایەتی بەهای خۆی بۆ بگەڕێتەوە و چیتر مرۆڤ نەبێتە سوتەمەنی جەنگەکان و نەبێتە قوربانی بۆ چاوچنۆکی مرۆڤە شەڕانگێزەکان.

### ئەمریکا و ژاپۆن لە جەنگی دووەمی جیهانیدا

بایەخدانی زۆری ئەمریکییەکان بە خۆرهەڵاتی دوور دوای شۆڕشی سەربەخۆیی ئەو وڵاتە بوو، لەوکاتەوە بوو کە بازرگانەکانی نیوئینگلاند بازرگانیان لەگەڵ چیندا دەکرد. جەنگی جیهانی دووەم بۆ ئەمریکا هەڵێکی زێڕین بوو بۆ

---

١ - د.فوزي درويش:الشرق الاقصى،ص١٦١.

٢ - رمضان لاوند:جەنگی جیهانی دووەم،و.سەفین لاوچاک،چ١،سلێمانی،٢٠٠٧،ل٥٠٨.

دەستەبەرکردنی سامانە سروشتیەکان، ئەم وڵاتە کۆمەڵێک هاوپەیمانی هەبوو لە ماوەی جەنگ، ئەوانیش هەوڵیاندا بەرهەمهێنراوەکانیان زیاتر بەرهەم بهێنن و شوێنێک بدۆزنەوە بۆ فرۆشتنی.[١]

مەبەستی سەربازە ژاپۆنییەکان لە جەنگ دوورکەوتنەوەی گیانی نەیارە ژاپۆنییەکان لە چین بوو، هەروەها مەسەلەی گرنگی ڕۆژهەڵاتی ئاسیا لەبەر ئەوەی ژاپۆن دەیەویت ڕۆژهەڵاتی ئاسیا لە ژێر ڕکێفی خۆیدا بێت، بەمەش ژاپۆن هەڕەشەیەکی ڕاستەوخۆ بوو بۆ سەر ڕۆژئاواییەکان، کۆمپانیا نەوتییەکانی ئەمریکا و هەروەها کۆمپانیا بازرگانی و پیشەسازییەکان هەستان بە ئەنجامدانی چالاکییەکی فراوانی ئابووری لە ناوچەکانی دەریای ناوەراست و کەنداوی عەرەبی و زەریای هندی و چین، ئەم چالاکییە فراوانە ئابوورییە لە ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتدا بەپێشینەیەکی باش دائەنرا بۆ دانانی بناغەی سیاسەتێکی کراوە بۆ کێشەی ئاسیا، ژاپۆن ئارەزووی داگیرکردنی هەموو ئاسیای دەکرد.[٢]

سەرکردە ژاپۆنییەکان وایان دانابوو کە داگیرکردنی ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی ئاسیا دەبێتە هۆی ئەوەی ئەمریکا و بەریتانیا نەتوانن لەو شۆکە هەستنەوە تا دوای چەند ساڵێک، بەمەش ژاپۆن ئەتوانیت ئامادەکاری بکات بۆ داگیرکاریەکانی و هێزی ئابووری و سەربازی بنیات بنێتەوە، دواتر ئەتوانن لەگەڵ دوژمنەکانیان ڕێکەوتن بکەن.

ئەمریکا خۆی بە پارێزەری دیموکراتیەت دەزانی، هەربۆیە روزفێلت لە سەرەتای خولی سێیەمی دەسەڵاتیدا، ئەم وتەیەی ئاراستەی کۆنگرێس کرد (لە ڕاستیدا ڕێگای ژیانی دیموکراتی لەم کاتەدا و لە هەموو جیهاندا لە مەترسیدایە، بەداخەوە پێویستە بڵێم داهاتووی سەلامەتیمان لە هەموو شوێنێک لە مەترسیدایە) بۆیە داوای کرد بەرهەمی جەنگی زیادبکرێ بۆ ئەوەی ڕووبەڕووی دیکتاتۆرەکان بوەستنەوە.[٣]

نەخشە و پیلانەکانی ژاپۆن بۆ دەست بە سەراگرتنی ئابووری ناوچەکە، هاوشێوەی نەخشە و هەوڵەکانی ئەمریکا بوو کاتێک ویستی لە ڕووی سیاسی و ئابوورییەوە دەست بگرێت بەسەر ناوچەکانی دەوروبەری دەریای کاریبی و ئەمریکای ناوەڕاست، ژاپۆن بۆ پلانەکانی خۆی سوودی لەمە وەرگرت.

---

١ - موریس کروزیة: س-پ، ل٥٩.

٢ - د.اسماعيل احمد ياغي: معالم التاريخ الأمريكي الحديث، ص١٩٧.

٣ - د.فوزي درويش: س-پ، ل١٦٠.

ژاپۆنییەکـان خۆیـان بە ڕزگـارکەری گەلە ئاسـیاییەکان دەزانـی، بـۆیە جەنگی جیهانی دووەمیان بە هەلزانی و دروشمی (ئاسیا بۆ ئاسیاییەکان)یان بەرزکردەوە. هەربۆیە ژاپۆنییەکان بیریان لە کردنەوەی بازاڕێکی ئابووری ناوچەیی کردەوە، لە پێناو پێشکەوتنی هاوبەشـی ئاسـیای گەورە، بە شـێوەیەک بەرهەمەکانی ئەم بازاڕە لە ژێـر کـۆنترۆڵی خۆیانـدا بێـت، ژاپۆنییەکـان پروپاگەنـدەی ئەوەیـان دەکـرد کە دەیانەوێت بەم کارەیـان ئاسـیا و ئـابووری ئاسـیا لە ژێر کۆنترۆڵی ئەوروپییەکـان دەربهێنن. [1]

ئەمریکا گرنگی زۆری دەدا بە ناوچەکانی ئاسیا، لە دوای دەست بە سەرداگرتنی دوورگەی(هـاوای) ئەو بـایەخ پێدانە زیـاتر بـوو، لە سـاڵی (١٨٩٨- ١٨٩٩) ئەمریکـا بەهـۆی ئەوەی بـوو بە خـاوەنی فلیپین بـووە دراوسـێی هەریەکە لە چین و ژاپـۆن، بازرگانە ئەمریکییەکان هەستیان کرد هەل ڕەخساوە بۆ ئەوەی بازرگانی لەگەڵ ئەو ژمارە زۆرەی خەڵکی چیندا بکەن. [2]

دوورگەی(ریوکبیـو) تەوەرەی نـاکۆکی ئەمریکـا و ژاپـۆن بـوو، ئەمەش کـۆمەڵێ دوورگەیە لە شێوەی کەوانەیەکی گەورەدا درێژ دەبێتەوە لە باشـووری ڕۆژئـاوای دوورگەکانی ژاپـۆن لە دووری (٥٠٠میل)، ڕووبەری ئەم کۆمەڵە دوورگەیە دەگـاتە (١,٢٩٠) مل و دانیشتوانی دەگەشتە (٩٠٠,٠٠٠) نۆ سەد هەزار کەس. [3]

دوای ئەوەی ڕووسـیا هێـزی سـەربازی هەبـوو لە زەریـای ئارامـدا مەسـەلەی دەستگرتن بەسەر زەریای هادیدا لە لای ویلایەتە یەکگرتووەکان مەسـەلەی ژیان و مردن بوو, لەبەر ئەوە هەریەکە لە ئەمریکا و ژاپۆن هەوڵیان دەدا لە ڕێگەی جەنگی جیهانی دووەمەوە بەرژەوەندی و ئاواتەکانی خۆیان بهێننەدی لەم ناوچەیەدا. [4]

لەلایەکی تریشەوە کێشەی ڕاوکردنی ماسیش لە ئاوەکـانی بـاکووری ڕۆژ ئـاوای زەریـای هێمنـدا هەبـوو کاتێـک ژاپۆنییەکـان زۆر لێهـاتووبوون لەم ناوچـانەدا، بەڵام ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بوونی هەبوو لە باکووری ڕۆژهەڵات و باشووری ڕۆژئاوا و باکووری ڕۆژئاوای زەریای هێمندا.

---

١ – د.عبـدالعظیم رمضـان:تأریخ اوروبـي والعـالم فـي العصـر الحدیث،الهیئـة المصـریة العامـة للكتـاب، القاهرة،١٩٩٣، ص١٤٥.

٢ – محمد عبدالغنی:جوگرافیا و پەیوەندییە سیاسیە نێو دەوڵەتیەکان،و.د.جەزا توفیق تالب و ئەحمەد علی ئەحمەد، چاپخانەی حەمدی،سلێمانی،٢٠٠٥،ت٢٩٤.

٣ – د.محمد متولي و د.محمود ابو العلاء:الجغرافیة السیاسیة،مكتبة الانجلو المصریة،القاهرة،١٩٨٦،ص٤٨٦.

٤ – كارلهاینتس دشنر: تاریخ الولایات المتحدة، ص ٣٦٠.

ئەمریکا هەمیشە دژی بەرژەوەندییەکانی ژاپۆن بوو لەو ناوچانەدا, هەروەک (کورد هێل) وەزیری دەرەوەی ئەمریکا ڕایگەیاند کە مەرامی ژاپۆن دژی ناوەڕۆکی پەیماننامەی (کۆلدج بریان) و دژی بنەماکانی پەیوەندییە نێودەوڵەتیەکانە. [1]

**پێکدادانی سیاسی و ئابووری نێوان ئەمریکا و ژاپۆن**

لە (٥) ئۆکتۆبەری ساڵی (١٩٣٧) روزفێلت لە شیکاگۆ وتارێکی خوێندەوەو تیایدا ئیدانەی کارەکانی ژاپۆنی کرد و داوای کرد ئابلۆقەی ئابووری و سیاسی بخرێتە سەر هەرسێ دەوڵەتی (ئیتالیا و ئەڵمانیا و ژاپۆن) و پەیوەندییە سیاسیە دەرەکیەکانیان سنووردار بکرێت، ئەمەش بە هۆی هێرشی ژاپۆنەوە بوو بۆ سەر مەنشوریا. [2]

ئەمەش وای لە ژاپۆنییەکان کرد ئەگەر بارودۆخی خۆیان نەگۆڕن، ڕووبەڕووی ئایندەیەکی تاریک دەبنەوە، بۆیە هەوڵیاندا سەروەرییەکی هەرێمی بۆ خۆیان دروست بکەن. ژاپۆنییەکان لەو بڕوایەدا بوون ئەو ڕێگایە بواری ئەوەیان بۆ دەرخسێنێ بەرەنگاری هەڕەشەکانی بەریتانیا و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ببنەوە. [3]

کاتێک حکومەتی ژاپۆن لە (٢٣)ی یۆلیۆی (١٩٤١) هەستا بە فراوان کردنی داگیرکارییە سەربازییەکانی لە هندی چینی (فەڕەنسیدا)، لە ڕۆژی (٢٦)ی یۆلیۆ حکومەتی واشنتن وەڵامی ئەمەی دایەوە بە بڕیاری قەدەغەکردنی هەموو ناردەنیەکان بۆ ژاپۆن و بلۆک کردنی موڵک و ماڵی ژاپۆنییەکان لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا. [4]

پێشتریش ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا یاسایەکی دانا بەپێی ئەم یاسایە، کۆچ کردنی کرێکارە ژاپۆنییەکانی بۆ ئەمریکا قەدەغەکرد, هەروەها ئەمریکا وەک وەڵام دانەوەیەک بۆ ئەو کارانەی کە ژاپۆن کردبووی لە داگیرکردنی مەنشوریا و لێدانی بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا لە چین ئەو ڕێککەوتنە بازرگانییەی ڕەتکردەوە کە لە ساڵی (١٩١١) لە نێوان ئەمریکا و ژاپۆندا مۆرکرابوو.

---

١ - بدون مؤلف:موجز التاريخ الأمريكي،ص١٣٩.

٢ - عبدالعزيز سليمان نوار واخرون: تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية،ص٢٠٨.

٣ - د.محمد ئیحسان: ململانیە نیودەوڵەتیەکان لە سەدەی بیستەم دا، ل١٣٥.

٤ - بدون مؤلف:موجز التاريخ الأمريكي،ص١٤٣.

بەڵام روزفێلت ئامادە نەبوو تەنها لە پێناو چیندا مەتریسەکانی جەنگ لەگەڵ ژاپۆندا قبوڵ بکات، پاشان ویلایەتە یەکگرتووەکان ڕێگەی نەدا بە ناردنی نەوت و ئاسن بۆ ژاپۆن، ئەمەش وەک هەماهەنگی و پەیوەست بونێک بوو بۆ هاوپەیمانەکان (یەکییەتی سۆڤییەت ، فەرەنساو بەریتانیا). [1]

کاتێک لە چیندا کارە شەڕەنگێزییەکانی ژاپۆن جۆرێک لە ئاژاوە و ڕق لێبونەوەیان هەژاند، چونکە ژاپۆنییەکان بەرژەوەندیەکانی ئەمریکای نەپاراست، بووە هۆی ئەوەی کە پەیوەندیەکانی ئەمریکا و ژاپۆن زیاد لە چەند بۆنەیەکدا گرژی و ئاڵۆزی بە خۆیەوە ببینێت.لە (١٦)ی دیسەمبەری ساڵی (١٩٤١)دا روزفێلت سەرۆکی ئەمریکا داوای لە ئیمپراتۆری ژاپۆن کرد کە کار بکەن بۆ پاراستنی ئاشتی، ژاپۆنیش وەفدێکی ڕەسمی نارد بۆ واشنتن بۆ چارەسەرکردنی ناکۆکیەکانیان بە شێوەیەکی ئاشتیانە، بەڵام ژاپۆن بە نهێنی هەستا بە هێرش کردنەسەر کەشتیەکانی ئەمریکا لە دوورگەی(پیرل هاربر). [2]

کاتێک (تشیانج کای شک) سکاڵای پێشکەش بە کۆمەڵەی گەلان کرد، کۆمەڵەی گەلان بڕیاریدا لە ساڵی (١٩٣١) ژاپۆن پابەند بێت بە کشانەوەی هێزەکانی لەو زەویانەی کە داگیری کردووە، بەڵام ژاپۆنییەکان هەوڵیاندا بارودۆخی جەنگی جیهانی دووەم بقۆزنەوە بۆ بەدەست هێنانی خواستە داگیرکارییەکانیان لە ناوچەی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا. [3]

هەر بۆیە ژاپۆن چاوی بڕییە سەر هندی چینی و ئەندەنوسیا, ئەم دوو ناوچەیە کەوتبوونە ژێر دەسەڵاتی فەرەنسا و هۆڵەندا، هندی چینی دەرامەتێکی گەورەی هەبوو لە لاستیک و خەڵوز و ئاسن و... هتد. [4]

ڕۆژ بەڕۆژ بارودۆخی ڕۆژهەڵاتی دوور خراپتر دەبوو ئیتر ئەمریکا بڕیاریدا بە هیچ شێوەیەک نەوت بە ژاپۆن نەفرۆشێت.پەیوەندییەکانی ئەمریکا لەگەڵ بەریتانیادا دەربارەی کرداری سیاسی هاوبەش لە زەریای هێمندا زیادی کرد و بەستنی بەڵێنی

١ - د.صلاح احمد هريدي:دراسات في التاريخ الأمريكي، ص ٢٨٩.

٢ - د.اسماعيل احمد ياغي: معالم التاريخ الأمريكي الحديث، ص٢٠٤.

٣ - د.خليل على مراد واخرون: س- پ، ل ٤٠٦.

٤ - د.خليل على مراد واخرون:دراسات في التاريخ الاوروبي،ص٤٠٦.

ئەنگلۆ ئەمریکی لێکەوتەوە، ژاپۆن هەوڵیدا حکومەتی لاوازی (فیشی) ڕازی بکات بۆ ئەوەی ڕێگەی پێبدات بۆ بە کارهێنانی فرۆکەخانەکانی هندی چینی فەڕەنسی.[1]

ئەم حکومەتە بێ هێزەش داواکارییەکەی پەسەند کرد، بەڵام چاوچنۆکی ژاپۆن بەمەوە نەوەستا، بەڵکو هێزەکانی بەرەو ناوچەکانی باکووری هندی چینی فەڕەنسا بزواند. توانی ڕێگای بۆرما کە یارمەتی پێدا دەڕۆشت بۆ چین بگرێت، ئەم هەوڵە فراوانخوازییەی ژاپۆن لە پێناو بونیادنانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆژهەڵاتی گەورەدابوو، کە خەونی لە مێژینەی ژاپۆنییەکان بوو لەو پێناوەشدا تێدەکۆشان.[2]

حکومەتی ئەمریکی سووربوونی خۆی لەسەر بەرهەڵستکاری کردنی ئەم دەست بە سەراگرتنەی ژاپۆن لە خۆرهەڵاتی دوور پێشاندا، بۆ ئەم مەبەستەش لە ماوەی پازدە مانگدا پەنای بردەبەر هۆ و پێناوی (فشاری ئابووری)،پەیوەندیەکانی نێوان ئەمریکا و ژاپۆن جۆرێک لە ئاڵۆزی و نائارامی لە خۆگرت بە شێوەیەکی گشتی بووە هۆی پێکدادانی بەرژەوەندییەکانی هەردوو دەوڵەت بە تایبەت لە ناوچەکانی ئەوپەری ڕۆژهەڵاتی ئۆقیانوسی هێمن، ژاپۆنییەکان هەستیان بە ئاڵۆزی بارودۆخەکە کرد، بەڵام بۆ بەدی هێنانی ئامانجەکانیان هەستان بە بەستنی ڕێکەوتننامەیەک لەگەڵ وڵاتە یەکگرتووەکاندا بۆ نزیک بوونەوەی بیروبۆچوونەکانیان، لە ساڵی (١٩٤١)دا گفتوگۆی نێوان ئەدمیراڵی ژاپۆنی (فومور و) و وەزیری دەرەوەی ئەمریکا (کوردل هل) بۆ چەند مانگێک بەردەوام بوو، بەڵام وڵاتە یەکگرتووەکان سووربوو لەسەر کشانەوەی ژاپۆن لە چین و هندی چینی، لە کۆنگرەی ئیمپراتۆری لە (٢)ی یۆلیۆی ساڵی (١٩٤١) ژاپۆن بڕیاریدا بەجێ بەجێکردنی پلانەکەی دەربارەی هندی چینی ئەگەر ئەنجامەکەی جەنگیش بێت لەگەڵ ویلایەتە یەکگرتووەکاندا.[3]

سەرکردە سەربازییە ژاپۆنییەکان درکیان بە نەزۆکی هەوڵەکانیان کرد، بۆیە بڕیارياندا پەنا بۆ شەڕ بەرن، دەستیان کرد بەجێ بەجێکردنی پلانی شەڕ لە کاتێکدا لە واشنتن گفتوگۆ دوو لایەنیەکان بێ سەرکەوتن بەردەوام بوون.

ژاپۆنییەکان بەردەوام بوون لە داگیرکردنی ناوچەکان، ئەوەبوو لە شوباتی ساڵی (١٩٤٢) سەنگافورە و ئەندەنوسیاشیان خستەژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە، حکومەتی

---

١ - بدون مؤلف:موجز التاريخ الأمريكي،ص١٣٨.

٢ - د.محمود السيد:تاريخ اوربا والامريكتين،ص٩٧.

٣ - د.فوزي درويش: س- پ، ل ١٥٦.

ژاپۆن بەکردەوە دەستی بەسەر هەموو ناوچە کەناراوییەکانی چیندا گرتبوو، لە پێناو زیادکردنی ئاواتەکانی بەرەو دەریاکانی باشووری هندی چینی و هندی هۆڵەندی،سوودی وەرگرت لە داگیرکردنی ئەڵمانیا بۆ زەویە نزمەکان و هەرەس هێنانی فەرەنسا. [1]

ئەمریکییەکان خۆیان لە ئاراستەی جەنگی ئەوروپا دەپاراست، بەڵام ڕۆڵی زۆریان لە ڕۆژهەڵاتی دووردا هەبوو، ژاپۆن دانانی (سیاسەتی نویێ)ی ئاشکرا کردو بە هەموو توانایەکیەوە هەوڵی دەدا بۆ دەسەڵاتداریێتی لە سەرانسەری ڕۆژهەڵاتی دوور و زەریای هێمندا، بەریتانیاش لە بارودۆخێکی وەهادانەبوو بتوانێت بەرگری بکات ، بۆیە دەستی بە کشانەوەی هێزەکانی کرد لە شەنگەهای. [2]

ئەمریکا بەرهەڵستیەکی گەورەی بۆ چاوچنۆکیەکانی ژاپۆن بۆ ئەندەنوسیا پێشاندا، ئاگاداری کردەوە لە هەر هەوڵدانێکی بۆ داگیرکردنی، ژاپۆنیش وەڵامی ئەم ئاگادارکردنەوەیەی دایەوە بەوەی کە بەلێننامەیەکی ئیمزاکرد لە بەرلین لەگەڵ ئەڵمانیا و ئیتاڵیا لە ئەیلولی ساڵی (١٩٤٠)دا. [3]

روزفێلت حەزی دەکرد سزایەکی ئاقڵکەرانەی ئابووری بەسەر ژاپۆنیەکاندا بسەپێنێ، لە سۆنگەی دەست درێژی کردنیان بۆ سەر باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا. لەبەر ئەوەی ناکۆکییەکان گەشتە ئەوپەڕی لە ڕۆژهەڵاتی دوور، ژاپۆن بە شێوەیەکی فەرمی چووە ڕیزی وڵاتانی (محور) و هەوڵیدا بۆ جێ بەجێکردنی سیاسەتە نویێ یەکەی کە ناوی لێ نابوو (سیستەمی نویێ)، ئەیان ویست لە پشت ئەو سیاسەتە نوێیەوە دەست بگرن بەسەر ڕۆژهەڵاتی دووردا. [4]

هارۆڵد ئایکز یەکێک لە وەزیرەکانی ئەوکاتەی حکومەتی ئەمریکا، لە دەفتەری یادەروەرییەکانیدا نوسیویەتی لە یەک کاتەدا باوەڕم وایە باشترین ڕێگا بۆ بەشداری کردن لە جەنگی جیهانی دووەم، ڕاگەیاندنی جەنگە لەگەڵ ژاپۆندا. بە تایبەت دوای هێرشی ژاپۆن لە (٧)ی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٤١)دا بۆسەر بەندەری (پیرل هاربر)، دوای ئەوەی ئەمریکا ڕاستی هێرشەکەی بۆسەر دوورگەی(پیرل هاربر) بۆ دەرکەوت، روزفێلت نامەیەکی ئاڕاستەی کۆنگرێس کرد

---

١ - د.صلاح احمد هريدي: س- پ، ل ٢٩٠.

٢ - فرنسيس فريدمان: موجز التاريخ الأمريكي،ص١٦٤.

٣ - د.خليل علي مراد واخرون: س- پ، ل ٤٠٦.

٤ - د.اسماعيل احمد ياغي: معالم التاريخ الأمريكي الحديث، ص٢٠٢.

و ئەمەش نامەکەی بوو: (دوێنێ لە (٧)ی کانوونی دووەمدا مێژوو بە پەڕەیەکی ڕوو ڕەش و ئابڕ وبەر دەنوسرێتەوە، بە شێوەیەکی کتوپڕ هێرش کرایەسەر ویلایەتە یەکگرتووەکان کە بەرلەوە لەلایەن هێزە دەریایی و ئاسمانیەکانی ئیمپراتۆری ژاپۆن ئامادەیی بۆ کرابوو) هەربۆیە هێزەکانی ئەمریکا بیریان لەوە دەکردەوە پێش ئەوەی ئەڵمانیا بڕوخێنن دەبێت تۆڵەی خۆیان لە ژاپۆن بکەنەوە. هەر لە هەمان ڕۆژدا کە ژاپۆنییەکان پەلاماری بنکەی بیرل هاربریاندا، فرۆکەکانیان هێرشێکی تریان کردەسەر فرۆکەخانە ئەمریکیەکان لە فلیپین و زیانێکی گەورەی لێکەوتەوە، لە هەمان ڕۆژیشدا ژاپۆنیەکان هێزەکانیان لە تایلاند دابەزاند، ودوای تەنها یەک ڕۆژ گیرا. [1]

لە بەرەبەیانی ڕۆژی دوای هێرشی بیرل هاربر لە (٨)ی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٤١)، روزفێڵت سەرۆک کۆمار لە کۆنگرێسی ئەمریکا ئامادەبوو و بە شێوازێکی خەماوی ڕایگەیاند (ژاپۆن هێرشێکی نامەردانەی کردۆتەسەر سوپای ئەمریکا لە ئاسیا) و لەهەمان کاتدا داوای لەکۆنگرێس کرد، جەنگ لە دژی ژاپۆن ڕابگەیەنن. [2]

روزفیڵت دەیزانی جەنگ لە دەرگای دەدات، دواتر بەریتانیای هاوپەیمانی ئەمریکا، دەستی کرد بە هێرشی بەردەوام بۆ سەر ڕێگای هاتووچۆی ژاپۆن بە مەبەستی لە ناوبردنی هێزەکانی ژاپۆن لە مایۆی ساڵی (١٩٤٢) ژاپۆنەکان بۆ بەدەست هێنانی چەند ئامانجێکی ستراتیژی و ئابووری هەستان بە هێرش کردنە سەر نیوە دورگەی میلانۆ چەند بەرەیەکیان کردەوە، لە یەک کاتدا لە مارسی ساڵی (١٩٤٢) بە تەواوی غینیای نوێ و دوورگەی سلێمان داگیرکرا، لە (٨)ی ئازاری ساڵی (١٩٤٢) هێزە دەریاییەکانی ئەمریکا لە جەنگی (دەریای کۆڕاڵ) پێشڕەوی ژاپۆنیەکانیان وەستاند و بە شێوەیەکی کاتی ئۆستراڵیایان لە مەترسی هێرشی ژاپۆنیەکان ڕزگارکرد. [3]

ژاپۆنیەکان بە خێرایی زنجیرەیەک سەرکەوتنی سەر سورهێنەریان بەدەست هێنا کە ئەندەنوسیای هۆڵەندی و فلیپین و ملقا و بە شێکی گەورەی بۆرمای دەست کەوت. لە هاوینی ساڵی (١٩٤٣) سەرکەوتنەکانی ژاپۆن شکستێکی کەمی توش بوو کە بووە هۆی وەستاندنی ژاپۆن لە بەرەوپێش چوون. [4]

---

١ – د. طليعة الصياح و راغب العلي: تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية، ص ٢١٤.

٢ – د.رأفت غنيمى الشيخ: أمريكا والعالم، ص ١١٧.

٣ – ديب علي حسن: س–پ، ل٢٨٦.

٤ – فرحات زيادة وابراهيم فريجي:تاريخ الشعب الأمريكي،ص٣٢٧.

له ساڵی (١٩٤٣)، بەریتانیەکان هێرشەکانیان بۆ سەر سوپای ژاپۆن و هێڵەکانی گەیاندنی لە بۆرمادا چڕتر کردەوە، توانیان لە سەرەتای ساڵی (١٩٤٥) ئەو ڕێگەیە ئازاد بکەن، ژاپۆن لە بۆرما و مەلایۆ شکستی هێنا. لە سەرەتای ساڵی (١٩٤٤)دا دوای هێرشێکی چڕ وپڕی هێزەکانی ئەمریکا بە سەرکردایەتی جەنەڕاڵ (دۆگلاس مارک ئارپهر) بۆ سەر غینیای نوێ توانیان کۆمەڵێک دوورگە داگیر بکەن. ئەوەبوو دوای ئەم هێرشانە ئەمریکا لە جەنگی دەریایی دژ بە ژاپۆندا لە هەردوو دەریای مەرجان و میراویدا سەرکەوت.[1]

لە تشرینی دووەمی ساڵی (١٩٤١) ئەمریکیەکان لە واشنتن (کۆرۆزۆی) نێردراوی ژاپۆنیان بە پێشنیارەکانی ئەمریکا سەبارەت بە چارەسەرکردنی قەیرانی نێوان هەردوو وڵات ئاشناکرد، بەڵام ژاپۆن ئەو پێشنیارانەی ڕەتکردەوە. ئەفسەری ژاپۆنی (میتسو فوشیدا) دەڵێت: (ڕۆژی یەکی کانوونی یەکەم، بڕیاری ڕاگەیاندنی جەنگ لە کۆنگرەی ئیمپراتۆریدا لە تۆکیو بە شێوەیەکی نهێنی درا، پاشان لە ڕۆژی دوایدا فەرمان درا بە سەرکردایەتی گشتی، کە کاتی (سفر) ڕۆژی هەشتی کانوونی یەکەم بە کاتی ژاپۆن، بەرامبەر بە حەوتی کانوونی یەکەم بە کاتی دورگەی هاوای و ئەمریکا بێت).[2]

بەم شێوەیە دوای هەڵمەتی هێزە ئاسمانیەکانی ژاپۆن بۆ سەر بیرل هاربر، کۆنگرێسی ئەمریکی حاڵەتی شەڕی ڕاگەیاند لە دژی ژاپۆن، دوای سێ ڕۆژ هەریەک لە ئەڵمانیا و ئیتاڵیاش جەنگیان دژی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ڕاگەیاند. دواتر هەریەک لە ئەڵمانیا و ئیتاڵیا و ژاپۆن بوونە بەرەیەکی دژ بە شیوعیەت و وڵاتە ڕۆژئاواییەکان، ئەوانیش بەریتانیا و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بوون و چین و یەکێتی سۆڤیەت چوونە پاڵ ئەمریکا و بەردەوام لە شەڕەکاندا سەرکەوتنیان بە دەست ئەهێنا. ئەوەبوو لە (٦)ی یۆنیۆی ساڵی (١٩٤٤) هێزەکانی هاوپەیمانان بە سەرکردایەتی جەنەڕاڵی ئەمریکی (داویت ئایز نهاورد)، لە کەنارەکانی (نۆرماندی) لە فەرەنسا دابەزین و زیاتر لە (٢٠٠) دووسەد هەزار سەربازبوون، زۆربەیان ئەمریکی و ئەوانی تر بەریتانی و کەنەدی و فەرەنسی بوون.[3]

---

١ - فرانكلن اشر: س-پ، ل١٧٤.

٢ - تشارلز وماری بيرد:تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية،ج٢/ص٢٦٧.

٣ - كارلهاينتس دشنر: تاريخ الولايات المتحدة، ص ٣٦٠.

لە (٧)ی ئایاری ساڵی (١٩٤٥) بەبێ هیچ مەرجێک سەرۆکی هەیئەتی ئەرکانی جەنگ لە ئەڵمانیا بەڵێننامەی خۆ بە دەستەوەدانی واژووکرد لەگەڵ سوپاسالاری جەنگ (ئایز نهاورد)، بەم شێوەیە جەنگ لە بەرەی ڕۆژئاوا کۆتایی پێهات و هاوپەیمانان ڕوویان کردە بەرەی ڕۆژهەڵات بۆ جەنگان لە دژی ژاپۆن.[١]

لە تشرینی یەکەمی ساڵی (١٩٤٤) هیزەکانی ئەمریکا دابەزینە دوورگەی (لیت)، لە سەرەتای ساڵی (١٩٤٥)دا توانیان دەست بەسەر (لدسون)دا بگرن، دواتر چوونە نێو شاری (مانێلا)ی پایتەختی فلپین. لە ماوەیەکی کەمدا توانیان دەست بەسەر تەواوی دوورگەکانی فلیپیندا بگرن، بەم شێوەیە هێزەکانی ئەمریکا وورده وورده لە دوورگەکانی ژاپۆن نزیک دەبوونەوە، لە ئازاری ساڵی (١٩٤٥) چوونە نێو دوورگەی (ئەوجیما) دواتریش چوونە نێو دوورگەی (ئەوکیناوا)، لە (٢٦)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٤٥) کۆنگرەیەک بەسترا لە (پۆتسدام) لەم کۆنگرەیەدا داوا لە ژاپۆن کرا بەبێ هیچ مەرجێک خۆی بدا بەدەستەوە یان بە شێوەیەکی یەکجاری کاول دەکرێت.[٢]

بەڵام ژاپۆن ڕازی نەبوو بەخۆ بە دەستەوەدان، تا ئەمریکا لە ئابی ساڵی (١٩٤٥)دا، لە ڕێگەی هاویشتنی دوو بۆمب، کە یەکەمیان لە هێروشیما کەوتە خوارەوە، دووەمیان لە ناکازاکی، لە ئەنجامدا ئیمپراتۆریەتی ژاپۆن ناچاربوو خۆی بەدەستەوە بدات.[٣]

لە (٢٢) حوزەیراندا، سەرکردەی هێزی ژاپۆنی خۆی کوشت و و ژمارەی کوژراوە ژاپۆنییەکانیش بە زیاتر لە (١٣٠) هەزار کەس مەزەندە دەکرێت و لە بەرامبەریشدا زیانەکانی سوپای ئەمریکی (١٣) هەزار کوژراو و (٣٧) هەزار بریندار بوو.لە ڕۆژی (١)ی ئەیلولی ساڵی (١٩٤٥) کە یادەوەری داگیرکردنی پۆڵەندایە ئیمپراتۆری ژاپۆن ناچار بوو بێ هیچ مەرج و بیانوویەک جەنگ ڕابگرێت و. بۆیە لەو یادەدا لەسەر پشتی کەشتی ئەمریکی (میسۆری) لە بەرامبەر کەناری تۆکیۆ لە نگەری گرتبوو، بەرپرسەکانی ژاپۆن ڕێکەوتنی خۆ بەدەستەوەدانی وڵاتەکەیان ئیمزاکرد و کۆتایی بە جەنگی جیهانی هات، کە بە گەورەترین کارەساتی مرۆڤایەتی دادەنرێت لە مێژووی کۆن و نوێدا.[٤]

---

١ - د.محمود السيد:تاريخ اوربا والامريكتين،ص١٠٤.

٢ - د. طليعة الصياح و راغب العلي: تاريخ الولايات المتحدة الأمريكية، ص ٢٢٩-٢٣٠.

٣ - د.خليل على مراد واخرون: س-پ، ل٢٨٥.

٤ - لوقمان خەیاڵی: س-پ، ل٥٠.

## جەنگی سارد

لە پاش تەواو بوونی جەنگی دووەمی جیهانی لە ساڵی(١٩٤٥) سیاسەتێکی نوێ هاتە کایەوە، ئەویش سیاسەتی (دەوردان)بوو. ئەمەش چەمکێک بوو لە چەمکەکانی جەنگی سارد، مێژوونووس و دیپلۆماتی ئەمریکی (جۆرج کینان) کە ئەو کات باڵوێزی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بوو لە یەکێتی سۆڤیەت، بە نووسینی وتارێک لە گۆڤاری (فورین افیرز) لە مانگی یۆنیۆی ساڵی(١٩٤٧)دا، لە ژێر کاریگەری تیۆری ترومان ، چونکە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەو کاتەوە تا ئێستا لە چوارچێوەی سیاسەتەکانی دەرەوەی ئەمریکا ڕێگە بە پیادەکردنی سیاسەتی گۆشەگیری نادات، بەڵام لە پاش تەواو بوونی جەنگی دووەمی جیهانی و سەرهەڵدانی جەنگی سارد لە زۆربەی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا ئەم سیاسەتە (واتە سیاسەتی ئابڵوقەدان) پیادە دەکرا، چونکە سیاسەتی دەوردان لە بەرهەمەکانی عەقڵی سیاسی سەردەم بوو، پاش ئەوەی سیاسەتمەداران کەلێنێکیان بەدیکرد لەنێوان دیالۆگی دیبلۆماسی و بەرەگاربوونەوەی سەربازی، ئەویش سیاسەتی دەوردانە، کە خۆی لەخۆیدا ڕووبەرووبوونەوەیەکی نادیار و شەڕێکی ڕاستەقینەی شاراوەیە،[1] بەرنامەکانی ئەم سیاسەتە لە دەستی ئەو لایەنەیە، کە سیاسەتی ئابڵوقەدان پیادە دەکات و بەرامبەرەکەی ناچار دەکات بە قایل بوون بە زۆربەی داواکارییەکان بە ئامانجی دەرچوون لەو قەیرانە بە کەمترین زیان، هاوکات خاوەن بەرنامە دەتوانێت باشترین و بەهێزترین گورزەکانی خۆی بوەشێنێت بەبێ ئەوەی خۆی ڕاستەوخۆ بەشداری ئەو بەرەنگاربوونەوانە بکات، هاوکات بە ئاسانی ئامانجەکانی خۆی بپێکێت و دوژمن ناچار بکات بە مەرجەکانی خاوەن ئەو سیاسەتە قایل بێت، بۆ نموونە لە ئەوروپا فشارێکی جیاواز سەریهەڵدا، کاتێک شۆڕشگێڕە شیوعییەکانی گوندە چیاییەکانی باکوور و ڕۆژئاوای یۆنان هەوڵیدا شکست بە حکومەتی نیشتیمانی یۆنان بهێنن، هەرچەندە بەریتانییەکان تا ماوەیەک توانییان کۆنترۆڵی ئەو بارودۆخە بکەن، بەڵام کاتێک بەریتانیا لە ساڵی (١٩٤٦) بڕیاری کشانەوەی هێزەکانی خۆیدا لە یۆنان، دووبارە بڵێسەی شۆڕش بە هاندانی

---

١ - دانیال ف.دافیز- نورمان لنجر: تاریخ الولایات المتحدة منذ ١٩٤٥،تر. عبدالحلیم ابراهیم الابیض،الدار الدولیة للنشر والتوزیع، القاهرة،١٩٩٠،ص٤٤.

ولآتە دراوسێ شیوعییەکانی یۆنان وەک (ئەلبانیا ، یۆغسلافیا و بولغاریا) لە دژی حکومەتی یۆنان سەریهەڵدا، لەم کاتەدا بەریتانیا لەئەنجامی دەرچوونی لە جەنگی دووەمی جیهانی و کشانەوەی هێزەکانی لە ناوچەکە، نەیتوانی هیچ هاوکارییەک پێشکەش بە حکومەتی یۆنان بکات. [1]

لە سەرەتای ساڵی(١٩٤٧) ئەمریکیەکانی ناو یۆنان واشنتۆنیان لە پێشهاتە نوێیەکانی ناوچەکە ئاگادارکردەوە بەتایبەت فشاری شیوعییەکان بۆ سەر یۆنان و مەترسی ڕووخاندنی حکومەتی یۆنان و هاوکات فشاری سۆڤێت بۆ سەر تورکیا سۆڤیەت هەوڵی دەدا فشار بخاتە سەر تورکیا،بەئامانجی قایلکردنی ئەو ولآتە بۆ ڕێگەدان بەهاتووچۆکردنی کەشتیەکانی – بازرگانی و سەربازی – لە ئاوەکانی دەردەنیل و بسفۆردا، ئەگەر هاتوو یەکێتی سۆڤێت لەم کارەی سەرکەوتوو بێت، بە تایبەت لە ڕۆژهەلآتی دەریای ناوەڕاست، ئەوا سەرچاوەی هەرسێ کیشوەرەکە (ئەوروپا ، ئاسیا و ئەفەریقا) بۆ خۆی کۆنترۆڵ دەکات. [2]

(دین انشسون) کە وەکیلی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا بوو، وتی(سۆڤیەت مەترسیدارترین سەرکێشی دەکات لە مێژوودا) هەروەها وتی (تەنها ئێمە دەتوانین ئەم یارییەیان لێ تێکبدەین)، ئەوەبوو سەرۆکی ئەمریکا (ترومان) پرۆژەیەکی پێشکەشی کۆنگریسی ئەمریکی کرد بە بڕی (٤٠٠)چوار سەد ملیۆن دۆلار وەک یارمەتی سەربازی بۆ هەر یەک لە (تورکیا و یۆنان) و لە ماوەی (١٠) ڕۆژدا کۆنگریس ڕازیبوو بە پرۆژەکەی ترومان، کە بە تیۆری ترومان ناسرا، بەمەش تورکیا و یۆنان لە ئەنجامی هاوکارییەکانی ئەمریکا لە دەرەوەی دەسەلآت و هەژموونی یەکێتی سۆڤیەتدا مانەوە. [3]

ئەم سیاسەتەی (دەوردان) کە ئەمریکا لە دژی یەکێتی سۆڤیەت گرتیەبەر لە پاش تیورەکەی ترومان وتارکەی (کینان) بوو، چونکە (کینان) لە درێژەی وتارەکەیدا ئامۆژگاری ئەمریکای دەکرد، کە ڕاستەوخۆ بە جەنگ ڕووبەڕووی یەکێتی سۆڤیەت نەبێتەوە، بەڵکو لەگەڵ حەزە فراوانخوازییەکانی یەکێتی سۆڤێت

---

١ – د.ئاراس فەریق زەینەڵ: ئۆباما و پرسە هەستیارەکان،ل١٣٢.

٢ – دانیال ف.دافیز- نورمان لنجر:سەرچاوەی پێشوو،ل٤٥.

٣ – د.ئاراس فەریق زەینەڵ: س- پ، ل١٣٤.

سیاسەتێکی درێژخایەن و تایبەتمەندو ژیرانە پیادە بکات، کینان پێی وابوو ئەم حەزانەی سۆڤیەت و نەبوونی یەکێتی ناوخۆیی وردە وردە زەمینە دەرخسێنێت بۆ ڕوخاندن و مێژوویش ئەو ڕاستی و بۆچوونەی کینانی سەلماند و لە ساڵی(١٩٩٠) لە ناو خوێدا لێکهەڵوەشا و ڕووخا. [1] ئەمەی باسمان لێوە کرد لە سەدەی ڕابردوودا ڕوویدا، ئایا ئۆباما و ئیدارەی نوێی ئەمریکا بۆ ئەم سەدە نوێیە خۆیان لە چوارچێوەی سیاسەتی دەرەوە چی لە هەگبەیاندایە بۆ گەڵنی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئەفریقیا و جیهانی سێهەم بەتایبەت عێراق و ئێران، لە ڕاستیدا ئۆباما هەر لە کاتی هەڵمەتی هەڵبژاردنەکانییەوە تا ئەمڕۆ پیادەکردنی سیاسەتی گفتوگۆ و دیبلۆماسیەتی بۆ چارەسەرکردنی قەیرانە نێودەوڵەتییەکان و خاڵە جیاوازەکانی نێوان ئەمریکا و وڵاتانی تری جیهان بە تایبەت کۆماری ئیسلامی ئێران پێ باشە و ئامادەیی خۆی نیشاندا تا ڕاستەوخۆ لەگەڵ سەرۆکی ئێران گفتوگۆ بکەن، هەرچەندە ئەم لێدوانەی لە لایەن نەیارەکانی لە نێو ئەمریکادا ببووە هۆی ئەوەی ڕەخنەی توندی لێبگیرێت، بەڵام ئۆباما وەڵامی دانەوە وتی ((ئێران ، فەنزوێلا وکوبا)) وڵاتی بچوکن لە چاو یەکێتی سۆڤیەت و مەترسیەکانی لە کاتی شەڕی سارد لەسەر بەرژەوندییەکانی ئەمریکا لە جیهان، ئەوەش بوو لەگەڵ یەکێتی سۆڤێت دانیشتین وگفتوگۆمان کرد، لێردا ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە سەرۆکی نوێی ئەمریکا دەگەڕێتەوە بۆ سیاسەتی جۆرج کینان، کە سیاسەتی دەوردانە بەرامبەر بە ئێران لە جیاتی ڕووبەڕووبونەوەی ڕاستەوخۆ وەک ئەوەی لە عێراق و ئەفغانستان ڕوویدا، بەوەش ئاشتی و ئارامی باڵی کێشا بەسەر وڵاتانی ئەورووپای ڕۆژهەڵاتدا، یەکێتی سۆڤیەت ڕووخاو جەنگی سارد کۆتایی پێهات. [2]

ئەگەر نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم سیمای توند وتیژی پێوە دیاربێ، ئەوا دیارترین شت لە نیوەی دووەمدا ڕوونەدانی جەنگی جیهانی سێیەم بوو لە جێی ئەوە جەنگی سارد هاتە ئاراوە.

جەنگی سارد بریتی بوو لە کێشمە کێشی ڕامیاری و ئابووری و ئایدۆلۆجی و پێشبڕکێی پڕچەک کردنی دوو وڵات یان چەند وڵاتێک بوو، لەگەڵ جەنگی دەروونی

---

١ - دانیال ف.دافیز- نورمان لنجر: تاریخ الولایات المتحدة منذ ١٩٤٥، ص٤٦.

٢ - د.ئاراس فەریق زەینەل: س- پ، ل١٣٦-١٣٧.

و ڕاگەیاندن بەبێ ئەوەی سەرباز یا چەکی تێدا بەکاربێت، واتە جەنگی سارد دوژمنایەتیەکی شاراوەی لە پەیوەندی نێوان دەوڵەتان دروست کرد، بەڵام بەرەو جەنگێکی ڕاستەقینە پەلکێشی نەکردن، ئەم زاراوەیەش (جەنگی سارد) لە پاش جەنگی دووەمی جیهانی سەرەتا بە کێشمەکێشی نێوان (بلۆکی ڕۆژهەڵات) و (بلۆکی ڕۆژئاوا) وتراوە.[1]

جەنگی سارد ناگەڕێتەوە بۆ ململانێیەک، بەڵکو بۆ سەردەمێکی مێژوویی دەگەڕێتەوە، ئەو سەردەمەش دروست بوون و بەردەوام بوونی چاخی مۆدێرنەیە لەگەڵ شۆڕشی فەڕەنسی و پیشەسازی کە لە کۆتایی سەدەی هەژدەهەمدا دەستی پێکرد، ئەگەر چی وڵاتە یەکگرتووەکان و یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو لە ماوەی جەنگی دووەمی جیهانیدا بە سەرکردەی هاوپەیمانان لە دژی هێزە یەکگرتووەکان لە قەڵەم دەدران، بەڵام ڕێک پاش کۆتای هاتنی جەنگەکە یەکێتیەکەیان گۆڕا بۆ ڕووبەڕووبوونەوەیەکی درێژخایەن و ئەم ناکۆکیەش بە بیانوی پاراستنی ئاسایش و بەرپەرچدانەوەی سۆشیالیستی پەردەی دەخرایە سەر، ئەم ململانێیەش لە نێوان ئەم دوو زلهێزەدا (دیاردەیەکی جیهانی) بوو، چونکە بە شێوەیەکی ئاسۆیی بەسەر هەموو جیهاندا بڵاوببۆیەوە، هەربۆیە لەم ماوەیەدا جیهان بەسەر دوو بلۆکدا بەش بوو لەگەڵ ئەوەشدا چەند وڵاتێک بەبێ لایەنی مابوونەوە.[2]

## دابەشبوونی سیاسی جیهان

## یەکەم: بلۆکی ڕۆژهەڵات

بلۆکی ڕۆژهەڵات بە هەموو وڵاتە کۆمۆنیستەکانی ڕۆژهەڵاتی ئەوروپا و ڕۆژهەڵاتی ئاسیا دەگوترا کە پەیڕەویان لەیەک ڕێبازی سیاسی و کۆمەلایەتی دەکرد، بەر لە جەنگی جیهانی دووەم ئەم زاراوەیە تەنها بۆ یەکێتی سۆڤیەت و پانزە کۆماری فیدراڵی ئەو وڵاتە بەکاردەهات، بەڵام پاش جەنگ هەموو ئەو وڵاتانەی دەگرتەوە کە لە بواری سیاسی و کۆمەڵایەتیەوە خاوەن ڕێبازێک بوون و پەیڕەوییان لە سیستەمی سۆسیالیستی دەکرد و پێک هاتبوون لە (یەکێتی سۆڤیەت،

---

١ - دانیال ف.دافیز- نورمان لنجر: س- پ، ل٤٧.

٢ - هەمان سەرچاوە.

ئالبانیا، پۆلۆنیا، چیکۆسلۆفاکیا، ڕۆمانیا، یوگوسلاڤیا، هەنگاریا، بولگاریا، ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات لە کیشوەری ئەوروپا، کۆریای باکوور و ڤیتنام لە کیشوەری ئاسیاو کوبا لە کیشوەری ئەمریکا). بلۆکی ڕۆژهەڵات ماوەیەک لە دوای جەنگی جیهانی دووەمیش خاوەنی یەکێتی سیاسی و خاوەنی هێز و دەسەڵات بوو، بەڵام یوگوسلاڤیا بە هۆی سیاسەتی تایبەتی ناوخۆیی سەرۆک کۆماری وڵات لە ساڵی (١٩٤٨) وازی لەم بلۆکە هێنا، هەرچەندە لە ڕووی ئایدۆلۆژیەوە بە بەشێک لەم بلۆکە دادەنرا. [1] ئەم دەوڵەتانە بیرۆکەی شۆسیالیستی واتە سیستمێکی کۆمۆنیزمیان هەڵگرتبوو لە دوای جەنگی دووەمی جیهانی یەکێتی سۆڤیەت یەکەمین وڵات بوو درێژە پێدەری بیرۆکەی سۆشیالیستی ئۆکتۆبەری بوو، لە دوای ئەویش مەنگۆلیا بەم شێوەیە لە سەرەتای پەنجاکانەوە زاراوەی ئۆردوگای سۆسیالیزم سەریهەڵدا، واتە لە ماوەی جەنگی سارددا بە جیهاندا بڵاوبۆیەوە وەک جەمسەرێکی ململانێ بەرامبەر جەمسەری ڕۆژئاوا واتە (سەرمایەداری). [2]

یەکێتی سۆڤیەت خاوەنی هێزی ئەتۆمی و تایبەتی خۆی بوو، بۆیە ڕۆژئاوا وای دەبینی لە یەک کاتدا ڕووبەڕووی دوو مەترسی دەبێتەوە، یەکەمیان مەترسی هێرشی ڕامیاری سۆسیالیزم لە ناوچەکانی ژێردەسەڵاتی و ناوەندەکانی دەسەڵاتی، دووەمیان مەترسی هێرشی ناوەکی بوو. [3]

لێرەوە جەنگی خۆپارێزی شێوەی خۆی وەرگرت، ئەویش بە دانانی پلانێک بۆ لە ناوبردنی هێزی بەرامبەر (دژ)، چینش ئەوکاتە هاتبووە مەیدان، پارتی کۆمۆنیستی چین وەک شۆڕشێکی دیموکراتی ڕزگاری ڕۆڵی گەورەی دەبینی لە ململانێکاندا، هەر بۆیە لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا چین بوو بە کەرەستەی هێزی سەربازی نەک یاریگایەک بۆ هەردوو زلهێزە جیهانیەکە، دەست ڕۆیشتنی یەکێتی سۆڤیەت بەسەر کۆریای باکوور و فلپین بۆی هەبوو گەمارۆدانی چینی لێبکەوێتەوە، ئەمە جگە لەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە درێژایی ئەو

---

١ - ادونيس العكرة: من الدبلوماسية الى الاستراتيجية (أمثولات من الحرب الباردة، دار الطليعة،الطبعة الاولى، بيروت،١٩٨١،ص٥٠.

٢ - هەمان سەرچاوە،ل٥١.

٣ - بول- ماري دولا غورس: الامبراطورية الاخيرة،تر.هيثم سرية، دار علاء الدين، الطبعة الثانية، دمشق، ٢٠٠٧، ص٢٠.

ماوەیە بۆ بەرژەوەندییەکانی خۆی هەوڵی یارمەتی دانی چین و ژاپۆنی دەدا، هەربۆیە لە دوای دەسەڵات گرتنەدەستی (خرۆشۆف) لە یەکێتی سۆڤیەت کێشمەکێشی نێوان یەکێتی سۆڤیەت و چین زیادی کرد لەبەر ئەوە یەکێتی بلۆکی ڕۆژهەڵات هەڵوەشایەوە و تا ئەمڕۆش چین و سۆڤیەت خۆیان بە دوژمنی یەکتر دەزانن، هەر بۆیە دەسەڵاتی سۆڤیەت لە ئەوروپای ڕۆژهەڵاتیش لە ساڵی (١٩٨٩) کۆتایی هات و یەکێتی سۆڤیەتیش لە ساڵی (١٩٩١) هەڵوەشایەوە. [١]

یەکێتی سۆڤیەت لەو ماوەیەدا جگە لە کێشمەکێش لەگەڵ چین و وڵاتانی تریشدا ناکۆک بوو، هەربۆیە ئەلبانیاش بەرامبەر بە یەکێتی سۆڤیەت دەستی دایە چەند سەرکێشیەک و ڕۆمانیاش لە سیاسەتی دەرەوەدا کەم تا زۆر سەربەخۆ بوو، ئەمە جگە لەوەی لە مەجەڕ و جیکۆسلۆڤاکیا چەند جارێک شۆڕشی خوێناوی ڕوویدا، هەموو ئەمانەش ئاوابوونی بلۆکی ڕۆژهەڵاتی لێکەوتەوە. [٢]

## دووەم: بلۆکی ڕۆژئاوا

بلۆکی ڕۆژئاوا بە وڵاتانی ئەوروپای ڕۆژئاوا و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دەگوترێ کە خاوەنی سیستمی سەرمایەدارین و زۆربەیان ئەندامی ناتۆن، واتە لە وڵاتانی بەریتانیا و فەرەنسا و ئەڵمانیای ڕۆژئاوا و کەنەدا پێک هاتبوو، ئەم ناولێنانەش بەرامبەر بلۆکی کۆمۆنیستی (بلۆکی ڕۆژهەڵاتە)، بۆیە ئەم وڵاتانە هاوپەیمانیەتی و بەرەیەکی سیاسی و سەربازیان بەرامبەر ئەو بلۆکە پێک هێنا. [٣]

وڵاتانی (سوید) و (سویسرا)ش لەم کێشمەکێشمەدا بێ لایەنی خۆیان ڕاگەیاند، بەڵام کاتێک دەڵێن (بلۆکی ڕۆژئاوا) ڕاستە زۆر جار وڵاتانی دەستنیشان کراو لە ئاسیا و ئەفەریقا و ئەمریکی لاتین دەکرێتەوە، بەڵام مەبەست لە جیاکردنەوەی ئەو وڵاتانە لە ڕووی دابەشکردنی ئایدۆلۆژی و سیاسی بۆ دژایەتی کردنە لەگەڵ بلۆکی ڕۆژهەڵات. [٤]

---

١ - د.محمد ئیحسان: س- پ، ل ١٤٣.

٢ - د.عبدالعزیز سلیمان نوار واخرون:تاریخ الولایات المتحدة الأمریکیة،ص٢٣٠.

٣ - مایکل نورثکوت:الملاک یوجة العاصفة،تر.د.عبدالعزیز الشیخ،مکتبة الشرق الدولیة،الطبعة الاولی، القاهرة،٢٠٠١،ص٤٣.

٤ - کارلهاینتس دشنر: تاریخ الولایات المتحدة، ص ٤٠١.

ئەمەریکا لەم قۆناغەدا بە پێچەوانەی سیستمی کۆمۆنیستی بلۆکی رۆژهەلات بایەخی بە دیموکراسی دەدا، کۆمەک و یارمەتیدانی بۆ دیموکراسی لەوەوە سەرچاوەی گرتبوو ئەمریکا بە نیازی بە هێزکردنی بلۆکی ڕۆژئاوابوو دژی پەلهاویشتنی سۆڤیەت، ئەمەریکا هەوڵی دەدا ڕۆڵی هاوسەنگی هێز ببینێ لە ئەوروپا کە پێشتر و تا ئەوکاتە بەریتانیا ئەو ڕۆڵەی دەبینی، بەلام لە دوای ئەوەی لە ساڵی (١٩٤٧) بەریتانیا نەیتوانی قەیرانی یۆنان کۆنترۆڵ بکات و داوای کۆمەکی لە ئەمریکا کرد، بەم شێوەیە هاوسەنگی هێز کەوتەدەست ئەمریکا، هەربۆیە پرۆژەی (مارشاڵ) لە ساڵی (١٩٤٧) و بنەمای ترومان و دامەزراندنی ناتۆ لە ساڵی (١٩٤٩)دا بە ئامرازێکی ئاشکرای ڕۆڵی نوێی ئەمریکا دادەنرێ.[١]

هۆکاری گەورەی ململانێی سۆڤیەت و ڕۆژئاوا رەت کردنەوەی بەرێوەبردنی دیموکراسی بوو لەو هەرێمانەی لە ژێردەستی سوپای نازیدا بوون و سۆڤیەت لە جەنگدا دەستی بەسەردا گرتبون، ئەمە لە کاتێکدا ڕێبەرانی دەوڵەتانی دیموکراسی واتا (بلۆکی ڕۆژئاوا) بۆ چارەسەرکردنی گرفتەکان پەنایان بردۆتە بەر گفتوگۆ و دانوساندن و ڕێگەی بەکارهێنانی چەکیان نەکردبوو بەنەریت.[٢]

ئەمریکا هەر لە کۆتایی جەنگی دووەمی جیهانیەوە ستراتیژیەتی نێودەوڵەتی (جیهانی) پەیرەو دەکات و بڕێکی زۆر سەرمایەی خەرج کرد بۆ بلاوکردنەوەی سەرمایەدرای لەو ولاتانی تردا بە تایبەت لە ژاپۆن  و ئەڵمانیا.

شان بە شانی ئەمەش پێشکەوتنی دیموکراسی لە دەرەوەی جیهانی کۆمۆنیست زیاتر دەبوو، لە حەفتاکاندا چەند ولاتێکی ئەوروپا وەک (ئیسپانیا ، پورتوگال و یۆنان) دیموکراسیان لە مێزگرت، پاشان هەر لە حەفتاکاندا سیستمی دیموکراسی لە هەندێ ولاتی ئەمریکای لاتین چەسپا، لە کۆتایی هەشتاکانیشدا تاکە ولات مایەوە لە مەیدانەکەدا (کوبا) بوو، هەر بۆیە هەر بەگۆڕانێکی لەم چەشنە هەر لە سەرەتاوە کاریگەری لە سەرسیتمی سەرمایەداری (بلۆکی ڕۆژئاوا) هەبووە و لە هەموو قۆناغەکاندا بەرەوپێشی بردووە.[٣]

---

١ – بدون مؤلف:موجز التاريخ الأمريكي،ص١٤٨.

٢ – هنري روبرتس:روسيا وامريكا،تر.شكري علاوي، المؤسسة الاهلية،بيروت، ١٩٥٦،ص١٤.

٣ – محمد عزيز شكري:الاحلاف والتكتلات في السياسة العالمية،عالم المعرفة،الكويت،١٩٨٧،ص٤٣.

## قۆناغەکانی جەنگی سارد

جەنگی سارد وەک هەموو جەنگەکانی تر بە ماوە و کاتێکی دیاریکراودا تێپەڕبووە، هەربۆیە دەتوانین ماوەی جەنگی سارد بەسەر چەند قۆناغاغێکدا دابەش بکەین لەوانە:

**قۆناغی یەکەم:** سەرەتای جەنگ (١٩٤٥- ١٩٥٣)ز

ترسان لە یەکێتی سۆڤیەت لە لایەن ئەمریکاوە پێویستی بەوە بوو بانگەشەی جەنگێکی خۆ پارێزی بکات، واتە خۆ پارێزی ناوخۆیی، سیاسەتی ئەمریکاش لەو ماوەیەدا بە سیاسەتی (ناوبرەکی ئاسنین) ناسرابوو، (جۆرج کینان) دای ڕشتبوو لە شێوەی وتارێکدا پێشکەشی کرد و تیایدا ڕوونی کردەوە دەسەڵاتی سۆڤیەت لە فراوانبووندایە ئەگەر ئەمریکا کارێک نەکات بۆ ڕێگرتنی، کاتێکیش (ترومان) لە کانوونی یەکەمی (١٩٤٦) ڕاپۆرتەکەی پێگەیشت لە وتارێکدا لە بەردەم کۆنگرێسدا بەم شێوەیە دوا:

(ئەو سەرکەوتنەی بە دەستمان هێناوە لە مەترسیدایە، پێویستە لەسەر گەلی ئەمریکی وریابن لە بەرپرسیارێتی جیهان)، لێرەوە دەرکەوت ترومان ئامانجی سیستمێکی جیهانیە لەسەر بنەمای ئەمریکا بۆ ئەو سیستمە. [1]

## پەیوەندییەکانی نێوان ئەمریکا و یەکێتی سۆڤیەت

لەمەڕ ئەو پەیوەندییانە کۆمەڵێک فاکتەر بوونە هۆی ئاڵۆزبوون و تێکچوونی پەیوەندییەکانی نێوانیان لەوانە:-

### یەکەم: ئەڵمانیا

بۆ بە ئەنجام گەیاندنی لێک گەیشتن لە نێوان سۆڤیەت و ئەمەریکا کێشەی زۆر هەبوو، کە لە ڕووی سیاسیەوە دەبوو چارەسەر بکرێن لە سەروو هەمووشیانەوە کێشەی ئەڵمانیا بوو، لە کۆتای جەنگی دووەمی جیهانیدا هەردوولا لەسەر ئەوە ڕێکەوتن نابێ بهێڵین ئەڵمانیا ببێتەوە بە مەترسی بۆسەر سۆڤیەت یان ئەمریکا. [2]

---

١ - د.محمد محمد صالح واخرون: الدول الكبرى،ص٣٢٦.

٢ - د.محمد ئيحسان: س- پ، ل ١٥٤.

ئەمریکاو سۆڤیەت لە کۆبوونەوەی (مالّتا)دا لەسەر ئەوە ڕێککەوتن ئەلّمانیا بیست ملیار دۆلار قەرزی شەڕ بداتەوە و لەو ڕێژەیەش (١٠) ملیار دۆلاری بۆ سۆڤیەت بێت و لە داهاتی کەرتی ئەلّمانیای ڕۆژئاوا بدریّ، بەلاّم ترومان ڕایگەیاند ئەگەر پارە لە ئاوەدان کردنەوەی ئەلّمانیای ڕۆژئاوا مایەوە ئەوسا دەدریّ بە سۆڤیەت ئەگەر نا با لە ئەلّمانیای ڕۆژهەلاّتی وەرگریّ کە خۆی داگیری کردووە، بەم شێوەیە ئەمریکا و سۆڤیەت لەسەر ئاوەدان کردنەوەی ئەلّمانیا لە یەکتری دابڕان. [1]

## دووەم: ژاپۆن

لە دوای جەنگی دووەمی جیهانی نوێنەری (٥٢) دەولّەت کۆبوونەوە و کۆنگرەیەکیان بەست لە (پۆستدام) کە (٤٨) دەولّەت ڕەزامەندییان لەسەر سەر بە بەخۆی ژاپۆن دەربڕی، سۆڤیەتیەکان داوای کەرتێکیان لە ژاپۆن دەکرد، بەلاّم ترومان ڕایگەیاند سۆڤیەت درەنگ گەیشتۆتە ئەویّ ، بۆیە دەبێت بیّ بەشبن و کەرتیان پیّ نادریّ، هەر بۆیە ئەمریکا کۆمەکی پێشکەش بە ژاپۆن کرد بۆ خێرا چاککردنەوەی ئابوورییەکەی تاببێت بەنموونەیەکی درەوشاوەی سەرمایەداری و دیواریّ بێت لە بەردەوام بلاّوبوونەوەی سۆسیالیزم. [2]

## سێیەم: ڕۆژهەلاّتی ناوەڕاست

ڕۆژهەلاّتی ناوەڕاست گرنگیەکی زۆری هەیە و هەموو دەولّەتەکانی بە یەکترییەوە بەستراونەتەوە و گرنگی خۆیان هەیە، بۆیە ناکریّ لە ڕووداوێک لەڕووداوەکان جیابکرێتەوە، هەموو هێزەکان جا ئەوەی لە ناوخۆدا دروست بووە یا لە دەرەوەی ناوچەکە دروست بووە هەولّیان داوە دەسەلاّتی خۆیان بەسەر ناوچەکەدا بسەپێنن.

بەریتانیا پێش جەنگ لە ڕۆژهەلاّتی ناوەڕاست بالاّدەست بوو، بەلاّم لە دوای جەنگ گۆڕانکاری زۆر هاتە ئاراوە، یەکێک لەوانە لە قۆناغی یەکەمی جەنگی ساردا ناوچەکانی کەنداوی فارس و ولاّتی ئێران لەبەر هۆکاری ستراتیجی و سامانی

---

١ - بدون مؤلف:موجز التاريخ الأمريكي،ص١٥٨.

٢ - د.عبدالعزيز سليمان نوار واخرون: س- ث، ل ٢٥٤.

نەوت و کانزا ڕووبەڕووی چاوتێبڕینی یەکێتی سۆڤیەت بوویەوە، بەڵام ئەمریکا لەو کاتەدا جێگەی بەریتانیای گرتەوە بۆیە ڕێگەی لە هەوڵە فراوانخوازییەکانی سۆڤیەت گرت. [1]

### چوارەم: ئەتۆم

سەرهەڵدانی چەکی ئەتۆم لە کۆتایی جەنگی جیهانی دووەمدا کاریگەری گەورەی هەبوو لەسەر گۆڕان و تەنانەت هەڵوەشانەوەی هەندێک لە پلانە ستراتیژیەکان، لەو بەرواره بە دواوە باس لە ستراتیژی ئەتۆمی دەکرا کە جیاوازە لە ستراتیژیە کلاسکیەکان،

(روزفیلت) سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بڕیاریدا یەکێتی سۆڤیەت لە بوونی بۆمبی ئەتۆمی ئاگادار بکاتەوە، هەر بۆیە لە کۆنگرەی پۆتسدامدا ترومان بەستالینی ڕاگەیاند ئەمریکا بۆمبی ئەتۆمی هەیە، بەڵام ستالین ئەو هەواڵەی بەلاوە ئاسایی بوو چونکە پێشتر لە ڕێی سیخورەکانیەوە ئەوەی بیستبوو. [2]

کاتێکیش ولاتە یەکگرتووەکان لە ساڵی (١٩٤٦) پڕۆژەی (باردخ)یان پێشکەشی نەتەوە یەکگرتووەکان کرد، تا نەتەوە یەکگرتووەکان چاودێری چەکی ئەتۆمی بکات، ستالین ئەو پڕۆژەیەی ڕەتکردەوە چونکە دەیوسیت بۆمبە تایبەتیەکەی خۆی دروست بکات. [3]

### قۆناغی دووەم: لە نێوان ساڵانی (١٩٥٣- ١٩٧٠)

ئەم قۆناغە لە (١٩٥٣ تا ١٩٧٠) درێژەی کێشا لەم قۆناغەدا ئەمریکا و سۆڤیەت بۆ جارێکی تر بە شێوەیەکی توندتر ڕووبەڕووی یەکتر بوونەوە، جارێکیان لەسەر بابەتی (کوبا) و جارەکەی تر لەسەر بەرلین لە هەردوو حاڵەتەکەدا سۆڤیەت تووشی قەیرانی نامۆ بویەوە و گەر چی سەرکەوتنەکانی نامۆ بوو، بەڵام دەستکەوتەکانی سۆڤیەت زۆرتر بوون. [4]

---

١ - د.محمد ئیحسان: س- پ، ل ١٥٥.

٢ - هەمان سەرچاوە.

٣ - د.محمد ئیحسان: س- پ، ل ١٥٥.

٤ - دانیال ف.دافیز،نورمان لنجر:تاریخ الولایات المتحدة منذ ١٩٤٥،ص٢٠٠.

لەم قۆناغەدا بەرلین دابەشکرا، ئەوەبوو (فرۆچونی) لەگەڵ کەنەدیدا لە کۆنگرەی (ڤیەننا) تێک چوون و فرۆچۆن ڕایگەیاند بەم زووانە کێشەی بەرلین چارەسەر دەکات، ئەوەبوو سەر لە بەیانی (١٣)ی ئابی (١٩٦١) هەزاران هاولاتی ئەڵمانیای خۆرهەڵات بەرەو ڕۆژئاوای بەرلین کشان، ئەوەبوو سەربازانی ئەڵمانیای خۆرهەڵات بە چەندین تۆپ و تەلی دڕکاوی و بلۆکی کۆنکرێتی و پیک و خاکەناز لە ناو ئۆتۆمبیلە سەربازییەکان هاتنە دەرەوە و بەرلینیان دابەشکرد. [١]

کوباش ئەوکاتە ناوچەیەک بوو بۆ موشەکەکانی سۆڤیەت ئەمەش بارگرژی لە نێوان ئەمریکا و سۆڤیەتدا زیاتر کردبوو تا ئەوکاتەی لە (١٩٦١- ١٩٦٣) ڕێکەوتنێک بەستراو لە وێدا دەوڵەتەکەی (کەنێدی) دانی بە سیستمی سۆڤیەت دانا لە کوبا و سۆڤیەتیش موشەکەکانی خۆی لە کوبا کشاندنەوە. [٢]

هەریەکە لە سۆڤیەت و ئەمریکا لە سالانی شەستەکان بەدواوە توانایەکی تەواویان لە چەکی ئەتۆمی بە دەست هێنابوو، بەمەش ئەگەر هەر ڕووبەڕوو بوونەوەیەکی ڕاستەوخۆ لە نێوانیاندا ڕوویبدایە کێشەی گەورەی لێ دەکەوێتەوە، هەروەها هەردوو وڵات هەوڵیاندەدا لە وڵاتانی جیهانی سێیەمدا هێزو پێگەی خۆیان زیاتر بکەن و بۆ سەرکەوتنیان لەم جەنگەدا دەیانویست سود لە توانا مرۆیی و سروشتیەکانی ئەو وڵاتانە وەربگرن و ململانێکانیان بگوازنەوە بۆ خاکی ئەو وڵاتانە. [٣]

هەر لەم قۆناغەدا ناکۆکی نێوان هندوچین لە ساڵی (١٩٦٤) گۆڕا بۆ جەنگێکی گەورە، هەروەها پەرەسەندنی ستراتیژی (دژە کرداری سنوردار) لەلایەن ناتۆوە لە ساڵی (١٩٦٧)دا بابەتێکی جێی قسە و باس بوو بەڵام وردە وردە ئەم ستراتیژە بە تەواوی جێگەی خۆی لە بەرنامەڕێژی بەرگری ڕۆژئاوادا کردەوە، لە ئاکامدا (ستراتیژی دژەکرداری) سنووردار وەک ژێرخانێکی تیۆری لە گەڵی لەو گۆڕانکاریانەی ڕوویاندا کاری لە (ستراتیژی و هێزەکانی ناتۆ- ئەمریکا کرد). [٤]

---

١ - لوقمان خەیاڵی: س- پ، ل٦٤.

٢ - د.عبدالعزیز سلیمان نوار واخرون: س- ث، ل ٢٥٥.

٣ - فرانکلن اشر: س- پ، ل ١٨٥.

٤ - د.عبدالعزیز سلیمان نوار واخرون: س- ث، ل ٢٦٠-٢٦١.

## قۆناغی سێیەم: لە نێوان ساڵانی (١٩٧٠- ١٩٩١)

قۆناغی سێیەمی شەڕی سارد لە دەیەی (١٩٧٠)وە دەست پێدەکات، توندی هێرشەکانی سۆڤیەت وماندوبوونی لە ڕادەبەدەری ئەمریکا لە شەڕی ڤێتنام و کەمبوونەوەی گرژی و ئاڵۆزییەکانی نێوان ئەمریکا و چین لە تایبەتمەندیە گرنگەکانی ئەم قۆناغە بوون.

لە دوای (١٩٧٠)شەوە بەرنامەڕێژی بەرگری ئەمریکا وردە وردە ناوچەکانی دەرەوەی خاکی ئەورووپای خستە بەرنامەی کاری خۆیەوە، لە ئەنجامی ئەمەدا لە دوای ساڵی (١٩٧٥) پەیوەندییەکانی ئەمریکا و سۆڤیەت بە شێوەیەک بوو هەندێک پێیان وابوو هەمان تایبەتمەندییەکانی قۆناغی سەرەتای جەنگی سارد دووبارە بۆتەوە، بۆیە بە جەنگی ساردی نوێ یان (جەنگی ساردی دووەم) ناویان دەبرد.[1]
هێرشەکانی سۆڤیەت بۆ سەر ئەفغانستان لە مانگی کانوونی یەکەمی (١٩٧٩) نموونەی دیاری جەنگی ساردی دووەمە، چونکە ئەمریکا ناچاربوو لەم قۆناغەدا پشتیوانی لە سیاسەتی کوشتنی ڕاستەوخۆی سەربازەکانی سۆڤیەت بکات.

ئەم جەنگە گرنگ بوو لەم قۆناغەدا، چونکە ئیدارەی (ڕیگان) مۆرکێکی ئایدۆلۆژیای کرد بەبەر جەنگدا و هەواڵگری ئەمریکیش هەموو ئەو گروپانەی پەراوێز خست کە لایەنگری نەتەوەیی بوون، لە بەرامبەردا هاریکاری ئەو گروپانەی کرد کە لە لایەنگری ئەمریکا بوون، ئەمەش لەبەر ئەوەی نەوەک دانوستان لەگەڵ سۆڤیەتدا بکەن لە ماوەی جەنگیشدا ئیدارەی ڕیگان تۆڕێکی ڕاهێنانی بۆ ئەو بزووتنەوانە دانا کە دژی سۆڤیەت بوون.[2]

هەر لەم قۆناغەدا لە ساڵی (١٩٨٥) گۆرباشۆف گۆڕانی بەسەر سیاسەتی ستراتیکی و ئامانجە سیاسی و ئاسایشەکانی سۆڤیەتدا هێنا، بەڵام ئەم ڕیفۆرمانە نەک ژیانێکی دووبارەی بەسەر سۆڤیەتدا نەهێنا، بەڵکو خاڵە لاوازەکانی ئەم سیستمەی زیاتر دەرخست، ئەم گۆڕانەش بێ ئەنجام بوو، لەم کاتەدا ئەمریکا بڕیاریدا موشەکە دوور هاوێژەکانی خۆی لە وڵاتانی ئەورووپای ڕۆژئاوادا جێگیر بکات و لەوێوە خاکی سۆڤیەت لە بەرامبەر هێرشە چاوەڕوان نەکراوەکەیدا بداتە

---

١ - هنری کیسنجەر:ئایا ئەمریکا پێویستی بە سیاسەتی دەرەوە هەیە،و.کەمال نوری،چاپخانەی حەمدی، سلێمانی،٢٠٠٥،ل٤٤٩.

٢ - د.محمد ئیحسان: س- پ، ل ١٧٠.

بەر هێرش و پەلامارەکانی خۆی، ئەنجامی بە فیرۆچوونی سەرمایەیەکی زۆر بە هۆی کڕینی چەکەوە و نەرمی نواندنی سۆڤیەت بەرامبەر ئەو بزووتنەوانەی لە ژێردەستی دابوون و دەرکەوتنی سەرکردەی نوێ ی کۆمۆنیستی و ڕیفۆرمخوازتر بووە هۆی نزیک بوونەوەی ڕووخانی سیستمی کۆمۆنیستی، پاش ئەمەش لە ئاکامی ئەو ئاڵۆزی و توند وتیژیەی لە ئەوروپای ڕۆژهەڵات و ناوەندا ڕوویدا لە ساڵی (١٩٨٩) بلۆکی ڕۆژهەڵات (کۆمۆنیزم) لەبەریەک هەڵوەشایەوە، بەمەش لە کانوونی یەکەمی (١٩٩١)دا بە ڕەسمی یەکێتی سۆڤیەت لەبەر یەک هەڵوەشاندنەوە.[١]

لە کۆتاییدا دەتوانین بڵێین بە درێژایی سەدەی بیستەم هەردوو دەوڵەتی (ڕووسیا و ئەمریکا) پەیوەندییەکی ئاڵۆز و دژ بەیەک لە نێوانیاندا هەبوو، هەردوو دەوڵەت لە جەنگی جیهانی یەکەمدا و بەدوای یەکدا لەبەرەی وڵاتانی هاوپەیمانانددا دژی وڵاتانی میحوەر شەڕیان کرد، بەڵام لە دوای جەنگی جیهانی یەکەم و لە ماوەی نێوان هەردوو جەنگدا پەیوەندی نێوانیان ئاڵۆز و دژ بەیەک بوو، ئەمەش بەهۆی جیاوازی بەرنامە و سیستمی سیاسی و ئابووری هەردوو وڵات بوو.

بەڵام بە هەڵگیرسانی جەنگی جیهانی دووەم و گەورەبوون و فروانبوونی مەترسیەکانی ئەڵمانیای (نازی) لەسەر تەواوی مرۆڤایەتی و (فاشی) لە ئیتاڵیا و دەسەڵاتی (سەربازی) لە یابان وایکرد ئەم دوو وڵاتە ببنەوە هاوپەیمان و پێکەوە لەیەک بەرەدا کاربکەن بۆ کەمکردنەوەی و سنوردارکردنی مەترسیەکانی ئەڵمانیا و هاوپەیمانەکانی و لەناوبردنی ئامانجە فراوانخوازییەکانیان، لەم پێناوەشدا ئەمریکا لە ڕێگەی خاکی ئێرانەوە هاوکارییەکی بێ شوماری دەوڵەتی ڕووسیای کرد، بۆ ئەوەی لەبەردەم هێرشی هەمەلایەنەی ئەڵمانیادا خۆی بگرێت، بەڵام ئەم هاوکارییانە نەبوونە سەرەتایەک بۆ پەیوەندییەکی بەهێزی نێوان ئەم دوو وڵاتە، بەڵکو پێش تەواوبوونی جەنگ ئەم دوو دەوڵەتە چوونە ناو یەکێک لە مەترسیدارترین و ماوە درێژترین جەنگەکانی مێژووی مرۆڤایەتی کە بە جەنگی سارد ناسرا، هەرچەندە ئەم جەنگە ڕووبەڕووبوونەوەی ڕاستەوخۆی سەربازی

---

١ - د.ياسين محمد العيثاوي:السياسة الأمريكية،ص٢٢٨-٢٢٩.

نێـوان ئەم دوو دەوڵەتەی تێدا نەبـوو،[1] بەڵکـو زیـاتر شـەڕی هاوپەیمانیەکـان و شەڕی ئابووری و پێشبڕکێی تەکنەلۆژی بوو. ماوەی ئەم ململانێ سەختەی نێوان ئەم دوو بەرەیە (سـەرمایەداری و ئیشـتراکی) تـا سـاڵی (١٩٩٠)ی خایانـد، بەڵام یەکیەتـی سـۆڤیەت و هاوپەیمانەکـانی لەم سـاڵە بەدواوە نەیـانتوانی درێـژە بەم ململانێ تاقەت پڕوکێنە بدەن و یەکیەتی سۆڤیەت هەڵوەشایەوە و سیستمی تاک جەمسـەری لە جیهاندا دەستی پێکرد، ئەم ململانێ درێژخـایەنە دەوڵەتـی رووسـیا (یەکیەتی سۆڤیەتی پێشوو)ی لە هەموو بوارەکانی ئابووری و سیاسی و بازرگانی و....هتـد تووشـی داتەپـین کردبـوو، بەڵام لە دوای سـاڵی (١٩٩٠)ەوە بەتـایبەت لە سـەردەمی هەردوو سـەرۆک (بـۆرج یەڵسـن و ڤلادیمێـر پـۆتن) دەوڵەتـی ڕووسـیا دووبـارە بە توانـاو گڕوتینێکـی زۆرەوە گەڕایەوە سـەرکایەی سیاسـی جیهـان و بوویەوە بە یەکێک لە گەورەترین زلهێزەکانی ئەمڕۆی جیهان.[2]

ئەمەش دوژمنەکانی دوێنێ و دۆستەکانی ئەمڕۆی (ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی) ڕووسیای تووشی نیگەرانی و دڵتەنگی کردووە، چونکە هەرچەندە لە دوای ساڵی (١٩٩٠)ەوە ڕووسیا و ئەمریکا پەیوەندییەکانی نێوانیان تاڕادەیەک هێوربووەتەوە، بەڵام بە گومـانەوە لەتوانـا و هەنگاوەکـانی یەکتـر دەڕوانـن (بەهـۆی پێشـینەی دوژمنـایەتی نێوانیـان)، ئەوەی مەترسـی دروسـت دەکـات لە ئـاڵۆزبوونی پەیوەنـدییەکانی نێـوان ئەمریکـا و ڕووسـیا، بـوونی جبەخـانەیەکی گەورەی چەکـی ئەتۆمیە لەم دوو وڵاتەدا بەجۆرێک ڕێژەی (٩٠%)ی چەکە ئەتۆمیەکانی جیهان لەم دوو وڵاتەدایە، حکـومەتی ئەمریکـا لە سـەردەمی بۆشـی کـوڕدا هەوڵـی دا چەنـد بنکەیەکـی دژە موشـەک لە چەنـد وڵاتێکـی ئەوروپـادا بونیـاد بنـێ (بە بیـانووی کەمکردنەوەی مەترسی موشەکە دوور هاوێژەکانی ئێران و کۆریای باکوور لەسـەر ئەمریکـا و هاوپمانەکـانی)،[3] ئەم هەنگـاوە مەترسـی ڕووسـیای بەرامـبەر ئەم سیاسـەتەی ئەمریکـا زیـاترکردوو بەتونـدی دژایەتـی کـرد، ئەمەش دووبـارە پەیوەندییەکانی نێوان ئەم دوو دەوڵەتەی بەرەو ئاڵۆزی بردەوە، بەڵام دوای هاتنە

---

١ - کارلهاینتس دشنر: تاريخ الولايات المتحدة، ص ٣٥٩.

٢ - بدون مؤلف:موجز التاريخ الأمريكي،ص٢٠٦.

٣ - امين شلبي:الوفاق الأمريكي السوفيتي،القاهرة،١٩٨١،ص٣٢.

بۆ کاراکردنی پەیوەندییەکانی نێوانیان، چونکە ئەمریکا پێگەو هاوپەیمانی و ڕۆڵ و دەستتێوەردانی سوریا و ئێران لە ناوچەکە دەزانێت، بۆیە زۆر بە وردی چاودێری ئەو هاوپەیمانێتیەی نێوان سوریا و ئێران دەکات لە ناوچەکەدا.[١]

### شەشەم/ ئەمریکا و پرسی فەلەستینی- ئیسرائیلی

پرسی فەلەستینی یەکێکە لەو کێشانەی کە زیاترین ئاڵۆزی و مەترسی دروست کردووە بۆ سەر ئاشتی و ئاسایشی جیهان بەتایبەت بۆ ئاشتی و ئاسایشی ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئەو ئاڵۆزی وکێشە وهەڵوێستە ڕۆژهەڵاتی و ڕۆژئاوایی وئەمریکیانەی کە لە خۆی دەگرێت. هەموان دەزانین چ بارووددۆخێ تەنگی هەڵچنیوە بە دامەزراندی دەوڵەتی ئیسرائیل و کردویەتی بە واقعی سەر زەوی، دەکرێت بڵێین دیدی سیاسی ئەوروپی وئەمریکی پێویستە بە داننان بە دەوڵەتی فەلەستینی کە بتوانێ لە پاڵ ئیسرائیلدا بژیت، ئەمەش بە واتای قبوڵکردنی ئەوەی ناودەبرێت بە (چارەسەری دوو دەوڵەت) سەرەڕای ئەوەی سەرۆک بۆش یەکەم سەرۆکی ئەمریکی بوو کە بە ئاشکرا باسی پێویستی دامەزراندنی دەوڵەتی فەلەستینی کرد، بەڵام سەرۆک ئۆباما لە یەکەم ڕۆژی دەسەڵاتیەوە بەڵێنی دا بە کارکردن لە پێناو ئەوەی ئاشتی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەراست بچەسپێ، دەوڵەتی فەلەستینی ئەبێ ببێ بە واقع. بۆیە لە ڕۆژی دواتردا جۆرج میشیل دیاری کرا بۆ ئاهەنگی دانانی لەبەر (بەڕاست سەلماندنی) بەڵێندانی پێشووی لە ماوەی هەڵمەتی هەڵبژاردنەکەیدا، میشیل دیاریکرا تا بچێ بۆ کێشەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بە تایبەت بەوەی ناسراوە بە ڕۆڵی لە چارەسەری ناکۆکی نێوان ئێرلەندای باکور و پاشان شارەزایی قووڵی بە کاریگەری نشینگە ئیسرائیلەکان و ڕەخنەگرتنی لەوکارە لە ماوەی ئەرکی خۆی بە نێردراوی ئاشتی لەنێوئیدارەی سەرۆک بۆشدا.

ئێستا و دوای ئەوەی سەرۆکی نوێ ئۆباما کارگێری ئەمریکای گرتوەتە دەست سەر لە نوێ جموجووڵی لەسەر پرسی فەلەستینی دەستپێکردەوە تا دەقی چارەسەرێ پەیدا بکات کە کۆتایی بهێنێ بە ئاڵۆزترین کێشە جیهان لە کۆتایی جەنگی جیهانی دووەم لە ساڵی (١٩٤٥) یەوە. ئایا دەکرێت ئۆباما ئەوچارەسەرە بێنێتە دی کە بۆ سەرکردەکانی دیکەی ئەمریکا و ڕۆژئاوا نەهاتە دی؟ ئایا سەرۆکی

---

١ - بڕوانە د.ئاراس فەریق زەینەل: س- پ، ل ١٠١-١٢١.

ئەمریکی ئۆباما لە ویست و جووڵەی لە پێناو گەیشتن بە ئەنجامێک کە ئەو ململانییە کۆتایی پێ بێت سوور و ڕاستییەکی تاڵە؟ ئایا ئەوە بۆ دەوڵەتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ناوچەکە وجیهان بە دیدێنێت کە ئاشتی وئاسایش بکاتە بەشیان و ئەو ناوچە لەو وێرانکاریە دوور بخاتەوە کە بەردەوامەو ودوور نیە وێرانکارییەکی گشتگیری لێ بکەوێتەوە، لە ئەنجامی ئەو ململانییەی کە گەیشتۆتە لوتکە. چونکە بارودۆخەکان ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لە گۆڕانی خراپتردان بەتایبەتی لەم قۆناغەدا کە ململانێی نیوان ئەو لایەنە نوێیانەی هاتونەتە مەیدان جەنگە کە توندتر بوەتەوە وەک ئێران کە بێباکانە لە هەموو بۆنەیەکدا دژایەتی خۆی بۆ ئیسرائیل و پشتگیری بۆ توندخوازی ناو فەلەستین و لوبنان و دوژمنانی دیکەی ئیسرائیل نیشان دەدات. هەروەها دڵەنگی ئیسرائیل بە پێشکەوتنی ئێران لە بواری بە دەستهێنانی تەکنەلۆژیای ناوەکی و توانای بەدەستهێنانی چەکی ناوەکیدا کە ئیسرائیل بە وردی وریای هەموو هەنگاوێکی ئێرانە لەو بوارەدا و ئەویش و ئەمریکاش دەترسن ئێران ببێتە دەوڵەتێکی ناوەکی وەک کۆریای باکوور کە لەگەڵ ئێران هاریکارە، ئێستا ئێران چەکی ناوەکی هەیە یان توانای بەرهەمهێنانی ئەو چەکەی هەیە وهێندەی ناوێت تا ئەزموونەکانی ڕاِبگەیەنێت.

لێدوانی دیبلۆماسی وسیاسی کۆتایی ناو کۆشکی سپی لە بەیەکگەیشتەکانی نێوان سەرۆکی ئەمریکی و وەزیری دەرەوەیدا لە لایەک ونێوان سەرۆک وەزیرانی ئیسرائیل و سەرۆکی فەلەستینی و وەزیری دەرەوەی میسر لەلایەکی دیکەوە چەند بەڵگەو ئاماژەیەک نیشان دەدات، بەو پێیەی ناوەندەکانی هەواڵ و شیکارە سیاسیەکانی ئەمریکا و ڕۆژئاوا سەبارەت بەو یەکتر بینانە قسە دەکەن گەشبینی هەیە سەبارەت بەو پرسە، باراک ئۆباما بە زمانێکی نوێ ئیسرائیلیەکانی دواند کە پێشتر لە سیاسەتی ئەمریکیدا نەبووە بەڵکو جەختی دەکردەوە لە بێلایەنی ڕووخساری ئەمریکا بەرامبەر ئیسرائیل و لە هەموو بوارەکاندا وای دەنواند، بەڵام ئێستا بەڵگەکان ئاماژە دەکەن بە گۆڕانی دەربڕینەکانی بە چەند پلەیەک بەوەی دەستێوەردانی وردی ئەمریکا ئەگەر کونجی دەستێوەردانی بە ئەرێنیش بکاتەوە و ویستێکی ڕاستگۆ و وردی تەواو بنوێنێ زیاتر لە کونجی توندی ئەوا پرسەکە دەتەقێتەوە و عەرەب جۆرەگەشبینیەک بەرامبەر هەڵوێست وبەڵێنەکانی ئەمریکا بەدیدەکەن، داوای ئۆباما بۆ وەستاندنی هەموو جۆرە نیشتەجێ کردنێک لە خاکی عەرەبی لە بەرەی خۆیدا کرۆک و واتاگەلێکی هەیە کە ئاستی سووربوونی لەسەر

جوولان لەسەر ئەو پرسە ودەسگرتنیشی بە چارەسەری هەر دوو لاوە نیشان دەدات (دەولەتی ئیسرائیل ودەولەتێکی سەربەخۆی فەلەستینی) کە بتوانێ کرانەوە بە ئاراستەی عەرەبیدا بەدیبهێنێت. دەکرێت عەرەب دلنیا بێتەوە لە ڕاستگۆیی و وردەکاری نیازەکانی باراک ئۆباما بەوەی ئەوانیش بچنە ناو چالاکیە ئاشتیخوازیەکەوە بە ویستێکی زیاترەوە بەتایبەت فەلەستینیەکان جگە لە چەند باڵێکی گەلی فەلەستینی وەک بزوتنەوەی حەماس کە هەلوێستی توندە و بەپێی نەخشەی ئێران دەجوولێننەوە و دژی باڵی میانڕەوەی فەلەستینیە.[1]

## حەوتەم/ئەمریکا و کۆریای باکوور

لە پاش تەواو بوونی جەنگی دووەمی جیهانی لە سالی (١٩٤٥) و کاتێک کۆرییەکان خۆیان بە دەستەوەدا، سوپای ئەمریکا و ڕوسیا ئیدارەی ئەو ولاتەیان لە نێوان هەردوولادا دابەش کرد، ڕووسەکان بەشی باکوور ئەمریکییەکان بەشی باشوریان بەرکەوت لە ولاتی کۆریادا.

لە کاتی جەنگی سارد بەتایبەت لە نێوان سالانی (١٩٥٠- ١٩٥٣)جەنگ لە نێوان هەردوو بەشەکەی کۆریا سەری هەلدا، بۆ دەست تێوەردان لە نێوان هەردوولا نەتەوە یەکگرتووەکان یارمەتی کۆریای باشووری دەدا.

لە بەرامبەردا چین هاوکاری کۆریای باکوری دەکرد، ئەم شەڕە لە نێوان هەردوو کۆریا نەبوو، بەلکو شەڕێک بوو لە جیاتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و یەکێتی سۆڤیەت دەکرا، لە پاش دوو سال جەنگ، سنوری نێوان هەردوو بەشی کۆریا گەڕایەوە بۆ پێش کاتی جەنگ.

پەیوەندییەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەگەل نیمچە دوورگەی کۆریا لەسەر دووبنەمای دیار مایەوە، ئەویش:

**یەکەم:** پەیوەندی لەگەل بەشی باشوور تایبەتمەند بوو بە هاوپەیمانی و پاراستن و واژۆ کردنی پەیماننامەی سالی (١٩٥٣).

**دووەم:** پەیوەندی لەگەل بەشی باکوور خراپ بوو، ئەمریکا کۆریای باکووری بە سەرچاوەی ئاژاوەی لە قەلەم دادە. بەلام ڕووداوەکانی (١١ی سێپتەمبەری سالی

---

١ - بڕوانە د.ئاراس فەریق زەینەل: س- پ، ل ١٢٢-١٢٩.

٢٠٠٠) پەیوەندییەکانی لەگەڵ کۆریای باکوور ئاڵۆزتر کرد بە تایبەت گۆرانکارییەکانی پاش ساڵی(٢٠٠٣)، ئەمەش بۆ خۆی کاریگەری خراپی هەبوو لەسەر پەیوەندییەکانی نێوان هەردوولا. ناچار ئیدارەی بۆش چاوی خشاندەوە بە هەڵوێستەکانی پێشتری، چونکە تا دەهات کێشەکانی ئاڵۆزتر دەبوو و ڕووی لە دوژمنکاری دەکرد. ئەمەش دوو ئاڕاستەی لێکەوتەوە: یەکەمیان لە پاش ئەوەی کۆریای باکوور هەڵوێستی(بەرهەڵستکردنی) وەرگرت بە ڕاگەیاندنی (بیۆنک یانک) بە پێشخستنی بەرنامە نەوەوییەکەی و بەگەڕخستنەوەی کە دژە لەگەڵ بەند و بنەماکانی ڕێککەوتننامەی جنێڤ کە لە ساڵی (١٩٩٤) واژۆ کراوە.

**دووەم- پەرەسەندنی ئۆپۆزسیۆنی جەماوەری.**

لە بوونی بنکەی سەربازی ئەمریکی لە ناو کۆریای باشوور و داواکردنی چاوخشاندنەوە و دانوساندن بەشێوەیەک لەگەڵ گۆڕانکارییە سیاسی و ئابوورییەکانی ناوخۆی کۆریا لەلایەک و پەیوەندییەکانیان لەگەڵ کۆریای باکوور لەلایەکی دیکە بگونجێ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ڕۆڵێکی نموونەیی و وێنە و چەشنی شتێکی گێڕا لەپێناو مانەوەی سەربازی خۆی، بەشێوەیەک کۆریای باشوور بەردەوام لە دۆخی ئابووری خراپدا بێت، سەرەڕای لاوازی بونیادنانی هێزی سەربازی خۆی تا پشت بە هێزەکانی ئەمریکا ببەستێت، چونکە دوژمنێکی گەورەی بۆ دروست بووە ئەویش کۆریای باکوورە.

لە ساڵی (١٩٩٣) کۆریای باکوور هەستا بە گەشەپێدانی بەرنامە ئۆتۆمییەکەی خۆی و هاوکارییەکانی ڕاگرت لەگەڵ ڕێکخراوی نێودەوڵەتی بۆ وزەی ئەتۆم و لە پەیماننامەی بڵاونەبوونەوەی چەکی ئەتۆم کشایەوە. ئەمەش قەیرانێکی توندی هەڵگیرساند لەنێوان(بیۆنگ یانگ) و ئیدارەی (بیل کلینتۆن)، لەو سەردەمەوە وەزارەتی بەرگری پلانێکیان دانا بۆ لێدانی چالاکییەکانی کۆریا لەلایەن هێزەکانی ئەمریکا و کۆریای باشوور لەناو خودی کۆریای باشوور، بە هەڵگیرسانی ئەم شەڕە بەلای کەمەوە یەک ملیۆن کەس لەناو دەچێت، چونکە هێزەکانی ئەمریکا تەنها (٢٠) میل لە سنوری کۆریاوە دوورن.

لە ساڵی (٢٠٠٣) ئەمریکا لە ڕێگای لێکۆڵینەوەیەکی دوور و درێژ کە لە سەنتەری نێودەوڵەتی و ستراتیجی لە واشنتۆن-((CSIS))

به ناونیشـانی((proliferation in the Axis of Evil)) لەلایەن (انتـونی کرودسمان) بەپشت بەستن بە زانیارییە هەواڵگرییەکان ئامادەی کردبوو، کەباس لە گرنگترین هۆ و پاڵنەرەکانی ئەمریکا دەکات، کە کۆریای باکور بخاتە تەوەری شـەڕ و مەترسی لە ڕۆژهەڵات.

قسەکردن لەسەر شەڕی پێشوەختی ئەمریکا لەگەڵ کۆریای باکوور پێویستی بە ژیـری و ووردبینـی هەیە لە شـێواز و نـاوەڕۆک لەلایەک ئاکـام و شـوێنەوارەکانی لەلایەکی دیکە، چونکە لەم قۆنـاغەدا ئیدارەی نوێ ئەمریکـا بە سـەرۆکایەتی ئۆبامـا هەنـدێ جـار پێویسـتی بە هەڕەشـە هەیە، بەڵام ناچـارە پەنـا ببـاتە بەر سیاسـەتی دەوردان لە ڕێگـای یابـان و کۆریـای باشـوور بـۆ ئەوەی پەیوەنـدییەکانی نێوانیـان زیـاتر ئـاڵۆز نەبێـت و مەترسـییەکانی کۆریـای بـاکوور لە ڕۆژهەڵات بە گشـتی و بەرژوەندییەکانی ئەمریکا بە تایبەت نەخـاتە مەترسییەوە، لەم بارەیەتەشـەوە ئۆبامـا وتـــی ئەم هەنگـــاوەی کۆریـــای بـــاکوور پێشـــێلکارییە بـــۆ بڕیارەکـــانی نەتەوە یەکگرتووەکـان، هەروەهـا وتـی مووشـەکی (تایبودونـک-٢) پێشـێلکارییەکی ڕوون و ئاشـکرایە بـۆ بڕیـاری ژمـارە (١٧١٨) ئەنجـوومەنی ئاسایشـی نێـودەوڵەتی، کە بە ئاشکرا ڕێگا نادرێت بە کۆریای باکوور هەستێت بە هیچ چالاکییەکی پەیوەندیدار بە بەرنامە ئەتۆمییەکەی. هاوکـات ئامـاژەی بەوە کرد کە ئەم کێشـەیە بە ڕاوێژ لەگەڵ هاوپەیمانـانی وەک (یابـان و کۆریـای باشـوور) و ئەنـدامانی ئەنجومەنی ئاسایشـی نێودەوڵەتی ڕەوانەی ئەو ئەنجـومەنە دەکرێـت بـۆ چارەسـەرکردن لە چوارچێـوەی سیاسـەتی دەوردانی لە ناوچەکە.[١]

**هەشتەم/ ئەمریکا و مەترسییەکانی چین**

دەرکەوتنی چین وەک هێزێکی ئـابووری گەورەی جیهـان، بۆتە جێگـای تێڕامـانی زۆربەی چـاودێران و هەروەهـا بـابەتی لێکۆڵینەوە لە هەمـوو بوارەکـان، بە تـایبەت نهێنییە سیاسییەکانی ئەم گەشەکردن و کارابوونە.

هـیچ کەس گومـان لەوە ناکـات پێشـکەوتن و گەشـەکردنی چـین هەنگـاوی تـری بەدواوەیە، چونکە چـین هەنگـاو بەهەنگـاو لە قۆرخکردنی بازاڕەکانی جیهاندایە، لە ڕاسـتیدا وڵاتـی چـین وەک هێزێکی چـالاک لەخـۆ سـەلماندندایە بـۆ سیسـتەمی نوێی

---

١ - بروانە د.ئاراس فەریق زەینەل: س- پ، ل ١٥٦-١٦٣.

جیهان. مێژوو ئەو ڕاستییەی بۆ تۆمار کردوین کاتێک دەوڵەتێک لە گەشەکردن و پێشکەوتندایە ڕووبەڕووی وڵاتی گەورە و زلهێز دەبێتەوە و ئەمەش لە سەدەی (١٩) و (٢٠) لە نێوان ئەڵمانیا و بەریتانیای مەزن و پاشان لە نێوان ژاپۆن و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ڕوویدا.

ئایا ڕووبەروبوونەوەی نێوان چین و ئەمریکا ڕوودەدات، ئایا چین دەتوانێت هەژموونی خۆی بسەپێنێت بەسەر گۆڕەپانی سیاسی نێودەوڵەتیدا؟

ڕەنگە ئێستا و لەم قۆناغەدا نەتوانین بڕیاری ئەو باڵادەستییە بدەین، بەڵام لە هەمانکاتدا دەتوانین لە چوارچێوەی هونەری دەسەڵات و بۆچوونەکان بۆ ئامانجەکانی و بەکارهێنانی هەموو ئەو ئامرازانە، کە خزمەتی ئەو پرۆسەیە دەکات، تێگەیشتنمان هەبێت بۆ واقعی وڵاتی چین.

ڕەنگە ئەم گەشەکردنەی وڵاتی چین لەم سەردەمانەی دواییدا مەترسی هەبێت بۆ سەر بەرژەوەندییەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە جیهان بە گشتی و ڕۆژهەڵات بەتایبەت، هاوکات حکومەتی چین بەردەوام پاساوی ئەوە دێنێتەوە، کە گەشەکردن و پێشکەوتنی وڵاتی چین ((ڕێنسانسی ئاشتی)) مەترسی نیە بۆ سەر سیستەمی نوێی جیهانی، کە ئەمریکا سەرکردایەتی دەکات، هەروەها توێژەری بەناوبانگی چینی (وانگ جیسی) دەڵێت: (ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا با دڵنیا بێت لەوەی گەشەکردن و رێنسانسی چین پێویستی بە پتەوکردنی پەیوەندییەکانیەتی لەگەڵ ئەمریکادا ئەگەر بیەوێت هەوڵەکانی لەپێناویدا سەرکەوتوو بێت)،

لە ڕاستیدا ئەم هەوڵانە واتە شەراکەت و هاوکاری واشنتۆن بۆ پەکین هۆکارێکی زۆر گرنگە بۆ ئەو ڕێنسانسەی کە چین هەنگاوی بۆ ناوە.

دەسەڵاتدارانی چین دەزانن بەتایبەتی سەرۆکی چین(هوینتاو) کەبەردەوام باس لەجیهانێکی تەبا دەکات و دەڵێت با هەموو وڵاتانی دونیا بە تایبەتمەندی و ئاراستە جیاوازییەکانییەوە پێکەوە بەئاشتی ژیان ببەنە بەسەر.

گومان لەوەدا نییە وڵاتێکی گەورەی وەک چین بەم لێدوانانەی ئامانجی هێورکردنەوەی ئەمریکایە لەلایەک و پاراستنی بەرژەوەندییەکانی خۆیەتی لە ئاسیا بە گشتی و لاوازکردنی بەرژەوەندییەکانی ئەمریکایە بەتایبەت، ئەوەی تێبینی دەکرێت لەم بوارەدا، تێگەیشتنی چین و رووسە لەگەڵ یەکتردا و دامەزراندنی ڕێکخراوی (شانگەهای) بۆ هاوکاری لەگەڵ وڵاتانی ئاسیای ناوەڕاست وەک

(کازاخستان، قرغیزستان، ئۆزبەکستان و تاجیکستان)، هەروەها ئەم ڕێکخراوە بە پەلە ناڕەزایی خۆی دەربڕی لەمەڕ بوونی هێزی سەربازی ئەمریکا لە ئاسیای ناوەڕاست، ئەوەبوو لە ناوەڕاستی ساڵی(٢٠٠٥) داوایان لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کرد کە خشتەی کشانەوەی هێزەکانی خۆی لە ناوچەکە دیاری بکات، هاوکات چینییەکان ڕێگایاندا بە وڵاتی هند و پاشان ئێران بەبێ بەشداریکردنی ئەمریکا وەک چاودێرێک لەم ڕێکخراوە کاربکەن.

چینییەکان کاریان کرد بۆ بەستنی چەند کۆبوونەوەیەک، لەوانە کۆبوونەوەی لوتکەی ڕۆژهەڵاتی ناوەراست کە بریتین لە(١٠) دەوڵەت وەک(کەمبودیا، ئەندونیسیا، برونی، دار السلام، لاوس، مالیزیا، میانما، فلیپین، سەنگافورە، تایلەند و ڤێتنام)، جگە لە (چین، ژاپۆن، کۆریای باشور، ئوستراليا، نیوزلەندا و هیند) ئەمەش ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکای تێدا نییە، وادەردەکەوێت کە وڵاتانی رۆژهەڵاتی ئاسیا و ڕێکخراوی (شانگەهای) بۆ هاوکاری بازرگانی لە چوارچێوەی پەیوەندییە ستراتیژییەکانی چین لەگەڵ وڵاتی ئاسیا، بۆ دەرخستنی گرنگی پەیوەندییەکانی چین و لاوازی پەیوەندییەکانی ئەمریکا بێت.

لە ڕاستیدا دوو هەڵوێستی تر گومانی زیاتر دەخاتە سەر نیازەکانی چین، ئەوانیش:

یەکەمیان: زۆر بەبێ دەنگی و هێمنی گەشە بە توانا سەربازییەکانی دەدات، بۆ نموونە تاماوەیەکی زۆر هیچ لایەنێک زانیاری دەربارەی ئەوە نەبوو کە وڵاتی چین چەکی دژی مانگی دەستکردی هەیە، ئەمەش لەلای ئەمریکا و زۆرێک لە وڵاتانی جیهان دڵەڕاوکێ و مەترسی دروست کردووە.

دووەم: چینییەکان لە ڕێگەی پەیوەندییەکانیان لەگەڵ وڵاتانی ئەفریقیا لە ڕێگەی بەستنی کۆنگرەی سەرکەوتوو و پێدانی قەرز بە قازانجی کەم و پێشکەشکردنی هاوکاری بەبێ کۆت و بەند و ڕێزگرتن لە مافەکانی مرۆڤ لەم وڵاتانە چالاکییەکانیان فراوانتر کرد، ئەمەش بۆ خۆی لەلایەن وڵاتانی ئەوروپا و ئەمریکاوە دوو بۆچوونی جیاوازی لێدەکەوێتەوە، ئەویش هەندێک لەو وڵاتانە پێشوازی لەم هەنگاوانەی چین دەکەن بۆ وڵاتانی ئەفریقیا، چونکە پێویستییان زۆرە بە و هاوکارییانە، لەبەرامبەردا هەندێکی دیکە بەویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاشەوە لەچوارچێوەی بەرنامە فراوانخوازییەکانی و بۆ گەیشتن بە سەرچاوە سروشتییەکان و دروستکردنی پەیوەندی بازرگانی و دەستکەوتی کەرەستەی خاو،

بەبێ ئەوەی هیچ پەیمانێک بدەن بەگەشەکردن و پێشخستنی وڵاتانی ئەفریقا و ڕەنگە جموجۆڵاً و چالاکییەکانی چین لەئاستی بەرگریکردنی بێت بە ئامانجی پاراستنی بەرژەوەندییەکانی چین و ڕێگرتن لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە جێبەجێکردنی ستراتیژییەتی دەوردان (الاحتواء) لە دژی توانا و هێزی چین، ئەگەر هاتوو لەلایەکی دیکەوە تەماشای مەترسییەکانی چین بکەین لەئەمریکا، بەئاسانی تێبینی ئەو مەترسییانە دەکەین بەتایبەت پەیوەندییە سەربازییەکانی ئەمریکا و بنکە سەربازییەکان لە کیشوەری ئاسیا هەر لەکۆریای باشوور و ژاپۆنەوە تا تایوان و لەوێشەوە بۆ ئوسترالیا و پاکستان، پاشان بۆ ئاسیای ناوەڕاست.

لێرەدا تێبینی ئەوە دەکرێت ئەمریکا شورایەکی نیمچە بازنەیی بە دەوری وڵاتی چیندا دروستکردووە، دەبێ ئەو ڕاستییەش بزانین هیچ هێزێک جگە لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەم سەردەم و قۆناغەدا توانای بەرگرتن و ڕێگرتنی لە کارابوون و هەڵسانەوەی چین نییە، هاوکات چینییەکان پێیان وایە ئەمریکا لە بەرامبەر چیندا سیاسەتی ئیحتیوا پیادە دەکات، ئەمەش لە ترسی ئەوەی نەوەک کۆنترۆڵی لاواز بێت بەهۆی هێز و تواناکانی چینەوە، جگە لە ئارەزووی ئەمریکا لە مانەوەی وەک تاک جەمسەر لە جیهاندا.[1]

### ئەمریکای گەورە زلهێزی جیهان

لە پاش ڕووخاندنی یەکێتی سۆڤیەت لە ساڵی (١٩٩٠) ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا وەک تاکە جەمسەر لەسەر سیستمی نوێی جیهان مایەوە، ئەم سیستمە نوێیە کە ئەمریکا دایهێنا، بۆ دەرخستنی توانا و هەیبەت و دەسەڵاتی بەسەر جیهان وەک گەورەترین ئیمپراتۆریەت یاخود وەک گەورەترین زلهێزی جیهان، پرۆسەی ڕزگارکردنی کوێتی جێبەجێ کرد بە دەرکردنی ڕژێمی عێراق لە کوێت و گەڕانەوەی سەربەخۆیی بۆ گەل و وڵاتەکەیان، هاوکات زەمینەی ڕەخساند بۆ سەرهەڵدانی ڕاپەڕینی شەعبانی باشووری عێراق لەلایەن شیعەکانی عێراقەوە، هەروەها بەرپابوونی ڕاپەڕینی مەزنی بەهاری گەلی کورد لە کوردستان و ئازادکردنی کەرکووک و پاشان دروستکردنی پشتێنەی ئەمنی لە کوردستانی عێراق

---

١ - بروانە د.ئاراس فەریق زەینەڵ: س- پ، ل ١٦٩-١٧٨.

و گەڕانەوەی خەڵکی کوردستان بۆ شارەکانی هەولێر و سلێمانی و گەرمیان و دهۆک و دروستبوونی بەرەی کوردستانی و دەستپێکردنی هەڵبژاردنەکانی کوردستان و دامەزراندنی یەکەم حکومەت و پەرلەمان لە کوردستان پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییەی حکومەتی عێراق بەجێی هێشت، ئەمەش بەرهەمی خوێنی شەهیدانی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد بوو، هەرچەندە لە ساڵی(١٩٩٦) شەڕی ناوخۆ دەستی پێکرد و حکومەتی هەرێم دابەش بوو بۆ دوو حکومەت، یەک لە هەولێر و ئەوی دیکە لە سلێمانی و ئیفلیجکردنی پەرلەمان و دابەشبوونی هەرێم بۆ دوو بەشی جیاواز، بەڵام لە سایەی سیستمی نوێی جیهانی، بەتایبەت لە دوای ڕووداوەکانی (١١) ی سێپتەمبەر لە نیویۆرک و واشنتۆن، ئەم سیستمە گۆڕانی بەسەردا هات و ئەمریکا وەک هێزێکی گەورە لە شێوەی ئیمپراتۆریەت سەریهەڵدا لە پێناو پاراستنی ئاسایشی نەتەوەیی ئەمریکا، بەو بۆنەیەوە وەزارەتێکی نوێ لە حکومەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکای دامەزرا، ئەویش وەزارەتی ئاسایش بوو بۆ ئاگاداربوون و ڕووبەڕووبوونەوەی هەر کێشەو گرفتێکی چاوەڕواننەکراوە، کە مەترسی لەسەر ئاسایشی نەتەوەیی ئەمریکا هەبێت، ئەم ئیمپراتویەتە کە لە پاش ڕووخاندنی یەکێتی سۆڤیەت سەری هەڵدا، پێویستی بە ڕابەر و سەرکردایەتی هەبوو، نەک لەلایەن یەک کەسەوە، وەک ئیمپراتۆریەتەکانی پێش خۆی، چونکە ئەم ئیمپرا تۆریەتە لەم سیستمە نوێیەی جیهاندا پێویستی بە کۆمەڵ و گروپ و لایەن هەیە تا بتوانن بە باشی بەڕێوەی بەرن، بۆ نموونە لە پاش ساڵانی نەوەدەکان گرووپێک بە ناوی پارێزگارە نوێیەکان سەریانهەڵدا و خاوەنی ڕاوبۆچوونی تازە بوون بۆ ئەوەی چۆن ئەمریکا بتوانێت سەرکردایەتی جیهان بکات لە پاش ڕووخانی یەکێتی سۆڤیەت، لەوانەش (دیک چینی و ڕامسفیلد و کۆندالیزارایس) و ئەمڕۆش (جۆن بایدن و جونس و هیلاری کلینتۆن...هتد)، جگە لەمانە، جولەکە خاوەن دەسەڵاتەکان لە ئەمریکا لە پشتی پەردەوە ڕۆڵیان هەیە لە بڕیاردان لەسەر چارەنووسی ئەمریکا، بەتایبەت ڕاوێژکارانی پنتاگۆن و ئاسایشی نەتەوەیی و کاروباری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، هەموو ئەمانە پێکەوە کاردەکەن تا بتوانن خزمەتی ئەمریکا بکەن و ئەمریکا بەردەوام لەپێشکەوتن و گەشەکردنی سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتی..هتد بێت. بێگومان ئەم ئیمپراتۆریەتەی باسی لێوە دەکەین، وەک هەموو ئیمپراتۆریەتەکانی قۆناغەکانی مێژوو ئامانج و ئامراز و بەرژەوەندی تایبەتی خۆی هەیە و گرنگترین ئامانجە ستراتیژییەکانی ئەوەیە کە ئەمریکا

بەردەوام بێت لە پێشەوایەتی جیهان، چونکە ئەمریکا سەدەی بیستەم بە سەدەی خۆی دەزانێت، بۆیە بە هیچ شێوەیەک ڕێگە بە هیچ وڵاتێک نادات سەدەی بیست و یەک لەدەستی ئەمریکا دەربکات بە مانەوەی توانا سەربازییەکانی لە جیهان پاش. شکستهێنان بەدیاردەی تیرۆر و پوکانەوەی تواناکانی ڕێکخراوی ئەلقاعیدە لە عێراق و ئەفغانستان، جێگیری باری ئەمنی تاڕادەیەکی زۆر لە عێراق و کەمبوونەوەی کوشتاری تایفی نێوان شیعە و سوننە، هەنگاونان بەرە و چارەسەرکردنی کێشەکانی ئەفغانستان، خستنەگەڕی هەوڵە دیپلۆماتییەکان بۆچارەسەرکردنی کێشەی ئەتۆمی ئێران و کۆریای باکوور و نزیککردنەوەی دیالۆگی سوری - ئیسرائیلی، کەمکردنەوەی ڕۆڵی ئێران لە عێراق و لوبنان و فەلەستین و پاراستنی بەرژەوەندییەکانی خۆی و هاوپەیمانەکانی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەراست، جگە لە کۆشش و هەوڵی جیددی بۆ چارەسەرکردنی قەیرانی ئابوری ئەمریکا بە بوژانەوەی دارایی ئەمریکا نەوەک وڵاتانی ئەوروپا و چین بازاڕەکان بۆ خۆیان قۆرخ بکەن، لە هەمانکاتدا ساغکردنەوەی کاڵا ئەمریکییەکان لە بازاڕەکانی ڕۆژهەڵات و کۆنترۆڵکردنی نەوتی کەنداو بەگشتی و نەوتی عێراق بەتایبەت وەک فاکتەرێکی سەرەکی و ڕۆڵی لە ئابوری جیهان گرنگترین ئامرازەکانی پاراستن و مانەوەی ئیمپراتۆریەتی ئەمریکی وەک سەدەی رابردوو کە بە تاک جەمسەر کۆتایی پێهێنا بەمانەوە و گەشەکردنی تواناو چالاکییە سەربازی و تەکنەلۆژییەکانیەتی بە بەراورد لەگەڵ وڵاتانی جیهان و زیادکردنی خەرجیە سەربازییەکانی، کە یەکێکە لەهۆکارەکانی سەرهەڵدانی قەیرانی ئابوری ئەمریکا، بەڵام ئەمریکا نایەوێت بەهۆی خەرجییە زۆرەکانی خۆی گۆشەگیر بکات، بەڵکو بۆ ئیدارەی نوێی ئەمریکا بە گشتی و وەزارەتی بەرگری بەتایبەت بودجەی زیاتر دابین دەکات، چونکە ئیستاشی لەگەڵدا بێت، تەنها بودجەی وەزارەتی بەرگری ئەمریکا بەرامبەر زیاتر لە (١٠)دە وڵاتی گەورەی جیهانە، ڕەنگە زیادەڕەوی تێدانەبێت گەر بڵێین بودجەی وەزارەتی بەرگری ئەمریکا بەرامبەر بودجەی وەزارەتەکانی بەرگری هەموو وڵاتانی دنیایە، بۆیە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ناچارە بودجەی زیاتر تەرخان بکات لەپێناو پاراستنی هەیبەت و هەیمەنەتی ئیمپراتۆریەتە پیرۆزەکەی خۆی لە جیهاندا. [1]

---

١ - بروانە د.ئاراس فەریق زەینەل: س- پ، ل ١٧٩-١٨٥.

## لیستی سەرچاوەکان


١- د.ئازاد محمد أمين:جغرافية الامريكتين،جامعة البصرة،١٩٨٣.

٢- مؤلف مجهول: معلومات وحقائق عن الولايات المتحدة الامريكية، دون مكان الطبع،١٩٥٦.

٣- فرحات زيادة و ابراهيم فريجي: تاريخ الشعب الاميركي، تحت اشراف فيليب حتي، مطبعة برنستون، ١٩٤٦.

٤- لوقمان خەیاڵی: پوختەیەک لە مێژووی گەورە زلهێزی جیهان، چاپخانەی وەزارەتی روشنبیری، سلێمانی، ٢٠٠٥.

٥- د. طليعة الصياح و د. راغب العلي: تاريخ الولايات المتحدة الامريكية، جامعة دمشق،١٩٩٥.

٦- د.صالح زهر الدين: موسوعة الامبراطورية الامريكية، المركز الثقافي اللبناني، ط١، ٢٠٠٤.

٧- تأريخ العالم لەسەر(C.D).

٨- د. محمد محمد صالح: تاريخ اوروپا من عصر النهضة و حتى الثورة الفرنسية(١٥٠٠-١٧٨٩) بغداد،١٩٨١،

٩- د.فرغلي علي تسن: تاريخ أوروپا الحديث المعاصر، جامعة العلاقات الدولية، دار الوفاء للطباعة والنشر.

١٠- د.عبد العزيز سليمان و د. عبد المجيد نعنعي: تاريخ الولايات المتحدة الامريكية الحديث، دار النهضة العربية،بيروت.

١١- د. اسماعيل احمد ياغي: معالم التاريخ الامريكي الحديث،مكتبة العبيكان،ط ١، الرياض،٢٠٠١.

١٢- د.صلاح احمد هريدي: دراسات التاريخ الامريكي، جامعة العلاقات الدولية، دار الوفاء للطباعة والنشر،٢٠٠٠.

١٣- لاوريت سيجولانه: امريكا اللاتينية (الثقافات القديمة ما قبل الكولومبية، ترجمة- صالح علماني، ط١، المجلس الاعلى للثقافة،٢٠٠٣، القاهرة.

١٤- ب. رادين: الحضارات الهندية في امريكا، ترجمة- يوسف شلب الشام، دار المنارة، ط ١، ١٩٨٩،سوريا.

١٥- ديب علي حسن: الولايات المتحدة الامريكية من الخيمة الى الامبراطورية، مراجعة وتدقيق. اسماعيل الكردي، الاوائل للنشر، ط ١، ٢٠٠٢، سوريا.

١٦- عمر خوشناو: سرینەوەی بەرامبەر لە کەلتوری ئەمریکیەکاندا(هندیە سورەکان)وەک نموونە، رۆژنامەی بزووتنەوەی ئیسلامی، ساڵی ٢٠٠٧.

١٧- لويس ى. لوماكس: ثورة الزنوج، تر. ابراهيم عبود، نيويورك، ١٩٦٢.

١٨- د. محمد فؤاد ابراهيم و د. حسين فوزي: المعرفة، المجلد الخامس، بيروت، ١٩٨١.

١٩- سمير سمو: فەرهەنگی سەیر و سەمەرەکانی جیهان، و.مستەفا سعید عەلی، چاپخانەی چوار چرا،سلێمانی ٢٠٠٥.
٢٠- مسعود الخوند: الموسوعة التاريخية الجغرافية، الجزء الثالث، اوروپا، د-ت.
٢١- کۆڤاری ئەمریکا ناسی، ژمارە (١)، سەنتەری نما، ٢٠٠٥.
٢٢- فرانک ال شوئل: امریکا چگونه امریکا شد، و.ابراهيم صدقياني، ج٣، چاپخانەی شبهر، تاران،١٣٨٣.
٢٣- د. رفعت غنيمي الشيخ: امريكا والعالم في تاريخ الحديث و المعاصر، عين للدراسات والبحوث، ٢٠٠٦.
٢٤- تشارلز وماری بيرد:تاريخ الولايات المتحدة الامريكية، مكتبة الاطلس،دمشق، الجزء الاول والجزء الثاني.
٢٥- ميسلون هادي: من اساطير الهنود الحمر، الموسوعة الصغيرة، بغداد.
٢٦- صاموئيل اليوت مورسيون:كريستوفر كولمبوس(المكتشف العظيم)، ترجمة- فوزی قبلاوي، مطبعة دار مكتبة الحياة،بيروت،١٩٥٩.
٢٧- محمود محمد الحبيب:كولمبوس مكتشف امريكا،ط١،بيروت،١٩٧١.
٢٨- كارلهاينتس دشنر:تاريخ الولايات المتحدة،ترجمة محمد جديد،ط١،دار قدمس للنشر و التوزيع، سوريا.
٢٩- د. محمد محمود النيرب: المدخل في تاريخ الولايات المتحدة الامريكية،ط١، ١٩٩٧، دار الثقافة الجديدة، الجزء الاول، القاهرة.
٣٠- د.محمود السيد: تاريخ اوربا و الامريكتين، مؤسسة شباب الجامعة، الاسكندرية، ٢٠٠٤.
٣١- فرانک اشر: موجز تاريخ الولايات المتحدة الامريكية، ترجمة – مهيبة مالكي الدسوقي، مطبعة دار الثقافة للطباعة والنشر،بيروت،١٩٥٤.
٣٢- ستيڤن ڤنسنت بنيه: أمريكا، ترجمة- عبدالعزيز عبدالمجيد، القاهرة، ١٩٤٥.
٣٣- ماكس ليرنر: أمريكا كحضارة، ترجمة- د.راشد البراوي، الجزء الاول، القاهرة، ١٩٦٦.
٣٤- جواهر لال نهرو: چاوپێداخشاندنێک بە مێژووی جیهاندا، و. رؤوف محمد زوهدي، بەرگی یەکەم، هەولێر.
٣٥- فریشتە نورائی: مێژووی گۆرانکاریی کۆمەلایەتی و سیاسیی ئەمریکا، و.هەورامان فەریق کریم، چاپخانەی خاني، چاپی یەکەم، ٢٠٠٧، دهوک.
٣٦- لاری الوتيز.نظام الحكم في الولايات المتحدة، ترجمة -جابر سعيد عوض، ط١، القاهرة،١٩٩٦.
٣٧- وليم لانجر: موسوعة تاريخ العالم، تر- د. محمد مصطفى زيادة، فرانكلين للطباعة والنشر، الجزء الرابع، القاهرة،١٩٦٣.

٣٨- د. محمـد محمـود النيـرب: تـاريخ الولايـات المتحـدة الامريكيـة، دار الثقافـة الجديـدة، الطبعـة الاولى،١٩٩٧، الجزء الاول.

٣٩- د.علي حسين الشلش: جغرافية امريكا الشمالية الاقليمية، جامعة البصرة، ١٩٨٠.

٤٠- ئيـزاك ئايسـيمۆف و فرانـك وايـت: مێژووی شارسـتانیەت (هەنگـاوی هەزارەکـان)، و حامیـد گەوهەری، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە،دەزگای ئاراس، هەولێر،٢٠٠٣.

٤١- بدون مؤلف: موجز التاريخ الامريكي، وزارة الخارجية، مطالعات عن اميركا.

٤٢- كنيث بپر: كل شيء عن امريكا، دار الكرنك،القاهرة،١٩٦٣.

٤٣- د. عبدالفتاح حسن ابوعليه: تاريخ الامريكتين والتكوين السياسي للولايات المتحدة الامريكية، دار المريخ للنشر، الرياض،١٩٨٧.

٤٤- فرنسيس فريدمان: موجز التاريخ الامريكي، القاهرة، د-ت.

٤٥- احمد كمال ابو المجد: التاريخ الدستوري للولايات المتحدة الامريكية، مطبعة عمان، ١٩٩٨.

٤٦- الان نفينز و هنري ستيل كوماجر: موجز تـاريخ الولايـات المتحـدة الامريكيـة، ترجمـة مصـطفى عامر، القاهرة.

٤٧- جوردن س.وود: الثورة الامريكية، ترجمة- نادر سعادة، مراجعة. فؤاد السروجي، الاهليـة للنشـر والتوزيع، الطبعة الاولى، عمان،٢٠٠٦.

٤٨- محمد مصطفى صفوت: الجمهورية الحديثة، الطبعة الاولى، الاسكندرية، ١٩٥٨.

٤٩- ميلتون ميلتز: معالم الحرية، ترجمة.احمد عزت طه، دار اليقظة العربية للتأليف والترجمـة والنشـر دمشق،١٩٦١.

٥٠- كلـود جوليـان:الامبراطوريـة الامريكية،نقلـة الـى العربيـة،ناجي ابـو خليـل و فـؤاد شـاهين،دار الحقيقة،الطبعة الاولى،بيروت، ١٩٧٠.

٥١- د.ياسين محمد العيثاوى: السياسة الامريكية بين الدسـتور والقوى السياسـية، دار اسـامة للنشـر والتوزيع، الطبعة الاولى،عمان،٢٠٠٩.

٥٢- محمد محمد صـالح: تـاريخ اوروپـا مـن عصـر النهضـة وحتى الثـورة الفرنسـية(١٥٠٠- ١٧٨٩م)، جامعة بغداد،١٩٨٢.

٥٣- دان ليس:الثورة الامريكيـة (دوافعهـا ومغزاهـا، ترجمـة- سـامي ناشـد، منشـورات مؤسسـة سـجل العرب، القاهرة،١٩٦٦.

٥٤- د.حسن صبحي: معالم التاريخ الامريكي والاوروپى الحديث،دار النهضة العربية، بيروت،١٩٦٨.

٥٥- ياسين جابر صالح: ئەنسکلۆ پیدیای گشتی، دەزگـای چـاپ و پەخشـی سـەردەم، چـاپی یەکەم، سلێمانی، ٢٠٠٥.

٥٦- (الكسي دو توكفيل: عن الديمقراطية في أمريكا، ترجمة- بسام حجار،معهد الدراسات الاستراتيجية، الطبعة الاولى،بيروت،٢٠٠٧).
٥٧- ليديا بجورنلوند:دامەزراندی ئەمریکا و دەستوورەکەی، وەرگێڕانی-ئەبو بەکر خۆشناو، چاپخانەی روون،چاپی یەکەم،ساڵی ٢٠٠٧.
٥٨- مايكل كامن:الدستور في ثقافة الامريكية، ترجمة- أحمد ظاهر،دار الفارس للنشر والتوزيع،الطبعة الاولى، عمان،١٩٩٦.
٥٩- د.محمد مصطفى صفوت: الجمهورية الحديثة، دار المعارف،الاسكندرية، الطبعة الاولى،١٩٨٥.
٦٠- المادة(٢) الفقرة(١) من الدستور الامريكي.
٦١- ارسنت صربيفن:نظام الحكم في الولايات المتحدة الامريكية،ترجمة- محمد عبد المعز،القاهرة،١٩٥٤.
٦٢- وايث ابراهيم و واحيد رأفت: القانون الدستوري،مطبعة الانجلو المصرية، القاهرة،١٩٧٣.
٦٣- كمال المنوفي: أصول النظم السياسة المقارنة، شركة الربيعان للنشر والتوزيع،الكويت،١٩٨٧.
٦٤- کازیوە صالح:فیمنیست ناسی وبزوتنوەوەی سیاسی،ک-رەهەند،ژمارە(١٨-١٩)،چاپخانەی رەنج.
٦٥- کۆمەڵێک نوسەر:رەوتەکانی فیمنیزم،و-کارزان محمد،چاپی یەکەم،چاپخانەی تەوار،سلێمانی،٢٠٠٨.
٦٦- فرانك تيسلويت:الثورة العظمى،تر- لجنة من الاساتذة،دار الشرق الجديد،بيروت،١٩٥٥.
٦٧- منصف السليمي: القرار السياسي الامريكي،الطبعة الاولى،مركز الدراسات العربي الاوروبي، ١٩٩٧.
٦٨- رالف غولدمان: من الحرب الى سياسة الاحزاب، ترجمة- فخري صالح، الدار الاهلية،الاردن،١٩٩٦.
٦٩- جيفرسون الرئيس الفيلسوف من كتاباته، اشرف على التحرير- برنارد مايو، ترجمة- د.محمد عبدالمعز نصر،مكتبة النهضة المصرية،القاهرة،١٩٥٩.
٧٠- الان بالمر:موسوعة التاريخ الحديث،١٧٨٩-١٩٤٥،تر- سوسن فيصل السامر ويوسف محمد امين،دار المأمون للترجمة والنشر،بغداد،١٩٩٢.
٧١- د.ئاراس فەریق زەینەل:ئوباما و پرسە هەستیارەکان، چاپخانەی چوارچرا،چاپی یەکەم، سلێمانی، ٢٠١٠.
٧٢- د.عبدالعزيز سليمان نوار ود. محمود محمد جمال الدين:تاريخ الولايات المتحدة الامريكية(من القرن السادس عشر حتى القرن العشرين)، دار الفكر العربي،القاهرة،٢٠٠١.

٧٣- بكر احمد يعقوب: ظهور امريكا كقوة عظمى ودوروها في بلدان شرق المتوسط،مطبعة شهاب،الطبعة الاولى، اربيل،٢٠٠٨.
٧٤- د.محمد محمد صالح ود. ياسين عبدالكريم:تأريخ اوروپا في القرن التاسع عشر، مطبعة جامعة بغداد، ١٩٨٥.
٧٥- روبرت ام كروندن:موجز الثقافة الامريكية،تر-مازن حمادة،الاهلية للنشر والتوزيع،عمان،١٩٩٥.
٧٦- لويس ي. لوماكس:ثورة الزنوج، تر.ابراهيم عبود،مطبعة الانشاء، ١٩٦٥.
٧٧- د.حسن حجي:معالم التاريخ الامريكي والاوروپي الحديث،دار النهظة العربية للنشر والتوزيع،بيروت، ١٩٦٨.
٧٨- د.جلال يحيى:التاريخ الاوروپي الحديث والمعاصر، المكتب الجامعي الحديث، الاسكندرية.
٧٩- فرانك ثيسلويت: الثورة العظمى،تر. لجنة من الاساتذة الجامعين،دار الشرق الجديد،بيروت.
٨٠- د. عبدالوهاب الكيالي: الموسوعة السياسية،دار الفارس للنشر و التوزيع، الطبعة الاولى،عمان،١٩٩١.
٨١- فرزند شيركۆ: ئەمريكا لە مێژووە وە بۆ داهاتوو،چاپخانەی خاک،سلێمانی ٢٠٠٥.
٨٢- وليد نويهض:عصر الغلبة اكتشاف أمريكا و المركزية الاوروبية،مركز الدراسات الاستراتيجية والبحوث، الطبعة الاولى،بيروت،١٩٩٢.
٨٣- روجر باركنسن:موسوعة الحرب الحديثة،تر.سمير عبدالرحيم الچلبي،دار المأمون،بغداد،١٩٩٠.
٨٤- ه.ج.ويلز:مؤجز تاريخ العالم،تر.عبدالعزيز توفيق،مكتبة النهة المصرية،مطبعة الحارة،مصر،١٩٦٧.
٨٥- كوزنتسوف:عرض اقتصادي تاريخي،مكتبة التحرير، بغداد.
٨٦- كارل إن.ديغلر:الانطلاق من الماضي(القوى التي شكلت أمريكا الحديثة)،تر.صادق ابراهيم عودة،دار الاهلية للنشر والتوزيع،عمان،١٩٩٧.
٨٧- روز براون: البرازيل (شعبها وأرضها)،تر.محمد عبدالفتاح ابراهيم، مكتبة النهضة المصرية، القاهرة، ١٩٦٩.
٨٨- د.جفرى برۆن:پوختەی مێژووی ئەوروپا، و.نهاد جلال حبيب الله،چاپی یەکەم،٢٠٠٩.
٨٩- د.خليل علي مراد وجاسم محمد حسن و د. عبدالجبار قادر:دراسات في التاريخ الاوروپي الحديث و المعاصر، الموصل،جامعة الموصل.
٩٠- تشالمرز چونسون: امريكا العظمى(القناع و الحقيقة)،تر.د.فاطمة نصر، الطبعة الاولى،٢٠٠٦.
٩١- د.عبدالعظيم روخان:اوروپا والعالم في العصر الحديث،الهيئة المصرية العامة للكتاب، القاهرة،١٩٩٣.
٩٢- د.راغب العلي ود.طليعة الصياح و د.عبدالكافي العطوف:اوروپا المعاصر،جامعة دمشق،١٩٩٥.

٩٣- فريدريكو روميرو: الامبراطورية الامريكية،تر. احمد الكريم،الاهالى للنشر،الطبعة الاولى،دمشق،٢٠٠٠.

٩٤- عمر الديراوي:الحرب العالمية الاولى:دار العلم للملايين، الطبعة الخامسة، بيروت،١٩٧٧.

٩٥- روجز پاركنسن: موسوعة التاريخ الحديث، ١٧٨٩-١٩٤٥.

٩٦- على حيدر سليمان:تاريخ الحضارة الاوربية الحديثة،دار الاوسط،بغداد،١٩٩٠.

٩٧- انيس لكود:قوة العلاقات الدولية،دارونووم،نيويورك،١٩٦٢.

٩٨- د.بشرى قبيس وموسى مغول:الحروب والازمات الاقليمية في القرن العشرين(أوروپا-أسيا)،بيسان للنشر و التوزيع، بيروت،١٩٩٧.

٩٩- ه.ا.ل.فشر: تاريخ اوربا في العصر الحديث(١٧٨٩-١٩٥٠)،تر.احمد نجيب هاشم و وديع الضبع، دار المعارف، مصر.

١٠٠-لويس ل.شنايدر:العالم في القرن العشرين،تر.سعيد عبود السامرائي،منشورات دار مكتبة الحياة،بيروت.

١٠١-ياسين صابر صالح:ئينسكلۆ پيدياى گشتى،دەزگاى چاپ و پەخشى سەردەم،سلێمانى،٢٠٠٥.

١٠٢-محمد محمد صالح و ياسين عبدالكريم ونورى السامرائي:الدول الكبرى بين الحربين العالميتين(١٩١٤-١٩٤٥)، جامعة بغداد.

١٠٣-فاروق الحريري: الحرب العظمى(الحرب العالمية الاولى)،منشورات وتوزيع المكتبة العالمية،مطبعة حسام، بغداد،١٩٩٠.

١٠٤-پيرو نوڤن: تاريخ القرن العشرين،تر- نورالدين حاطوم،دار الفكر الحديث،بيروت،١٩٦٩.

١٠٥-وليم ز.لوستر:موجز تاريخ الحركة النقابية العالمية،تر.عبدالحميد الصافي،مطابع دار الثورة، بغداد، ١٩٧٤.

١٠٦-ميشال جوبير:الاميركيون،تر.وجية البعيسى،المطبعة العربية،الطبعة الاولى،بيروت،١٩٨٩.

١٠٧-د.عبدالعظيم رمضان: تاريخ اوروپا والعالم الحديث من ظهور البرجوازية الاوروبية الى الحرب الباردة،الهيئة المصرية العامة للكتاب،١٩٩٣.

١٠٨-موريس كروزية:تاريخ الحضارات العالم،تر.يوسف اسعد داغر، عويدات للنشر والطباعة، بيروت، ١٩٩٤.

١٠٩-چون ستيل جوردون: ابراطورية الثروة(التاريخ الملحمى للقوة الاقتصادية الامريكية،تر.هشام ممدوح طه، الشرق الدولية،الطبعة الثانية،القاهرة، ٢٠٠٩.

١١٠-الكسندر كيرسانون:الولايات المتحدة الامريكية،واوروپا الغربية،تر.جبرئيل فياض،دار الفارابي، بيروت، ١٩٧٤.

١١١-د.فوزي درويش:الشرق الاقصى(الصين واليابان)،الطبعة الثالثة،١٩٩٧.

١١٢-محمد عبدالمنعم الشرقاوي:الولايات المتحدة ارضا وشعب ودولة ،الطبعة الثالثة،١٩٥٦.
١١٣-د.فاضل حسين ود.كاظم هاشم نعمة:التاريخ الاوربي الحديث،(١٨١٥-١٩٣٩)،دار الكتب للطباعة والنشر، جامعة الموصل،الطبعة الاولى،١٩٨٢.
١١٤-رمضان لاوند:الحرب العالمية الثانية،دار العلم للملايين،الطبعة الثانية،بيروت،١٩٨١.
١١٥-لويس ل.شنايدر:العالم في القرن العشرين،تر.سعيد عبود السامرائي،بيروت.
١١٦-الكساندر كيرسانوف:الولايات المتحدة الامريكية وأوروبا الغربية(العلاقات الاقتصادية بعد الحرب الكونية الثانية)،تر.جبرائيل الفياض، دار الفارابي،بيروت،١٩٧٤.
١١٧-ميشال بوغنون جوردان:أمريكا التوتوليتارية الولايات المتحدة والعالم:الى أين،تر.خليل احمد خليل،الطبعة الاولى،دار الساقي،٢٠٠٢.
١١٨-بول م.سام ويلسون واخرون:الاقتصاد،تر.هاشم عبدالله،الاهلية للنشر،عمان،٢٠٠١.
١١٩-ج.م.روبرتس: موجز تاريخ العالم،تر.فارس قطان،دمشق،٢٠٠٤.
١٢٠-د.محمد ئيحسان: ململانيه نيودهولّهتيهكان له سهدهى بيستهمدا،د. ئاسۆ كريم و كامران مهنتك،چاپى يهكهم، وهزارهتى پهروهرده،ههولێر،٢٠٠١.
١٢١-د.كهمال مهزههر:چهند لاپهرهيهک له مێژووى گهلى كورد،دهزگاى روشنبيرى كوردى،بغداد،١٩٨٥.
١٢٢-د.رياض الصمد:تطورات الاحداث الدولية في القرن العشرين،المؤسسة الجامعية للدراسات والنشر والتوزيع،الطبعة الاولى،بيروت،١٩٩٩.
١٢٣-عبدالوهاب القيسي واخرون:تاريخ العالم الحديث ١٩١٤-١٩٤٥،الطبعة الاولى،الموصل،١٩٨٣.
١٢٤-رمضان لاوند:جهنگى جيهانى دووهم،و.سهفين لاوچاك،چ١،سلێمانى،٢٠٠٧.
١٢٥-د.عبدالعظيم رمضان:تأريخ اوروبي والعالم في العصر الحديث،الهيئة المصرية العامة للكتاب، القاهرة،١٩٩٣.
١٢٦-محمد عبدالغنى:جوگرافيا و پهيوهنديه سياسيه نێو دهولّهتيهكان،و.د.جهزا توفيق تالب و ئهحمهد على ئهحمهد، چاپخانهى حهمدى،سلێمانى،٢٠٠٥.
١٢٧-د.محمد متولي و د.محمود ابو العلاء:الجغرافية السياسية،مكتبة الانجلو المصرية،القاهرة،١٩٨٦.
١٢٨-دانيال ف.دافيز- نورمان لنجر: تاريخ الولايات المتحدة منذ ١٩٤٥،تر. عبدالحليم ابراهيم الابيض،الدار الدولية للنشر والتوزيع، القاهرة،١٩٩٠.
١٢٩-ادونيس العكرة: من الدبلوماسية الى الاستراتيجية (أمثولات من الحرب الباردة، دار الطليعة،الطبعة الاولى، بيروت،١٩٨١.
١٣٠-بول- ماري دولا غورس: الامبراطورية الاخيرة،تر.هيثم سرية، دار علاء الدين، الطبعة الثانية، دمشق، ٢٠٠٧.

١٣١-مايكل نورثكوت:الملاک يوجة العاصفة،تر.د.عبدالعزيز الشيخ،مكتبة الشرق الدولية،الطبعة الاولى، القاهرة،٢٠٠١.

١٣٢-هنري روبرتس:روسيا وامريكا،تر.شكري علاوي، المؤسسة الاهلية،بيروت، ١٩٥٦.

١٣٣-محمد عزيز شكري:الاحلاف والتكتلات في السياسة العالمية،عالم المعرفة،الكويت،١٩٨٧.

١٣٤-هنری کیسنجەر:ئایا ئەمریکا پێویستی بە سیاسەتی دەرەوە هەیە،و.کەمال نوری،چاپخانەی حەمدی، سلێمانی،٢٠٠٥.

١٣٥-امين شلبى:الوفاق الامريكى السوفيتى،القاهره،١٩٨١.

١٣٦-راشد البراوى:العلاقات السياسية الدولية،القاهرة،ط،١٩٨٢.

١٣٧-د.عصام العطية:القانون الدولي العام،ط٥،بغداد،١٩٩٣.

١٣٨-كلود جوليان:الامبراطورية الامريكية،تر.ناجي ابو خليل،دار الحقيقة،ط١،بيروت،١٩٧٠.

١٣٩-د.عبدالقادر محمد فهمي: الصراع الدولي وانعكاساتة على الصراعات الاقليمية،دار الحكمة للطباعة والنشر، الموصل،١٩٩٠.

١٤٠-فرزند شيرکۆ:ئەمریکا لە مێژووەوە بۆ داهاتوو،چاپخانەی خاک،سلێمانی،٢٠٠٥.

١٤١-محمد عباس جلال،مێژووی خەباتی گەلی ڤێتنام،و.فەرهاد هەمزە محمد،بغداد،١٩٤٨.

ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە دەستپێکی دۆزینەوە جوگرافیەکان و دۆزینەوەی جیهانی نوێدا دۆزرایەوە، هەر لە سەرەتاوە پانتاییەکی فراوانی لە زەوی بەپیت و ژینگەیەکی رەخساو بۆ گەشەی ژیان و جوولەی مرۆڤایەتی لە خۆگرتبوو، ئەمەش هۆکاری سەرەکی بوو بۆ ئەوەی بە لێشاو خەڵکی بە جیاوازی ئاستی کۆمەڵایەتییانەوە لە هەموو ناوچەکانی جیهانەوە بە تایبەت لە ئەورووپای رۆژئاواوە رووی تێبکەن و تیایدا بناغەی ئەم دەوڵەتە بەهێزەی ئەمڕۆ دابرێژن.

بەهۆی فراوانی رووبەرەکەی و بێئەندازە دەوڵەمەندی خاکەکەی و نەبوونی دەسەڵاتێکی بەهێز بۆ پارێزگاریکردنی، ئەمە وایکرد زلهێزەکانی ئەو سەردەمە چاو ببڕنە ئەم دیاریە بەنرخەو ململانێ بکەن بۆ بردنەوەی، لە کۆتاییدا بەریتانیا کە گەورە زلهێزی ئەو سەردەمە بوو توانی دەستبگرێت بەسەر ئەو خاکە دەوڵەمەندە تازە دۆزراوەدا.

وەک نەریتی ئەو سەردەمەی زلهێزەکان لەگەڵ خەڵکی ئەو ناوچانەی کە داگیریان دەکرد بەریتانیا گەلی ئەمریکای لە زۆر لە مافە سەرتاییەکانی بێبەش کرد و لە ناو خاکی خۆیاندا وەک هاوڵاتی پلەدوو مامەڵەیان لەگەڵ دەکردن، یەکێک لەو رەفتارانەی بەریتانیەکان کە مایەی نیگەرانی زۆری ئەمریکیەکان بوو ئەوەبوو کە بە درێژایی ئەو ماوە زۆرەی کە بەریتانیا حوکمی ئەمریکای دەکرد هیچ پلەبەرزێکی بەریتانیا (شا یان وەزیرێکی پلە بەرز) سەردانی ئەمریکایان نەکرد، لە کۆتاییدا هەستکردنی ئەمریکیەکان بە چەوسانەوەو ژێردەستی و هەموو ئەو سوکایەتیانەی بەرامبەریان دەکرا بوون بە هۆکاری سەرەکی بۆ سەرهەڵدانی شۆڕشی گەلی ئەمریکا لە پێناو سەربەخۆییدا.